دکتۆر حەمیدی ئادخوێن

# ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی

دکتۆر هیمدادی حوسێن

# ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٨

٠٧٠
ﻫ ٤٨٨ هیمدادی حوسێن
ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی/ دانانی هیمدادی حوسێن.- سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨.
٤١٠ل: ١٧,٥×٢٥ سم.- زنجیرە؛ ٨٣.
١- ڕۆژنامەوانیی کوردی ٢- ناونیشان ٣- زنجیرە؛ (٨٣)
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێڕستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٨٣
کتێب: ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی
دانەر: دکتۆر هیمدادی حوسێن
مۆنتاج: لاس
خەتی بەرگ و ڕووبەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ٧٥٠
نرخ: ٥٥٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: ١٢٠١ی ساڵی ٢٠٠٨
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لە بڵاوکراوەکانی
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣
نۆرمال: ٣١٢٩١٠٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
سنووقی پۆست: ١٤ E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

# پێرست

## یەكدوو وشە و ڕوونكردنەوەیەك

ئەم كۆمەڵە بابەتە كە لە دووتوێی ئەم كتێبەدا هاتوون، هەندێكیان وەك لێكۆڵینەوەی ئەكادیمی لە گۆڤارە زانستییەكانی زانكۆكانی كوردستاندا بڵاو بوونەتەوە، هەندێكیشیان وەك وتار لە ڕۆژنامەو گۆڤارە كوردییەكاندا بڵاو بوونەتەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی نامەی ماستەرەكەیشم لەمەڕ ڕەنگدانەوەو ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی ژانرە ئەدەبییەكان لەم كتێبەدا هاتووە، هێڵێك كە هەموو ئەو بابەتانە پێكەوە گرێ دەدات دنیای پڕ لە خەون و گەڕان و ماندووبوون و سەراسیمەیی ڕۆژنامەوانییەو ڕۆڵی ئەو ڕۆژنامەوانییە لە تازەكردنەوەو نوێخوازیی شیعر و چیرۆك و خولقاندنی زەمینەیەكی بەپێز بۆ ڕەخنەی ئەدەبی و وتارو ژیاننامە و بابەتە ئەدەبییەكانی دی.

## پێشـــەکی

ڕۆژنامەوانیی کوردی بەگشتی خزمەتێکی زۆری ئەدەبی کوردی کردووە، گۆڤاری (هیوا) لە کۆتایی ڕژێمی پاشایەتی و سەرەتای سـالآنی شۆڕشـی ١٤ی تـەمووزدا، وەك درێژەپێـدەری گۆڤاری (گەلاوێژ) بە تەنیا لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا ڕۆڵی دیارو بەرچاوی لە گەشەپێدانی هونـەرە ئەدەبییەکاندا بینیوەو لاپەڕەکانی تۆمارێکی پڕشنگداری چەندین بەرهـەمی ئـەدەبیی بـەپێزی نووسەرانی ئەو سەردەمەن و یارمەتی زۆر نووسەری لاویدا بـۆ بـلاوکردنـەوەی بەرهەمـەکانیان، ئەمە بێجگە لەوەی نووسەرە دیارەکانی سەردەمەکەی لە ڕێی ئەو گۆڤارەوە شاکارەکانی یەکتریان هەڵدەسانگاندو لەپێناو کـامڵبوون و گەشـەکردنی ئـەدەبی نەتەوەییمانـدا سـەرنج و ڕاو بۆچـوونی هەمەچەشنەیان دەخستە ڕوو، بۆیە نووسـینەوەی مێـژووی ئـەدەبی کـوردی بـەبێ ڕۆڵـی ئـەدەبی گۆڤـاری (هیـوا) مێژوویـەکی ناکامـڵ دەبێـت و هـەر ئەمـەش بـوو وای لەئێمـە کـرد، کـە ئـەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ڕۆڵی ئەو گۆڤارە بنووسین لـە پێشخستنی هونـەرەکانی ئـەدەبی کوردیـدا، چونکە تاوەك ئێستاش نەوەك کتێب و وتـاری زانـستی، بـەڵکو زۆر بەدەگمـەن نـەبێ و لـە چـەند ئاماژەیەکی لاوەکی بەولاوە زیاتر ئاماژەی بۆ نەکراوەو مافی خۆی نەدراوەتێ. ئەمەش هەر تەنها پەیوەندی نییە بە گۆڤاری (هیوا)وە، بەڵکو ڕۆژنامـەو گۆڤارەکـانی تریـشمان، کـە لێکۆڵینـەوەی زانستیانەیان دەربارە کرابێ لەپەنجەی دەستێك تێ ناپەڕێ.

بۆ لێکۆڵینەوەکەمان سەرەتا ئەو وتارو ئاماژە پەرت و بلاوانـەمان بەسـەر کـردەوە، کـە لەملاو لەولا لەبارەی گۆڤاری (هیوا)وە لەلایەن نووسەرانی کوردو غەیری کـوردەوە نووسـراون، بەلآم لەبەر نەبوونی بیبلۆگرافیاو کەمی سەرچاوەی پێویست و هەژاریی کتێبخانەی کـوردیی و دەسـکەوتنی ئـەو سەرچـاوانە شـتێکی ئاسـان نییـە، کـە ئەمــەش خـۆی لەخۆیـدا دەبێتـە گیروگرفتێکی بەردەوام لەبەردەم لێکۆڵینەوەی زانستیدا.

گیروگرفتێکی دیکە لە لێکۆڵینەوەکەماندا ئەوەبوو، لەبەر زۆریـی بابەتـە بلاوکراوەکـانی ناو گۆڤاری (هیوا) و هەمە جۆری بابەتە ئەدەبییەکانـدا بـە ناچارییەوە لـە نموونـە هێنانـەوەو باسکردن و شیکردنەوەدا شێوەی بیبلۆگرافیایمان لەبەر دەگرت و لە هەر بابەتێکـدا تـەنیا سـێ چوار نموونەمان وەردەگرت، ئەم کارەیـەش لـەپێناوی هەمـە چەشنەیی و هەمەلایـەنی بابەتـە ئەدەبییەکانی ناو گۆڤارەکەوە بوو، بەو ئومێدەی زۆربەی هونەرەکانی ئەدەب بەخۆوە بگرێت.

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە بریتییـە لـە پێشەکییەك و دەروازەیـەك و چـوار بـەش و ئەنجامـە گشتییەکان و پاشکۆکان، کە ئەوانیش بریتین لە نامـەی چـەند نووسـەرێکی گۆڤـاری (هیـوا)و چەند وێنەیەك، کە لە خزمەتی ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکەدان. لە دەروازەدا دروسـتبوونی یانـەی سـەرکەوتن و ئامـانجی یانەکـەو چـالاکی و پێوەنـدی بـە نووسـەرانەوەو بڕیـاری بلاوکردنـەوەی گۆڤاری (هیوا) باسکراوە، ئەمەش لەو ڕوانگەیەوەیە، کە یانەی سەرکەوتن خاوەنی ئیمیتیازی گۆڤارەکە بوو.

لە بەشی یەکەمدا بارودۆخی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئابووریی و ڕۆشنبیریی عیراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە تا داخرانی گۆڤـاری هیـوا باسـکراوە، ئـەم باسـکردنەش لـەوەوە دێـت، کـە ئـەدیب وەك تـاکێکی کۆمـەڵ کەوتۆتـە ژێـر کارتێکەری ئەو بارودۆخەو ئەدەبیش ڕەنگدانەوەی واقیعە.

لەبەشی دووەمدا، ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی یـەکێ لـە هونـەرە سـەرەکییەکانی ئەدەبدا باسکراوە، کەئەویش شیعرە. دوای ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی و تازە کردنەوە لە شیعری کوردیدا، شیعرەکانی ناو گۆڤارەکە بەپێی ناوەرۆك و بەپێی ڕێبازە ئەدەبییەکان دابەش کـراون و لێیان کۆڵراوەتەوە.

لـە بەشـی سـێیەمدا، دوای ئاوڕدانەوەیـەکی مێـژوویی لـە پەخـشانی کـوردی، هونـەرە سـەرەکییەکانی پەخـشانی کـوردی (وتـارو ژیاننامـەو چیرۆك) باسـکراون و وتارەکـان بـەپێی ناوەرۆك دابەش کراون وناوەرۆك و زمان و تەکنیکی چیرۆکەکان شی کراوەتەوە.

بەشی چوارەم، تەرخان کراوە بۆ ڕۆڵی گۆڤاری هیـوا لـە پێشخـستنی هەنـدێ بابـەتی ئـەدەبی لەوانە (ڕەخنەی ئەدەبیو ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و وەرگێڕانی ئەدەبی) و تیشکی لێکۆڵینـەوەمان خستوونەتە سـەر. لەکۆتاییـشدا ئەنجامـە گشتییەکانمان بـە چـەند خاڵێـك دەسـت نیـشان کـردووەو سەرچـاوەکانی لێکۆڵینەوەکـەمان بـەپێی ئـەلف و بێـی نـاوی نووسـەرەکان ڕیـز کـردووە. پاشـان پاشکۆکان، کە بریتین لەنامەی چەند نووسەرێکی گۆڤاری (هیوا)و چـەند وێنەیـەکی مێـژوویی، بـەو ئومێدەی زیاتر ناوەرۆکی نامەکە ڕوون بکەنەوەو لەخزمەتی مەبەست دابن.

ئەم لێکۆڵینەوە، هەوڵێکە بۆ دەرخستنی پەیوەندی توندو تۆڵی ڕۆژنامـەوانی و ئـەدەبی کوردی و ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە مەیدانی ئەدەبی کوردیدا.

# دەروازە

## چی دەربارەی گۆڤاری (هیوا) نووسراوە

لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب و ڕەوتی مێژوویی ڕۆژنامەوانیی کوردیی بێ توێژینەوەو وردبوونەوە لە بابەتە بلاوکراوەکانی ناو گۆڤاری (هیوا) کارێکی بێ کەڵك و کەموکوڕی دەردەچێت. دوای داخستنی گۆڤاری (گەلاوێژ) لە ساڵی ١٩٤٩دا، ڕووناکبیرانی کورد لەدەوری یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری (هیوا)دا کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی گۆڤاری (هیوا) جێگەی گۆڤاری (گەلاوێژ) لە خزمەت کردنی بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردیدا بگرێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە گۆڤارەکە پەیوەندیی ڕۆشنبیریی لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستان و وڵاتانی دەرەوەدا پتەو کردو نووسەران لە وڵاتانی ترەوە نووسینەکانیان بۆ گۆڤاری (هیوا) ڕەوانە دەکرد تاقە گۆڤاری ڕۆشنبیری بوو، کەبەزمانی کوردی لە بەغدا بلاو دەکرایەوە لە ١٩٥٧-١٩٥٨دا.

تاوەك ئێستا دەربارەی گۆڤاری (هیوا)، لێکۆڵینەوەیەکی زانستیو ئەکادیمی یان کتێب و نامیلکە نەنووسراوە، پچڕپچڕو لەملاولەولا ئیشارەتی پێ دراوە، وا هەندێك لەو ڕایانە دەخەینە ڕوو، کە دەربارەی گۆڤاری (هیوا) نووسراوەو لە ئاست هەندێکیاندا هەڵوەستەیەك دەکەین:

عبدالله میدیا دەڵێ: ((وا ئێستا لەجێی گەلاوێژ وە لەئاسۆی هیواوە (هیوا) لە دەمکەل دەرکەوت و هەڵهات هیوامان وایە ئەو پەیامەی، کە (گەلاوێژ)هەڵیگرتبوو ە پەیمانی دابوو، کە بیگەیەنێت بەئامانج و فریا نەکەوت ئەمجا (هیوا) هەڵیدەگرێت و دڵسۆزانە بیبات بەرێوە)).[١]

بەشیر موشیر دەڵێ: ((لەکاتێکدا زانیم ئیمتیازی گۆڤاری (هیوا) دراوە بەیانەی سەرکەوتن، دڵم گەش، چاوم ڕوونبووەوە، هەستم بەوەکرد، کە هێزی قەڵەمی نووسەرانمان دەکەوێتەوە کارو بەزمانە شیرینەکەی خۆمان ئەنووسین و ئەخوێنینەوە. بەم هۆیەوە زۆر سوپاسی ئەندامەکانی یانەی سەرکەوتن ئەکەم، کە توانیان ئەم خزمەتە گەورەیە بکەن.))

---

[1] مامۆستا —ع، ئەستێرەیەکی نوێ لە ئاسۆی ئاسمانی وێژەی کوردا، گ. هیوا، (ژ١، س١) تەمووزی ١٩٥٧. نووسەران بە تەواوکەری گۆڤاری (گەلاوێژ)ی ناو دەبەن، زۆر گۆشە هەبوون لە (گەلاوێژ) لە (هیوا)یشدا بەردەوام بوو، وەك گۆشەی (چیرۆکی ژمارە) و (کورد لای بێگانە) و (ناڕێکی کۆمەڵایەتیمان) و (قسەی نەستەق). سەرەڕای ئەوەی زۆربەی نووسەرانی گۆڤاری (گەلاوێژ) پاشان لە گۆڤاری (هیوا)دا لە نووسین بەردەوام بوون.

(ا. ب. هەوری) بە شیعر دەربارەی گۆڤاری (هیوا)دەڵێ:

هیوا، چووزەرەی بنکی گەلاوێژ بەبیری وردی پوختی والاّ بێـــژ

بێرە کایەوە ساوای تـــازە بوو کاتی فرمانە تۆش ئـــازانە زوو

دەستی خزمەتت پیرۆز، وەك ناوت تـــا ببیتە فـــەڕو بـــرەو بێ نـاوت[٢]

(بێخەو) هەر بە شیعر هەستی خۆی دەردەبڕێ:

ئەی گزنگی وێژەی ژیـــــان زەنگ و چرای کاروانی گەل

هیوای دڵ و دەروون پاکـــان زرنگ کەرۆی لاوی تەمـــەل[٣]

د. مارف خەزنەدار دەڵێ: ((هیوا گۆڤـارێکی مانگانـەی ئـەدەبی هونەرییـە لـە بەغـدا دەردەچـێ، تـا ئینقلابـی ٨ی شـوباتی ١٩٦٣ بـەردەوام بـووە، زمانحـاڵی یـان گۆڤـاری یانـەی سەرکەوتنی کوردان بووە. بە دیالێکتی کرمانجی خواروو ئەلف و بێی عەرەبی بلاّو دەکرایەوە.

لە سەرەتای دەرچوونی گۆڤارەکە ڕەنگدانـەوەی بـیروڕای ڕۆشـنبیری چـینەکانی سـەرەوەی کورد بوو، وەك پەرلەمانتارە کوردەکان لەپەرلەمانی عیراق، هیوا تۆزێك خۆی بەدوور دەگرت لە سیاسەتی ڕۆژانەی ولاّت، زیاتر بایەخی بەلایەنی ئەدەبی و ڕۆشنبیری (کلتـوری) دەدا. بـلاّو کەرەوەکانی زۆر هەوڵیان دەدا گۆواری هیوا وێنەیەکی تری گۆڤاری گەلاوێژی بـەناوبانگ بـێ. لەبەر ئەوە هەوڵیان دەدا زیاتر بایەخ بەئەدەبی کوردی بدەن.

لـــە پـــاش شۆڕشـــی ١٤ی تـــەمووزی ١٩٥٨ گۆڤارەکـــە کەوتـــە دەســـت ڕۆشـــنبیری پێـشکەوتنخوازی کـورد. لەسـەر خـەباتی پێکـەوەیی کـوردو عـەرەبی دەکـردەوە لـە پێنـاوی پێشکەوتنی دیموکراتی و کۆمەلاّیـەتی. لـە سـاڵی ١٩٦١ دا ڕێـڕەوی شـۆڕش گـۆڕاو کەوتـە ڕاونـانی هێـزە پێـشکەوتنخوازو دیموکراتییـەکان، کـارێکی گـەورەیان کـردە سـەر ئـەم گۆڤارە، لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئێجگار هاتـە خـوارەوەو لـەکاتی خـۆی دەرنەدەچـوو، بە پچڕ پچڕی بلاّو دەکرایەوە.))[٤]

---

[2] هەوری، ئامۆژگاری بۆ گۆڤاری هیوا، ژ ٢، س١، ل٣٤.

[3] بێخەو، بۆ هیوا، گ. هیوا، ژ٣٠، س٤، ل٤٤.

[4] مارف خەزنەدار، بەکورتی مێژووی ئەدەبی کوردی تازە، مۆسکۆ،١٩٦٧، ل٧٤-٧٥. (بەزمانی ڕووسی). ئەم کتێبە نامەی دکتۆرای مامۆستا (د.مارف خەزنەدار)ە لەساڵی ١٩٦٧ چاپکراوەو لە

د. مارف خەزنەدار لە هەڵسانگاندنەکەیدا باش بۆی چووە، بەلاَم نووسینەکانی گۆڤاری (هیوا) تەنها بەدیالێکتی کرمانجی خواروو نەبوو و بەرهەمی کرمانجی سەروویشی تیایە. هەروەها دوا ژمارەی گۆڤارەکە لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢ دا دەرچووە، بەلاَم لە ساڵی ١٩٦٣ دا بڕیاری داخستنی گۆڤارەکەو ڕەت کردنەوەی ئیمتیازی گۆڤارەکە دراوە.

عبدالجبار محمد جباری دەڵێ: ((گۆڤارێکی وێژەیی و زانیاری و کۆمەلاَیەتییە، مانگی جارێك لەبەغدا دەردەچوو، خاوەن ئیمتیاز: یانەی سەرکەوتنی کوردان بوو، وە بەڕێوەبەری لێپرسراوی حافظ مصطفى قاضی بوو. یەکەم ژمارەی لەمانگی گەلاوێژی ١٩٥٧ دەرچوو.

گۆڤاری هیوا بەبێ پەك کەوتن لەلایەن دەستەیەکی خوێندەوارو ڕۆشنبیری کورد پەرەوەرەوە یارمەتی ئەدرا هەمیشە بە نووسینەوەی بەکەڵکی مێژوویی و ئەدەبی هتد... کۆمەکییان ئەکرد، وە بەو جۆرە هەتاکو ماوەیەك بەوپەڕی توانـاوە ئەو شێوینە بەتاڵەی گۆڤاری (گەلاوێژ)ی ئاوابووی گرتەوە وە هەمان ڕێبازی گرت لە هەوڵ وتەقەلادانا.))[5]

علاءالدین سجادی، لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا نووسیویە: ((هیوا گۆڤارێکی ئەدەبی زانستی مانگانەیی بووە، لە شاری بەغدا لە چاپخانەی (التمدن) دەر کراوە، مودیری لێ پرسراوی حافز مستەفا قازی بوو، ماوەیەکیش دوکتۆر هاشم دۆغرمەچی بووە، یەکەم ژمارەی لەتەمووزی ساڵی ١٩٥٧ دەرچووە، حەوت ساڵ ژیاوە (٣٦) دانەی لێ دەرچووە، لە... دا داخراوە.))[6]

ژمارەکانی ساڵی یەکەمی گۆڤارەکە لە چاپخانەی (التمدن) چاپ کراوە، بەلاَم پاشان لە چەند چاپخانەیەکی دی، لەوانە (النجوم) و (صلاح الدین) و (النجوم) و (شفیق) گۆڤارەکە چاپکراوەو شەش ساڵ ژیاوە.

---

١٩٦٢گفتوگۆی لەسەر کراوە. لەساڵی ١٩٩٣ تەرجەمەی زمانی عەرەبیش کراوە، بڕوانە: د. معروف خەزنەدار، موجز تاريخ الادب الكردي المعاصر، ترجمه عن الروسية الدكتور عبدالمجيد شيخو، بيروت، ١٩٩٣.– ئەو زانیارییانەی دەربارەی گۆڤاری هیوا لەسەرەوە نووسیمان دکتۆر مارف خەزنەدار لەزمانی ڕووسییەوە بۆی تەرجەمە کردین.

[5] عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ل١٠٤.

[6] علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی،چ٢، ل٦١٧.

جەمال خەزنەدار لە ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیدا وا باسی گۆڤاری هیوا دەکات:

((هیوا گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی مانگی بووە، لەلایەن یانەی سەرکەوتنی کوردان لە بەغدا دەرچووە، مودیری مسؤول حافظ مستەفا قازی بووە، ژمارە یەکی لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٥٧دەرچووە، پێنج ساڵ ژیاوە، دوا ژمارەی (٣٦) بووە، لە شوباتی ساڵی دەرچووە. ئەوەی پێویستە بوترێ ئەوەیە، کە هاشم دۆغرەمەچی و موکەڕەم تاڵەبانی ناوەناوە بوون بە مودیری مسؤول. وە کەریم زانستی و کامل ژیر و محەمەدی مەلا کەریم و عیزەدین مستەفا بەشداری بەڕێوەبردنیان کردووە.))[7]

جەمال خەزنەدار ڕاستیی نەپێکاوە، کەدوا ژمارەی (٣٦)ە، بەڵکو دوا ژمارەی (٣٨) و لە حوزەیرانی ١٩٦٢دا دەرچووە. بەڕەسمیش موکەڕەم تاڵەبانی نەبۆتە مودیری مسؤل بەڵکو لە ژمارە (٨) (س٢)ەوە هاشم دۆغرەمەچی تا دوا ژمارەی دەرچوونی مودیری مسؤول بووە.

د. کمال مەزهەر لەبارەی گۆڤارەکەوە نووسیویەتی:

(هیوا)

بەغدا

ژمارە یەکی: تەمووزی ١٩٥٧.

لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نووسراوە: گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستییە مانگی جارێك دەرئەچێ) خاوەنی ئیمتیتازی یانەی سەرکەوتن و مودیری مەسئۆلی تا ژمارە (٨)ی ساڵی (٢)ی حافظ مستەفا قازی و پاشان دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی بوو، زۆربەی ژمارەکانی لە (٨٠) لاپەرە زیاترن، شوباتی ١٩٦٣داخرا (١٢×٤١سم)ە.[8]

وادیارە دکتۆر کەمال زانیاریی تەواوی دەربارەی گۆڤارەکە نەبووە، قەوارەکەیشی (٢٠,٥×١٤سم)ە.

د. جەمشید حەیدەری لە وتارێکیدا نووسیویە: ((باری ئەدەب هەر لەنزمی و لاوازیدا دەمێنێتەوە تا ساڵی... کەیانەی سەرکەوتنی کوردان لەبەغدا بڕیار دەدات گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی (مانگانە) دەربکات بەناوی (هیوا)و هەروەها لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٨ شێخ عبدالقادر بەرزنجی لەکەرکوك گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی کۆمەڵایەتی دەردەکا بەناوی

---

[7] جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٦٣.

[8] د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، ل٢٤١-٢٤٢.

(شەفەق) ئەو دوو گۆڤارە ڕۆڵێکی گەورەو دیاریان بینیووە لەبەرەو پێش بردنی پەخشانی کوردی و بەڵکو دەتوانین بەبەردەوامی (گەلاوێژ) یان دابنێین لەم بوارەدا.))[9]

(کامل ژیر)یش بیروڕای وایە، کە ((گۆڤاری هیوا قوتابخانەیەکی کوردایەتی گشتی بوو بۆ ئەو ڕۆژە، پێنووسی نووسەرە گەورەو نودارو بەبڕشتەکانی ئەو سەردەمەی لەخۆ گرتبوو جگە لەنووسەرو هەستیارە لاوەکان.)) هەروەها دەڵێ: ((وەك ڕاستیەك ئەشێ ئەوەش بدرکێنین، کە گۆڤاری (هیوا) ئەتوت لە کوردستانێکی ئازادا دەرئەچێ. هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان وێنەیەکی مەلیکی تێدا بلاّو نەکرایەوە.))[10]

(محەمەد نوری توفیق) وەك نووسەرێکی گۆڤاری هیوا دەڵێ: ((دوای دەرچوونی چەند ژمارەیەك دەستم کرد بە نووسین، بەلاّم (شیعرنا)، زۆربەی زۆری نەوەکانی سەردەمی خۆم، بەڵکو لەپێشدا بەوەرگێڕان، کەوابزانم یەکەم بەرهەمم لەبارەی خەلاّتی (نۆبل)ەوە بوو، کە یەکەم بەرهەمم بلاّو کرایەوە هێندەی تر هیوام لا خۆشەویستر بوو، ئیتر هیوا بەرەو پێشەوە ئەچوو، خوێنەرەکانی زیادی کردو ژمارەکانی زیاتر ئەبۆوە، منیش بەردەوام بەرهەمم بۆ ئەنارد، ئەدەبی، سیاسی، زانستی، دواجار لەنگەری چیرۆکم لەسەر لاپەڕەکانی داگرت.))[11]

ئەمە بێجگە لەوەی لە هەندێ کتێب و وتاری ڕۆژنامەنووسیدا لەپاڵ زۆر ڕۆژنامەو گۆڤاری دیکەی کوردیدا ئاماژەی بۆ کراوە.[12]

---

[9] جەمشید حەیدەری، کورتەیەك لەمێژووی لێکۆڵینەوەی پەخشان و چیرۆکی کوردی، گ وان، ژ۱، سوید، ۱۹۹۲، ل۲۸.

[10] نامەی تایبەتی (کامل ژیر) بۆ لێکۆڵەرەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕێکەوتی ۱۹۹٤/۹/۱٤ بڕوانە پاشکۆی ئەم نامەیە.

[11] نامەی تایبەتی محمد نوری تۆفیق بۆ لێکۆڵەرەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕێکەوتی ۱۹۹٤/۹/۱٥.

[12] لە ڕۆژنامەی (ژین) دا بەبۆنەی دەرچوونی گۆڤاری (هیوا)وە نووسراوە: ((موژدە بێ لەم ڕۆژانەدا گۆڤاری (هیوا) دەرچوو، کەلەلایەن یانەی سەرکەوتنەوە لەبەغدا سەرپەرشتی ئەکرێ، بێگومان دەمێکە هەموو لایێك تینوون بۆ گۆڤارێکی کوردی، وا ئەو ئاواتە هاتە دی، هیوامان وایە ئەم تازە خوشکەی (ژین) کەلێنێکی باش پڕ بکاتەوە لە ڕێی پێش خستنی وێژەو زمانی کوردی)). بڕوانە: ڕۆژنامەی ژین، ژ۱۳٥۲، س۳۲ پێنج شەممە۱۹٥۷/۷/۱۸، ل۲. لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی دا ناوی گۆڤاری (هیوا) هاتووەو نووسراوە: حافز مستەفا قازی لەبەغدا (۳٦) ژمارەی ڕۆژنامەی (هیوا)ی بلاّو کردەوە. بڕوانە:

The Encyclopaedia of Islam‹ Vol: V,1981, P.485.

## یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری هیوا

ڕووناکبیرانی کورد دوا بەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە باشووری کوردستاندا کەوتنە بیری ئەوەی لە ڕێگەی دامەزراندنی کۆمەڵ و ڕێکخراوی ڕۆشنبیرییەوە میللەت ڕووەو خوێندەواری و زانست ببەن و لە دەردی هەژاری و نەخوێندەواری و بێئاگایی ڕزگاریان بکەن. بە تایبەتی شکستی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود لەو سەردەمەداو ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیزەکان زیاتر ئەم بیرەی قووڵ کردەوە. لەپێش هەموو کەسێ جەنابی معروف چیاووك، کە نارراوی هەولێر بوو ئەم بیرەی (فکرەی) خستە پێشەوە وە لە ڕۆژی ٩ شوباتی ١٩٣٠ بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی زانستی ئیستدعاییێکی دا هەر چەندەش نارراوەکانی تر لە مۆرکردنی ئەم ئیستدعایە خۆیان کێشایەوە، بەلام مەرحوم محامی احمد مختار بەگ زەهاوی، کە لە مەدرەسەی حەربیە، بە زابتی دەرچوو بوو و یۆزباشی بوو لە مەدرەسەی حقوقیش شەهادەتنامەی سەندبوو و ڕەئیس یوزباشی محمد علی بەگ عەبدولعەزیز، محامی عارف بەگ پشدەری، ئیستدعاکەیان بەشەوق و هەوەسەوە مۆر کرد، وە تەقدیمی وەزارەتی داخلیە کرا، لەپاش کەشمەکەش و ماندوویەتیەکی زۆر بە ژمارەی ٦٨٩٥وە مێژووی ١٩-٢٠مایسی مأذونیەتی کرانەوەی یانەی سەرکەوتن بە جەنابی مەعروف جیاووك درا، وە هەر زوو لە ڕۆژی ٣٠ی مایسی ١٩٣٠ لەسینەمای ڕۆیال بە حەفلەیەکی زۆر موحتەشەم یانەی سەرکەوتن کرایەوە.[١٣]

---

- هەروەها بڕوانە: کرد در دائره المعارف اسلام، ترجمه اسماعیل فتاح قاضي، مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردي- انتشارات صلاح الدین، چاپ اول، ارومیه، ١٣٦٧، ص١٩٠. بەلام هەڵەیەکی تیایە، (هیوا) ڕۆژنامە نیية، بەڵکو گۆڤارەو حافز مستەفا قازی تا ژمارە٨، س٢ مودیری مەسولی بووە. لە ڕۆژنامەی (ڕووناکی)دا نووسراوە: (هیوا-١٩٦٠) گۆڤاری یانەی پێشکەوتنی کوردی بوو لە بەغدا چاپ ئەکرا))، بڕوانە: ڕۆژنامەی ڕووناکی، ژ٢٩٠، هەینی، ٢٣ تشرینی یەکەمی ١٩٦٩، ل.٤٤ ساڵی چاپەکەی و دەرچوونی هەڵەیە لە (١٩٥٧-١٩٦٢) دەرچووە.

[13] هەر لەو ئاهەنگەدا، جەمیل صدقی زەهاوی و ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزو دەوڵەمەندو قوتابیان هاتبوون و بەڕێزان مەعروف جیاوك و ئەمین زەکی بەگ وتاریان خوێندەوە. دوو ساڵ بەم شێوەیە لە ماڵی مەعروف جیاوك یانەکە بەردەوام بوو. پاش مردنی ئیبراهیم حەیدەری، ئەمین زەکی بوو بەسەرۆکی

لە یەکەم هەڵبژاردنی یانەی سەرکەوتنی کورداندا ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری بە سەرۆك هەڵبژێردراو محەمەدەمین زەکی بەگ و مەحموود جەودەت و جەنابی ئەحمەد ئاغا کەرکوکلی زادەو جەنابی عەبدوڵڵا لوتفی بەگ حاجی عەلی ئاغا و جەنابی میرزا فەرەج شەریف و شێخ عەلی قەرەداغی و خەڵەف شەوقی داودی و بەشیر مشیری بەرگدروو بە هەیئەتی ناوچەی کۆمەڵە هەڵبژێردران.[١٤]

یانەی سەرکەوتنی کوردان هەر لەسەرەتاوە باوەڕی بەهەڵبژاردن بوو، ((چونکە بەپێی پێڕەوی یانەکە هەر نۆ مانگە جارێك ئەندامانی تازە بۆ یانەکە هەڵدەبژێرێتەوە.))[١٥] نابێ

---

یانەو مەعروف جیاوك موعتەمیدی یانە بوو. بەهۆی کەم دەرامەتی و نەبوونییەوە. مەعروف جیاوك لە ساڵی دووەمی یانەکە بە نائومێدییەوە دەڵێ: بەڕاستی شایانی دڵ ئێشەیە، جێی شەرمەزارییە، کە ئێمە (کوردەواری) یانەیەکی وا بچووکمان پێ بەڕێوە نەبرێ. کەچی لەناو گەلانی تردا بەدەیان کۆمەڵ و یانە بەڕێوە دەبرێن! بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: باربو، ل٢٦-٣٧. هەروەها: شاکر فتاح، خەباتی ڕۆشنبیران، ل٤١. مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، گ. ڕۆشنبیری نوێ ژ١٢٤، ١٩٩٤، ل٦٨-٧٧.

[14] باربو،... لە یەکەم هەڵبژاردندا ژمارەی دەنگەکان بەم شێوەیە بوو:

| ناوەکان | ژمارەی دەنگەکان |
|---|---|
| - ابراهیم افندی حەیدەری | ٥٢ دەنگ |
| - امین زەکی بەگ | ١٠٧ دەنگ |
| - مەعروف افندی جیاووك | ١٦٠ دەنگ |
| - محمود جودت بەگ | ١٠٢ دەنگ |
| - عبدالله لوتفی | ٨٧ دەنگ |
| - خلف شوقی افندی | ٩٤ دەنگ |
| محمد عارف افندی، زابتی تۆپچی | ٨٦ دەنگ |
| احمد اغای کرکوکلی | ٦٣ دەنگ |
| محامی عارف افندی پشدەری | ٥٨ دەنگ |

بڕوانە: غەفوور میرزا کەریم، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، بەغدا،١٩٧٨، ل١٩.

[15] شاکر فتاح، خەباتی ڕۆشنبیران، ل٣٨.

ئەوەشمان لەبیر بچێت، دامەزراندنی چەند یانەیەکی تری عەرەبەکان لەو کاتەو لە بەغدا کاریگەری خۆی لەسەر دامەزراندنی یانەی سەرکەوتنی کورداندا هەبوو.[16]

**ئامانجی یانەی سەرکەوتنی کوردان**

دەتوانین ئامانجەکانی یانەی سەرکەوتنی کوردان لەم چوار خاڵەدا کۆبکەینەوە:

**١- ئەو قوتابیانەی، کە بۆ تەواو کردنی خوێندنیان بۆ بەغدا دێن لەناو یانە جێگایان بۆ تەرخان بکرێ و پیشتگیریان بکرێت.**

**٢- بەپێی توانا لەناو یانەکەدا چەند ژوورێك بۆ ئەشراف و سەرانی کورد تەرخان بکرێ لە کاتی سەردانیان بۆ بەغدا تیایدا بحەسێنەوە.**

**٣- کۆمەڵ چەند لیژنەیەك پێك دەهێنێ، بەپێی شارەزایی و پسپۆڕیان کتێب دادەنێن و وەردەگێڕن و (قاموس و دەستووری زمانی کوردی) دەنووسن، چونکە لە پێش هەموو شتێکا یەکبوونی زمانەکەمان پێویستە کە هەموو بتوانن لەیەکتری تێ بگەن.**

**٤- مانگی جارێك، هەروەك دائیرەی عیلاقاتی گشتی ئاهەنگی یەکتری ناسین و خۆش ویستن ئەکا، بەم جۆرە خەڵکی ڕۆژئاواو ئەوروپاو ئەمریکا ئەماننناسن و تێمان ئەگەن، کەئێمەیش وەك ئەوان ئینسانین و حەقی ژیانمان هەیە و دەبێ هەروەك خەڵکی تر ئیستیفادە لە یەکتری بکەین.[17]**

لەگەڵ ئەم ئامانجانەدا، هەروەك لە کورتەی پێڕەوی ناوخۆی یانەکەدا هاتووە، ((کۆمەڵ لەگەڵ سیاسەتا خەریك نابێ. یارمەتی دانی هەژارو هەتیوو نەخۆشەکان دەدات و بەخێو

[16] هادی ڕەشید چاوشلی دەڵێ: ئەو کاتە هەست بە جموجۆڵێکی کوردانە کراو قوتابیانی کورد لەدەوری یەك کۆبوونەوە، بە تایبەتی پاش ئەوەی کەهەندێ برای عەرەب (یانەی المثنى) یان دامەزراند. لەو بەڕێزانەی لەدامەزراندنی یانەی سەرکەوتن دا دەستی دیاریان هەبوو بریتی بوون لە: ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس و مەعروف جیاوك، بڕوانە: ژیان و بەرخودان هادی ڕەشید چاوشلی، ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٥١، ١٩٩٤/٩/٢٦،ل٢. هەروەها بۆ یانە عەرەبیەکانی ئەو سەردەمەی بەغدا بڕوانە: الدكتور عماد احمد الجواهري، نادي المثنى واجهات التجمع القومي في العراق ١٩٣٤-١٩٤٢، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٨٤.

[17] باربو، ل٣٧-٣٩.

کردنی لاوانە بە چەشنێکی عیلمی و پەروەردەیی و ڕەوشتی بەرزەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە هەمو شارو شارۆچکەکانی کوردستان لق دەکاتەوە.))[18]

## چالاکیەکانی یانەی سەرکەوتنی کوردان

دەتوانین چالاکییەکانی یانەی سەرکەوتن بکەین بە دووبەشەوە:

١- چالاکی کۆمەڵایەتی.
٢- چالاکی ڕۆشنبیری.

چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیش، زۆر لایەنی گرتۆتەوە. لێرەدا هەوڵ دەدەین ئاماژە بۆ هەندێك لەو چالاکی یانە بکەین. ئەندامانی یانە بەشداری پرسەی پیاوە ناسراوەکانیان کردووەوە بەپێی توانا یارمەتی ماددیشیان داون.[19] هەروەها لە بۆنە تایبەتییەکان دا ئاهەنگی گێڕاوەو خێزانانی کورد بەشداری یەکترناسین و خۆشەویستی و پەیوەندی کردنیان بەیەکەوە کردوە، ئەمەش ڕێگە خۆشکەرێك بووە بۆ ئەوەی ئەو خێزانە کوردانەی، کە لە بەغدا نیشتەجێن ئاگاداری هەواڵی یەکتر بن و هەستی کوردایەتیان تیا نەفەوتێ.[20]

---

[18] بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەپێڕەوی ناوخۆی یانە بڕوانە: باربو، ل٣٩. مەسەلەی کردنەوەی لقی یانە لە شارەکانی دی جێ بەجێ نەکرا، چونکە یانە بە ڕێگەی باربو بەڕێوە دەچوو، توانای ماددی نەبوو بتوانێ خانوویەك بۆ خۆی بەکرێ بگرێ و بێ جێگەو ڕێگەیی وای کرد دوو ساڵان ماڵەکەی مەعروف جیاوك بارەگای یانە بێت و ناوبراو زۆر ناوچەی کوردستان بگەڕێت بۆ ئەوەی پیتاك بۆ کرێی خانوو کۆبکاتەوە، حکومەت یارمەتی یانەکەی نەدەدا، لە گەشتەکانی مەعروف جیاووك دا چەندین هەڵوێستی جوانی خەڵکی کوردستان پیشان دەدات لەیارمەتیدانی یانەی سەرکەوتن بە پارەوپول، دەڵێ لەسەفەری خانەقین دا شاگرد کەبابچییەکی هەرزەکار بە دینارێکەوە هاتە پێشەوەو بە دەنگێکی خۆش و بەرز گوتی: سەروەت و سامانم هەر ئەمەیە وا بە یانەی ئەبەخشم. ماڵ چییە، گیانم بۆ یانەی کوردان ئەبەخشم. وە بە چەپڵە ڕێزانێکی زۆر گەرم، لێی وەرگیرا، بڕوانە: باربو، ل٤١.

[19] لە ڕۆژنامەی (ژین) دا هاتووە: ((یانەی سەرکەوتن بەشداری (پرسە) دەکات ئەندامانی بەرێوەبەری یانەی سەرکەوتن لە بەغدا کە بە تەواوەتی پێویستی نیشتمانی خۆیان بەجێ هێنا))، بڕوانە: ڕۆژنامەی ژین،١٢٧، س٣٠، پێنج شەممە، ١٩٥٥/١١/١٧.

[20] باربو، ل٣٨. هەروەها گ هیوا، ژ١٠، نیسانی ١٩٥٨، ل١٢-١٧. مستەفا نەریمان دەڵێت: ((ڕۆژی ٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٤ ئاهەنگێکی گەورە بۆ یەکترناسین ساز کراو ئەنواعی میوەو نانی تیری و پەنیرو ژاژی و هەنگوینی سپی تەقدیم کراو پیاوانی بیانییش بانگ کران، بڕوابپێکراوی یانە دوانێکی گرنگی دا یەك ڕاست (تامیر ئیسکوت) ئەیکردە ئینگلیزی.

به بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام محەمەد (د.خ) مەولوودی نەبەوی لە یانە دەخوێندرایەوەو پیاوە ناسراوەکان بەشدارییان تێدا دەکردو چەندین وتاری ئایینی و ئامۆژگاری کۆمەلآیەتی تیا پێشکەش دەکرا.[21] یانە بە بەردەوامی لەگەڵ کەم دەرامەتی خۆیدا یارمەتی هەژارو دەستکورتەکانی دەدا، بە تایبەتی یارمەتی ئەو قوتابییە دەستکورتانەی، کەهەژارن بۆ ئەوەی لەخوێندن بەردەوام بن و ئالآی ڕۆشنبیری بەرز بێتەوە.[22]

یانە بە هەستێکی بەرزی کوردانەوە، هەموو ساڵێك لە جەژنی نەورۆزدا ئاهەنگی گێڕاوە، بە تایبەتی دوای ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی لە عیراقدا، بەشێوەیەك، کە نەورۆزی کوردبووە ڕۆژێکی ئەوتۆ، لێ پرسراوان و دەستەلآتدرانی تیا ئاگادار دەکردەوەو لە شەرعیەتی میللەتی کوردو داوا ڕەواکانی.[23]

---

– لەپاش مانگێك ڕۆژی ٢٦ی شوباتی ١٩٤٤ مەلا مستەفای بارزان دەعوەت کراو هەندێ لەپیاوە ناودارەکان و بێگانەکان بانگ کران لەوێش باوەڕ پێکراو وتاری داو قسەکانی یەك ڕاست کرانە ئینگلیزی.) بڕوانە: مستەفا نەریمان، یانەی سەرکەوتنی کوردان، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ١٣٤، ١٩٩٤، ل٧٤.

[21] لە ڕۆژی ٢٤ی مارتی ١٩٤٤ لە یانەی سەرکەوتن بە بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) مەولودێکی کوردی خوێنرایەوەو پاشان مەلا ئەحمەد باوەڕپێکراوی یانە وتارێکی خوێندەوەو دواجار چای و شیرو کێك و شیرینی دابەش کرا، بڕوانە: باربو، ل٨٦.

[22] لەو ڕۆژنامەیەی (ژین)دا هاتووە: ١٠٠٠٠ (دینار بۆ یانەی سەرکەوتن) وەزیری داخلیە ئیزنی بە یانەی سەرکەوتندا کە باربۆیەك بکات بۆ کۆکردنەوەی (١٠٠٠٠) دینار لە هەموو عیراقدا بە ئاگاداری ئەم لیجنەیەی خوارەوە بۆ یارمەتی ئەو قوتابیانەی کە دەست کورتن وەناتوانن خوێندن تەواو بکەن بە شەرتێك کە لە ماوەی ساڵێکدا بکرێت: لیژنەکە: ١– محمود بابان ٢– عبدالقادر حشمت ٣– دوکتۆر نوری فتوحی ٤– ڕەشید عارف ٥– محمد بریفکانی). بڕوانە: ڕۆژنامەی ژین، ژ١٢٧١، س٣٠، پێنج شەممە ١٩٥٥/١١/٣. هەروەها یانەی سەرکەوتن هەوڵێکی جوامێرانەی دا بۆ یارمەتی ئەوانەی لە لافاوەکەی سلێمانی زیانییان لێ کەوتبوو، بەوەی کە لە بەغدا و شارەکانی ترا لە کەرکوك و کفری کۆمەڵەی کۆکردنەوەوی پیتاکیان دانا و بێوچان تێکۆشان بۆ یارمەتی لێ قەوماوان، بڕوانە. گ. هیوا، ژ٥، س١، ل٣–٥.

[23] لە ساڵانی پێش شۆڕشی تەمووز، قوتابیانی کورد بەدزییەوە بەسەرپەرشتی یانە نەورۆزیان دەکرد، کاك مستەفا سلێمان، کە ئەندازیارێکی خانەنشینە، لە چاوپێکەوتنێکماندا لە سلێمانی ١٩٩٤/٩/١٣ وتی: ((لە ساڵی ١٩٥٦ بەدزییەوە قوتابییە کوردەکان لەپشت وەزارەتی بەرگری نەورۆزمان کرد.))

بێجگە لەو چالاکییە کۆمەڵایەتییانە، یانەی سەرکەوتنی کوردان، چەندین چالاکی ڕۆشنبیریی نواندووە. یانە هەر لە سەرەتای دامەزرانییەوە، بەگەرمییەوە بەردەوام بوو لەسەر کردنەوەی خولی تایبەتی بۆ فێر بوونی زمانی کوردی، کەتیایدا ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری یانە، لە سەرووی هەموویانەوە مامۆستا تۆفیق وەهبی، بەبەردەوامی دەرزی کوردی وتۆتەوە و تیایدا بنەچەی زمانی کوردی و شێوازەکانی زمانی کوردی و ڕێنووسی کوردی بە پیتی لاتینی و عەرەبی بۆ ئارەزووداران و قوتابیان وتۆتەوە، ئەمەش هۆیەك بووە بۆ ئەوەی برا کوردەکان لەناوچە جیاجیاکاندا فێری دیالێکتەکانی یەکدی بن.[24] چالاکییەکی تری یانەی سەرکەوتن ئەوەبوو، کە داوای لە نووسەران کردووە نوسراوو کتێبەکانیان بۆ یانە ڕەوانە بکەن تاوەکو بۆیان چاپ و بلاوبکاتەوەو. لە ١٩٤٣-١٩٤٤دا یانەی لەسەر ئەرکی خۆی کتێبی (باربو)ی چاپکردو پاشان (مێژوو)ی بۆ ئەمین زەکی بەگی مێژوونووسی کورد چاپ کرد. ئەمە بێجگە لەوەی سەرپەرشتی چاپکردنی ژمارەیەك کتێب و نامیلکەی کوردییشی کردووە. دیارترین چالاکی ڕۆشنبیرییانەی سەرکەوتن دەرکردنی گۆڤاری (هیوا) بوو، وەك گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی مانگانە لە ساڵی١٩٥٧دا. ئەم گۆڤارە دەورێکی دیار و بەرچاوی لە پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا هەیەو پایەیەکی گەورەی لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا هەیە. لە کات و ساتێکی وەهادا بلاو کرایەوە کە دەنگی ڕۆشنبیران کپ کرابوو. «لە ساڵی ١٩٥٦ دەوڵەمەندی نیشتمانپەروەرو کوردپەروەر ڕەشید عارف داوەتێکی تایبەتی بۆ وەزیری ناوخۆ

---

بەڵام لە ١٩٥٧ دا بەهۆی بارو زرووفەوە نەورۆز نەکرا. دوای شۆڕش لە ساڵی ١٩٥٩دا ئاهەنگی نەورۆز بەئاشکرا لە بەغدا لە هۆڵی گەل ساز کراو زەعیم و دەستەلأتداران و خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون و چەندین وتاری سیاسی تیا خوێندرایەوە. بڕوانە: کەمال مەزهەر، ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩ لە بەغدا، گ هیوا، ژ٨، س٢، ل٦٨.

[24] تا ساڵانی ١٩٥٥-١٩٥٦ تۆفیق وەهبی لە یانەی سەرکەوتن دەرزی کوردی وتۆتەوە، هەر لە ساڵی (١٩٣١)ەوە جەنابی لە لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی یانەدا بووە لەگەڵ جەمال بابان و میرزا فەرەج و شێخ عەلی قەرەداخی و سەبری عەلی، بڕوانە گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٨٧. هەروەها شاکر فتاح، خەباتی ڕۆشنبیران، ل٣٩. لەم خولانەی زمانی کوردیدا، کە تۆفیق وەهبی دەرزی تێدا وتۆتەوە، د. مارف خەزنەدار لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٤/١١/٤دا وتی: خەڵکێکی زۆر ئامادە دەبوون، لەوانە بینیومە فاضل الجمالي وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی عیراق ئامادە دەبووو لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشت.

سەعید قەزاز و سێ لە وەزیرەکانی تر لە بەغدا کردووەو هەر لەو داوەتەدا لەسەر داواو پێشنیازی ڕەشید عارف، وەزیری ناوخۆ ئیمتیازی گۆڤارێکی ڕۆشنبیری داوە بە یانەی سەرکەوتن.))٢٥ دوای خۆ ئامادەکردن یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە لە مانگی تەمووزی ١٩٥٧ دا بلاو کرایەوە. سەرنووسەرو نووسەرو سەرپەرشتیارانی ئەو کاتەی گۆڤارەکە لە سالی یەکەم و دووەمیدا، بەڕێزان کامل ژیر و محمد نوری عارف ونەسرین فەخری و سعید ناکام و کریم سعید زانستی و حافظ مصطفی قاضی بوون. پاشان نووسەرانی تر وەك محمدی مەلا کەریم و فاتح عبدالکریم و عزالدین مصطفی ڕسول و علاءالدین سجادی و ناهیدە سەلام و مکرم تالەبانی و عبدالرزاق محمد بیمار و کاکەمەم بۆتانی بوون بە لیژنەی دەرکردنی گۆڤاری هیوا.

گۆڤارەکە هەر لە سەرەتاوە بەهۆی کەم دەرامەتییەوە دەستەیەکی نووسەرانی نەگۆڕی نەبووەو نەوەك هەر گۆڤارەکە، بەلکو یانەی سەرکەوتن کێشەی بێ خانوویی و بێ بارەگایی هەبووە، بەردەوام داوای لە دەولەمەند و خەلکی کوردستان کردووە یارمەتی ماددیو مەعنەوی ئەو تاکە دەزگا ڕۆشنبیرییە لەبەغدا بدەن، لە سالانی کۆتایی حوکمی پاشایەتی و سەرەتای سالانی سەرکەوتنی شۆرشی١٤ی تەمووزدا.[٢٦] بەلام کێشەی هەژاری و دەست کورتی و کەمیی نووسینی چاك و هەلوێستی یانەو گۆڤاری هیوا لە بەرامبەر کێشە سیاسییەکانی

---

[25] ئەم زانیارییەم لە دکتۆر محمد محمد نوری عارف لەدانیشتنێکی تایبەتی لە کۆلیجی ئەدەبیات- بەشی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین لە ڕۆژی ١٩٩٤/١٠/١ وەرگرتووە، کە لەمامی (ڕەشید عارف)ی بیستووەو خۆیشی لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بووە، لە دوو سالی سەرەتای گۆڤارەکەدا. (د.مارف خەزنەدار) لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٤/١١/٤دا لەوباوەڕەدا بوو، کە بەر لەو مێژووە سیاسەتی ئەمریکاو ئینگلیز لە عیراق ڕوو لە چاکەکاری بوو، تەنانەت هەندێ خەلکی ڕۆشنبیر و کاربەدەستیان ڕەوانەی ئەمریکا کرد بۆ ئەوەی ژیانی ئەوێ ببینن.

[26] غەمی بێ بارەگایی و نەبوونی خانووی شیاو بۆ یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری هیوا بە ڕاشکاوی لە گۆڤارەکەدا، بلاو کراوەتەوە. بڕوانە: گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل١-٤.

سەبارەت بە هەژاریو کەم دەرامەتی دەستەی نووسەرانی هیوا دەلێن: ((دەرکردنی گۆڤاری هیوا لەلایەن پارەوە ئەرکێکی زۆری ئەوێ، وە ئەویش جگە لە پارەی دانە فرۆشکراوەکانی، چی تر شك نابات، چونکە ئاشکرایە گۆڤارێکی بازرگانی نییەو پالی بەکڕێی (بۆ زانین)ی بازرگانی نەداوەو یانەش چاوی لە دەستکەوت و قازانجی ئەم گۆڤارە، چیڕ نەکردۆتەوە. ئەوەی مەبەستێتی، تەنیا دەرهێنانی مایەی خۆیەتی و چی تر نا....)) بڕوانە: گ هیوا ژ٣٤، س٥، ل٥-٦.

سەردەمی عبدالکریم قاسم بووە هۆی ئەوەی یانەی سەرکەوتنی کوردان و گۆڤاری (هیوا)ش نەتوانن پەیامی پیرۆزی خۆیـــان لە خزمەتی ڕۆشنبیریی کوردییدا درێژە پێ بدەن و جوانەمەرگ بوون.[٢٧]

## یانەی سەرکەوتن لە ویژدانی شاعیراندا

شاعیر و نووسەرو ڕووناکبیرانی کوردستان لە هەموو لایەکەوە، بەبۆنەی کردنەوەی یانەی سەرکەوتن سۆزی دڵ و دەروونیان لە شیعری بەرز و پەخشانی بەپێزدا دەربڕیوە. پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) بەبۆنەی کردنەوەی یانە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئەسما لەسەما کە دێتە خوارێ | ناوی باش نوری لەسەر دەبارێ |
| یانەی سەرکەوتن کەناوی چاکە | بە نوری خوایی پێشی ڕووناکە |
| بەو ڕووناکییە هونەر دەردەخا | بەو هونەرەوە قەومێك سەردەخا |
| ئەمری بەمەعروف نەهی لە مونکەر | ئاینی کوردی پێ دەچێتە سەر |
| هیوامان وایە یانەی سەرکەوتن | زۆر خدمەت بکا بەکوێری دوژمن |
| کەوابێ ئێمەیش خدمەتی دەکەین | ناوی تەئریخی بۆخۆمان دەبەین[٢٨] |

---

[27] یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری هیوا چەندین هەڵوێستی سیاسی جوانیان نواندووە، لەوانە، بەرپەرچی ڕۆژنامەی (الثورة)یان داوەتەوە. کە دروشمی (تواندنەوەی کورد)ی بلاو کردبووەوە. لە گۆڤاری (هیوا) دا هاتووە: «هەوڵ دان بۆ ژیاندنەوەی بیری چەپەڵی تواندنەوە، لەلایەن ڕۆژنامەی (الثورة)وە لەم سەردەمی جومهوریەتە ئازادەدا، لە دەسکیسییەکی ئیمپریالیزم بەو لاوە نییە کە ئەیەوێ ریزی نیشتمانی پارچە پارچە بکاو جیاوازی بنێتەوە لە نێوان ڕۆڵەکانی کوردو عەرەب بۆ ئەوەی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی بێنەوە سەر رووی کار.» بڕوانە: گ هیوا، ژ٣، س٤، ل٦٨. هەروەها دەرهەق بە موحاکەمەکردنی نیشتمانپەروەرە کوردەکانی تورکیا دەنووسێ: «موحاکەمە کردنی نیشتمان پەروەرە کوردەکانی تورکیا، بەهۆی نەتەوە پەروەرێتی و دەست گرتنیانەوە بە ماف و یاسای- نەتەوەکەیانەوە، بە پێڵێ هەڵبڕینێکی ئاشکراو پشت تێکردن ئەژمێردرێ لە مافەکانی ئادەمیزاد و یەکیەتی نیشتمانی لە تورکیادا. ئێمە داوای وەستاندنی ئەو موحاکەمە نادەستوورییانە ئەکەین، وە داوا ئەکەین ئەو کوردانە بەرەللا بکرێن.» بڕوانە: گ. هیوا ژ٣٢، س٤، ل٤١.

[28] باربو، ل٩١.

هەروەها شێخ نوری شێخ سالح (١٨٩٦-١٩٥٨ز) دەڵێ:

داوی شەو لە خەوا سیروەی بادی سەحەر ئەنگووت          وەك صوبحی بەهاران

شـەو عـاقـیبـەتـی هـات و دڕی صوبحی گریبان          ڕۆژ بـۆوە لە کوردان

* * *

ئەم کەیفەچی یە پڕ لە نەباتات و لە ئینسان          بۆ چین هەموو شادان

تاکە سەنەمێ، لەب شەکەرێ، غونچە دەمانێ          شمشـادی میانێ

شیرین سوخەنێ تازەی تەڕ، مادەرکی کوردان          وەك یوسفی کەنعان

گورج هاتە تەکەللوم وتی: ئەم عەیش و سروورە          ئەم شایی و سوورە

بۆ (یانەی سەرکەوتن)ە، ئەم عالەمە شادان          هاتوونەتە جەولان[٢٩]

شێخ سەلام (١٨٩٢-١٩٥٩ز) لە شیوەنی مەعروف چیاووکدا، ٣٠ کە دامەزرێنەرو باوەڕپێکراوی یانەی سەرکەوتن بوو، باسی کەسایەتی چیاووك و دەوری یانەی سەرکەوتن دەکات:

کێ لە مەجلسدا ئەتوانێ هەڵسێ          وەك شێر ڕاوەسێ

حقووقی قەومی یەك یەك بپرسێ          لە کەس نەترسێ

کێ بیکاتەوە (یانەی سەرکەوتن)          بۆ کوردی مەزن

دایم هەوڵی بێ هەر بۆ یەك گرتن          بەکوێری دوژمن٣١

ئەسعەد مەحوی (١٩٠٢-١٩٧٦)یش هەستی خۆی لە شیعرێکدا دەربڕیوە:

---

[29] دیوانی شێخ نوری شێخ سالح، ئازاد عبدالواحد کۆی کردوەتەوەو ساغی کردوەتەوەو لەسەری نووسیوە، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، ل١١٣-١١٧.

[30] دەربارەی کەسیەتی مەعروف چیاووك (١٨٨٥- ١٩٥٨/١/١٤)، شاکر فتاح دەڵێ: مارف چیاووك کوردێکی مەرد و نەبەردو ئازایە. لەکوردەکانی شاری هەولێرە، ئەمە چەند ساڵێکە دەبینم شێرانەخەبات دەکات بۆ کەڵك و چاکەی نەتەوەکەمان. جیاووك ئازاو سەربەستە. کە قسەی ڕاست هاتە پێشەوەو بە باشی زانی بیکات بۆ کەڵك و چاکەی کورد، لەبەردەمی هەر کاربەدەست و دەستەلاتدارێکی میریدا بێ دەیکات. بێ باکە سڵ لە کەس ناکات، بڕوانە: شاکر فتاح خەباتی ڕۆشنبیران، ل٦٦.

[31] دیوانی سەلام، ئامادەکردن و پێداچوونەوەو پێشەکی بۆ نووسین ئومێد کاکەڕەش، چ٢، ل٢١٣.

یانەیی سەربەستیە سەربەست ئەکا لاوانی کــورد

هەوڵ ئەدا دائـم لەبۆ سەرکەوتنی گەنجانی کورد

تیَئەکـۆشیَ بۆ بلّندی نیـشتمـانی کـوردەکان

ئەیکوڑی میکرۆبی کویّری بیلبیلەی چاوانی کورد

* * *

هـــــــەر بژی مەعــروفی یانەو گەنجەکانی کۆمەڵی

چونکە زۆر کۆشش ئەکەن (ئەسعەد) لە بۆ لاوانی کورد[32]

عەونی (١٩١٤-١٩٩٢) شاعیریش دەڵیّ:

| | |
|---|---|
| ئەی برادەران یانەی ســــــەرکەوتن | میللەت ئەخاتە ڕیّگەی پیّشکەوتن |
| فائــیدەی زۆرە یانە بۆ میــللــەت | گەل ڕزگار ئەکا لە جەورو میحنەت |
| بـــــەهۆی یانەوە ڕیّکی و ئیتیـحاد | بـلاّوئەبیّــتــەوە نامیّـنی فەســاد |
| یەکەم نیشــــــانەی کۆمەڵی (یانە) | یەکیــەتی بیــرو دڵ و زوبــــانە[33] |

## بەشی یەکەم

## ئاوڕدانەوەیەکی میّژوویی لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری عیراق لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ١٩٤٦ تا داخستنی گۆڤاری هیوا ١٩٦٣

لەو ڕوانگەیەوە، کە ئـەدەب ڕنگدانـەوەی واقیعـی کۆمـەڵایـەتی و سیاسـی و ڕۆشـنبیری میللەتە لە هەموو ڕۆژگاریّکدا و هەموو هونەریّك شاهیّدی سـەردەمەکەی خۆیـەتی و لـەدایك بووی ئەو سەردەمەیە، بۆیە بەر لە هەموو شتیّك بەپیّویستی دەزانین ئاوڕیّك لە بارودۆخی ئەو ڕۆژگارەی عیراق بدەینەوە، کە بووە هۆی ئەوەی جووڵانەوەیەکی ڕۆشـنبیری دەسـت پیّبکـات و دەوری ئەدیب و ڕووناکبیر و ڕۆژنامەنووسەکانی کورد لـەو بزووتنەوەیـە دیـار بخـەن، کـە چـۆن دوای ئەوەی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا نەزانین و نەخویّنـدەواری بـاڵی بەسـەر هـەموو لایـەکی عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی دا کیّشابوو، ڕووناکبیرەکانی کـورد زۆر چـاك لـەوە تـیّ

---

32 باربو، یادگاری یانەی سەرکەوتن، ژمارە (١)، ل٩١-٩٢.

33 سەرچاوەی پیّشوو، ل٩٥.

گەیشتبوون میللەت لە گێژاوی نەزانی و دواکەوتوویی ڕزگار نابێ، تاوەکو چاو لە زانست و خوێندەواری نەکەن، هەروا سەرگەردان و دواکەوتوو لە کاروانی میللەتان دەمێننەوە، بۆیە کەوتنە هەوڵی ئەوە چەند کۆمەڵ و ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیریی دامەزرێنن و ڕۆژنامە و گۆڤار و نامیلکەی ڕۆشنبیری بڵاو بکەنەوە لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری میللەت و مافی کوردان و گەلان، ئەوەبوو لە ساڵی ۱۹۳۰دا مۆڵەتی کردنەوەی یانەی سەرکەوتن دراو پاشان ئەم یانەیە (یانەی سەرکەوتنی کوردان) لە ساڵەکانی دواتردا، گۆڤاری (هیوا)ی بەچاپ گەیاند، کە ئێمە لێرەدا لێی دەدوێین، بۆیە لە ڕۆژگاری دەست بەکار بوون و چالاکی ئەم یانەیەوە دەست پێ دەکەین، واتا لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە.

**بارودۆخی سیاسی**

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی دووەم و هەرەسهێنانی فاشیزم، ئینگلیزەکان لە عێراقدا لە هەوڵی ئەوەدا بوون زیاتر جێ پێی خۆیان قایمتر بکەن و هەموو شێوازێك لەبەر بگرن بۆ زیاتر بەستنەوەی عێراق بە بەریتانیاوە، بەڵام ئەو گۆڕانکارییە خێرایانەی لە کۆمەڵگای عێراقدا ڕوویان دەدا وایان دەکرد، ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و نەتەوەیی بچێتە چوارچێوەیەکی تازەوە و مەرام و مەبەستی ئینگلیزەکان بەو جۆرەی، کە ئەوان دەیانویست عێراق بکەنە بنکەیەکی گرنگ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و دەست بەسەردا گرتنی داهات و کەرەسەی خاوی عێراق لە ڕێگەی کۆنەپەرستان و نانەوەی دوو بەرەکی و گیانی ناتەبایی لە نێوان هێزە نیشتمانپەروەر و ئازادیخواز و دیموکراسییەکاندا، چونکە هێزە نیشتمانپەروەرەکانیش لەو ڕۆژگارەدا بە تەواوی لەسەر نەخشە و پلانێکی دیاریکراو نەدەڕۆشتن و یەکیەتییەکی نیشتمانی، کە تاکە ڕێگەی ڕزگاری و بەهێزکردنی چین و توێژەکانی و هێز و پارتە سیاسییەکان بوو لەبەرچاو نەدەگیرا.

((ڕۆژی ۲۳ی شوباتی ساڵی ۱۹٤٦ تۆفیق سوێدی یەکەم وەزارەتی دوای شەڕی دامەزراند، کە دوو نوێنەری بۆرژوازی نیشتمانی تێیدا بەشدار بوون، یەکەمیان سەعد ساڵح، کە بووە وەزیری ناوخۆ و دووەمیان عەبدولوهاب مەحمود کە بووە وەزیری دارایی.))[34]

---

[34] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل۲۰٤؛ ل. ن. کایلوف و. ا. ف. فدیشنکو، تاریخ الاقطار العربیة المعاصر ۱۹۱۷-۱۹۷۰، الجزء الاول، موسکو، ۱۹۷٥. ص۳۱۱.

ئەم کابینە نوێیەی وەزارەت، هەر لەگەڵ دەست بەکاربوونیدا، چەند هەنگاوێکی نا، کە تا ڕاددەیەکی کەم تینوویەتی دڵسۆزان و هێزە نیشتمانپەروەرەکانی شکاند، لەو هەنگاوانە دیارترینیان، ڕەتکردنەوەی حوکمی عورفی لەسەر وڵات بوو و گۆڕینی ئەو بارودۆخە نائارام و نائاساییەی وڵات بوو، کە لە ئەنجامی شەڕ خۆی سەپاند بوو بۆ بارودۆخی هێمن وئارام و ئازاد کردنی بەندکراوە سیاسییەکان و هەڵگرتنی سانسۆر بوو لەسەر چاپەمەنی و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و ڕێگەدان بوو بە چەند پارتێکی سیاسی، لەوانە: (حزب الاستقلال) و (حزب الاحرار) و (حزب الوطني الديموقراطي) و (الاتحاد الوطني) و (حزب الشعب). لە هەمان کاتدا (پارتی دیموکراتی کوردستان) وەکو پارتێکی دیموکراسی دامەزرا بۆ بەدیهێنانی حوکمی زاتی لە ناوچە کوردییەکان لە چوارچێوەی عێراقدا[٣٥]. لەو نێوانەدا، هیچ کام لەو پارتە سیاسییانە گرنگییان بە مەسەلەی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد نەدەدا و هەندێکیان (گەلی کوردی کردبووە یەکێك لە [کۆسپ]ەکانی جێبەجێ کردنی یەکیەتی عەرەب).[٣٦] دوای ئەوەی سالح جەبر وەزارەتی نوێی لە ساڵی ١٩٤٧ دامەزراند، بارودۆخی کۆمەڵانی خەڵك ڕوو لە خراپی بوو و زیاتر ڕق و تووڕەیی جەماوەری هەڵساند، چونکە سالح جەبر هەرچی زووتر دەیویست ڕێککەوتن نامەیەکی نوێ لەجیاتی پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٠ کە دوای جەنگی دووەمی جیهانیی هەڵوەشابووەوە لەگەڵ بەریتانیادا مۆر بکات، بێ گوێدانە بەرژەوەندییە باڵاکانی نیشتمانپەروەرانی عێراق، ئەوەبوو لە ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨دا لە بەندەری پۆرتسمۆس پەیماننامەی پۆرتسمۆس مۆر کرا، کە ئەم پەیماننامەش لە ناوەڕۆکدا جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٠دا نەبوو، بەڵکو زیاتریش لە بەرژەوەندی بەریتانیادا بوو، خۆپیشاندان بێ جیاوازی نەتەوەیی و بیروڕای سیاسی هەموو لایەکی گرتەوە و شەڕو پێکدادان لەنێوان هێزەکانی پۆلیس و خۆپیشاندەران لە بەغدا و شارەکانی دیکەدا دروست بوو، ژمارەیەك خوێندکار و فەرمانبەر و مامۆستا کوژران و بریندار بوون.[٣٧]

---

[35] الدكتور فاضل حسين وآخرون، تاريخ العراق الحديث، بغداد، بلا، ص١٤٥-١٤٦.

[36] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ل٢٠٦، هەروەها بڕوانە: محمد مهدی كبة، مذاكراتي في صميم الاحداث (١٩١٨-١٩٥٨) بيروت، ١٩٦٥، ص١٩٩.

[37] صادق حسن السوداني، لمحات موجزه عن تاريخ نضال الشعب العراقي، الموسوعة الصغيرة (٤٥)، بغداد، ١٩٧٩، ص٦٣، لەو نامیلکەیەدا هاتووە، کە نزیکەی سەد کەس شەهید بوون بێجگە لە بریندار

هەر لێرەوە ئەو یەکیەتییەی نێوان کورد و عەرەب زیاتر قوڵبووە و ژمارەیەك لە خەڵکی شاری هەولێر و سلێمانی و کۆیە چوونە بەغدا و بەشداری ڕاپەڕین و خۆپیشاندان و ڕێ پێوانیان کرد و چەندین دروشمیان دژی ئەو پەیماننامەیە بەرز کردەوە و بەشداری ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٨یان کرد.[٣٨]

---

و ڕفێنراو و گیراوەکان. (زیاتر لە ٣٠٠ هەزار بەشداری خەبات و تێکۆشانیان کرد دژی پەیماننامەکەی (پورتسموس)، بڕوانە: ل، ن. کاتلوف و ا. ف. فدتشنکو، تاریخ الاقطار العربیة المعاصرة ١٩١٧-١٩٧٠، ص٣١٥.

[38] گۆڤاری گەلاوێژ لە ژمارە (٣)ی ساڵی (٩)، مارتی ١٩٤٨دا لە لاپەڕە (١٢)دا بە ناونیشانی (پۆستەی کوردەواری) نووسیویەتی: (کوردەواری لە هەموو شت بەلایانەوە خۆشتر گیانی برایەتی و جەرگی یەکیەتییە چ لە بەینی خۆیانا چ لەگەڵ عەرەبەکاندا، بەڵام داخی بەجەرگم تا ئێستا لەوەتەی ئەم حکومەتە نازدارەی عێراق‌ـە سەری بردۆتەوە ناو حکومەتانەوە و کورسییەکەی لە دیوەخانی دەوڵەتەکان داناوە لە هەموو دەورێکیا جۆرد پیاوی وا سەری هێناوەتە کۆڕی ئیش کردنەوە کە بێجگە لە قازانج پەرستی خۆی نەبێ هیچ ئامانجێکی تری نەبووە.. پاشان نووسیویە: (لە ڕۆژی ١٩٤٨/٢/١٣دا پۆستەی کۆیە و هەولێر گەیشتنە جێ، ئەوەی پێی بڵێن پیاوەتی نواندنیان، بە شەقامەکانا، لەسەر گۆڕی شەهیدەکان گەڕان..) پاشان بەردەوام دەبێ: (ڕۆژی ١٩٤٨/٢/٢٦ کورگەلی سولەیمانی گەیشتن، تەنها ئەوان (٣٠٠) کەسێك بوون، لەگەڵ لاوەکانی (ڕانیە) و (زاخۆ) یەکیان گرت...) بەردەوام دەبێ، ئینجا خوتبەی (محمد احمد طه) نووسراوە: «شەهیدەکانی ڕێی ئازادی ئەوا پۆستەی سولەیمانی و کوردەواری ڕێگەیەکی دوور و درێژیان بڕیوە و هاتوون بۆ دیدەنیان، ئەو گیانە پاکانەتان کە بە زۆری گوللە کۆچی ماڵاواییان لە لەشەکانتان پێ کراوە ئەوا بەسەر سەرمانەوە وەکو پەپوولە ئەسووڕێنەوە..» دوای ئەو: (رشید احمد) و (عاملە)ی کچی حەیدەر سلێمان بە زمانی عەرەبی وتاریان خوێندەوە). پاشان دەڵێ: «لە ڕۆژی ١٩٤٨/٣/٦ پۆستەی خانەقی دیمەنی سەد کوردی خانەقی و سەد کوردی بەغدات ئەدی، کە گەیشتنە سەر گۆڕستان ئیش لە هەزار کەس نەما..». هەر لە هەمان ژمارەی گۆڤاری گەلاوێژدا بە ناونیشانی (ساڵی چل و هەشت) لاواندنەوەیەکی کچە کورد خۆشناو بۆ شەهیدانی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٨ بڵاو کراوەتەوە، هەروەها شاعیرانی کوردیش، (پیرەمێرد) و (بێکەس) و چەند شاعیرێکی دی سۆز و کوڵی دڵیان بە هۆنراوە دەربڕیوە، (پیرەمێرد) دەڵێ:

وا ڕۆژهەڵات لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە      خوێنی شەهیدە ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە

بڕوانە: دیوانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوە و ساغ کردنەوەی فائق هوشیار و ئەوانی تر، ل٢٠٧.

(بێ کەس)یش دەڵێ:

لــه کەرکووکیــشدا خەڵکــه نیــشتمانپەروەرەکه هێرشــیان کــرده ســەر کۆنــسوڵخانەی بەریتانی[39] و دوو ساڵ پێشتریش (لـه مـانگی تـەمووزی سـاڵی ١٩٤٦دا هـەموو کرێکـارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکووك به کورد و عەرەب و تورکمان و ئاسوورییەوه قسەیان کرده یـەك و بڕیاریـان دا کـه لـه مـافی خـوراو و دزینـی ڕەنجیـان چاوپۆشـی نەکـەن..)،[40] لـەو کاتەیـشدا حکومەتی پاشایەتی عێراق بەر له ساڵێك له ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٤٨، (له بەرەبەیانی ١٩ی حـوزەیرانی ١٩٤٧ ڕژێمـی پاشـایەتی بـەکرێگیراو لـه بەندیخانـەی ناوەنـدی بەغـدا حـوکمی خنکاندنی ئەو چوار قارەمانەیدا، لەبەر ئەوەی داوای مافی ڕەوای گەلەکەیان دەکرد).[41]

هێرش و خۆپیـشاندانی خوێنـدکارانی کۆلێجـەکان و نیـشتمانپەروەران و بەشـداری ژنـان ئەوەندەی دی ئاگری ڕاپەڕینەکەیان خۆش دەکرد، ئەم بارودۆخە ناهەموارە و سیاسەته چەوتەی ساڵح جەبر لەبەری گرتبوو وای له عەبدولئیلا کرد داوا له ساڵح جەبر بکات واز لەکار بهێنێت و محەمەد سەدر ڕابسپێرێت که کابینەی حکومەتێکی نوێ دامەزرێنێ. سەرۆك وەزیرانـی نـوێ له یەکەم هەنگاوەکانیدا ئەوەبوو پەیمانی پۆرتسمۆس ڕەت بکاتەوە.

سەبارەت به دەستکەوتەکانی گەلی کورد له سـەرکەوتنی ڕاپـەڕینی سـاڵی ١٩٤٨دا، د. کەمال مەزهەر دەڵێ: «گەلی کوردیش له ئەنجامی سەرکەوتنی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمدا بـه چەند مافێکی سەرەتایی خۆی گەیشت. بۆ یەکەم جار له مێژووی عێراقـدا ڕێگـەی دەرچـوونی گۆڤارێکی سیاسی به زمانی کوردی درا. ڕۆژی ٢١ی مارتی ١٩٤٨ بـۆ یەکـەم جـار کـورد وا

---

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ

بڕوانه: دیوانی بێکەس، محەمەد مەلا کەریم ڕێکی خستووه و سەرەتای بۆ نووسیووه و سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووه، چاپی سێیەم، ل٨٣.

[39] S. H. Longrigg, Iraq. 1900 To 1950. Oxford Univecity Press. 1968. P. 347.

[40] میدیا، ڕاپەڕینەکەی گاورباخی نیشانەی خەباتی هاوبەشی کرێکارانی عیرقه، پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق، ژ٥، پێنج شەممه ١٩٧٧/٧/٢١ ل٤، هەروەها: الدکتور کمال مظهر احمد صفحات من تاریخ العراق المعاصر، دراسات تحلیلیه، بغداد ١٩٨٧، ص١٣٤.

[41] محرم محمد امین، ڕۆژی ١٩ حوزەیران یادی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستانه، ك ڕۆژی نوێ، ژ٣، س٢، سلێمانی، حوزەیرانی ١٩٦١، ل٨٥.

هەروەها: نەمری بۆ قارەمانانی کوردستان، ڕۆژنامەی خەبات، ژ١٣، س٦، ١ی تەمووزی ١٩٥١، ل١. ئەم چوار ئەفسەرەش (خیرالله عبدالکریم و محمد قودسی مصطفی خۆشناو و عزت عبدالعزیز) بوون.

فراوان و ئاشکرا یادی نەورۆزی لە بەغدا و شارەکانی کوردستان کردەوە))[42]. هەر لەو ساڵەدا کورد بەشداری شەڕی فەلەستینی کرد. ئەم بارودۆخە جارێکی تر نەهامەتی بەخۆیەوە دی و کۆمەڵێ گۆڕانکاری سیاسی ڕوویدا. لە ساڵی ١٩٥٢دا شۆڕشی ٢٣ی تەمووز خاڵی وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ هەموو هێزە نیشتمانی و دیموکراتی خوازەکان بۆ ئەوەی ئەو سەرکەوتنەی گەلی میسر بەدەستی هێنا و توانی ڕووبەڕووی ئیمپریالیزم بێتەوە، گەلی عیراقیش تەکانێکی وا بدات لە ڕەگ و ڕیشەوە بگۆڕێت. ڕژێمی پاشایەتی تەفروتونا بکات. دەستبەجێ پارتە سیاسییەکان و سەرۆك وەزیرەکانی پێشوو لە کۆشکی پاشایەتی کۆبوونەوەیەکیان ساز دا، تەنانەت هەندێکیان ڕاستەوخۆ عەبدولئیلایان بە بەرپرسی ئەو بارودۆخە ناهەموارە لەقەڵەم دا، چونکە پێیان وابوو ئەو هۆکارانەی کۆدێتایەکەیان خولقاند لە عیراقیشدا هەن، بۆیە دەبێ دەستو بردی لێ بکرێت. هەر زوو ئەمە لە هەڵوێستی قوتابیانی کۆلێجەکانی پزیشکی و دەرمانسازی و بازرگانی ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیان ڕژانە ناو شەقامەکان و لە دروشمەکانیاندا داوای چاکردنی باری ناوخۆ و پیادەکردنی دیموکراتی و سەربەستی و هەڵبژادنیان لە وڵاتدا دەکرد.

ئەم خۆپیشاندانە وای لە سەرۆك وەزیران (مصطفی العمری) کرد دەست لەکار بکێشتەوە و سەرۆك ئەرکانی سوپا (نورالدین محمود) کابینەی نوێی حکومەت دابمەزرێنێ. سەرۆك وەزیرانی نوێ دەستبەجێ حوکمی عورفی لە وڵات ڕاگەیاند و بڕیاری داخستنی پارتە سیاسییەکانی دەرکرد.[43]

---

[42] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ل٢١٨، مەبەست لەو گۆڤارە سیاسییەش گۆڤاری (نەزار)ە، کە خوا لێخۆشبوو علاءالدین سجادی سەرنووسەری بوو. (گۆڤارێکی سیاسی کوردی و عەرەبی هەفتەیی بووە، لە شاری بەغدا دەردەچوو، لێپرسراوی مەحموود سنوی بووە، (٢٣) ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە، ژمارەیەکی لە ڕۆژی ٣٠ی مارتی ساڵی ١٩٤٨ دەرچووە). وە ژمارە (٢٢)ی لە ١٥ی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ دەرچووە). بڕوانە: جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، بەغدا ١٩٧٣، ل٥٥.

[43] عبدالواحد مصطفی الحصونة، الحركة الطلابية العراقية و دورها في النضال الوطني والقومي ١٩٤٧-١٩٦٣، (رسالة ماجسيتر) جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص١٠١-١١٠.

ئەم بارودۆخەش نەیتوانی سەر بە گەلی عیراق و پارتە سیاسییەکان نەوی بکات. بۆیە لە ۱۹۵٤/۸/۳دا نوری سەعید وەزارەتی دوازدەهەمی خۆی دامەزراند.[٤٤]

ئەمجارەیان هەر لە سەرەتاوە نوری سەعید هەولّی دەدا پەیماننامەیەك لەگەلّ بەریتانیادا مۆر بکات و شکست بە هێزە ڕزگاریخواز و ئازادیخوازەکان بهێنێ. دوای یەك سالّ واتە سالّی ۱۹۵۵ عیراق چووە نێو (پەیماننامەی بەغدا) ئەو پەیماننامەیە جارێکی دی عیراقی پابەندی بەریتانیا کردەوە، لە ڕێگەی پیاوی شارەزای ئینگلیز لە عیراقدا (نوری سەعید). لە سالّی ۱۹۵٦دا بەهۆی دەست درێژییە سێ قۆلّییەکەی سەر میسر شەپۆلی توندوتیژی پایتەخت و شارەکانی عیراقی گرتەوە. پارتی دیموکراتی کوردستانیش وەکو حیزبێکی کوردی پشتگیری لە گەلی میسری کرد[٤٥]. تەنانەت خۆپیشاندانەکان ئەوەندە درێژەی کێشا وا لە حکومەتی نوری سەعید کرد سەر بۆ داواکانیان نەوی بکات و ئامادەییشی پیشان بدات بۆ ناردنی یارمەتی سەربازی بۆ میسر،[٤٦] بەلاّم خۆی لە ڕاستیدا، ئەو بەلّێنانەی حکومەت بلّقی سەر ئاو بوون و لەژێرەوە کەوتە گرتنی شۆڕشگێڕان و بەشداربووانی خۆپیشاندانەکان. یەکێ لە ئەنجامەکانی سەرنەکەوتنی ئەو خۆپیشاندانە وای لە هێزە نیشتمانپەروەرەکان کرد لە سالّی ۱۹۵۷دا

---

44 لەم وەزارەتە نوێیەدا سەعید بێجگە لە کاری سەرۆك وەزیران وەزیری بەرگریش بوو، سەعید قەزاز وەزیری ناوخۆ و موسا شابەندەر وەزیری دەرەوە و خلیل کنە وەزیری مەعاریف و محەمەد عەلی محمود وەزیری داد و عبدالوهاب مەرجان وەزیری کشتوکالّ و شاکر الوادی وەزیری کاروباری کۆمەلاّیەتی، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الدکتور جعفر عباس حمیدي، التطورات والاتجاهات السیاسیة الداخلیە فی العراق ۱۹۵۳–۱۹۵۸ بغداد، ۱۹۸۰، ص ۱۰۳–۱۰٤.

45 پەیوەندی نێوان گەلی کورد و حکومەتی میسری لە چلەکاندا بەهێز بووە و حیزبی (ڕزگاری کورد) یادداشتنامەیەکی لەو کاتە دایە مفوەزییەی میسر لە بەغداد دەربارەی پشتگیری گەلی کورد، بۆ دەقی یادداشتنامەکە بڕوانە: ژمارە ۳۲۰ی ڕۆژنامەی (خەبات)، ۲۳ی ئەیلولی ۱۹٦۰.

پاشان پارتی دیموکراتی کوردستان وەکو حیزبێکی نەتەوەیی کوردی پشتگیری خۆی بۆ گەلی میسر دەربڕی لەو هێرشەی لە سالّی ۱۹۵٦ کرایە سەری، بڕوانە: حسن علي عبدالله، الموقف الرسمي والشعبي من تطور الاحداث السیاسیە فی مصر ۱۹۵۲–۱۹۵٦، (رسالة ماجستیر)، جامعة بصرة، ۱۹۸٦، ص۱۲۱–۱۲۳.

46 وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی عیراق دکتۆر فاچل الجمالي وتی: ((عیراق پشتگیری لە هەموو داواکانی میسر دەکات و کێشەی میسر کێشەی عیراقیشە بێ جیاوازی)). بڕوانە الدکتور مجید محی الدین، العراق والسیاسە العربیە ۱۹٤۱–۱۹۵۸، بغداد ۱۹۸۰، ص۲۳۷.

هەوڵەکانیان بەشێوەیەکی بەرەیی درێژە پێ بدەن و (بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی) پێک بهێنن.[47] بەڵام خۆڕێکخستنی (الضباط الاحرار) و هێرشی سێ لایەنی بۆ سەر میسرو مەسەلەی فەلەستین و ڕۆڵی ڕێکخستنی قوتابیان و خەڵکی زەحمەتێکێش و ئەو سیاسەتە نارەوایەی نوری سەعید بۆ سەرکوت کردنەوەی بزاڤی پارتە سیاسییەکان هەموو ئەمانە بوونە هۆی ڕووخانی پاشایەتی لە عێراق و بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨. لەگەڵ بەرەبەیانی شۆڕشدا و ((دوای کەمتر لە سەعاتێك لە خوێندنەوەی بەیانی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی نیشتمانی لە ڕادیۆی بەغدا سەرکردەکانی پارتی لە کەرکوك برووسکەی پیرۆزبایی و پشتگیرییان بۆ سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان نارد و هیواخوازی خۆیان تێدا دەربڕی بوو بەوەی، کە ئەم شۆڕشە پیرۆزە سەرەتای سەردەمێکی نوێ بێ لە پێوەندی نێوان کورد و عەرەب، کە چاکە و پێشکەوتنی هەردوو گەلی تیابێ)).[48]

هەر بەوەش نەوەستا بەڵکو زووبەزوویی وەفدی کورد ڕووی کردە بەغدا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە پاڵپشتی شۆڕشی ساوای عیراق بکات و لە هەمان کاتدا داوای بەردانی هەموو بەندکراوە سیاسییەکانی کورد بکات و دوورخراوەکان بگەڕێنەوە شوێن و زێدی خۆیان، لە نێوانیاندا مەلا مستەفا بارزانی و هاوەڵەکانی، کە ئاوارەی یەکیەتی سۆڤیەت ببوون. گەڕانەوەی بارزانییەکان و هاوەڵەکانیان لەسەر دێڕی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاو کرایەوە و جۆش و خرۆشێکی تازەی بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەخشی، گۆڤاری (هیوا)یش بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی خۆی نووسیوە و دەڵێ: ((بەخێر بێنەوە ئەی قارەمانان خۆش هاتیتەوە ئەی دلاوەر، خۆشهاتیتەوە سەربازی جەنگاوەر، هاتنەوەی تۆ و هاوڕێکانت هاتنەوەتان ئاوا بە ئازادی و ڕێزەوە جێی شانازیە بۆ نەتەوەی کورد، سەرکەوتنێکی گرنگە بۆ میللەتەکەمان، گوللەیەکە بۆسەر دڵی ئیمپریالیزم. ڕۆڵەی پێشەوای کورد، مستەفا بەرزانی، تۆ سەلمانت کە

---

[47] ئەم بەرەیە لە حزبی شیوعی و حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی سەربەخۆیی و حزبی بەعس پێکهاتبوو، هەموو پارت و ڕێکخراوەکان پشتیگرییان لێ دەکرد و لە ساڵی ١٩٥٧ دامەزرا، بڕوانە: ل. ن. کاتلوف و أ. ن. ف. فدتشنکو، تاریخ الاقطار العربیة المعاصر، ص٣٢٤.

[48] ابراهیم احمد، الشعب الکردی و العراق الجمهوري، جریدة الاتحاد العدد ٩٠ فی ٣٠ تموز، السنه الثانیة، ١٩٩٤، ص٣.

نەتەوەی کورد ئازاو نەبەرد، دوژمنی زۆر و داگیرکەرن، هەواڵی کوڵدان نازانن، گەلێکن تێکۆشان و تێ‌ئەکۆشن لەپێناوی ئازادییاندا)). پاشان بەردەوام دەبێ: ((ئێمەش دەستەی نووسەرانی هیوا هەر لە ئێستەوە چەپکە گوڵی خۆشنودیی خۆمانتان پێشکەش ئەکەین، لە کانگەی دڵمانەوە ئەڵێین: بەختیارین بە هاتنەوەتان، شادین بە ئازادییتان.. بەخێربێنەوە.

دەستەی نووسەرانی هیوا))[٤٩]

بە سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز ژمارەیەك ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی ڕێگەی بڵاو کردنەوەیان درا، بۆ تێگەیشتنی بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە دەکرێ بکرێنە سەرچاوەیەکی بەکەڵك بۆ لێکۆڵینەوە. لە ڕۆژنامەی (ئازادی)دا[٥٠] کە کۆمۆنیستەکانی کورد دەریان دەکرد هەڵوێستی خۆیان ڕوونکردۆتەوە: ((گەلی کوردیش لە عیراقا بەشێکە جوێ ناکرێتەوە لە میللەتی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستانی پارچە پارچە کراواو لە مابەینی دەوڵەتانی تورکیا و ئێران و عیراقا، وە میللەتی کورد یەك میللەتە، هەموو خاسیەتێکی نەتەوایەتی میللەتی هەیە، سەبارەت بەوەی کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێن، بە درێژایی مێژوو پێك هاتوون، خاکێکی موشتەرەکیان هەیە، کە بێتە هۆی سەربەستی و یەکگرتنی نەتەوایەتییان))[٥١] گەلی کورد هیوای زۆری بە کۆماری ساوای عیراق هەبوو و هەر زوو زەعیم عەبدولکەریم قاسم جێگەی لە دڵی خەڵکی کورددا کردەوە، بەو هیوایەی کە (عیراقی کورد و عەرەب)[٥٢] هەروەکو لە بەندی سێیەمی دەستووری کاتیی عیراقدا هاتبوو جێبەجێ بکرێت

---

[49] گۆڤاری هیوا، ژ٣، س٣، بەغدا، ل٥٣.

[50] ڕۆژنامەی (ئازادی)، ڕۆژنامەیێکی ڕۆژانەی سیاسی بووە، زمانی پارتی کۆمەنیستی عیراقی لقی کوردستان بووە، خاوەن و سەرنووسەری پارێزەر نافع یونس بووە، ژمارە یەکی لە ڕۆژی ١ی ئایاری ساڵی ١٩٥٩ دەرچووە، دوا ژمارەی لە ساڵی دووەمی ژمارە (٥٦) بووە، ڕۆژی ٢٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٠ دەرچووە، ئیتر پەکی کەوتووە، ئەحمەد غەفوور و محەمەد کەریم فەتحوڵڵا و محەمەدی مەلا کەریم و عەزیز محەمەد و حوسێن عارف و مستەفا ڕەسوڵ بەشدارییان لە دەرکردنی کردووە، بڕوانە: جمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی ل٦٨.

[51] لە بابەت سیاسەتی ئازاد بوونی عەرەب و مەسەلەی نەتەوایەتیی کوردەوە، ڕۆژنامەی ئازادی، ژ٢، س١، کەرکووك، یەك شەممە، ١٠ی ئایاری ١٩٥٩.

[52] لە بەندی سێیەمدا دەڵێ: ((کورد و عەرەب هاوبەشن لە عیراقدا)) بڕوانە:

سەبارەت بە مافی نەتەوایەتی کورد، تەنانەت لە ساڵی دووەمی جمهوریەتدا کە تەقەی لێکراو ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە غەم و پەژارەیەکی زۆر بە هەموو لایەکی کوردستاندا بڵاو بووەوە و لەگەڵ دەرچوونی لە خەستەخانەدا شادی گێڕرا[53]. هەروەها لە سەرکوت کردنەوەی بزووتنەوەی (الشواف)یش لە موسڵ کورد یارمەتییان دا[54]، بەڵام عەبدولکەریم قاسم لەوکاتەدا بەهۆی ململانێی خۆی لەگەڵ عبدالسلام عارفدا لەسەر دەستەڵاتی وڵات زۆر شتی لەبیر بردبووەوە، هەردووکیان بە دوو هێڵی جیاوازدا دەڕۆیشتن، عبدالسلام لەلایەن نەتەوەییەکان و عبدالکریم لەلایەن شیوعییەکانەوە، تاوەکو دواجار توانی عبدالسلام لە دەسەڵات دوور بخاتەوە بەوەی کە وەکو باڵوێزێك ڕەوانەی ئەڵمانیای بکات.[55]

---

Thomas Bois, The Kurds, Translated from the French by Professor M.W. Welland, Beirut, 1966, p. 153.

[53] حسن ارفع، کردهاو یك بررسی یاریخی و سیاسی، تهران، ١٩٦٦، ص١٢٥.

هەروەها: دکتۆر. ش. ئەشیریان نووسیویەتی: ((لە سەرەتای مانگی مارتی ١٩٥٩دا یاخی بوون لە مووسڵ دەستی پێکرد. ئەو حەلە بەشی زۆری سوپای عیراق لە بەغدا و باشوور بوون. لەو کاتەدا بۆ قاسم زەحمەت بوو بتوانێ هێزەکانی ڕەوانەی ئەوێ بکات بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیەسەرکوت بکەن، بۆیە هانای بۆ کورد و حزبی شیوعی برد تاوەکو بەرگری لە کۆماری عیراق بکەن. بە هاوکاری کورد و حزبی شیوعی لە ماوەیەکی کەمدا یاخیبوونەکەیان کۆتایی پێهێنا، پێشمەرگەکان لەژێر سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و کۆمەڵانی چەکداری خەڵکیش بە سەرکردایەتی حزبی شیوعی عیراق لە هەشتی مارتدا، لەو ڕۆژەی یاخی بووەکان پلانەکەیان داڕشتبوو، بەرەو باکوور ملییان ناو مووسڵیان داگیر کردو نەیارو ناحەزانی شۆڕشیان بەدیل گرت و ئەو دیموکراسییانەشیان ئازاد کرد، کە لەلایەن یاخی بووەکانەوە پێشتر بەدیل گیرابوون)) بڕوانە: ش. ج.ا شیریان، الحرکة الوطنیة الدیموقراطیة فی کردستان، العراق ١٩٦١–١٩٦٨، ترجمه ولاتو، بیروت ١٩٧٨، ص٦٩. فەسڵێکی ئەو کتێبە لەلایەن کاك نەجاتی عەبدوڵڵا تەرجەمەی کوردی کراوە و بڵاو کراوەتەوە، بڕوانە: تەنگژەی حکومەتی قاسم و سەرەتای تەقو تۆقی، جەنگ لە کوردستانی عیراقدا ١٩٥٨–١٩٦٣، ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٤٠ یەکشەممە ١٩٩٤/٩/١١، ل ٦،٧.

[54] ڕۆژنامەی ئازادی، ژ ٥٠، س، ١٩٥٩/١٢/٢٨، ل٢.

[55] صالح حسین الجبوري، ثورة ٨ شباط ١٩٦٣ فی العراق، دراسات فی التاریخ السیاسي (اسبابها مقدماتها– قیامها)، (رساله ماجستیر)، بغداد، ١٩٨٦، ص٢٥.

هادی حسن علیوي، عبدالکریم قاسم الحقیقة، بغداد، ١٩٩٠، ص٧٣.

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر تەمەنی کۆماری عیراقدا قاسم مۆڵەتی چەند حیزبێکیدا بە ئاشکرا کار بکەن وەکو هەنگاوێك ڕوە و دیموکراسی. یەکێ لەو حیزبانە (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوو، خەڵکی کوردستان تەواو دڵنیا بوون لە نیازپاکی قاسم. ڕۆژنامەی (نەورۆز) نووسیویەتی: ((لە ڕۆژی ١٩٦٠/٢/٩ لەکاتی ئێوارە هەموو شاری سلێمانی دەنگی دایەوە بە مۆڵەت وەرگرتنی پارتی دیموکراتی کوردستان بە ئاشکرا وە هەموو شارەکە بەم مژدەیە کەوتنە گەڕان بە شەقامەکاندا)).[٥٦]

هاوکات ڕۆژنامەکانی تریش مانشێت و سەردێڕی ڕۆژنامەکانیان بە وتەی عبدالکریم قاسم دەڕازاندەوە.[٥٧] لەو کاتەدا بەعسییەکانیش وەك حیزبێکی نەتەوەیی داوای یەکیەتییان دەکرد، ڕووکەشانە دەیانویست سۆزی کورد بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، مێشێل عەفلەق دەیووت: (هێزێك نییە لێکمان جیا بکاتەوە تا دوا تنۆکی خوێنمان نیشتمانەکەمان ئەپارێزین)،[٥٨] بەلاّم ئەو بەڵێن و خەونانە زۆر درێژەی نەکێشا، قاسم لە زۆربەی بەڵێن و پەیمانەکانی دەرهەق بە کورد پەشیمان بووەوە. ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو ڕۆژگارەیش لە خستنەڕووی حەقیقەتەکان درێغییان نەدەکرد، لە ڕۆژنامەی (ئازادی)دا هاتووە: ڕۆژ نییە چەند نامە و عەرزو حاڵ و بیرخەرەوەیان پێ نەگات لەلایەن ئەو ڕەنجبەر و فەلاح و تێکۆشەرە دڵسۆزانەی تری جمعوریەتەوە کە لە ناوچەکانی کوردستان دوور خراونەتەوە بۆ هەندێك شارو دێهاتی خواروو، وە هەندێکیان خزێنراونەتە بەندیخانەکانەوە یان لە گرتووخانەکاندا ڕاگیراون وە کەس‌وکاری خێزان و دۆست و ناسیاویان هەموو هاوار ئەکەن تا کەی ئەم دڵسۆزانەی جمهوریەت بە دەربەدەر کراوی، دوور لە ماڵ و منداڵ و ئیش و کاریان بمێننەوە سەبارەت بە درۆ و دەلەسەی چەند دەرەبەگێکی داخ لە دڵ).[٥٩] ئەم جۆرە نووسینانە لە بەرژەوەندی قاسمدا نەبوو، بۆیە هەر لە ساڵی ١٩٥٩وە کەوتۆتە گلەیی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و دەڵێ: ((هەندێ ڕۆژنامە

---

[56] ڕۆژنامەی نەورۆز، ژ١٥، س١٢، ٢ شوباتی ١٩٦٠، ل٢.

[57] بۆ نموونە ڕۆژنامەی خەبات لە لاپەڕەی یەکەمدا نووسیویەتی: ((سەرۆك عبدالکریم قاسم دەڵێ: من نەتەوایەتی کورد– القومیة الکردیة– دەپارێزم))، ژ١٥، س٢١، ای تەمموزی ١٩٥٨، ل١.

[58] گۆڤاری پێشکەوتن، ژ٢١، س١، بەغداد، ١٦ی ئابی ١٩٥٨.

[59] ڕۆژنامەی ئازادی، ژ٢، چوارشەممە ٥ی ئاياری ١٩٦٠.

دەنووسێ کەوا هێزە دیموکراتییەکان تۆقێنراون و پەرش و بڵاو کراونەوە،[٦٠] هەر لەوێ بە ئاشکرا هەڕەشەیان لێ دەکات و بە ئاشکرا کەوتە گرتنی پێشکەوتنخوازەکان[٦١] و سەرکردە سیاسییەکان و وەستاندنی هەندێ دەزگای ڕۆشنبیریی کوردی و پێشێل کردنی وەفدە کوردییەکانی بەغدا و مافە سەرەتاییەکان،[٦٢] ئەمانە وای لە مەلا مستەفا کرد بەغدا بەجێبهێڵێ و ڕووە و بارزان بگەڕێتەوە. لەو کاتەدا قاسم وەکو ڕژێمەکەمەکانی پێش خۆی سیاسەتی کورد بەگژیەکەوەنانی لەبەر گرت و هەندێ سەرۆك عەشیرەتەکانی لە دژی مەلا مستەفا قیت کردەوە. پاشان بە هێزی سوپاییەوە هێرشی کردە سەر ناوچەکە و فڕۆکەکانی عیراق ناوچەی بارزانیان بۆردومان کرد، بۆیە (مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٦١/٩/١٦ کۆبوونەوە و بڕیاری شەڕیان ڕاگەیاند)[٦٣] ئەم بارودۆخە تاوەکو ساڵی ١٩٦٣ بەردەوام بوو. لەو ساڵەدا بەعسییەکان لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا بە کۆدێتایەکی سەربازیی حکومەتی "عبدالکریم قاسم"یان ڕوخاند)).

بەعسییەکان بەرلەوەی کۆدێتاکەیان سەربکەوێ بیریان لەوە کردبووەوە بە هەموو شێوەیەك دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردایەتی بجولێتەوە و وەکو نەتەوەیەکی کۆنەپەرستیی عەرەب ڕەفتار بکەن، بۆیە سەیر نییە ئەو ڕاستییە لەخۆیان ببیستین وە شاهێدی ئەو ڕاستیە بن.[٦٤]

---

[60] ڕۆژنامەی خەبات، ژ٢٣، س١، هەینی ٣١ی تەموزی ١٩٥٩.

[61] مامۆستا ابراهیم احمد بەهۆی نووسینی وتارێك لە ڕۆژنامەی (خەبات) و بەوەی کە حکومەت تاوانباری کردبوو بە کوشتنی سەدیق میران درایە دادگا و لە پاش کێشەیەکی زۆر (تبریە) بوو، بڕوانە: احمد ڕەسوڵ پشدەری، یادداشتەکانم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٩٢، ل١٤١.

[62] بۆ پێشێل کردنەکانی قاسم و هەنگاوەکانی دژ بە جووڵانەوەی ڕزگاری خوازی کورد بڕوانە: نبیل زكي، الاكراد الاساطير والثورات والحروب، مطبوعات كتاب اليوم (٨)، مطبعة مؤسسة دار اخبار اليوم" القاهرة، ١٩٩١، ص٧٩.

[63] د. حامد محمود یاسین عیسی علي، المشكلة الكردية، ص٢٠٢. شایانی سەرنجە مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ بە ڕۆژی بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول دادەنێت، بڕوانە ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٤٠، یەکشەممە ١٩٩٤/٩/١١.

[64] صالح حسین الجبوري دەڵێ: بۆیە بۆ ئەنجام دانی کۆدێتاکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەعس سوودیان لە فڕۆکەکانی (الحبانیة) وەرگرت چونکە نزیك بوو لە بەغدا، بەڵام فڕۆکەخانەی کەرکوك تەرخان کرا

ڕەفتاری (الحرس القومی)یەکانیش لە کوردستاندا مایەی نەفرەت لێکردنە. ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانیش، کە هەردەم پەیوەستی بارودۆخی سیاسی وڵات بوون، لەگەڵ هاتنی بەعسییەکاندا بۆ سەر حوکم زۆربەیان پەکیان کەوت و لەکار خران.[٦٥]

## بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە باری سیاسیی عیراق هەمیشە پڕ ئاژاوە و نائارامی سیاسی بووە و بەهیچ شێوەیەك سەقامگیر نەبووە، لە ساڵانی ١٩٥٦، ١٩٥٢، ١٩٤٨، ١٩٥٨، ١٩٦١، ١٩٦٣دا شۆڕش و کۆدێتا و بزووتنەوەی جیا جیا ڕوویان داوە.[٦٦]

سەقامگیر نەبوونی ئەو بارە سیاسییەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ یاری کردن بە بڕیارە سیاسییەکان و زەوت کردنی مافەکانی خەڵك و سەپاندنی فەرمانی عورفی فێڵ کردن لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن. بەهۆی شوێنی ستراتیژی عیراقەوە و داهاتی زۆری، بەریتانیا حیسابی تایبەتی بۆ دەکرد و چاوی تێ بڕی بوو. بۆ درێژەپێدانی بە چەوسانەوە و مانەوەی خۆی لە عیراقدا سەرکوتی هەموو جووڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕی دەکرد و خێزانی هاشمییەکانی لەسەر وڵات کردبووە کۆتێك، کە خەڵکەکە ژیانی لێ ببێ بە مەرگەسات و ڕۆڵەکانی عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی لە زیندانە نووتەکەکاندا دەئاخنی و مافە سیاسیەکانی پێشێل دەکردن، پەیوەندیەکانی خێزان، پەیوەندییەکی خێڵەکی دواکەوتوو بوو، ڕادەی بوون و مردن لەگەڵ ڕێژەی زیاد بوونی دانیشتواندا نەدەگونجا. ژمارەی مردن لە زۆربەی کاتدا، لەگەڵ ژمارەی لەدایکبووندا یەکسان بوو. ئەم خشتەیەی خوارەوە ڕادەی لەدایك بوون و مردن لە لیواکانی کوردستان لە ساڵی ١٩٥٣دا پیشان دەدات.[٦٧]

---

بۆ سەرکوت کردنەوەی بزووتنەوەی یاخی گەرانی مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی، بڕوانە: ثورة ٨ شباط ١٩٦٣ فی العراق، ص١٤٩.

[65] گۆڤاری (هیوا) و ڕۆژنامەی (بڕوا) و گۆڤاری (روناهی) و گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) و هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی تر، تەنیا ڕۆژنامەی (ڕاپەڕین) لە گۆڕەپانەکەدا بوو، بڕوانە: جمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٦٣-٩١.

[66] لە ئەنجامی ئەو نا ئارامییە سیاسییەدا لە سەردەمی پاشایەتی لە عیراقدا لە ١٩٢٠-١٩٥٨، (٥٩) وەزارەت دامەزرا، بڕوانە: عبدالرزاق الحسنی، تاریخ الوزارات العراقیة، ج ١٠، ص٢٨٤.

[67] د. شاکر خصباك، الکرد والمسألة الکردیة، منشورات الثقافة الجدیدة، بغداد، ١٩٥٩، ص٥٨.

بێگومان ئەم خشتەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە خزمەتگوزاری تەندروستی و باری گوزەرانی خەڵك لە پلەیەکی نزمدا بووە،[٦٨] خواردن و خۆراکی چاك بۆ ساوا نەبووە، ئەم بارودۆخەش نەوەکو هەر لەپێش شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا، بەڵکو دوای شۆڕشیش هەر بەردەوام بووە و لە ساڵی ١٩٦١دا دکتۆر شاکر خەسباك دەڵێ: ((باری تەندروستی ناوچە کوردییەکە خراپە و ڕادەی مردن زۆرە)).[٦٩] هەروەها دەڵێ: ((دەستکەوتی گشتی تاکێکی عیراقی وە بەتایبەتی دێهاتییەکان لە نزمترین ڕادەدایە)).[٧٠]

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ ژمارەی دانیشتوانی عیراق شەش ملیۆن و نیو کەس بوو، کە پێکهاتبوو لە عەرەب و کورد و تورکمان و کەمە نەتەوەییەکانی تر. لە ڕووی ئاینیشەوە بەشی زۆری موسڵمان و ئەوانی تر مەسیحی و یەهوودی و ئایین و مەزهەبەکانی دی بوون).[٧١]

لە ڕووی پێکهاتی چینایەتییەوە چینی زەحمەتکێش (٩٠٪)ی دانیشتوانیان پێك دەهێنا و ئەوەی تر دەرەبەگ و بۆرژواکان بوون، بۆیە کۆمەڵگای عیراق دابەش دەبووە سەر دوو چینی سەرەکی: چینی زەحمەتکێش: ئەویش (جووتیار و کرێکار و کاسبکار و فەرمانبەرانی دەگرتەوە (وردە بۆرژوا).[٧٢]

---

[68] بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٥٥، لە لیوای سلێمانی و هەولێر و کەرکوك هەریەکە (٥) نەخۆشخانەی تیا بوو. بڕوانە: د. شاکر خصباك، الکرد والمسألة الکردیة، ص٦١.

[69] بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٥٥، لە لیوای سلێمانی و هەولێر و کەرکوك هەریەکە (٥) نەخۆشخانەی تیا بوو. بڕوانە: د. شاکر خصباك، الکرد والمسألة الکردیة، ص٦١.

[70] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧.

[71] بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، ژمارەی دانیشتوانی عیراق ٦،٢٩٨،٩٧٦ کەس بوو و ژمارەی کورد لە لیواکاندا بەم شێوەیە بوو:

| لیوا | کورد |
|---|---|
| مووسڵ | ٢٣٢٢٠٦ |
| هەولێر | ٢٤٣٣٣٥ |
| کەرکوك | ١٨٧٥٩٣ |
| سلێمانی | ٢٩٩٩٣٦ |

هەروەها ژمارەی موسڵمانان لە عیراقدا ٦،٠٢١،٢٨٤ کەس بووە، واتە بەڕێژەی ٩٥،٧٥٪، ئەوەی تر مەسیحی و یەزیدی و تایفە و مەزهەب و ئاینەکانی تر بوون، بڕوانە: محمود الدّرة، القضیة الکردیة، الطبعة الثانیة، منشورات دار الطلیعة، بیروت ١٩٦٦، ص٢٢٣-٢٢٥.

[72] لیث عبدالحسن الزبیدي وای دابەش کردووە:

چینی بەرز: ئەویش (دەرەبەگ و بۆرژوا گەورەکان)ی دەگرتەوە.

**چینی زەحمەتکێش:**

حاڵەتی جووتیار ئەوە جارێك شپرزە بوو بەدەست ئاغا و دەرەبەگە خوێنمژەکانەوە و داهاتی جووتیار هەمووی بۆ ئاغای خاوەن زەوی و زار بوو، بەشی جووتیار هەر نان و زگ بوو. جوتیار پارچەیەك زەوی نەبوو لەپێش شۆڕشی ١٤ی تەمووز، ساڵ دوانزە مانگ بۆ ئاغا کاری دەکرد و داهاتی بۆ گیرفانی ئاغا بوو، چونکە لە سەردەمی پاشایەتیدا هیچ یاسایەکی چاککردنی کشتوکاڵ نەبوو بتوانێ بەرگری لە جووتیاران بکات، بەڵکو بە پیچەوانەوە هەموو یاسایەکان لە بەرژەوەندی دەرەبەگدا بوون و ساڵانە داهاتێکی زۆری گەنم و جۆ لە لیوایەکانی کوردستان بەرهەم دەهێنرا، بێئەوەی چینی زەحمەتکێش سوودی لێ ببینن. ئەم خشتەیە بەروبوومی هاوینەی ناوچە کوردییەکان پیشان دەدات لە ساڵی ١٩٥٣دا:[٧٣]

| لیوا | گەنم بە تەن | جۆ بە تەن |
| --- | --- | --- |
| سلێمانی | ٧٠٠٠ | ٧٠٠٠ |
| هەولێر | ١٠٤٠٠٠ | ٦١٠٠٠ |
| کەرکوك | ١٠٩٠٠٠ | ١٥٦٠٠٠ |
| مووسڵ | ٢٧٢٠٠٠ | ١٧٨٠٠٠ |
| هەموو عیراق | ٤٧٩٠٠٠٠ | ١١١١٠٠٠ |

ئەم بارودۆخەی جووتیارانی کورد لە لادێکاندا لەنێو شیعری کوردی لە جوانترین شێوەدا ڕەنگی داوەتەوە.[٧٤] یان چەندین چیرۆکنووس زەبرو زەنگی ئاغاکانیان لە زەوی داگیرکردن و

---

١- دەرەبەگ ٢- بۆرژوا (گەورە و بچووك) ٣- چینی زەحمەتکێش (کرێکار و جووتیار و سەرباز و ئەفسەرە شۆڕشگێڕەکان و ڕۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکان)، بڕوانە: لیث عبدالسن الزبیدي، ثورة ١٤ تموز فی العراق، ص٣٢-٣٩.

[73] دکتۆر شاکر خەسباك، کورد و مەسەلەی کورد، وەرگێڕی لە عەرەبییەوە ئەمین موتابچی، ل٤٩.

[74] (گۆران)ی نەمر دەرهەق بە زەبری ئاغا بۆ جووتیاران لە وێنەیەکی شیعریی بەرزدا دەڵێ:

لەژێر تارای سوومەچنا هەرە جوانی دێ (کچی جووتیار) بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە ڕێ

کۆشکی ئاغا گەچ کارییە، ئاوێنە بەندە کەس نازانێ بە ژمارە پەنجەرەی چەندە!

بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمی گۆران، دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم، محەمەد مەلا کەریم کۆی کردۆتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، ل١٩٩.

دەست درێژی کردن بۆ سەر کچ و ژنی جووتیاران کردۆتە ناوەرۆکی چیرۆکەکانیان[75]. لەم بارودۆخەدا هەمیشە جووتیاران لە خەباتدا چەندین ڕووبەڕوو بوونەوەی جیا جیا لە سەرانسەری عیراقدا لە نێوان ئاغا و جووتیاراندا ڕووی داوە.[76] تەنانەت دوای دوو ساڵ لە سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزیش حاڵی جووتیاری کورد لە کوردستاندا بە تەواوی چارەسەر نەکرابوو، هەر دەرەبەگ خاوەن زەوی و زار بوو[77]، بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێ کە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز هەندێ بڕیار و گۆڕانکاری ڕوویدا، بەڵام لە هەموو ناوچەکاندا وەکو یەك جێبەجێ نەدەکرا، لە ناوچە کوردییەکاندا کۆسپ دەکەوتە بەردەم لیژنەکان، چاك کردنی کشتوکاڵ لە ماددەی (١٤)ی دەستووری کاتی داهاتووە بەوەی، کە (موڵکایەتی زەوی و زار دەبێ بەپێی یاسا ڕێك بخرێ و پاشان یاسای ژمارە (٣٠) لە ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٥٨دا دەرچوو، کە بەپێی ئەو یاسایە نابێ کەس لە ٢٠٠٠ دۆنمی زیاتر هەبێ لە زەوی دێمەکاری.[78] ئەمەش لێدانێکی بەهێز بوو بۆ دەسەڵاتی دەرەبەگەکان.

ئەگەر حاڵی جووتیاران وەها بووبێ، حاڵی کرێکارانیش لە کۆمپانیاکانی نەوت و هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر و بەندەرەکان و پۆستە و گواستنەوە و دەزگاکانی تری حکومەت و

---

[75] بۆ نموونەی ئەو چیرۆکانە بڕوانە: کامەران موکری، سزا، ڕۆژنامەی ژین، ژ١١٠٣، س٢٧ (١٢,١٩)ی حوزەیرانی ١٩٥٢؛ جەمال نەبەز، لالۆ کەریم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٥٦؛ کاوس قەفتان، خاڵە حەمە، گ، ڕۆژی نوێ، ژ٧، س١، سلێمانی، تشرینی یەکەمی ١٩٦٠، ل١٠١؛ مەحموود ئەحمەد، جوان، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٦٠؛ حەسەنی قزڵجی، پێکەنینی گەدا، چ٢ چاپخانەی علاء، بەغداد، ١٩٨٥، ل٨٠-٩٤.

[76] یاخی بوونی جووتیارانی عەشیرەتی ال زیرج لە ساڵی ١٩٤٦ و سوێند خواردن و یاخی بوونی جووتیارانی دزەییاتی لە دەشتی هەولێر لە ١٩٥٣ و جووتیارانی وارما و (هەڵەبجە و سلێمانی) و جووتیارانی هۆرین شێخان لە لیوای دیالە لەهەمان ساڵدا نموونەی ئەو ڕووبەڕوو بوونەوانەیە. بڕوانە: لیث عبدالحسن الزبیدي، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، ص٢٦.

[77] بەپێی ئەو یادداشتەی، کە مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٢٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦١ بۆ عبدالکریم قاسم بەرزی کردۆتەوە و لە (١٣) خاڵ پێکهاتووە و لە هەموویاندا تەئکید لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە ناوچە کوردەوارییەکان لە خزمەتگوزاری و ئاوەدان کردنەوە بێ بەشن، یەکێ لەو خاڵانە دەربارەی چاك کردنی زەوی و کشتوکاڵ و چاندنی تووتنە. بۆ خاڵەکانی ئەو یادداشتە بڕوانە: جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية ص٢٨٨-٢٩٦؛ د. جورج حجار، المسألة الكردية نحو اخوه عربية كردية، ص٢٤-٢٥؛ ادمون غريب، الحركة القومية الكردية، ص٣٨.

[78] بڕوانە: لیث عبدحسن الزبیدي، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، ص٣٠٢.

کارگەی بۆرژواکان کاریان دەکرد لەحاڵی جووتیاران باشتر نەبوو، زۆربەشیان هەر ئەو جووتیارانە بوون، کە لە گوندەکانەوە لە زەبری ئاغا ڕزگارییان ببوو و بۆ بژێوی و نان پەیدا کردن ڕوویان لە شارەکان کردبوو و لەلایەن خاوەن کارگە و دەزگاکانەوە بەرهەم و ڕەنجی شانیان بە نرخێکی سووك و هەرزان حسێب دەکرا و لە بەرژەوەندی چەند کەسێك دابوو. بەهۆی نەبوونی بیمەی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری تەندروستی و خانووبەرە کرێکاران لە گوزەرانێکی تاڵدا دەژیان. بۆیە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوای و لەگەڵ هەموو جووڵانەوە شۆڕشگێڕی و خۆپیشاندانەکانی دژ بە ڕژێمی پاشایەتیدا بەشدارییان دەکرد. زۆر جاریش یاخی بوون و ڕاپەڕینی کرێکاران لە سنووری نەتەوەیی دەردەچوو. ڕاپەڕینی کرێکارانی گاورباغی نموونەیەکی زیندووە لە دەربڕینی ڕقی کرێکاری کورد و عەرەب و ئاسووری و تورکمان بە یەکەوە لە بەرامبەر هەژاری و نەداری و مۆنۆپۆلەکانی نەوت.[79] ئەم بارودۆخەی کرێکارانیش لە ئەدەبی کوردیدا بۆتە تابلۆیەکی نەمر.[80]

لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز سالانی حوکمی (قاسم)یشدا کرێکار لەگەڵ هەندێ گۆڕانکاری لە پایتەخت لە شارەکانی تردا وەکو دابەش کردنی زەوی و خانوو بۆ کرێکاران و

---

[79] بۆ زانیاری دەربارەی ڕاپەڕینی کاورباخی، بڕوانە: الدكتور كمال مظهر احمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر، ص١٣٤. هەروەها: خالد محسن محمود الراوي، تاريخ الحركة العمالية في القطر العراقي ١٩٦٨–١٩٧٥، رسالة ماجستر، ص٥٤.

[80] شەهید مارف بەرزنجی لە هۆنراوەیەکدا وێنەی ژیانی سالانی (١٩٥٤–١٩٥٥)مان بۆ دەکێشت:

ئەپرسن لێم ئەحواڵی ژین
چ ژانێکە بن بۆ ئێمە ژین
هەژاری و بێداری و ڕزین
بەند و مەست و بێ فرمان
بێ نان و بەرگ و بێ دەرمان
قەرزار، داماو، سەرگەردان
پاشا خۆش بێ و شەریکەی نەوت
عالەم نابێ یا ئەبێ فەوت
قۆنتەراتی زۆرمان دەس کەوت

بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ) کۆکردنەوە و ڕێکخستنی سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعروف بەرزنجی، ل٧٥–٧٧.

سووککردنی باری ژیانیان له ڕێگەی کردنەوەی نەخۆشخانە و پرۆژەی ئابووری و دانانی هەندێ کارگە، بەڵام له کوردستاندا، بێ کاری بە ڕێژەیەکی بەرفراوان بڵاوبۆوە[81].

## چینی دەرەبەگ و بۆرژوا:

چینی دووەم له پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگای عیراق دەرەبەگ و بۆرژواکان بوون، بۆرژوای بچووك و گەورە، کە کەمینەیان پێك دەهێنا. ئەم چینە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان هەمیشە له دژی بەرەی میللەتدا بوون پشتگیرییان له کاربەدەستان و حکومەتی پاشایەتی دەکرد، تەنانەت ئەگەر سەرنج بدەینە باری سیاسی ئەو ڕۆژگارە زۆربەی ئاغا و بەگە نەخوێندەوار و سەرۆك هۆزەکان له ئەنجوومەنەکاندا دەبوونە نوێنەر و دەرەبەگ کە خاوەن زەوی و زار بوون، له کاتێکدا جووتیار خاوەنی بستێ زەوی خۆی نەبوو، دەوڵەتیش لەپشت ئەوەوە بوو، کە زەوی و زاری بەدەست ئاغاکانەوە بێت. بەشی دووەمیشیان کە بۆرژواکانی دەگرتەوە ڕێگەی بازرگانی و کڕینی زەوی و زار و گران کردنی داهات سەرچاوەی ژیانی خەڵك قازانجێکی زۆریان له خەڵك و دەزگاکانی دەوڵەت دەست دەکەوت. فەرمانبەر و ئەفسەرانی سووپایش، خۆیان له خانەی وردە بۆرژوادا دەدۆزییەوە، لەژێر باری قورسی ژیاندا دەیانناڵاند و فەسادێکی ئیداری و پابەند نەبوون بە یاسا و فرمانەکانی دەوڵەت و بڵاو بوونەوەی بەرتیل بەئاشکرا بڵاو ببووەوە. ئەم گوزەرانە تاڵە وای لێکردبوون خۆیان له ویست و ئارەزوو و خەباتی چینی زەحمەتکێشانی میللەت جیا نەکەنەوە و بەشداری هەموو بزووتنەوەیەك بکەن، سەبارەت بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و قات و قڕی و گرانی و زۆریی باج ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان له باشووری کوردستاندا ئاوێنەیەکی ڕوونی ئەو ڕۆژگارە دەنوێنن.

ڕۆژنامەی هەولێر نووسیویەتی: ((وەزارەتی نوێ باجی هەندێ شتی لەسەر سەوزەوات و بەری دار هەڵگرت، بەمە هەنگاوێکی گەورەی نا بۆ ئاشت کردنەوەی دڵی دانیشتوانی خاکی عیراق. خۆزگە وەزارەتی بەڕێز بە تەواوی باجی (استهلاك)ی لەسەر خەڵك هەڵگرتایە. تا ئەمەندە دەست پیسی له سامانی حکومەتی نەکرایە، وە ئەوەندەش دڵی لادێی و خەڵکی باژێڕ

---

[81] جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ص٢٨٨-٢٩٦.

لەلایەن فەرمانبەرانی استهلاکەوە نەشکێنرایە))[82] پاشان بەردەوام دەبێ: ((نەوێرین بڵێین باجەکانی حکومەت، هۆیەکن لە هۆیە بەهێزەکانی پاش کەوتنمان...)).[83]

ڕۆژنامەی (ژین) چەندین وتاری جۆراوجۆری لەم ڕووەوە بڵاو کردۆتەوە، کە تیایدا باری دواکەوتوویی خەڵکی کوردستان پێشان دەدات و پشتگوێ خستنی کوردستان لەلایەن حکومەتەوە. لە وتارێکدا دەقی وتاری (رئیسی بلدیەی سلێمانی فائق هوشیار کە ڕۆژی ١٩٥٥/١١/٤. لە کۆبوونەوەی باخی گشتیا بە عەرەبی بۆ خاوەن شکۆ مەلیکی مەزنی خوێندەوە)[84]. بڵاو کراوەتەوە، کە تیایدا سەرۆکی شارەوانی باری ناهەمواری خەڵکەکە دەردەبڕێ و داوای کردنەوەی کارگە دەکات لە سلێمانی و داوای پێشکەوتنی شارەوانی و مشورخواردن لە حاڵی دواکەوتوویی کۆمەڵ دەکات. لێرەوە دەتوانین پەی بە نەبوونی پلانی ئابووری بەرنامە بۆدارێژراو بکەین، لە هەمان کاتدا دەوڵەت لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە کشتوکاڵ بکاتە بنچینەی گەشەکردنی ئابووری، کەچی دەیویست پەیوەندی بەرهەم هێنان نەگۆڕێ و دەرەبەگان سەروەر بن، چونکە بە چاك کردنی باری گوزەرانی جووتیاران بەرژەوەندی بەرهەم هێنان نەگۆڕێ و دەرەبەگەکان سەروەر بن، چونکە بە چاك کردنی باری گوزەرانی جووتیاران بەرژەوەندی لەگەڵ چینی دەرەبەگ وبۆرژوا بخاتە بەردەم هەموو پڕۆژەیەکی پیشەسازی قوورس و چینی کرێکاریش بە لاوازی بمێنێتەوە و هۆشمەندی چینایەتییان کزبێت.

### باری ڕۆشنبیری

ئەگەر بمانەوێ لەباری ڕۆشنبیری ئەو ڕۆژگارە تێ بگەین، بە پێویستی دەزانین لە دوو ڕوانگە و دوو بنیاتی سەرەکی ڕۆشنبیریی ڕوونی بکەینەوە، ئەوانیش:

١- قوتابخانەکان.

٢- ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.

تێڕوانینێکی خێرا ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە مێژووی کردنەوەی قوتابخانە لە شارەکانی باشووری کوردستاندا بۆ سەرەتای ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە. پێشتر لە سەدەکانی ڕابردوودا مەڵبەندی خوێندن حوجرە و مزگەوتەکان بوو، ژمارەیەك مەلاو زانای کورد دەرسیان تێدا

---

[82] ن. ل، بیری سەربەست، ڕۆژنامەی هەولێر، ژ١٠٤، س٣، سێ شەممە ٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣، ل٢.

[83] سەرچاوەی پێشوو، ل٢.

[84] ڕۆژنامەی ژین، ژ١٢٧٣، س٣٠، پێنج شەممە ١٩٥٥/١١/١٧، ل٣.

دەوتەوە، ئەو زانست و زانیارییە ئایینیانەشی کە لەوێ دەخوێندرا، هەتاوەکو ئەدەبیاتیش بە زمانی عەرەبی فارسی بوون، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کزی هەستی نەتەوەیی، تەنانەت لە سەردەمی میرنشینە کوردییەکانیشدا ئەوەندە بە تەنگ خوێندن و زمانی کوردییەوە نەبوون. نامەنووسین و کاروباری خەڵك بە زمانی فارسی بووە.[٨٥]

زمانی کوردی زمانی شیعر بووە، ئەویش بە چاوێکی سووك سەیر کراوە، بۆیە (نالی) هاواری لێ هەڵساوە:

کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییە

هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا[٨٦]

قوتابخانە خاڵی وەرچەرخانێکی گەورەیە لە ژیانی خوێندەواری و ڕووناکبیری هەموو میللەتێکدا، لە ساڵی ١٩٠٥ی زایینییدا پیاوماقوڵانی کورد وە کۆمەڵانی خەڵکی سلێمانی جارێکی تر بە هەوڵ و کۆششی خۆیان توانیان قوتابخانەیەکی ئەعدادی مولکی لە سلێمانی دامەزرێنن، شایانی باسە، ئەم قوتابخانەیە لە ڕوشدیەی عەسکەری باڵاتر و گرنگتر بوو.

لە ساڵی ١٩١٢یشدا ساختمانی قوتابخانە لە کۆیە تەواو بووە و دەرسی تێدا دەخوێندرا[٨٧]. پاشان لە سەردەمی شێخ مەحموودی نەمردا ژمارەی خوێندنگاکان زیادی کرد و (لە دوو خوێندنگای شڕو پڕی سەردەمی ئینگلیزەکانەوە، خوێندنگاکان لە سەردەمی شێخ مەحمووددا بوون بە چوار خوێندنگای ڕێكوپێك و پۆشتە و پەرداخو شۆخو شەنگ)[٨٨]، هەر لە سەردەنی شێخی نەمردا: (بۆ یەکەمجار لە سلێمانی قوتابخانەی (زەهرا)یش بۆ کچان لە ١٩٢٦دا کرایەوە)[٨٩].

---

85 نامەکانی (مەولەوی)، شاعیر، کە بۆ شێخەکانی ناردووە، هەمووی بە زمانی فارسی بووە، بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، شارۆیەك، لە باخچەی ئەدەبی مەولەوی، گ کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، ل٢٥٣.

86 دوکتۆر مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل٥٣.

87 هیمدادی حوسێن، بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم و خوێندن و نووسینی کوردی، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٤١٤، س١، چوارشەممە ١٩٩٢/٦/١٦.

88 شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ٣، ١٩٨٤/٤/١٠، ل١٥٨.

89 د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل٢٦٢.

هەر لە سەرەتای درووست بوونی حکومەتی عیراقەوە، بارودۆخی ناوچە کوردییەکان لە ولایەتی موسڵ حیسابی تایبەتی بۆ دەکرا. تەنانەت بە بڕیاری (عصبة الامم) لە ساڵی ١٩٢٥دا زمانی کوردی لە ناوچە کوردەوارییەکاندا بووە زمانی خوێندن و ئیداراتی حکومەت و ((هەوڵی ئەوەش درا لە ناوچە کوردییەکاندا فەرمانبەرەکان کورد بن)).[90] ئەم بڕیارە حکومەتی عیراقی ناچار کرد بەپێی بڕیاری ژمارە (٧٤)ی ساڵی ١٩٣١ پەیڕەو بکات و هەنگا و بۆ ئەم مەبەستە بنێت. ڕووناکبیرێکی ئەو سەردەمە (ساطع الحصري)، کە مدیری مەعاریفی ئەو کاتە بوو دەڵێ: ((کە حکومەتی عیراقی بڕیاری دا زمانی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمی لە شارو گوندە کوردییەکاندا، لەسەر وەزارەتی مەعاریف بوو ئەو شتانە جێبەجێ بکات، کە بۆ ئەم مەبەستە دەبووایە بکرایە، ئەڵبەتە باشترین ڕێگەش بۆ ئەوە، ئەوەبوو، کتێبە مەنهەجییەکانی خوێندنی قوتابخانە سەرەتاییەکان تەرجەمەی کوردی بکرێن.. بۆیە وەزارەت لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی کاری وەرگێڕان بکەن، لە چوار کەس لە ڕووناکبیرەکانی کورد پێك هاتبوون، کە لە بەغدایێ فەرمانبەر بوون، ئەوانیش: تۆفیق وەهبی و عەبدول ڕەحمان ساڵح و شوکری فەزلی و نووری بەرزنجی بوون)).[91]

ساڵانی دواتر، کە وردە وردە قوتابخانەکان لە لادێکان کرانەوە، ئەمجارە مامۆستاکان تووشی ململانێیەکی تووند بوون لەگەڵ پیاوانی ئایینی و ئاغاکان و ڕێگەی ئەوەیان نەدەدا خەڵکەکە منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە، بێگومان خوێندن و خوێندەواری و هۆشمەندی و وریابوونەوەی چینی زەحمەتکێش لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوو.

ساڵانی ڕژێمی پاشایەتی، حکومەت بە عەقڵیەتێکی پۆلیسییەوە، مامەڵەی لەگەڵ باری ڕۆشنبیریدا دەکرد، خۆیان سەرپشك بوون لە وەرگرتنی قوتابیان لە قوتابخانە و کۆلێجەکاندا. هەروەها لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێنمایی و بانگەشەی گشتی سانسۆری بەهێزیان خستبووە سەر ئەو کتێبانەی لە میسر و سوریا و لوبنانەوە دەهاتن و چاودێرییان خستبووە سەر ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبییەکان و هاوڵاتی عیراقییان لە هەموو ئەو ڕێبازە ئەدەبی و فیکرییانە بێبەش

---

[90] د. حامد محمود عیسى علي، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى ١٩٩١، ص١٠٣؛ محمود الدرّة، القضية الكردية، ص٢٣٥.

[91] منذر الموصلي، عرب واكراد رؤية عربية للقضية الكردية، ص٣١٨.

کردبوو، کە لە وڵاتانی عەرەبی ڕوویان دەدا. دەرگای سینەماکان بۆ فلیمی ناچیز و تاوانکاری و هاندانی ڕۆحی جەنگ و پەرەپێدانی ڕەگەزپەرستی کرابووەوە و هەموو فلیمێکی چاك، کە باسی دڵسۆزی و برایەتی گەلان بکات قەدەغە کرابوو. نەخوێندەواری بە ڕێژەیەکی زۆر بڵاو ببۆوە تەنانەت لە زۆر لادێدا تەنها مەلا خوێندەوار بوو و ئەو بابەتانەیشی، کە لە قوتابخانەکاندا دەخوێندرا، مێژووی پاشا و خەلیفە و ئیستعمار بوو و ئەم دوو خشتەیە ڕێژەی خوێندەواری و ژمارەی قوتابخانەکان لە ساڵی ١٩٥٤ لە لیوای کوردییەکاندا پیشان دەدات[٩٢]:

| لیوا | قوتابخانە سەرەتاییەکان | | | | قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کوڕان | کچان | ساوا | هەمووی | کوڕان | کچان | هەمووی |
| سلێمانی | ٥٧ | ٩ | ١ | ٦٧ | ٣ | ١ | ٤ |
| هەولێر | ٥٩ | ٨ | ١ | ٦٨ | ٣ | ١ | ٤ |
| کەرکوك | ٧١ | ١٣ | ١١ | ٩٥ | ٦ | ٢ | ٨ |
| موسڵ | ١٥٤ | ٢٩ | ١٦ | ١٩٩ | ٩ | ٤ | ١٣ |
| لە عیراقدا | ١٠٩ | ٢٥٦ | ١٠ | ١٤٥١ | ٩٢ | ٤٢ | ١٣٤ |

| لیوا | ژمارەی خوێندەوار | | ژمارەی دانیشتووان | |
|---|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٩٠٨٥ | ١٢١٩ | ١٠٣٠٤ | ٢٢٦٤٠٠ |
| هەولێر | ٤٨٠١ | ١٠٠٩ | ٩٤١٠ | ٢٣٩٧٧٦ |
| کەرکوك | ٢١٧١٤٢ | ٢٣٩٢ | ٢٠٥٣٤ | ٢٨٦٠٠٥ |
| موسڵ | ٣٦٠٢٤ | ١٢٨٠٢ | ٤٨٨٢٦ | ٥٩٥١٩٠ |
| لە عیراقدا | ٣٣٣٤٦٤ | ٤٨١١٢ | ٤٠٧٥٧٦ | ٤٨١٦١٨٥ |

[92] د. شاكر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، ص٦٤.

لەگەڵ کەمی ژمارەی قوتابخانە لە گوندەکاندا، چۆنیەتی دابەشبوونی قوتابخانەکانیش بە ڕێژەیەکی یەکسان نەبوو و زۆربەیان کەوتبوونە ناحیە و قەزاکانەوە، یان لە گوندێکی لاچەپدا بوو و منداڵی گوندەکانی دیکە زۆر بە زەحمەت دەیان توانی هاتوچۆ بکەن. ئەمە بە تایبەتی لە گوندەکانی کوردستاندا هەستی پێ دەکرا، بەهۆی باری جوگرافی کوردستان، کە شاخاوی هەڵکەوتوەو لە زستاندا بەفری زۆر کێشەکەی قورستر دەکرد. د. شاکر خەسباك دەڵێ: ((گیروگرفتێکی تر هەیە، کە تایبەتە بە ناوچە کوردییەکەوە ئەویش گیروگرفتی زمانی خوێندنە. زمانی کوردی لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا ئەخوێنرێ، بەڵام زمانی عەرەبی لە قوتابخانە ئامادەییەکاندا بەکار ئەهێنرێ بۆ وانە وتنەوە. بێگومان ئەم گۆڕینە لە کوردیەوە بۆ عەرەبی زۆر گرانە بۆ کوردەکان. وە کوردەکان لە مافی خۆیان، کە بە زمانی نەتەوایەتی خۆیان بخوێنن))[٩٣] بنیاتی دووەمی ڕۆشنبیری ڕۆژنامە و گۆڤارەکانە. هەر لە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییەوە (کوردستان ١٨٩٨-١٩٠٢)، پاشان ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی دی، بە تایبەتی لە باشووری کوردستاندا لە بیستەکانەوە هەمیشە پێشەنگ بوون لە خزمەتکردنی خەڵکی کوردستان بە هاندانیان بۆ خوێندەواری و وریا بوونەوەیان لە دەردە کۆمەڵایەتییەکان و هەژاری و نەخۆشی و ئاگاداری هەواڵی سیاسەت و ئەدەب. ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە ڕۆڵێکی بەرچاویان بینییوە لە ڕەخنە گرتن لە دامودەزگا حکومییەکان، لەپاڵ ئەوەشدا وشەی کوردیی ڕەسەن و زمان و کەلتووری ئەو میللەتەیان پاراستووە. بۆیە ئەمڕۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ میللەتی کورد و لێکۆڵینەوە لە مێژووی هاوچەرخی کوردیی تۆمارێکی زیندوون. بۆ نموونە لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی بێ لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان کارێکی نەشیاوە، (بۆیە ناکرێ بە وردی و کارامەیی لە جووڵانەوەی ئەدەبی هاوچەرخ و نوێمان بگەین، ئەگەر بە وردی لە ڕەوتی جووڵانەوەی ڕۆژنامەوانیمان نەگەین..)[٩٤]. گۆڤارەکانی بەرایی وەکو (زاری کرمانجی) و (هاوار) و (ڕووناکی) و (گەلاوێژ) و (روناهی) و (هیوا) و (شەفەق) و

---

[93] د. شاکر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، ص٦٣-٦٥، شایانی باسە ساڵانی ١٩٦١-١٩٦٢، ژمارەی قوتابخانەکان گەیشتە (٢٣٦) قوتابخانە لە هەولێر و (٢٢٩) قوتابخانە لە کەرکوك و (٤٧١) قوتابخانە لە موسڵ، بروانە: محمود الدرة، القضية الكردية، ص٢٣٨.

[94] محمود زامدار، دەوری ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ژیانی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی گەلی کورددا، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ١١٣، ل٢٣٢

ڕۆژنامەکانی وەکو (تێگەیشتنی ڕاستی) و (ئومێدی ئیستیقلال) و (ژین) بوونە هۆی پێشخستنی پەخشانی کوردی و دەرکەوتنی چەندین ژانری ئەدەبیی تازە. ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە لەلایەن ئنگلیزەکانیشەوە بۆ مەبەستی سیاسەتی خۆیان و پڕوپاگەندە و بانگەشەی سیاسییەوە دەردەچوون، لە خزمەتکردنی ڕۆشنبیریی کوردیدا بوون و دەوری وشیار کردنەوە و پاك کردنەوەی زمانی کوردییان دەبینی لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)دا چیرۆکنووسانی وەکو (دڵسۆز، حسین حوزنی موکریانی، ئیحسان مستەفا..) دەرکەوتن و هونەری وەرگێڕان بۆ کوردی زیاتر گەشەی کرد، لەڕێگەی (گەلاوێژ) و (هیوا) و (شەفەق)ەوە ژمارەیەکی زۆر پەندی پێشینان و گاڵتەوگوپ و مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی بڵاو کرایەوە و شیعری شاعیرانی کۆن و نوێ و ڕەخنەی ئەدەبی و نامەی ئەدەبی و ژیاننامەی کەڵە نووسەران بڵاو کرایەوە. ئەمە لەپاڵ ئەو باسانەی، کە پەیوەندییان بە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵ و نەتەوە و دیموکراسی و بیری پێشکەوتنخوازی سۆسیالیستییەوە هەیە...

ڕۆژنامەوانیی کوردی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیووە،[95] لە هەموو قۆناغەکاندا دەربڕی خواستی گەل بووە و سەرچاوەی ڕووناکبیری بووە، هەر بۆیەش گەورە پیاوان ئەوەندە گرنگییان بە ڕۆژنامە داوە و لەدەمی ڕۆژنامەنووسان ترساون،[96] ئەگە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، (دەسەڵاتی چوارەم)[97] بێت، ئەوا لەنێو کوردیشدا کەم بایەخ نەبووە، هەتاوەکو ئەمڕۆش جێگەی مەترسی دەسەڵاتدارانە و ژمارەیەك ڕۆژنامەوانیشمان هەڵوێستی مەردانەیان نواندووە،

---

[95] بۆ دابەش کردنی قۆناغەکانی ڕۆژنامە نووسیی کوردی بڕوانە: عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧٠؛ د. عزالدین مصطفی رسول، حول الصحافة الكردية، ص٥٨؛ د. شوکریە ڕەسوڵ، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، ل١٩٧.

[96] ناپلیۆن وتویەتی: ((سێ ڕۆژنامە لە سەد هەزار سەرباز زیاتر دەمترسێنن)) بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، ل١٨.

[97] دەسەڵاتی چوارەم (السلطة الرابعة) یان دەسەڵاتی ڕای گشتی (سلطة الرأي العام)یشیان پێ وتوە، کە یەکسەر لەدوای دەسەڵاتی (تشريعي وتنفيذي وقضائي) دێت، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٨٢٨ ئەم زاراوەیە بۆ ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنووسی بەکار هێنرا. بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، ل١٩؛ عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ل٥.

ڕۆژنامەوانیی کوردی هەر چۆنێك بەسەر قۆناغەکاندا دابەش بکرێت، نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە سەرکەوتنی شۆڕی ١٤ی تەمووز هێزو گۆڕێکی تازەی بە ڕۆژنامەوانیی کوردی بەخشی و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە ساڵەکانی سەرەتای شۆڕشدا بە سەربەستیەکی زیاتر و زەمینەیەکی ئازاد تر لە کێشە و گرفتەکانی ڕۆشنبیریی کوردی بدوێن و لە هەمان کاتدا نووسەران و ئەدیبانیش ئەوەی لە دڵیان پەنگی خواردبۆوە و مەینەتییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی بەشێوەیەکی ئەدەبیی بەرز بخەنە شیعر و وتار و چیرۆك و ژانرەکانی تری ئەدەبی، ئەمە بێجگە لەوەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هەموو بوارەکانی دی بەگشتی گۆڕانی بەسەردا هات، با ئەو گۆڕانانە لەچاو باری ناهەمواریی کۆمەڵگای عیراق کەمیش بێت، بەڵام لەڕووی ڕۆژنامەوانییەوە ژمارەی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان زیاد بوو، بەمەش بواری زیاتر بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری ڕەخسا.[٩٨]

## گۆڤاری هیواو شیعری کوردی

### ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لەشیعری کوردی

ئەگەر چاوێك بەمێژووی ئەدەبی کوردیدا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەدەبی کوردییش سەرەتا بەشیعر دەستی پێ کردووە، یان ڕاستتر بڵێین، ئەو دەقە ئەدەبییانەی لەبەر دەستدان، لەکۆنەوە بەشیعر دەست پێ دەکەن و مێژووی پەخشانی نووسراو لەگەڵ چاپەمەنی و ڕۆژنامەو گۆڤارەوە بە شێوەیەکی سەرەکی دەست پێدەکات.

ئەمەش گەلێ هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، ڕەنگە لەهەموویان دیارتر ئەوەبێ، کە ژیانی مرۆڤ لەسەدەکانی ڕابردودا ئەوەندە ئاڵۆز نەبووبێ و لەتوانای شیعردا بووە بابەتە سادەکانی ئەو قۆناغە دەرببڕێت، ئەمە لەپاڵ ئەوەی شیعر بەچەند بەیتێکی سەروادار و مۆسیقی، کە

---

[98] دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار ڕێگەی بڵاو کردنەوەیان دا، لەوانە: (ڕۆژنامەی گەل– ١٩٥٩)، (ڕۆژنامەی ئازادی ١٩٥٩)، (ڕۆژنامەی خەبات ١٩٥٩)، (ڕۆژنامەی برِوا ١٩٥٩)، (ڕۆژنامەی دەنگی گێتی ١٩٦٠)، (گۆڤاری ڕزگاری ١٩٥٩)، (گۆڤاری بلێسە ١٩٥٩)، (گۆڤاری نەورۆز ١٩٥٩)، (گۆڤاری ڕۆژی نوێ ١٩٦٠)، (گۆڤاری ڕوناهی ١٩٦١) و گەلێکی تر، بڕوانە: جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٦٧–١٠٧.

لەبۆ زیاتر ئەزبەرکردن ئاسانە، توانیویانە بیپارێزن، بە پێچەوانەی پەخشان، کە پێویستی بە کاغەزو ڕووپەڕی ڕۆژنامەکانەو لەڕووی قەبارەوە درێژترەو بابەتەکانی فراوانترە و کەمتر لا لەسۆزو مۆسیقاو خەیاڵ و ئەندێشە دەکاتەوەو لەسەر بناغەیەکی ژیری و مەنتیق و بیرو هزرەوە دەڕوات، ئەمەش وەنەبێ تەنیا لەئەدەبی کوردیدا ئەم دیاردەیە هەبێت، لە مێژووی ئەدەبیاتی میللەتانی دراوسێشدا بەرچاو دەکەوێت. کۆنترین دەقی شیعری بەجێماومان چوارینەکانی (بابا تایەری هەمەدانی)یە، کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی دا ژیاوە.[99] زانیارییەکی زۆرمان دەربارەی ژیانی ئەو شاعیرەمان لەبەر دەستدا نییەو ساڵی لەدایك بوون و مردنیشی تەواو ئاشکرانییە. ئەمە سەرباری ئەوەی بیروڕای وەهایش هەیە، کە باباتەیەر بە شاعرێکی کورد نازانن و هەر لوڕەکان بەکورد لە قەڵەم نادەن،[100] شیعرەکانی باباتایەر بەدیالێکتی لوڕییە و سەرجەم شیعرەکانی لەبابەت تەسەوفەوەیەو غەزەلیشی هەیە، فەلسەفەی ئەو تێڕوانینی ئەون بۆ بوون و ژیان و وەك خواناسێکی گەورە ناوبانگی بەزۆر لادا بلاوبۆتەوە، فارسەکان دەسکاری زۆری چوارینەکان یان دوو بەیتییەکانی ئەویان کردووە، بەلاَم مۆرکە کوردییەکەی خۆی پاڕاستووە.

---

[99] بڕوانە: حنا الفاخوري، تأريخ الادب العربي، الطبعة السادسة، بيروت، ١٩٤٢، ص٤٢.
سەرەتای پەخشانی فارسیش لەنیوەی یەکەمی چوارەمی کۆچییەوە دەست پێدەکات، بڕوانە: دکتر خطیب رهبر، گزینه نپر فارسی، بخش سوم، چاپ پنجم، انتشارات صفی علیشاه، تهران، ١٣٥٥، ص٥٩٥؛ وحید دستگردی، دیوان بابا طاهر عریان، چاپ دوم، مؤسسه مطبوعاتی امیر کبیر، تهران، ١٣٣٣، مقدمه.
دەربارەی ساڵی لەدایك بوون و مردنی باباتایەر.

[100] ڕای جیاواز زۆرە بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمدامین زەکی، بابا تاهیر، گ گەلاوێژ، ژ٧، س١، حوزەیرانی ١٩٤٠،ل٥-٩؛ شێخ محەمەدی خاڵ، باباتاهیری هەمەدانی مەشهور بەعوریان، گ. کۆڕی زانیاری کورد، ب٥، ل٣-٣١ عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، ل١٧٠؛ د. محمد نوری عارف، باباتاهیری هەمەدانی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ١٠٨، ل١٠٩-١٢٩.
د. محمد نوری سەبارەت بە کۆنترین دەقی شیعری کوردی ڕایەکی دیکەی هەیەو دەڵێ: «مەلا پەرێشان کۆنترین بەرهەمی نووسراوی ئەدەبی کوردییە، کە تا ئەمڕۆ پێمان گەیشتبێ.» بڕوانە: تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبێ کوردی، گ. کۆلیجی ئەدەبیات: زانستگەی بەغدا، ژ١٨، ل٧٢. - بۆ وێنە بڕوانە: د. کمال فوئاد، گ. نووسەری کورد، ژ١٢.

بەرلەوەی باسی شیعر بکەین دەبێ ئاماژە بۆ خالێکی گرنگ بکەین، ئەویش ئەوەیە، بەهۆی ئەوەی کورد قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی نەبووە، کە بتوانێ زمانی یەکگرتووی نووسین و ئەدەبیاتی هەبێ، بۆیە ئەدەبی نووسراو (بەتایبەتی شیعر)ی کۆنمان بەپێی حوکم و دەستەلاتی میرنشینەکان، کە ئەو سەردەمە دیالێکتی ئەو ناوچەیە بالادەست بووە، زمانی شیعر، بەو دیالێکتە بووە ئەمەش وای کردووە، شیعری کۆنمان بەدیالێکتی لوڕی و گۆرانی و کرمانجی سەروو و خواروو بێت، هەریەکەیان لەو دیالێکتانە سەردەمێك بوونەتە زمانی شیعر و شاعیران شیعریان پێ نووسیوە.

عەلی حەریری و فەقێ تەیران و ئەحمەدی باتەیی.. لەناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا دەرکەوتن و شیعرەکانیان نموونەی گیانی خواپەرستی و غەزەلن. سەبارەت بە ژیان و بەرهەمی ئەو شاعیرانەش زانیارییەکی تەواو لەبەردەست دانییە، (عەلی حەریری) ناسراو بووە، هاوچەرخی شاعیری گەورەی فارس (فیردەوسی) بووە، بۆیە لە شاهنامەکەیدا ناوی بردووە:

مردی دیدەام در جزیر          شیر دیدەام در حریر[١٠١]

فەقێ تەیران، یەکێکە لە شاعیرەکانی ترمان، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول دەڵێ: ((دەتوانین تەواو لەو ڕایەوە نزیك بینەوە فەقێی تەیران لەکۆتایی سەدەی شانزەهەم و سەرەتای حەڤدەهەمی میلاد دا ژیاوە))[١٠٢]، شیعرەکانی بە نازناوی (میم و حێ) یان (میم و هێ) نووسیوە، شاعیر ((لەچیرۆکی شێخی سەنعان دا بەشارەزایەکی ڕێبازەکانی فەلسەفەی ئیسلام خۆی دەنوێنێت، بەڵام شێوەی زۆربەی ئەم هۆنراوانەی سادەیەو لەو ڕیزەیە کە بەهۆنراوەی میللی ناودەبرێت.))[١٠٣]

ئینجا مەلای جەزیری وەك شاعیرێکی بەتوانا ((ریزی پێشەوەی لە ئەدەبی کوردیدا بۆ خۆی گرتووە.))[١٠٤] شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەد ناسراو بە مەلای جەزیری لە کۆتایی سەدەی دەهەمی هیجریدا ژیاوە، واتە لەپاش ساڵی (٩٥٠هـ) عەرەبی.[١٠٥]

---

101 ڕێکێش ئامێدی، توری کوردیێ کەڤن و ئاڤرییەك، گ. نووسەری کورد، ژ٤، خوولی سێهەم، ل١٧.

102 د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، شیعری کوردی، ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەشی یەکەم، ل١٨.

103 کۆمەڵێ نووسەر، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، چ٨، ل٨٣.

104 کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، چ٢، بەغدا، ١٩٨٠، ل٢٥٧.

مەلای جەزیری لەژێر کاریگەری شیعری فارسی بە تایبەتی (حافزی شیرازی)دا بووەو شیعرەکانی نموونەیێکی بەرزی شیعری غەزەل و خواپەرستین.

(ئەحمەدی خانی) وەك شاعیرێکی نەتەوەیی توانی گیانێکی تازە بەناوەڕۆکی شیعری کوردی ببەخشێ و داستانی (مەم و زین) بەهۆنراوە بنووسێتەوەو تێکەڵ بەرازی دڵی خۆی بکات، کە بوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و هاندانی شاعیرانە بۆ ئەوەی بە زمانی شیرینی کوردی بنووسن، بۆیە دەڵێ:

شەرحا غەمێ دل بکم فەسانە

زین و مەمێ بکم بەهانە[106]

خانی وەك خۆی نووسیویە لە (١٠٦١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٦٥٠)ی زاینی لەدایك بووە:

لەورا کو دەما ژ غەیبێ فەك بوو

تەئریخ هەزارو شەست و یەك بوو[107]

لەو شاعیرانەیشی کە بە دیالێکتی گۆرانی شیعرییان نووسیوە، مەلا پەرێشان و خانای قوبادی و مەولەوی و بێسارانی و سەیدی هەورامی. لە شاعیرە دیارەکانن.

مەلا پەرێشان، کۆنترین شاعیری کوردە، کە بەشێوەی گۆرانی شیعری ئایینی نووسیووەو ئەم شاعیرە ناوی محەمەدەو خەڵکی دینەوەرە لە ناوچەی کرمانشاە، وەك خۆی نووسیویە: لە ساڵی ٨٠١ ی کۆچی ١٣٩٨-١٣٩٩ی زایینیدا ژیاوە. ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی ئایینییەو لەسەر مەزهەبی شیعە بووە.[108]

(خانای قوبادی)یش ئەو شاعیرەیە، کە بە سەرکەوتوویی (خوسرەو و شیرین)ەکەی شاعیری گەورەی فارس (نظامی گەنجەویی)[109] وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، دەربارەی

---

105 دکتۆر محمد نوری عارف، تێکستی ئەدەبی کوردی، بەشی دووەم، ل١٦٥.

106 ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئامادەکردن و پەراوێز نووسینی هەژار، ل٣٠.

107 زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، چ٨، ل٨٠.

108 بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، ل١٠٨.

109 شاعیرێکی ناسراوی فارسییە، لەساڵانی ٥٣٤–٥٤٠ ك لەدایك بووەو لەساڵانی ٥٩٩–٦٠٢ مردووە، لەشاری (گەنجە) لەدایك بووەو دایکی ناوی (رئیسە) بووەو کورد بووە، بەرهەمەکانی: مخزن الاسرار،

بایەخی ئەم کارە ئەدەبییە. محمدی مەلا کەریم دەڵێ: ((ئەگەر بەچاوی هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبییەوە ئەم بابەتانە بخوێنینەوە بۆمان دەرئەکەوێ خانا چۆن هونەرمەندی بووەو کارەکەی لەجیهانی ئەدەبدا چ شاکارێکەو مایەی چۆن شانازێکە بۆ ئەدەبی کورد.))[110] هەروەها دەڵێ ((هەر لەو بابەتانەی ئەتوانین وەك کەرەستەیەکی فۆلکلۆری کەڵکێکی باشیان لێ وەرگرین و خانا لەم کتێبەدا جێی کردونەتەوە.)).[111]

(مەولەوی) لە شاعیرە زۆر ناسراوەکانی دیالێکتی گۆرانە، مەولەوی (سەید عەبدولڕەحیم نازناوی (مەعدومی)یە، ساڵی ١٢٢١ی کۆچی لە ناوچەی تاوەگۆزی لە گوندی (سەرشاتە) لەدایك بووەو لە ١٣٠٠ کۆچیدا مردووە.[112] زۆربەی شیعرەکانی بۆ شێخەکانی نەقشبەندی نووسیوەو خۆی بە موریدی ئەوان زانیوە، بێجگە لەوەش هەندێ شیعری بەپێزی لەسەر سروشتی کوردستان نووسیوەو هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان لەوەدا یەك دەگرنەوە، کەسیما دیارەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا لە (مەولەوی)یەوە دەست پێدەکات لە ڕووی ڕوخسارەوە، کێشی شیعرەکانیشی لەسەر کێشی پەنجەیە، یان کێشی خۆماڵییە.

ئەمەش وەنەبێ هەر لەشیعری مەولەوی بەڵکو لە شاعیرانی دیالێکتی گۆرانیدا هەستی پێدەکرێ، کە ڕەنگە یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی ئەوەبێت، کە ناوچە جوگرافییەکەی وای کردووە لە کاریگەری عەرەب و ئایینی ئیسلام بەدووربوونە و زیاتر ئەو کێشانە لە (سرودەکانی گاتاکان)ی ئاڤێستای زەردەشتدا وەرگرتبێت، هەروەها کێشی خۆماڵی (١٠) دە کەرتی کێشی هۆنراوەی فۆلکلۆرییە، مەولەوی بەکاری هێناوە.

د. مارف خەزنەدار دەڵێ: ((شیعری کوردی شێوەی گۆرانی شیعرێکی ڕەسەن و بەئەسڵ و بنیادە لەڕووی ڕووخسارەوە، بەتایبەتی کێشی خۆماڵی (سیلابی)و قافیەی مەسنەوییە. زۆربەی هەرە زۆری کێشی شیعری شێوی گۆرانی کێشی دە کەرتی یە.))[113]

---

خسرو شیرین، لیلی و مجنون، هفت پیکر، اسکندرنامه، بروانه: کلیات خمسه حکیم (نظامي گنجه‌ای)، انتشارات امیر کبیر، تهران، تیرماه، ١٣٤٤، ص١.

[110] محمدی مەلا کەریم، شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی، بەغدا، ١٩٧٥، ل٢٣.

[111] سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

[112] مەلا عبدالکریمی مدرس، دیوانی مەولەوی، ل(٨-١٠).

[113] د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، ل٩٢.

شیعری کلاسیکیی کوردیش بەشێوەی کرمانجی خواروو، لەسەردەمی میرنشینی بابـان و لەسـەر دەسـتی (نـالی)و (سـالم) و (کـوردی) شـیعرییان گەیانـدە ئاسـتێکی بـەرزی هونـەری وردەکاریو ڕەوانپێژی. لە کات و سەردەمێکدا ئـەوان شـیعری یـان بـەو شـێوازە نووسـی، کـە نووسینی کوردی بە زمانی کوردی نەدەنووسراو زیاتر زمـانی فارسـی زاڵ بـوو، شـاعیرەکانیش هەوڵیان دەدا بەزمانی فارسی بنووسن بۆ ئەوەی ناوبانگ و شۆرەت پەیدابکەن و زمانی کوردی ڕەواجی نەبوو و خوێندەواری نـەبوو، بۆیـە (نـالی) غـەمی گـەورەی ئـەوە بـووە خەڵکەکـە لـە شیعرەکانی تێنەگەیشتوون و ڕێزی زمانی کوردی ناگرن، دەڵێ:

عومرێکە بەمیزانی ئەدەب توحفـە فـرۆشـم

زۆرم گوت و کەس تێ نەگەیی ئێستە خەمۆشم [114]

نالی ((خدری کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی میکایەلییە)، لە دێی (خاك و خۆڵ) لـە ١٨٠٠ز لەدایك بووە و لە (١٨٧٣)ز لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە.)) [115] نالی پێجگە لە زمـانی کوردی، زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی باش زانیوەو شیعری پێ نووسیوەو خۆی دەڵێ:

فارس و کـــورد و عەرەب هەرسـێم بەدەفتەر گرتووە

(نالی) ئەمڕۆ حاکـمـی سـێ مولکە دیـوانی هەیە [116]

شـیعر لای (نـالی) سـەلیقەو وردەکـاریو سـەنعەت بـووە، شـیعرەکانی لەسـەر کێشی عەرووزی عـەرەبییـە و هونـەرەکانی غـەزەل و قەسـیدەو موسـتەزاد لـەناو شـیعرەکانیدا بـەدی دەکرێ. زمانی شیعرەکانی زمانێکی تێکەڵ لە زاراوەی فارسـی و عـەرەبییـە، هاوکـات لەگـەڵ (نالی)دا، سالم (عەبدولڕەحمان بەگی ساحێبقران) وەك شاعیرێکی نیشتمانپەروەری بـەتوانا لـەو سـەردەمەدا ژیـاوەو شـیعرەکانی ئاوێنەیـەکی بێگـەردی سـەردەمی میرنـشینی بابـان و ڕووخاندنیەتی و هەستی نەتەوەیی لە شـیعرەکانیدا ئاشـکرایە، تێگەیـشتنی شـیعرەکانی سـالم ئاسان نین، لە شیعرەکانیدا سەبکی هیندی پێڕەو کردووەو زۆر شوێن گەڕاوەو لە زمانی فارسی

---

114 د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل٧٧.

115 د. عبدالله حداد، (نالی) هەندێ زانیاری تازە، گ. کاروان، ژ٨٠، ل٣١.

116 د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل١١٥.

و زاراوەی ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژهەلاتدا شارەزابووە، سالم لە سالی(١٨٠٠ز)دا لە سلێمانی لەدایك بووەو هەر لەوێش لە سالی(١٨٦٦ز)دا مردووە.[117]

حاجی قادری کۆیی، شاعیرێکی نیشتمانپەروەری کوردە، لە سالی(١٨١٧ ز)دا لەگوندی (گۆڕقەرەج) لەدایك بووە.[118] سەرەتا لە کۆیەو پاشان لە ئەستەمبوڵ لای خێزانی بەدرخانییەکان گیرساوەتەوەو شیعرەکانی نەتەوەییەکانی بەهەموو لایەکی کوردستاندا بلاوبۆتەوە. لە غەزەل و وەسفی سروشتیدا دەستێکی بالای هەیە. لەشیعرەکانیدا هانی میللەتی کوردیداوە بۆ عیلم و خوێندەواری و بەتاقە ڕێگەی نەجات بوونی داناوە.

شێخ ڕەزای تالەبانی سالی ١٨٣٥ز لە گوندی (قرخ)ی سەر بە کەرکوك لە دایکبووەو بەهۆی شیعرە هەجووەکانییەوە زۆر ناسراوەو شاعیری تری لەو بابەتە و بەو توانایەمان نییە و کەلێنێکی گەورە لەم مەبەستەی شیعری پڕکردۆتەوە. شاعیری شیعرە فارسی و تورکییەکانیشی لەئاستێکی هونەری بەرزدان و نیشانەی دەستەلاتی ئەون لەزانینی ئەو دوو زمانەدا. دووجار سەردانی ئەستەمبوولی کردووەو زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، دواجار لە (١٩١٠ ز)دا کۆچی دوایی کردووە.[119]

شاعیرانی وەك حەمدی و بێخودو کەمالی و ویصالی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیەش لاسایی ئەو شاعیرانەی سەرەتایان دەکردەوە. دەتوانین خاسیەتی شیعریی شاعیرانی کۆن لەم خالانەدا کۆبکەینەوە: هەموویان، بێجگە لەو شاعیرانەی بە دیالێکتی گۆرانی شیعریان نووسیوە) هونەرەکانی شیعری عەرەبی و فارسییان بەکار هێناوە، لە کیشی عەروزی عەرەبی و هونەرەکانی شیعریی وەك موستەزادو مولەممەع و پێنج خشتەکی

[117] حەمەسەعید حەمە کەریم، دیداری شیعری کلاسیکی کوردی، ل٢٢. لێرەدا حەسیب قەرەداغی (١٨٦٨)ی داناوە، هەروەها ڕەفیق حیلمی دەلێ: ١٢٢٠هـ لەدایك بووەو لە ١٢٨٦هـ مردووە، بڕوانە: ڕەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، ل٥٤.

[118] سەردار میران و کەریم شارەزا دەلێن: (١٨١٥–١٨١٦ز) بووەو لە ١٨٩٧ز، مردووە، بڕوانە، سەردار حمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، بەغدا ١٩٨٦، ل١٠–١٧.

[119] دکتۆر محمد نوری عارف، تێکستی ئەدەبی کوردی، لا١٢٥، سەبارەت بە ژیان و مردنی شێخ ڕەزا، عەلی تالەبانی دەلێ: لە ١٢٥٣ ك لەدایك بووەو لە ١٣٢٧ ك مردووە، بڕوانە: علی تالەبانی، دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی، بەغدا، ل٣–٥.

و چوارین و تیٚ هەلکیٚش و تەرجیع بەند. هەرەها لە هەلٚبژاردنی مەبەستەکانی شیعردا، وەسف و ستایش و پیاهەلدان و داشۆرین و غەزەل و نیشتمانپەروەری و کۆمەلاٚیەتی و ئایینی پیٚرەوی شیعری میللەتانی ڕۆژهەلاٚتیان کردووەو لە هەلٚبژاردنی دەستەواژەو زاراوەی ئەدەبی کلاسیکی میللەتانی ڕۆژهەلاٚت دریٚغیان نەکردووە، ویٚرای پیٚرەوی شیٚوازەکانی (خوراسانی، عیراقی، هیندی).[120] ((باسیٚکی دیار لە شیعری کلاسیکی کوردیدا - کە ڕەنگە تا ڕادەیەك لەزۆر بەرهەمی تری ڕۆژهەلاٚتی جیابکاتەوە،ئەوە باسی ولاٚت و نیشتمانپەروەرییە، کە زۆر زوو لە شیعری کوردیدا سەری هەلداوە)).[121]

## تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا

دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، سەرەتاو خالیٚ وەرچەرخان بەرەو قۆناغیٚکی نویٚ لە شیعری کوردیدا دەستی پیٚکرد، ئەمەش لەریٚگەی کاریگەری خویٚندنەوەی ئەدەبیاتی تازەی تورکەوە، کە ئەوانیش لەو ڕۆژگارەدا بەهۆی کاریگەری ریٚبازە ئەدەبییەکانی ڕۆژئاوا لەهەولیٚ نویٚ بوونەوەو تازەکردنەوەدا بوون. بارودۆخی سیاسی و کۆمەلاٚیەتی و ڕۆشنبیریی کوردستانیش کەوتبووە قۆناغیٚکی نویٚوەو تەنانەت د. عیزەدین مستەفا ڕەسوولٚ دەلیٚ: (تازەکردنەوەی شیعری کوردی دەبەستین بەبزوتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەیی کوردەوە..)[122] پاشان دەلیٚ: ((یەکەم گۆڕینی کیٚش و قافیەی شیعری کوردی، بەرەو شتیٚکی تازەی سەر بەجیهانی شیعری جیهانی لەسروودی کوردی دا بوو.))[123]

لیٚرەدا (د.عیزەدین خۆی لەدەوری شیٚخ نوری شیٚخ سالٚح دەدزیٚتەوەو دەچیٚتە سەر (زیٚوەر)، کە ئەو سروودانەی لەسەر ئاوازی سروودو گۆرانی تورکی هۆنیوەتەوە، بەمەش سالیٚ تازەکردنەوەی شیعری کوردی بۆ ناوەڕاستی بیستەکان دەگەڕیٚنیٚتەوەو لەپایەو ڕۆلیٚ

---

120 ئەم شیٚوازانە تایبەتن بە شیعر (سبك)یان پیٚ دەوتریٚ، ئەگینا لە پەخشانیشدا شیٚوازی تر هەیە، بڕوانە: محمد تقی بهار (ملك الشعرا)، سبك شناسی یا تأریخ تطور نثر فارسی، جلد ٢ چاپ سوم، تهران، اذرماه ١٣٤٩.

121 د. عیزەددین مستەفا ڕەسوولٚ، شیعری تازەی کوردی، گ. ڕۆشنبیری نویٚ، ژ ١٠٥، ل١٩٤.

122 د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، شیعری تازەی کوردی، گ. ڕۆشنبیری نویٚ، ژ: ١٠٥، ل١٩٥.

123 سەرچاوەی پیٚشوو، ل١٩٥.

ئەزموونەکانی شێخ نووری کەم دەکاتەوە، کە وەك ڕەفیق حیلمی دەڵێ: «تا ماوەیێك زەعیمی ئەو ئینقلابە بووە.»[124] ئەگەر بەوردی بۆ سەرەتای ئەو تازەکردنەوەیە بچین، ئەوا (پیرەمێرد) و (عبدالرحمن بەگی نفووس) و(شێخ نووری شێخ سالح) و (گۆران)و (ڕەشید نەجیب) و (عبدالواحد نوری) بەرابەرانی ئەو بزووتنەوەیە دەژمێردرێن و هەمووشیان بەئاشکرا کاریگەری ئەدەبی تورکییان بەسەرەوەبوو.

(گۆران) دەڵێ: «نووسەرو شاعیرانی ئەوسا، بەتایبەتی شێخ نووری و ڕەشید نجیب و من، کە پێکەوە بە ئەدەبی تورکی متأسر بووین و پێکەوە ئەمواننووسی، بەلاّم تەنها شێخ نوری شعرەکانی بلاّوئەکردەوەو من بلاّوی نەئەکردەوەو ئەو لەم بارەیەوە نشاتی دەرئەکەوت و ئەدەبی تورکی قوتابخانەی شعری تازەی تیا پەیدا ببوو، کە پێیان ئەوترا (ادبای فجری ئاتی) لەوان (توفیق فیکرەت) و (جلال ساهر) بوون. وە ئەدیبێکی تری تورك کە (عبدالحق حامد)ە ئەگەرچی لەم کۆمەڵە نەبوو، بەمّ دیسان هەر پێی متأسر بووین، هەموومان بەیەکەوە ئەمان ڕوانییە یەك کلاّورۆژنە، بەلاّم ئەتوانرێ بە شێخ نوری بووترێ سەرۆك بەهۆی:

١- زۆری بەرهەمی،

٢- بلاّوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی.»

سەبارەت بە سیماکانی ئەو تازەکردنەوەیەش دەڵێ: «تازەکردنەوەکە چی بوو؟

١- یەکیەت بابەت (وەحدەی موچوع)یان هێنایە کایەوە.

٢- تەرتیبی قافیەکان گۆڕران.

٣- ئەگەر شعر هەر لەسەر عەرووزی عەرەب هۆنراوەتەوە لەم سەردەمەدا، بەلاّم مجزوئەکانی بحری عەروزیان وەرئەگرت.

لێرەدا لەئاست خاڵێکی گرنگ دەوەستین، ئەویش ئەوەیە بەپێی قسەکانی مامۆستا (گۆران) خۆیشی لەرووی مێژووییەوە بێگومان (شێخ نوری شێخ سالح) ڕچەشکێنی شیعری کۆن بوو یان وەك (کامەران موکری) شاعیر واتەنی (مامۆستا ماوەی گوێزانەوەیە (فترە الانتقال) لە هۆنراوەی کوردیدا.»

---

[124] ڕەفیق حیلمی، ئینقیلاب لەشیعری کوردیدا، گ. پێشکەوتن، ژ١، س١، ١٩٥٨

ئەم تازەکردنەوەیەش هەروا بەخۆڕایی نەبوو، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لەو ڕۆژگارەدا، پێویستی بە ژیانێکی نوێ و سەربەستی و گۆڕان لـە چـەمکی شیعرییـشدا هـەبوو وەك بەشـداری کردنێـك لـەو پرۆسـەیەدا، ئـەوەش دیـارە سـەرەتاکەی لـەلای کەسـانی خـاوەن ڕۆشـنبیرییەکی بـەرز دێتەکایـەوە،[125] شـێخ نـوری تـوانی یـاخی بـوونی خـۆی ڕابگەیـەنێ و بەرهەمەکانی بەقەناعەتەوە بوێرێ بلاوبکاتەوە. ((ئەگەر خوێنەر بە وردی شـوێن پێـی شـیعرو نووسینەکانی شێخ نـووری هـەلگرێ، ئـەوەی بـۆ ڕوون دەبێتەوە،کـە لەگـەلّ (نـوێ بوونەوەکـە) سەرپێی و ڕاگوزارانە نەبووە، بەلّکو بەدلّ و بەگیان و لە قوولایی ناخییەوە لە گەلّی هەلّتەکاوەو چووەتە ناو ئەزموونی تازەی شیعری کوردییەوە، یەکەم جار کە ویستی بەشیعری تازەی تەعبیر لە ژیان و ڕوانینی تازە بکات.))[126]

ئەم دەسـت نیـشانکردنە مێژووییـە بـۆ سـەرەتای تازەکردنـەوەی شـیعری کـوردی، ئـەوە ناگەیەنێ، کە کەسی تر بەشداری نەکردووە یان ڕادەی داهێنانی شاکاری شـیعری فـلان لـەفلان باشـترە، نـەخێر، هـەر شـاعیرەو بـەپێی بەرهەمـەکانی پایـەی خـۆی دەسـت نیـشان دەکـات و بەرهەمەکانی گەواهی بۆ ئاستی شیعری ئەو دەدەن، بەلاّم لە نووسینەوەی مێووی تازەکردنەوەی شیعری کوردیـشدا نـابێ ئـەو ڕاسـتییە پـشتگوێ بخرێت،کـە سـەرەتا کـێ دەسـتی پێکـردووەو ڕچەکەی شکاندووە، شێخ نووری هەستی بـەوە کـردووە، کـە دەبـێ ئـەدەبی کـوردی و شـیعری کوردییش خاسیەتی خۆی هەبێ و نابێ هەر چاوی لەلاسایی کردنەوەی عەرووزی عەرەبی بێت، بۆیە دەلّێ: ((مەعلوومی عالیتانە زبانێکیش کـە مەوجوودیـەتی خـۆی ئیـسپات بکـا لازمـە بەلّکو واجبە ئەدەبیاتی ببێ، لە نووسیندا ڕیعایەت بکرێ، چـونکە تـەرزی تـەکللوم و شـێوەی

---

[125] لەو کاتەدا نوری شێخ سالّح بەتەمەن لەگۆران گەورەتربوو، زیاتر قالّبووی نێو ڕۆشنبیری سەردەم بووە، ئەمە سەرباری ئەوەی بێجگە لە شیعر وەك ڕۆژنامەنووسێکیش چەندین وتار نووسیوە، لەوانە: ٢٥ ئەلّقە لەوتاری (ئەدەبیاتی کوردی) لەڕۆژنامەی (ژیان) سالّی ١٩٢٦–١٩٢٧، لەبارەی ئەم وتارانەوە دکتۆر کامل حسن البصیر، دەلّێ: ((بۆ یەکەم جار لەمێژووی ڕۆشنبیری وێژەیی کوردیدا ئەم نووسەرە کوردە دروشمی ڕێبازی زانستی لەکۆڕی لێکۆلّینەوەی ڕەخنەسازی و وێژەیی دا بە چەشنێکی تیۆریی پراکتیکی بەرز کردۆتەوە.)) بڕوانە: دکتۆر کامیل حسن عزیز البصیر، شێخ نوری شێخ سالّح لە کۆڕی لێکۆلّینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا، ل٨٤.

[126] ئازاد عبدالواحد، دیوانی شێخ نوری شێخ سالّح، ب١، بەشی یەکەم، ل١٥٧.

تەحریریەی هەموو قەوم و میللەتیٚ جیاوازە. ڕیعایەت کردنی ئەم نوقتەیەش بە وجودی عیلم و ئەدەبیاتەوە مومکینە کە ئەم جیهەتەش مەعەل ئەسەف مەفقوودە.))[127]

(گۆران) زیاتر لەناو هاوەڵەکانی دەرکەوت و بووە لوتکەیەکی بڵند لە پرسەی تازە کردنەوەی شیعری کوردیدا، کەئەمەش بێ گومان چەند هۆکارێك یارمەتیدەری بوون، وەك زانینی زمانانی تری غەیری کوردی (بەتایبەتی ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبی ئینگلیزیدا)و شارەزایی لە ئەدەبیاتی کۆن و تازەی ڕۆژهەلاّت و ئەزموونی شیعرییان و بەردەوام بوون لەگەشت و گوزارو باری ناگزووری خێزانی و لەسەرووی هەمووشیانەوە تێکەلاّو بوونی بەسیاسەتەوە لەبەر گرتنی ڕێبازی ڕیالییزم.

(گۆران) خۆی ئەمەی ڕوون کردۆتەوە: ((پاش ئەم ماوەیە کە سەرمەستی ئەدەبی تورکی وفارسی بووین، بەرە بەرە ئەدەبی تازەی عەرەب و ئەدەبی ئینگلیزی هاتنە کایەوەو بلاّو بوونەوە، وە هەروەها (تیار)ی سیاسی و کۆمەلاّیەتی کەوتە ناومانەوە وە من بەتەئسیری ئەم دوو ئەدەبە کەوتمە هەوای واقیعیەتەوە.))[128]

### گۆڤاری هیواو شیعری کوردی

یەکیٚ لە بابەتە سەرەکییەکانی هونەرەکانی ئەدەب، کە گۆڤاری هیوا گرنگییەکی زۆری پێدا وەو هەوڵی پێشخستنی داوە، (شیعرە). ئەو شیعرانەی، کە لە (دیوانی هیوا)دا یان بە جیا لەو گۆشەیەدا بلاّو کراونەتەوە، لە ڕووی شێوەکانی زمانی کوردییەوە دابەش دەبن بۆ کرمانجی خواروو و کرمانجی سەروو گۆرانی.. هەروەها لە ڕوانگەی ڕێبازە ئەدەبییەکانەوە کلاسییزم و ڕۆمانسییزم و ڕیالییزمی گرتۆتەوە.

شیعرە بلاّوکراوەکانی ناو گۆڤارەکە لە ڕووی مەبەست و ناوەڕۆکەوە، شیعری نیشتمانی و سیاسی و غەزەل و دلّداری و کۆمەلاّیەتی و شیوەن و وەسف و گالّتەو گەپ و موناسەباتن. گۆڤاری هیوا لەگەڵ بلاّوکردنەوەی ژمارەیەکی کەم لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی و هەوڵدان بۆبلاّوکردنەوەی نموونەی شیعری ڕۆمانسی بە پێز، گرنگی دانی سەرەکی بۆ شیعری ڕیالیزم

---

[127] نوری، ئەدبیاتی کوردی، ڕۆژنامەی ژیان، ژ٢٠، س١، (١٠)ی حوزەیرانی ١٩٢٦.

[128] عبدالرزاق بیمار، دانیشتنێك لەگەڵ –گۆران–دا، گ. بەیان، ژ٢، ل٣٠.

تەرخان کردووە، دیارە ئەمەش هەروا ڕێکەوت نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو ڕووداوە سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییانەی دوای جەنگی جیهانی دووەم و سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر دەروون و بیرکردنەوەو هوشیاری شاعیرو نووسەرانەوە هەبووە، بۆیە هەڵبژاردنی بابەتە سەرەکییەکانی ژیان و موعانات و ژانی چینی زەحمەتکێش بوونە تەوەری سەرەکی شیعرەکان بوونە ئاوێنەیەکی بێ گەردی خەباتی هەژاران و کۆڵنەدەران و شاعیری نوێ وەك شاعیرە کلاسیزمەکان وێڵی زەخرفەوە وردەکاری و عەرووز و وشەبازی نەبوو، بەشێوەیەك شیعرەکانی، کە هیچ مۆرکێکی نەتەوەیی کوردیی لە ڕووی مەبەست و ناوەرۆکەوە پێوە دیار نەبوو. لە ڕووی ڕووخساریشەوە لاساییەکی کت و متی شێوازو تەکنیکەکانی شیعری چینی دەرەبەگ و دیوەخان دابوو لەگەڵ خەمی چینی زەحمەتکێشی کورددا نەبوو، هەروەها شاعیری نوێ بەپێچەوانەوەی شاعیرە ڕۆمانسییزمەکانیش لەبۆتەی خەفەت و خەیاڵ و فانتازیدا نەدەتوایەوەو لە واقیع ڕابکات و ڕوو لەدەشت و دەر بکات و ئەو ژیانە بەشتێکی ناچیز بزانێت و ڕوو لە سروشت بکات، بەڵکو بڕوای بەریالیزم بووە، چونکە (ریالیزم مەستی خەباتی ڕەنجدەرانە لە ژیانی مرۆڤ دا، دژی هەموو جۆرە چەوساندنەوەیێکی نەتەوایەتی و چینایەتی)یە،[129] لەم دیو بۆچوونەوە گۆڤاری هیوا شیعری ریالیزمی زیاتر چەسپاندو بەرەو پێشەوەی برد.

گۆڤاری (هیوا)یش هەرەکو ئەزموونی پێش خۆی لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا، لە ساڵانی سەرەتای تەمەنیدا گۆشەیەکی کردبۆوە بە ناوی (دیوانی هیوا) و تیایدا زیاتر لە (٢٠٠) پارچە شیعری بڵاو کردۆتەوە.

### ا- شیعرەکانی گۆڤاری (هیوا) بەپێی مەبەست و ناوەرۆك:

شیعرەکانی ناو گۆڤاری هیوا بەپێی مەبەست وناوەرۆك بەم شێوەیە دابەش دەکەین:

#### شیعری سیاسی:

ئەو بابەتە سیاسییە سەرەکییانەی، کە لە شیعرەکاندا ڕەنگی داوەتەوە ئەمانەن: خەباتی نەتەوەیی کورد بۆ ڕزگاربوون، برایەتی کوردو عەرەب و پشتگیری لە شۆڕشی ١٤ی تەمووز،

129 عومەر مەعروف بەرزنجی، پشکۆو ریالیزم، گ. نووسەری کورد، ژ٦، بەغدا، مارت ونیسانی ١٩٧٣، ل٨٢.

خۆشەویستی خاك و نەتەوەو ئازادی. (عوسمان عوزێری) لە پارچە شیعرێکدا بیری نەتەوەیی خۆی دەردەبڕێ:

پێست و گۆشت و ئێسقانەکەم	خوێن و دەماری گیانەکەم
هۆش و بیرو گشت ئامانجم	لەگەڵ ماوەی ژیانەکەم
ناویان بەکوردی نراوە	یەك ئاواتیان تیا نێژراوە
ئەویش پەرستنی کوردە	بە بنچینەم سپێرراوە[١٣٠]

(بەختیار زیوەر)ی شاعیر ڕۆڵەکانی کورد بەرەو یەکیەتی و تەبایی هان دەدا بەوەی چاکی مەردایەتی لێ هەڵکەن و هیوایان بەژیانی ئازادی بەرز بێت:

میللەتێك هیوای بەرزی ژیان بێ
تینووی ئازادیو دیلی زەمان بێ
بەندی هەژاری زۆر لاگران بێ
هێزی مەردانەی کە هاتە گەرش
وەك -ئەتۆم- زەمین دێنێتە جۆش[١٣١]

جەمال شاربازێری، خۆشەویستی خاك وای لێ دەکات خەبات بکات تاوەك مژدەی هەڵهاتنی پرشنگی وڵات ڕووناك بکاتەوە:

ئەی کوردستان، ئەی مەڵبەندی، نەتەوەی کورد
ئەی ئەو دایکەی، بەخوێن منت پەروەردە کرد
ئەی ئەو خاکەی بەسەر تۆدا هەنگاو ئەنێم
لەناو تۆدا: ئەخۆم، ئەژیم، بەستە ئەڵێم[١٣٢]

قەدری جان دبێژی:

مزگین... مزگین... گەلی کوردان
ڕوژا کوردستانی هەلات...

---

130 عوسمان عوزێری، کوردم، گ. هیوا، ژ٩، س١، ل٨١.

131 گ هیوا، ژ١٠، س١، ل٤٨.

132 جەمال شاربازێری، بۆ کوردستان، گ. هیوا، ژ٦، ٧، س٢، ل٨٠.

بارزانی هاتە نشتمان

شێر هات وڵات... شێر هات وڵات

مزگێن ل وە، بارزانی هات[133]

شاعیری کورد خەمی ڕزگاری و خەباتی نەتەوەیی لەگەڵ خەباتی گەلی جەزائیر گرێداوە و خۆی بەهاوبەشی خەباتیان دەزانێ و هەردوولا خۆیان ڕووبەرووی ئیمپریالیزمی جیهانی دەدۆزنەوە، (ك. ج، غەمبار) دەڵێ:

وەك فرۆکە بکەوە گەڕ ئەی کۆتری جوانی نامەبەر

بفڕە، بڕە، جەرگی ئاسمان بەسەر زەریا، دەشت، بیابان

تاکو ئەگەیتە -جەزایر- وڵاتی ئاسن و ئاگر

تا دەگاتە: ئەوسا بڕۆ لای جەمیلە ئەوقارەمانەی کە دیلە[134]

سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز، ڕۆژگارێکی تازەی بۆ هەڵڕشتنی خەمی پەنگ خواردووی دەروونی شاعیر ڕەخساند. ساڵانی یەکەمی شۆڕش هەموو کەناڵەکانی ڕۆشنبیریی ئازاد کرد، حەسیب قەرەداخی دەڵێ:

ئەمرۆ جەژنە جەژنی شادی جەژنی ئازادی وڵات

جەژنی مایەی هەوڵ و کۆشش دەردو ئازار و خەبات

جەژنی میللەت کوردە عەرەب جەژنی پیرۆزو بەهات

جەژنی خۆشی و بەختیاری جەژنی سەربەستی و نەجات[135]

## شیعری غەزەل و دڵداری:

(نالی) لەغەزەلێکی تەڕو پاراودا، دنیاو قیامەت بە زولف و پیشانی یارەکەی دەگۆڕێتەوە، بێ زینەتی ماچی خۆشەویستەکەی ڕۆژوویشی بەتاڵە؛ (نالی) غەزەلەکانی ئەوەندە وردن، توانەوەیە لە عەشقا بۆیە دەڵێ:

---

133 قەدری جان، شیعری وڵات بارزانی هات، گ. هیوا، ژ٤، س٢، ل٧٦.

134 ك. ج. غەمبار، نامەیەك بۆ جەمیلە، گ هیوا، ژ٩، س١، ل٣٥.

135 حسیب قەرەداخی، بیرەوەری یەکەم ساڵی شۆڕشی ١٤ی تەمووز، گ. هیوا، ژ(١١،١٢)، س٢، ل٥٥.

دەورانیە وەك هێلەكی سەوداسەری گیژم
بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم
هەر پەرچەم و پیشانیە فکری شەوو ڕۆژم
هەر گەردن و زولفە ئەمەلی دوورو درێژم
بێ دیدەو دیاری ئەتۆ خوێنە گرینم
یەعنی گوڵ و نێرگس کە نەبێ لالە دەنێژم[136]

(پێناو)، زوخاوی دڵ بەدەست غەم و پەژارەی دڵداری لە تابلۆیەكی ڕەنگین دەنەخشێنێ و لێك دابڕانی خۆی و خۆشەویستەكەی دەبێتە یادگارێكی جوان و دووبارە هیوایەكی تازەی پێ دەبەخشێتەوە:

هەزار ئەفسووس بەهەشتی پاكی دڵداری كە جارێكە
كە دڵ ئاوارە بوو تیایا ژیان زنجیكی تاریكە
شەپۆلی ئەرك و ئازارە شەپۆلی ئەرك و فرمێسكە
ئەوەی بۆت جێ بهێڵێ جۆش و قوڵپەی یادگارێكە
لەناو دڵدایە كڵپەی دێ بەڵام بێ سوودە بێ كەڵكە[137]

مارف بەرزنجی (پشكۆ) خەفەت بۆ ڕۆژانی لاوی دەخواو لەگەڵ دڵ دەكەوێتە ڕازو نیازو گفتوگۆ، ئەو ڕۆژانەی، كە لەگەڵ نیگاری خۆی دڵیان گۆڕیوەتەوەو پاكی خۆیان بە سروشتی ڕەنگینی كوردستان دەچوێنێ:

هەتاو نیگار یاری لێ ون بووم — بەهەشتی دڵم زۆر زوو لەدەست چووم
كە جارێكی تر نیگار دێتەوە — جوانی بەسەر چوو ناگەڕێتەوە
كاتێك كە لاو بووم یار وەك پەرە گوڵ — گۆڕیمانەوە لەگەڵ یەكتر... دڵ[138]

(گۆران)ی جوان پەرست و شەیدای تەزووی گەرمی دڵداری بەرامبەر كچێكی قژ زەرد لەهەولێر، بەبەندییەوە هەستی خۆی دەردەبڕێ:

ئەی قژ زەرد! ئەی بەژن و باڵای كەڵگەت! — بۆ كز ڕاوەستاوی بەرامبەر من؟
بۆ دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەفەت — لە عاستی دیمەنی دەربەدەری من؟

---

136 گ. هیوا، ژ٤، س١، ل٤٣.

137 پێناو، هەزار ئەفسوس، گ. هیوا، ژ٦، س١، ل٥٠.

138 پشكۆ، دڵی من، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٤٠.

ئەو چاوە کاڵانەت، نیگای دەربەست بوون    لەبەرچی ئەگرنە گرفتاری من؟
سرنجت، ڕووی دەمی پرس کردنی ڕوون    ئەکاتە کەلەپچەی دەستی دیاریَ من؟[139]

**شیعری کۆمەڵایەتی:**

ژمارەیەکی زۆر شیعری کۆمەڵایەتی لە گۆڤاری هیوادا بڵاوکراوەتەوە.تەوەرەی سەرەکی بابەتەکان بە چواردەوری ئەم لایەنانەدا دەسوڕێتەوە، هاندانی کۆمەڵ بەرەو خوێندەواری و زانست و ڕوو کردنە قوتابخانە، کێشەی نێوان ئاغاو جووتیارو پیشاندانی زوڵم و زۆرداری دەربەگ و بێ دەستەڵاتی جووتیار لەلادێ یەکان دا، هاندانی کۆمەڵ بۆ پشتگیری و یارمەتی و هاوکاری یەکتر لەکاتی ڕوودانی ڕووداوی سروشتی وەك لافاو، باری گوزەرانی ناهەمواری فەرمانبەران و ڕێز گرتنی پایەی خوێندەوار لەناو کۆمەڵدا، زەرەرو زیانی مەی خواردنەوەو چەندین بابەتی دی کۆمەڵایەتی ناوەرۆکی شیعرەکان پێك دەهێنن.

(ا. ب. هەوری)، لە ئوپەرێتی وەرزی ساڵ ئێش و کاری جووتیارو سەپان و وەرزێر و ئاودێرو قازانجیان بۆ وڵات و ڕەنج و ماندووبوونیان لەئۆپەریەتیەکی شیعریی وێنە کێشاوە؛ وێنەکان بەزمانێکی سادەو ساکارو بێ‌گرێ وگۆڵەیە:

جووتیار:

مـن جـووتیـاری وڵاتم    پاییـزە وەختـە هاتـم
بە مانگ زیاتر پێـش پەڵە    ورد لەسەر خۆ بـێ هەڵە
تفاقی جووت هەڵ ئەگرم    ڕێ بـۆ وەردەکـەم ئەگرم
بانە ئەبڕم تـاك و جووت    تۆو ئەچێنم ڕۆژە جـووت
بەهۆ هۆ ئەرز ئەکێـڵـم    خەفەت لەوێ جێ بێـڵـم[140]

کارەساتی لافاوەکەی شاری سلێمانی لەساڵی ١٩٥٧دا، هەستی زۆر لەشاعیران و چیرۆکنووسانی ورووژاند، گۆڤاری (هیوا)یش ژمارەیەکی تەرخان کرد بۆ بڵاو کردنەوەی ئەو نووسینانە،[141] بینینی دیمەنی هات و هاواری دایکان بۆ منداڵی ناو بێشکەی خنکاوو کەسو

139 گۆران، دوا سرنج، گ. هیوا، ژ ٤، س٣، ل٢٤.

140 ا. ب. هەوری، ئۆپەرێتی وەرزی ساڵ، گ. هیوا، ژ٤، س١، ل٤٥-٤٦.

141 لەو ژمارە تایبەتیەی گۆڤاری هیوا، کە ژمارەی (٥)ی تشرینی دووەمی (١٩٥٧)ە، ئەم شیعرانە بەرچاو دەکەون، کەتایبەتن بۆ لافاوەکەی سلێمانی، لافاوی مەرگ: خالد ڕەشید (لافاو، کامل ژیر).

کاریان و مردنی چەندین کوڕی گەنج و تێکدانی خانووی شڕی هەژاران، (خالید ڕەشید زێوەر)ی واهەژاندوە:

| | |
|---|---|
| ڕۆژی جمعە بوو سەر لە ئێوارە | لافاوی مەرگ هاتە ئەم شارە |
| باوەشی ئەکرد بە گەلی کوردا | چ لەسەر جادە چ لەناو ژووردا |
| نەی ئەبیست هاوار ئەی برد، ئەی فڕان | بەجێی نە ئەهێشت هەتا ئەی مران |
| سێ پیاوی پیر، سێ لاوی خوێن گەرم | وەك سەگی برسی، بردنی بەبێ شەرم[142] |

دەردێکی کۆمەڵایەتی باو لەسایەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی پەنجا و شەتەکان و بەدواوەو، بەزۆر بەشوودانی کچ و شیربایی و نەبوونی سەربەستی ئافرەت لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی دا لە ئەدەبی کوردی بە شیعرو چیرۆکییەوە ڕەنگی داوەتەوە، (کامەران) بە (چیرۆکە شیعر) ئاماژەی بۆ کردووەوە دیمەنێکی جوانی ئەو تابلۆیەی بۆ کێشاوین:

| | |
|---|---|
| بووك گەیشتە ژووری تەلار | دەوریـــــان دا کچی نازدار |
| جوانترین شتی وان، دەگمەن | لە ژوورێکا ئاوێن بــــــەن |
| جوان، ڕێکیان خستبوو بۆ بووك | بووکی وردیلەی ئێسك سووك |
| تا دەگاتە: دڵی زاواش پیری تـــــەڕ پۆش | هەر چاك بوو، نە ئەبوو بێ هۆش |
| زاوا پۆشـــــــی بووی جلی جوان | سەری تاشـــــــی بوو بەگوێزان[143] |

لە ناهەمواربیە کۆمەڵایەتییەکان (سوورانە)یە، کە ئاغاکـان سـەپاندبوویان و مەسـەلەی جیاوازی نێوان کوڕو کچ لەلادێ دا، شاعیرزیرەکانە مەسەلەکە پەیوەست دەکـات بـەرادەی بـیر کردنەوەی دەرەبەگ و پاشە ڕۆژی کچ و لەهەمان کات داوای چارەسەری ئەو مەسەلەیە دەکات:

| | |
|---|---|
| لە کوردستان جارێك بۆ لای کوردێك چون، | بە موژدەوە، لە بۆموژدانەی کچ بوون ! |
| جوان هاتەدوو، ئەو کوردە، زوو لەوانە | وتی: موژدەی کچ بوون لەسەر میرانە! |
| چونکە میر کچ ئەدا بەشوو هەر خۆشی | سوورانەوەکی ئەسێنێ و ئەیکا نۆشی[144] |

---

هەروەها چیرۆکی (کوا کوڕەکەم، مستەفا ساڵح کەریم). وتاری (کارەساتە ستەمەکە، ع. شەماڵ)، چیرۆکی (لافاو، ع).

142 خالد ڕەشید (زێوەر)، لافاوی مەرگ، گ. هیوا، ژ٥، س٢، ل١٥.

143 کامەران، تیشکی چرایەك، گ. هیوا، ژ١٠، س١، ل٨٢.

144 هۆشەنگ، سوورانە، گ. هیوا، ژ(٢،٣)، س٣، ل٦١، ٦٢..

شاعیران و ڕوناکبیران بەچاکی هەستیان بەوە کردووە، یەکێ لەو هۆیانەی بووەتە هۆی کورد لەکاروانی پێشکەوتن دوا بکەوێت لەپاڵ هەژاری و نەخۆشی دا نەخوێندەوارییە، بۆیە داوایان لەلاوی کورد کردووە ڕوو لەزانست و خوێندەواری بکات:

لاوی کورد بخوێن خوێندن مەرهەمە بۆ زامی گەل

تیشکی زانینە ئەدا ڕۆشن بەئەستێرەی ئەمەل

میللەتی جاهل لە قافلەی ژین و تاریخی بەشەو

دەستە پاچە کەوتووە، جێ ماوە، لەش ئیفیج و شەل

تا دەگاتە:

بۆ ئەوەی ئێمەش بچینە ڕیزی وان ئەی لاوی کورد

تێ بگە، کۆشش بکە، هەنگاو هەڵێنە، بکوتە پەل[145]

سروشتی کوردستان تێکەڵاو بەروحی مرۆڤی کورد بووە، شاعیر کە پەروەردەی سروشتی ڕەنگینی کوردستانە، شانازی بەوە کردووە کوردستان لە جوانی دا نموونەی بەهەشتی سەر زەمینە، تەنانەت ئیستاتیکای سروشت لای هەندێ شاعیر بووەتە خەمێکی گەورەو پەیوەستی بەهەستی نەتەوەییەوە کردوە، (کامل ژیر) لەبەهاری کوردستان دەدوێ:

بۆ جوانی بەهار

بەهاری سەر وەرزی دیار

زەردەخەنەو گەشەی ژیان

بەهاری خاکی کوردستان

خاکێك بێ گرێ و سەرپاسەر

پێك هاتبێ لەپیتو فەڕ

لەجێ و نیگاری دڵ ڕفێن

لەباو شەماڵی خەم ڕەوێن[146]

لە وەسفی جوانی ڕەزو باخی شاری شەقلاوە لە هاویناندا وەك هاوینەهەوارێك بۆ گەشتگەران، شاعیر وەسفێکی جوانی کردووەو لە هەمان کاتدا ئەو وەسفە پەیوەست دەکا بەکوردایەتییەوە:

---

[145] دلزار، لاوی کورد، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل٢٣.

[146] کامل ژیر، بەهاری کوردستان گ. هیوا، ژ ١، س١، ل١٩.

شەقلاوە خاکی کوردان مەلبەندی شێرو مـەردان

دیمەنی باخی مێوەت هەر لەگوڵ ئەچێ شێـوەت

لەنجەی چناور لاولاو شەنگەبی وسەروی دەم ئاو

ڕائەکێشی دڵ و گیان کات و دەمـــــی ئێواران

خوڕەی ئاوی ساردی تۆ دارو دڕك و بەردی تۆ[١٤٧]

مارف بەرزنجی (پشکۆ) لە وەسفی (قادر کەرەم)، کە مەڵبەندی لەدایکبوونی خۆیەتی، ناوی میوەو میوەجات و شوێنەکان و ڕووبار و ڕاوو شکاری مەڵبەندەکە دەکاتە تابلۆیەك بۆ خوێنەر:

چەمی (باسەڕە) و تاڤگـە و ناوروانی　　　لە (گۆمە گەورە) بۆمەلـــــەوانی

وێنەی پەلکی یار خەم خەم و پێچ پێچ　　　یا وەك تیرەمار بکشێ پێچـاو پێچ

سالـــــی دووهەم کە هاوینانە[١٤٨]

هەر لەوەسفی بەهارو سروشتی کوردستان دا شیعرە بەناوبانگەکەی حاجی قادری کـۆیی، کەوەك فـەرهەنگێکی دەوڵەمەنـدی نـاوی گوڵـەکانی بـەهاری کوردسـتان وایـە بـڵاو کراوەتـەوەو نموونەیەکی بەرزی داهێنانی شیعرییە:

وتم بەبەختی خەوالوو: وەرە ئەتوبی خوا　　　لە خـەو هەڵستە زەمانێ بچنە ئەولا

گوڕەی بەهاریە ئێستێکە شاخ و داخی وڵات　　　پڕە لەلالەو نەسرین و نەرگـسی شەهلا[١٤٩]

لەلای (مەولەوی) بەهار مەدلولێکی تری هەیە، بەفرمێسکی چاو جۆگە هەڵدەبەستێ و لەگەڵ هیجرانی یـار دا پەیوەنـدی دەکـات و بـەهار بـۆ ئـەو بـەو هـەموو جوانییـەوە، مایـەی خەفەتە:

وەهارەن، سەیرەن، سەوزەی دیاران　　　نم کەوت نەدیدەش چون شەو بیداران

پەی دڵەی مانیای دەروون مەلالان　　　سایە بەستەوە خەیمەی گولالان

بوی یەخەی سەحەر پەی دەماخ دل　　　مانو وەنەسیم جیب جەمین گول[١٥٠]

---

[147] وەردی، جوانی شەقلاوە، گ. هیوا، ژ١، س٣، ل٤٢.

[148] پشکۆ، وێنەیەك لەژیانی ڕابردووی قادر کەرەم، گ. هیوا، ژ٤، س٤، ل١٨.

[149] حاجی قادری کۆیی، وتم بەبختی خەوالو، گ، هیوا، ژ ٥، س٣، ل١٨.

[150] مەولەوی و بەهار، گ. هیوا، ژ٣٢، س٤، ل٢٠.

### شیعری گاڵتەوگەپ

گاڵتەو گەپ لەناوەرۆکدا یان بۆ بەسەبردنی کات و خۆشییە و دەروونی مرۆڤ ئاسوودە دەکات یان ڕەخنەیەکی توندەو ئاراستەی کۆمەڵ دەکرێت و گاڵتەو گەپەکە دەکرێ بەهۆیەك بۆ ئەوەی مەبەستە سەرەکییەکەی پێ ڕوون بکرێتەوە، کە ناهەمواریەکە.

(محمود حاجی ڕحیم)، بە شێوەیەکی گاڵتە جارانە، باسی پیاوانی ڕژێمی پاشایەتی دەکات، کە زۆریان بۆ ئینگلیز کرد، بەلاّم ئیمپریالیزم بەهانایانەوە نەهات و شۆرشی ١٤ی تەمووز تەخت و تاراجی تەفرو تونا کردن:

کوا بزەی سمێلی جاران کوا گورجو گۆڵی
بیستم وتت کێ ئەم کوڕێ نەبووە لەدایك
بەخێرێ تۆی لە مەیدانا ئەڵێی فتبۆڵی
وتیان پەنجەت ئیشارەت بات دنیا ئەسوتێ
با عیبرەت بێت بۆیان دیتیان پەنجە و قۆڵی

تادەگاتە:

سەدجار وتت کوڕی گەورەو ڕاستی ئینگلیزم
کوا ئەی بۆ ئێستا ناتناسن کەوابوو زۆڵی[151]

(هەژار)ی شاعیر لە شیعرێکی گاڵتەئامێزدا شەڕی براکوژی و تەفرەقەی نێوان لایەنە سیاسییەکان و کورد کوژی دەخاتەڕوو، کە دەمێکە کورد پێیەوە دەناڵێنێ و ڕەخنەیەکی بەسوودە بۆ یەکگرتنی ریزەکانی کۆمەڵ:

بایز:

چیت بۆ بڵێم؟ بەخوا بونە دوو دەستە
هەر داوێنەیەك بەجوێ، و بەستە
یەك دەڵێ سوورم یەك دەڵێ بۆرم
یەك دەڵێ زەردم یەك دەڵێ زۆرم
یەکێ ئێژێ قیر یەکێ ئێژێ ماست
یەکێ ئەڵێ لار یەکێ ئەڵێ ڕاست
تا چەنە شل بوو چەقەو جنێوە
ئەمجا شەڕە شەق ئەڕوا بەرێوە

تا دەگاتە، باپیر:

بایز چیمان و چم چاو پێکەوت
هەرچی ئەی بینین هەر لارەو چەوت
وتمان ئەم زوڵمە سەرمان لاچێ
ئیتر کورد ناچێ یەکتر داپاچێ ١٥٢

---

151 محمود حاجی ڕحیم، کێ ئازایە، گ. هیوا، ژ٢، س٢، ل٧١.

**شیعری شیوەن:**

شیعری شیوەن مێژوویەکی کۆنی هەیە، لە گۆڤاری (هیوا)یشدا کۆمەڵێ شیعری شیوەن بەرچاودەکەوێت، هەندێکیان بۆ بوێژە کۆچکردووەکانەو هەندێکی دی بۆ کارەساتی لافاوو بەشدارانی ڕاپەڕینەکانەو هەندێکی کەسییەو بۆ کەس وکارە.

لە کارەساتی لافاوەکەی شاری سلێمانی لەساڵی ١٩٥٧دا، چەندین منداڵ و گەنجی جوان بوونە قۆچی قوربانی، بۆ (کامیل)، کە گەنجێکی خوێندەواربووە، وتراوە:

خونچەیەك بـووم تەڕو ئازیز　　بەڵام لافـاوەکەی پایز
نەی هێشت ببم بە گوڵی سوور　　نەڕانی بەسـەرما لەدوور
وروژمی بـردە ژوورەکەم　　کوشتمی و کـردی بە (ماتەم)
ئەی فرمێـسکی لیَڵ بلەرزە　　لـە عەزرەت باران و تەرزە
(کامل): ئـەی کوڕە شەنگە کە　　(کامـل): لاوەبێ دەنگەکە[١٥٣]

(کرمانج) ناوێك لە شیوەنی باوکیدا، کە وەك پێشمەرگەیەکی بەجەرگ لەڕێی ڕزگاری کوردستاندا سەری ناوەتەوە، یادو پەیمان دووپات دەکاتەوە، کە ڕێڕەی باوکی بەر نەداو تۆڵەی باوکی لە دوژمنان بکاتەوە:

لێرەدا نێژرای باوکی نـازدارم　　بە بەرگی خوێنین سەربڵندو بەرز
بۆچی نایبیسم پەرچی پرسـیارم؟!　　چونکە تۆ نوستوی لەناو توێی ئەرز
منیش بەجێ مام بەبێ پشتیوان

تا دەگاتە:

ئامانجم بەرزە، بابە بـزانە　　ئەو ڕییەی گرتت منیش ئەیگرم
بۆ ئەم وڵاتە ئەم کوردسـتانە　　قوڕگی دوژمنی خوێنە خوێ ئەدڕم
ئیتر تۆ بنوو منیش بۆ کـاروان[١٥٤]

(گۆران)ی داهێنەر لەشیعرێکی دا بۆ شین و یادی (پیرەمێرد)ی مامۆستای، سۆزو کوڵی دڵی هەڵدەڕێژێ و شوێن، و پایەی پیرەمێرد دەردەبڕێ:

---

152 هەژار، دەمەتەقێی بایزو باپیر، گ. هیوا، ژ٥، س٢، ل٨.

153 مێژووی ژیانی کاملی جوانەمەرگ، گ. هیوا، ژ٥، س١، ل٢٥.

154 کرمانج، یاد و پەیمان، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٦٩.

ئەم بەهارە

لەسەر گردی مامە یارە،

بۆ یانزە جار

نوێ گوڵاڵەی سووری بەهار

خوێنی ڕژایە سەرگیای سەوز،

خوێن پەنگی خواردەوە، وەك حەوز [١٥٥]

**شیعری بۆنەو موناسەبات:**

بەوپێیە، کە ئەدەب ڕەنگدانەوەی واقیعە، ئەدیبی کوردییش لەکانگەی ڕووداوەکان بەشدارییەکی کاریگەری لەگۆڕانە سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیرییەکاندا کردووە. چەندین بۆنەی سیاسی و نیشتمانی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی هەیە، شاعیری کورد بەشیعر بەشداری کردووەو لەو بۆنانەدا هەستی خۆی دەربڕیوە.

ئەو شیعرانەی لەموناسەبات دا وتراون لە گۆڤاری (هیوا)دا ژمارەیان زۆرەو ژمارەو جیاوازی موناسەبەتەکانیش فرەن، بەبۆنەی دەرچوونی گۆڤاری (هیوا)وە، (أ. ب. هەوری) هەندێ ئامۆژگاری گۆڤاری (هیوا) دەکات:

| | |
|---|---|
| هیوا، چووزەرەی بنکی گەلاوێژ | بەبیری وردی پوختی والابێژ |
| بێرەکایەوە ساوای تازەبوو | کاتی فرمانە تۆش ئازانە زوو |
| دەستی خزمەتت پیرۆز، وەك ناوت | تا ببیتە فەڕ و برەو بێ باوت |
| هیوا، هیوای هۆزی بەجێ ماو | لەڕێ لانەدەی قەت بەچاوڕاو [١٥٦] |

بەبۆنەی سەرکەوتنی شۆرشی ١٤ی تەمووزو ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی لەعێراقدا، ڕۆژگارێکی نوێ هاتەکایەوە، سەربەستی و ئازادییەکی بەرفراوان بۆ ڕۆشنبیریی کورد ڕەخسا، شاعیرانیش وەك دەنگی ڕاستەقینەی میللەت هاتنەگۆ، (صالح یوسفی) دبێژی:

| | |
|---|---|
| خەتیرە هەلکر لەشکەری مەزن | بەردا پەتیلکا شورشا بی بن |

---

155 گۆران، یادی پیرەمێردی بوێژ، گ. هیوا، ژ ٣٣، س٥، ل٢٦

156 هەوری، ئامۆژگاری بۆ گۆڤاری هیوا، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل ٣١. هەر بەبۆنەی گۆڤاری (هیوا)وە شیعری تر وتراوە، بڕوانە م. شاربازێڕی، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٣٢.

کەلێت (باستلا) لدیف ئیك ییت کەڤن		زوردار نوزانن دی کیڤە ڕەڤن
دەستیت (کەریمی) دنیا تێك هژاند		بویا شۆڕشی هاڤیت پەڤژاند[157]

بەبۆنەی سەرکوت کردنەوەی بزووتنەوەی تاقمەکەی (الشواف) لە موسڵ و لەخۆشەویستی زەعیم و جمهوریەت، کە کوردییش بەشداری لەو سەرکوت کردنەوەیەدا کرد، عبدلرزاق بیمار، دەنگ هەڵدەبڕێ:

کوا بۆ هەڵبەستێك وەك ئاگر
کەللەی دوژمـــن بتەقێنێ
بالۆرەی کـــۆنی ڕزیــوی
ئــاغایەتی و ڕەنج خــواردن
ئەفسانەی میللەت دیل کردن
- وەك (مێشکۆڵەی) سەگێکی هار!
لێ دەربێنێ[158]

دوای تێ پەڕبوونی یەك ساڵ بەسەر تەمەنی جمهوریەت دا، تەقەیان لە عبـدالکریم قاسم کرد و بریندارىيان کرد، بەم ڕووداوە گەلی کوردو عەرەب و کەمە نەتەوەییەکانی دی دڵتەنگ بوون، پاشان کە ناوبراو لەخەستەخانە دەرچوو لەزۆربەی شارەکان دا ئاهەنگی خۆشی سـازدراو میللەت بەشداری ئاهەنگەکانی کرد، شاعیرێکی کورد بەم موناسەبەتەوە دەڵێ:

لەژێر پەردەی تەم و دوکـــەڵ		دەستی تاوان، دەستی چەپـــەڵ
دەستێکی سوور بەخوێنی گەل		شــــــالاو ئەبا بەپەلە پەل
داوای چییە؟ گیانێك شیرین،		گیانیك هیوای بەختیاری ژین[159]

جەژنی نەورۆز، بۆتە سیمای خەباتی نەتەوەیی کورد بەدرێژایی مێژوو، هەردەم دوژمـنان ویستیویانە نەورۆز لە کورد قەدەغە بکەن و شوێنەواری بسڕنەوە، بەڵام نەورۆز ساڵ بەساڵ لەدەروونی شاعیری کوردو خەڵکی کورد بەگشتی ڕەگ و ڕیشەی قووڵتر داکوتاوە، (شێخ سەلام) دەڵێ:

---

[157] صالح یوسفی، شورشا پیرۆز، ژ٢، س٢، ل٤٣.

[158] عبدالرزاق حمد، هۆنراوەو میللەتەکەم، گ. هیوا، ژ (١٠،٩)، س٢، ل٢٩.

[159] حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی، لە قەڵغانێکی پۆڵایینە، گ. هیوا، ژ(٢،٣)، س٣، ل٧٢.

جەژنـــــی نەورۆزت یاخوا پیرۆزبێ		هـــەوارت بەرز و تیرەت بەهرۆز بێ
هەر ئەم ڕۆژە بوو، کاوەی گوردی کورد		مێشکی زووحاکی بەچەکوش ورد کرد[160]

(کامەران موکری)یش، لەرۆژی نەورۆزداسێ چەپك نێرگس و گوڵی ناسك دەكاتە دیاری بۆ گەلی کوردو مـوژدەی ئەوەشیان دەداتێ، کە لە نەورۆزدا ئاسۆی پاشەرۆژێکی ڕووناك دەردەکەوێت:

بۆ ڕۆژی نەورۆز ســێ چەپك		لە نێرگس و گوڵی ناســـك
ئەکەم بەدیارییەکی جـوان		بۆ گەلی کوردی قارەمـــان[161]

## ب- شیعرەکانی گۆڤاری هیوا بەپێی ڕێبازە ئەدەبییە سەرەکییەکان

### ڕێبازی کلاسیزم:

ئەگەرچی لەڕووی مێژووییەوە شیعری کوردی وەك قۆناغە مێژووییەکە بەگوێرەی ئەدەبی ئەورووپییەوە کاریگەری ئەورووپای لەسەر نەبووە، بەلاّم پاشان وەك زاراوەیەك بەبالاّی شیعری کۆنی کوردیاندا بڕا.[162] وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی کۆمەڵی کوردەواری بە تەواوی و بە چەمکی دەرەبەگایەتی ڕۆژئاوا وەك یەك نەبوو، شاعیری کلاسیزمی کوردیش شاعیری دەربارو دیوەخانی ئاغا نەبووە، بەڵم لەژێر کارتێکەری ئەدەبی میللەتانی ڕۆژهەلاّتدا ئەدەبی کوردییش، بەتایبەتی شیعر، مۆرکی ئەو میللەتانەی لە روخسارو ناوەرۆکدا وەرگرتووە.

لە ڕووی ڕوخسارەوە، شیعری کلاسیزمی کوردی سوودی لەهەموو ئەو هونەرانە بینیووە، کە لەشیعری کلاسیکی یان کۆندا هەبووە، وەك غەزەل و قەسیدەو پێنج خشتەکی و

---

[160] سەلام، جەژنی نەورۆز، گۆڤاری هیوا، ژ٣٥، ل٣.

[161] کامەران، دیاری نەورۆز، گ هیوا، ژ ٣٥، ل١٤. ژمارە (٣٥) تەرخان کراوە بۆ جەژنی نەورۆز.

[162] بەگوێرەی ڕێبازی کلاسییزم لەئەدەبی ئەورووپیدا، کەلەپووری ئەدەبی (گریکی و ڕۆمانی) دەگرێتەوە، پاشان لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم لە فەرنسا جارێکی تر ڕێبازی (کلاسییزمی نوێ) سەری هەڵدایەوە، بەهۆی لاسایی کردنەوەی ئەدەبی یۆنانی و ڕۆمانی لەو ڕوانگەوە، کە لەسەر بنەمای عەقڵ و سروشت و ئینسانییەو نەمرە، بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەو ڕێبازە ئەدەبییەو چۆنیەتی گەشەکردنی و بنەماکانی بڕوانە: الدکتور محمد مندور، الادب ومذاهبە، ص٤٥-٥٩؛ د. علي جواد الطاهر، الخلاصة في مذاهب الادب الغربي، الموسوعة الصغيرة، ١٢١، ص١٣-١٧.

چوارین و موستەزاد.. هەروەها پەیڕەوی کێشی عەرووزی عەرەبی و فارسی کردووە لەکێشانەی شیعرییدا و قافیەی بەیتی یەکەم بووەتە بناغە بۆ سەرجەم قافیەی کۆتایی بەیتەکان،[163] لەرووی زمانییشەوە، زمانێکی تێکەڵ لەزمانی عەرەبی و فارسی و تورکییەو زۆربەی زاراوەکانی شیعری کلاسیکی ڕۆژهەلاتی تیا بەدی دەکرێت.[164]

لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە بابەتە سەرەکییەکانی شیعری کلاسییزمی کوردی، هەروەك مەبەستەکانی شیعری میللەتانی دراوسێن، بەتایبەتی عەرەب و فارس، وەسف و ستایش و داشۆرین و مەی و خواپەرستی و دڵداری و نیشتمانپەروەرییە، ئەگەر لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژییەوە لەبابەت و ناوەرۆکی شیعری کلاسییزمی کوردی بڕوانین، هەرگیزاو هەرگیز لە خزمەتی چینی زەحمەتکێش و چەوساوەی کورد دا نەبووە، چونکە شیعرەکان گوزارشتیان لەخواستی جووتیارو پاڵەی کورد نەکردووە، بەڵکو بەزمانێکیش شیعرەکان هۆنراوەتەوە چینی زەحمەتکێش لێی تێنەگەیشتووە، شاعیرەکانییش ئەوەندە پەرۆشی ئەوە نەبوون خەڵکی سادە لێیان تێ بگات، خەریکی وردەکاری و سەنعەتی شیعریی ورد بوون و ئەو بیروڕایە هەردەم باڵادەست بووە، کە شیعر بۆ کەمینەو چینی هەڵبژاردە دەنووسرێ بۆیە سەیر نییە گەر شاعیرێکی وەك (نالی) هاواری لێ هەڵسێ و بڵێ:

عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم
زۆرم گوت و کەسی تێ نەگەیی ئێستە خەمۆشم[165]

گۆڤاری (هیوا) لەپاڵ ئەوەی، کە ژمارەیەکی زۆر شیعری نوێی کوردی بلاوکردۆتەوە، شیعری شاعیرانی کلاسیکیشی بلاوکردۆتەوە و تەنانەت لەبەر بەرزیی شیعرەکان و بەگرنگی

---

[163] کێشی عەرووز (عروض)، خلیل بن احمد الفراهیدی دۆزییەوە، پاشان فارسەکان بۆ ئەوەی لەگەڵ بنەمای زمانەکەیاندا بگونجێ کێشی دیکەیان دۆزییەوە بوو بە (١٦) بەحر، بەلام شیعری کلاسیکی کوردی بەزۆری سوودی لەدوو کێشی (هزج) و (رمل) وەرگرتووە، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کێشەکانی عەرووز لەشیعری کلاسیکی کوردیدا، بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی (الوفاء)، بەغداد، ١٩٦٢ عەزیز عەبدوڵلا گەردی، کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسی، (نامەی ماجستێر)، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٤، ل٣٠٧ – ٣٠٨.

[164] کۆمەڵە زاراوەیەکی هاوبەش هەیە، کە لەشیعری کلاسیکیی میللەتانی ڕۆژهەلات دا بەدی دەکرێت، لەوانە: ئاتەشی توور، بەردولعەجوز، جیلوەگەر، چەشمەسار، چەرخی دوون پەروەر، ڕەهزەن، سەرووی ڕەوان، مووشکاف، مەردومەك، هوما... هتد.

[165] د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، ل٧٧.

ڕوانینە ئەو شاعیرانەوە زۆرجار (دیوانی هیوا)دا لەسەرەتادا بلاّوکراونەتەوە یان لە سەرووی شیعرەکانەوە نووسراوە: ((ئەو گولاّنەی هەرگیز سیس نابن)).

ئەحمەد موختاری جاف (١٨٩٧-١٩٣٥ز) لە شیعرە بەناوبانگەکەیدا داوا لەگەنج و تولازی کورد دەکات بخوێنن و ڕوو لەزانین بکەن:

لە خەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تەئریخی عالەم شاهدی فەزل و هونەرتانە

دەسا تێ کۆشن ئەی قەومی نەجیبی بێ کەس ومەزلوم

بەگورجی بێ برن ئەو ڕێگە دوورەی وا لەبەرتانە

ئەم شیعرە لەرووی ڕووخسارەوە، لەسەر کێشی عەرووزەو لەبەحری (هەزەج)ی هەشت هەنگاوی یە (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) لەرووی قافیەشەوە، قافیەی کۆتایی بەیتی یەکەم بووە بە بنەما بۆ هەموو بەیتەکان تاوەك دوابەیت، بڕوانە: (زەرەر، هونەر، لەبەر...)، لەرووی زمانیشەوە، وشەی بێگانەی زۆری تیابەدی دەکرێت، (زەرەر، تەئریخ، عالەم، شاهد، قەوم، نەجیب، مەزلووم...).

ئەختەر (١٨٣٩-١٨٨٧ز) لە غەزەلێکیدا،کە لەسەر کێشی عەرووز و لەبەحری هەزەجی هەشت هەنگاوییە دەڵێ:

ئەمان سافی دڵی شەیدا لەجەوری دیدە غەمگینە

لە نەشئەی چاوەکەی مەستت پیاڵە پڕ کە بۆم بینە

فدای چاوی سیاهت بووم، کە هۆشم بوو ئەویشم چوو

بەتاراجی نیگاهت چوو، ئەگەر عەقڵ و ئەگەر دینە[١٦٦]

مەولەوی (١٨٠٦-١٨٨٣ز) لە وەسفی بەهاردا دەڵێ:

نازك تەدارەك فەصل وەهاران    شیرین ئارایش هەردەو کۆساران

گول چون ڕوی ئازیز نەزاکەت پۆشان    وە فراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان[١٦٧]

ئەم شیعرەی (مەولەوی) لەرووی ڕەوانبێژییەوە کلاسیکییەو لەرووی کێش و قافیەشەوە هەروەك سەرجەم شیعری کوردی شێوەی گۆرانی لەسەر کێشی خۆماڵییە، کێشی دە بڕگەی پەنجەیە، لەڕووی قافیەوە جووت قافیەیەو هەر بەیتە قافیەی خۆی هەیەو لەمەسنەوی نزیك دەبێتەوە.

---

166 نزار، ئەختەر کێ یە؟، گ. هیوا، ژ٩، س١، ل٨٧.

167 مەولەوی بەهار، گ. هیوا، ژ٨، س٢، ل٤٠٤.

## ڕێبازی ڕۆمانسییزم:

ئەم ڕێبازەیش یەکێکە لەڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەب، کە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکانی ئەدەب بەشۆڕشێکی ئەدەبی دەزانن بۆ ڕزگار بوون لەکۆت و پێوەندی ئەدەبی کلاسیکی کۆن، کە دوای ئەوەی سەدە و نیوێك لەئەدەبی ئەورووپیدا درێژەی کێشا، بێ گومان هەموو ڕێبازێکی ئەدەبی لەناکاو کت و پڕ لەدایك نابێ و دەروازەیەکی هەیە، بۆیە لەرەخنەی ئەدەبی دا ئەو قۆناغەی بەر لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم بە (پێش ڕۆمانسیزم - ماقبل الرومانتیکیە) ناسراوە، کە (جان جاك ڕوسۆ) دەورێکی سەرەکی تیا بینیوەو چاکسازی ئایینی ڕێ خۆش کەر بووە)[١٦٨].

سەرەتاکانی ڕۆمانسیزم لەئەدەبی ئینگلیزی و ئەڵمانی دا دەرکەوت پاشان لەفەرەنسا بەشێوەیەکی پتەو جێگیربوو، ئەو ڕێبازەی (وەك دیاردەیەکی ئایدیۆلۆژی تەنها خۆی لەهونەردا نەدۆزیوەتەوە، بەڵکو پەرەی ستاندووە بۆ شارستانی و ڕۆشنبیرییەکانی تریش وەك (کۆمەڵناسی، ئابووری و ساسی، فەلسەفە و ئایین و زانستە سروشتییەکانو پزیشکگەرییش)[١٦٩].

ڕێبازی ڕۆمانسییزم لە ناوەڕۆك و لە بنچینەدا لەگەڵ ڕێبازی کلاسییزمی پێش خۆی جیادەبنەوە بەوەی، کە ((هەر لەسەرەتادا لەوە دوورکەوتنەوە کە بەزۆر بەوردی خۆیان و بیرو بۆچوونەکانیان بخەنەڕوو، بەپێچەوانەی کلاسیکییەکان تەئکیدیان لەسەر ڕوونبێژی و خۆ بەدوورگرتن لەتەم و مژ کردەوە، هەروەها ڕۆمانسییەکان خۆیان لەپۆلین کردن و تێڕوانینی ورد دەپاراست و لەجیاتی ئەوە بە شێوەیەکی ڕاگوزاری و عەفەوی و لەناخی دڵەوە بەخەیاڵ و تێڕامانێکی سەرپێی و ئەزموونی ڕاستەوخۆی خۆیانەوە بەهرەمەند بوون.))[١٧٠] لەپاڵ گەڕانەوە بۆ سروشت و خەیاڵی فراوان و گۆشەگیری و فرمێسکی گەرم بۆ خۆشەویستییەکی پاك و بێ گەردی فریشتە ئاسادا ڕێبازی ڕۆمانسییزم زیندووکردنەوەی ڕۆحی نەتەوەیی دروشمی بوو و ڕوویەکی شۆڕشگێڕییشی هەبوو و بارودۆخی تایبەتی و گۆڕانەکانی باری سیاسی و دەستەڵات

---

[168] د. علي جواد الطاهر، الخلاصة في مذاهب الادب الغربي، ص١٨.

[169] د. جميل نصيف التكريتي، المضاهب الادبية، ط١ بغداد، ١٩٩٠، ص١٥٧، هەر لەم ڕووەوە ڤیکتۆر هۆگۆ پێی وایە، ڕێبازی ڕۆمانسیزم و لیبرالیەت لەسیاسەت دا هەردوکیان یەك شتن و هەردووکیان ڕزگاربوونن، ڕۆمانسیزم لەئەدەب و لیبرالیەت لە سیاسەت و کاروباری وڵاتدا، بڕوانە: الدكتور حلمي مرزوق، الرومنتيكية والواقعية في الادب (الاصول الاديولوجية) دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٣، ص١٨.

[170] جميل نصيف التكريتي، المذاهب الادبية، ص١٥٩.

لەفەرەنسادا وای لەشاعیرە ڕۆمانسییەکان کرد خۆیان لەکۆمەڵانی خەڵك جیانەکەنەوەو شیعرو بەرهەمیشیان بۆ ئەو مەسەلەیە تەرخان بکەن و ئەدەب بکەنە پەیامێکی کۆمەڵایەتی[171].

ئەدەبی کوردی، بەلاساییکردنەوەی ئەدەبی تورکی لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە گۆڕانکاری و تازەکردنەوەیەکی بەخۆیەوە بینی، ڕێبازی ڕۆمانسییزم لە ئەدەبی کوردیدا لەسەر دەستی پیرەمێرد و شێخ نوری شێخ صالح و گۆران.. پەرەی پێدراو ئەویش بەدەرچوون لەیاسا چەسپاوەکانی شیعری کلاسییزمی وەك خۆ دەربازکردن لەکێشی عەرووز و ڕووکردنە کێشی خۆماڵی فۆلکلۆری کوردی و بەکارهێنانی زمانی کوردی پەتی و وشەی ڕەسەنی کوردی و بەکارهێنانی جووت قافیە لەرووخسارداو ڕووکردنە کێشە کۆمەڵایەتییەکان و هەڵبژاردنی بابەتەکان لە واقیعی ژیاندا.

ئەگەرچی گۆڤاری هیوا لەسەردەم و ڕۆژگارێکدا دەرچووە، کە ڕێبازی ڕۆمانسیزم لەناوەوەدا کزببوو، بەڵام گرنگی دانی گۆڤارەکە بەرێبازە ئەدەبییە جیاوازەکان گۆڤارەکەی دەوڵەمەند کردووە. (غ. س. غەمبار) لە پارچە شیعرێکدا (بەیانی زوو)، کە ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی نەحەسانەوەو خەم و خەفەت و نەخەوتن، لەهەمان کات دا پاك و بێ گەردی سروشت و هێمنی و جوانی سروشت لە ڕۆمانسیەتدا، گوێ بۆ ناڵەی دڵی شوانێك ڕادەگرێ کە بە شمشاڵەکەی دەردی دڵی هەڵدەڕێژێ:

| | |
|---|---|
| بەیانی یێك زوو پێش مەلا بانگدان | پێش پێ کەنینی زەردی قەد هەردان |
| پێش ئەوەی لەدەشت گزنگی هەتاو | بەبزەی لێو و بەواتەی سلاو |
| وەك بەرگی تاوس هەزار جۆرە ڕەنگ | سپی و سوورو شین زێرین و قەشەنگ[172] |

مارف بەرزنجی (پشکۆ)، گفتوگۆیەکی هێمنانە لەگەڵ دڵی خۆی دەکات و دەیەوێ پەی بەئەسراری دڵ ببات و بەرەو دنیای یادگارییە کۆنەکانی ڕۆژانی گەنجی مل دەنێت و خۆزگە بەو ڕۆژگارە دەخوازێت و خەفەت بۆ ئەوە دەخوات جارێکی تر لاوی ناگەڕێتەوە:

---

171 (لامارتین) شاعیری گەورەی فەرەنسا دەڵێ: «سەرشۆڕییە بۆ کەسێ گۆرانی بڵێ و لەولایشەوە وا ڕێما دەسووتێ» بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فان تیغم، الرومنطیقیة، ترجمة بهیج شعبان، بیروت، ١٩٥٦، هەروەها: لیلیان فرست، الرومانسیة، ترجمة: د. عبدالواحد لؤلؤة، موسوعة المصطلح النقدي (٢)، بغداد، ١٩٧٨.

172 غ. س. غەمبار، دەنگی شمشاڵ، گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٢٤.

ئـــــەی دڵ وەك دەریای پڕ و لێڵ        شامــــــە لاوانان لەکـــەنارت وێڵ

کەس تێ نەگەیشت چییە ئەسرارت        کـــەس بۆی نەکراوە گرێی ئازارت

تا دەگاتە:

کـــــــەی جارێکی تر نیگار دێتەوە        جـــــــوانی بەسەرچوو ناگەڕێتەوە[173]

گەڵاڕێزانی پاییزو خەزان و بارانی پاییز واناخی (گۆران) دەهـەژێنێن نموونەیـەکی بـەرزی شیعری ڕۆمانسی کوردی و داهێنەرانەی (گۆران) دەخولقێنێ، دیمەنی پـاییز لـەلای شـاعیرانی ڕۆمانسی نیشانی گریان و توانەوەی ڕۆحەو حەسانەوەیەك و سوکنایی دڵە:

دڵۆپی ساردو فێنك با لەسەر دارو دەوەن بـــڕژێ

بەسەر سنگی چیادا چۆکی داداوە، کش و بێ دەنگ

بەسەر پاییزی زەردا با بەخوڕ بگری، بەکـــوڵ بگری

لەسەر ئاخر گەڵا، ئاخر چڵی تەنیایی گــــوڵ بگری!

تادەگاتە:

طه بیعەت زەرد و ژاکاوە، لە حاڵی گیان کەنشتایە،

نیشانەی ماتەمی پایز لەفرمێســـــــکی درشتایە![174]

ئەم شیعرە لەرووی زمانەوە، بەکوردییەکی پەتییەو لەرووی کێشەوە، لەسەر بەحری (هەزەج)ەو جووت قافیەیە.

## ڕێبازی ڕیالیزم:

ئەم ڕێبازە ئەدەبییەش سەرەتا لە فەرەنسا سەری هەڵدا، پێـشڕەوەکانی ڕازی نـەبوون واقیـع بکەنە شتێکی میسالی (میتافیزیك)، هەوڵیان دەدا، کە وێنەی شـتەکان لـە واقیعـدا چـۆنە وای وێنە بکێشن و نووسەر تیایدا بێلایەن بێت، بۆیە نووسەرەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهـەم لـە فەرەنسادا کەوتنە خەیاڵی ئەوەی بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە گوزارشت لەژیانی خەڵکی سادە بکەن.

یـەکێ لـە سـیماکانی ئـەم ڕێبـازە ئـەوەبوو بەربـەرەکانێ و توندوتیـژی لەگـەڵ ڕێبـازی ڕۆمانـسییزمدا نـەبوو (بەپێـچەوانەی ململانـێ ی نێـوان کلاسـییزم و ڕۆمانـسییزم) ئەگـەر ڕۆمانسییەکان شیعری لیریکییان وەك هونەرێکی ئەدەبی بـۆ گوزارشـت لەخـەیاڵ و ئەندێـشەی خۆیان هەڵبژارد، ئەوا ڕیالییزم لەسەرتاوە لەلایەن چەند چیرۆکنوسێکی وەك بەلزاك و سـتەندال

---

173 پشکۆ، دڵی من، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٤٠-٤١.

174 گۆران، هەوری پایز، گ. هیوا، ژ٢،٣. س٣، ل١٤-١٥.

گەشەی پێدراو جێگەی خۆی کردەوە، کە هەر ئەوانە خۆیشیان سەر بەرێبازی ڕۆمانسییزم بوون و سەرنجی بەهێزیان دەربارەی ژیانی ڕۆژانەی سەردەم هەبوو، هەروەها نابێ دەوری (فلۆبێر)مان لەبیربچێت، کە هەر زوو لەرۆمانسییزم هەڵگەڕایەوەو گاڵتەی پێکردن،[175] ئەمەش کاریگەرییەکی وای بوو لەدوای خۆی (مۆپاسان)یش لەسەر هەمان ڕێڕەو ڕۆیشت.

ڕێبازی ڕیالییزم لەبنچینەدا بڕوای وایە (شەڕ) سەرەتاو بنەمایەو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێوەی دەناڵێنێ، نەوەك (خێر) کەلای میسالییەکان بنچینەیەو بڕوایان وایە هەموو شتێك خۆی لەخۆیدا (خێر) و (چاکە)یەو دوایی ئالوودە دەبێت، بۆیە سەیر نییە ئەو بیروڕایە لەرۆمانی ڕۆماننووسەکانی سەر بە ڕێبازی ڕیالیزم ڕەنگ بداتەوەو باشترین نموونەش (کۆمیدیای ئینسانی)یەکەی (بەلزاك)ە.

ئەمەیە تێڕوانینی ڕیالییزم، بەتایبەتی (ریالیزمی ڕەخنەگرانە) بۆ هونەرو بۆ کۆمەڵ، بەلاّم ڕیالییزمی سۆسیالیستی، ئەگەرچی زۆربەی نووسەران پەیوەستی دەکەن بە ڕۆمانی (دایك)ی گۆرکی یەوە، بەلاّم «ڕەگ و ڕیشەی ئەم ڕێبازە لەلای چەند نووسەرێکی غەیری سۆڤیەتی، وەك لۆرکای ئەسپانی و بریختی ئەڵمانی و ئەراگۆنی فەرەنسی و نازم حیکمەتی تورکی و بابلۆ نیرۆدای چیلی و فۆچیکی چیکی و کەسانی تردا بەرچاو دەکەویت.»[176]

ئەم ڕێبازە لە ڕووسیا (لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەبارودۆخیکی ڕەخنەیی دژ بە کەپیتالەکان لەلایەن چینی زەحمەتکێشانەوە (پرۆلیتاریا) سەری هەڵدا، ئەوانە خۆیان بۆ شۆڕشی سۆسیالیستی لە ڕووسیادا ئامادەکردبوو وەك لەبەرهەمی(دایك)و شیعر و ڕۆمانە شیعرییەکانی گۆرگی و شاعیرانی پرۆلیتاریا سەری هەڵدا.

ڕیالیزمی سۆسیالیستی هەنگاوێکی تازەی لە بەرهەمی هونەری بەرەو پێش چووی مرۆڤایەتی داناوە.. لەبەرهەمە هونەرییەکاندا تەنێ پشت بە بەرهەمی ئێستا نەبەستراوە، بەڵکو ڕابردوویش کە سوودی کۆمەڵگای تیابێ بەستراوە. واتە نووسەرانی سەر بە ڕێبازی ڕیالییزمی سۆسیالیستی تێڕوانینیان بۆ ئەدەب و هونەر ئەوەیە، کە دەبێ ئەدەب لەخزمەتی

---

175 فلۆبێر، خۆی لەسەرەتادا لەگەڵ ڕۆمانسییزمەکان بوو، پاشان چەندین چیرۆکی لە دژی ڕۆمانسییزمەکان نووسی و قەناعەتی بەوە بوو، نابێ ئەدەب بکرێتە هۆیەك بۆ چاکردنی کۆمەڵ، بەڵکو (هونەر دەبێ بۆ هونەر) بێ هەروەك مەبەستی نیگارکێشێك نیگارەو بەس، ئەگەر ڕۆمانووسێکیش ئەگەر ڕۆمانەکەی لەخزمەتی مەسەلەیەکدا بوو ئەوا ناپاکی لەگەڵ هونەرەکەیدا کردووەو هونەرەکەی کردووە بە هۆیەك نەوەك مەبەستێك، بڕوانە: د. علي جواد الطاهر، الخلاصة في مذاهب الادب الغربي، ص٣٠.

176 الدكتور سالم احمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي ومظاهرها في الادب العربي الحديث، ص١٨١.

کۆمەڵدا بێ و خەون و ئازار و ویستی چینی زەحمەتکێش و هەژاران دەربڕێ، لەم بارەیەوە (بیلینسکی) وەها ڕیالیزم ڕاڤە دەکات، (خولقاندنەوەی سەرلەنوێی واقیعە لەگەڵ هەموو ئەو ڕاستییانەی واقیع بەخۆیەوە دەگرێت)

کەوابێ جیاوازی سەرەکی نێوان ڕیالیزم لەئەوروپاو ولاتە سۆسیالیستەکانی پێشوو ئەوەیە، ڕیالیزم لە ئەوروپا واتا (هونەر بۆ هونەر) و ئەوەی تر (هونەر بۆ کۆمەڵ)، لێرەدا هەوڵ دەدەین، بزانین تاچەند ئەو ڕێبازە ئەدەبییە کاریگەری خۆی بەسەر شاعیرانی گۆڤاری هیوادا بەجێ هێشتووە.

لە سالانی جەنگی دووەمی جیهانیدا، لەگەڵ بلاوبوونەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و گیانی شۆڕشگێڕی و بزووتنەوەی ١٩٤١دا، ئەدیبانی کورد ڕووەو ڕێبازی ڕیالیزم هەنگاوی خێرایان ناو ڕووداوەکان بوونە هەوێنی بابەتە ئەدەبییەکان بەشیعرو چیرۆکەوە، شاعیرە ڕۆمانسییزمەکانیش ئیتر لەجیاتی ئەوەی بۆ یارەکانیان بگرین، دەسبەداری گۆشەگیریی خۆیان بوون و کەوتنە ڕەخنەگرتن لە ناهەموارییەکانی کۆمەڵ.

(پیرەمێرد)ی شاعیر، کە لە ریزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەبوو، نقوومی خەیاڵی ڕۆمانسییانە ببوو، ئەمجارە کاریگەری وەسبەی ١٩٤٨ و شەهیدانی گەلی کوردو عەرەب هەژاندی:

تائێستا ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا

قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا[177]

(بێکەس و گۆران و هەردی و دیلان و کامەران)یش بە هەمان شێوە مەشخەڵی گڕی تووڕەی شۆڕشگێڕی نەتەوەیی و دەردە کۆمەلایەتییەکان لە چەوسانەوەی ئافرەت و کێشەی نێوان دەرەبەگ و جووتیارو نەخوێندەواری و چەندین بابەتی ڕۆژانەی چینی زەحمەتکێشی یان کردە بابەتی شیعرەکانیان و (ڕێبازی ڕیالیزم)یان چەسپاند.

عەبدوڵلا گۆران (١٩٠٤ - ١٩٦٢ز) دەڵێ: ((پاش ئەم ماوەیە، کە سەرمەستی ئەدەبی تورکی و فارسی بووین، بەرە بەرە ئەدەبی تازەی عەرەب و ئەدەبی ئینگلیزی هاتنە کایەوەو بلاوبونەوە، وە هەروەها (تیاری) سیاسی و کۆمەلایەتی کەوتە ناومانەوە.. وە من بە تەئسیری ئەو دوو ئەدەبە کەوتمە هەوای واقیعیەتەوە.

---

[177] دیوانی پیرەمێرد، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی فایق هوشیارو کەسانی تر، ل٢٠٧.

ئەبی ئەوەش لەبیر نەکەین کە لەسەرەتاوە، بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدوای نظریەی (هونەر بۆ هونەر) ئەرۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە، وەك هینەکانی (جۆن کیتس)و (ئۆسکار وایلد)، بەلاّم لە ۱۹۳٥ بەولاوە وە دوای هاتنە ناوەوەی جوولاّنەوەی پێشکەوتوویی (تقدمی)و کۆمەلاّیەتی پالّی پێوەناین کە لەئەدەبی عەرەبی و ئینگلیزییشدا بەدوای نموونەی ئەدەبێکی تقدمی بگەڕێین. بەم هۆیەوە لە ۱۹۳٥ بەولاوە ئەم ڕێگەیەم گرت، وەك لەهەلّبەستی (دیاری خوای شەڕ)دا دەرئەکەوێ، کە لە گۆڤاری گەلاوێژ لەسالّی ۱۹٤۳دا بلاّوکرایەوەو چەند سالێك بەر لەو مێژووە دامنابوو.)) [۱۷۸]

قۆناغی گۆڤاری هیوا، قۆناغی ڕیالیزم بوو لەئەدەبی کوردیدا، دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە هەردەم پشتگیری نوێخوازیان کردووەو دەستی شاعیرانی لاویان گرتووەو هانی بلاّوکردنەوەی شیعری ڕیالیزم و نموونەی بەرزی شیعرییان داوەو واقیعە کۆمەلاّیەتییەکەیان کردۆتە بابەتی سەرەکییان.

خالید دلێر هەموو جوانی سروشت بەلاوە دەنێ ئەگەر خەلّکی ولاّتەکەی هەژارو زۆرلێکراوبن و بەدەستی هەژاری و نەدارییەوە بنالێنن، غەمی نەبوونی لەسەرووی هەموو غەمەکانەوەیە، بێ گومان دەستەلاّتییش تاوانباری یەکەمە لەو مەسەلەیەداو نەبوونی دادوەری کۆمەلاّیەتی هۆیەکەیەتی، شاعیر دەلّێ:

| | |
|---|---|
| ولاّتم لەمە زیاتر جوان بێ | هەموو شتێ هۆی دلّ خۆشی و ژیان بێ |
| ئەگەر ئێمەی خاوەن ولاّت هەژار بین | چەوسێنراوەی دەس بێگانەو زۆردار بین |
| بەئێمە چی جوانی سروشت؟ چی بەهار؟ | روونی کانی، ورشەی گیا، چرۆی دار؟ |
| کام جوانی کام ئاواز کام بۆنی خۆش | دلّی هەژار لەخەم ئەکەن فەرامۆش [۱۷۹] |

حەسیب قەرەداغی لەبیرەوەری یەکەم سالّی شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا بەراوردێك لەنێوان ژیانی کارگەران و جووتیارانی گەل دەکات، کە زۆرینەی کۆمەلّیان پێك دەهێنا لەپیش شۆڕش و دوای شۆڕش، لەوێنەیەکی شیعرییدا وادێتەگۆ:

---

[178] عبدالرزاق بیمار، دانیشتنێك لەگەلّ (گۆران)دا، گ. بەیان، ژ۲، ل۳۰، سەبارەت بە ڕیالیزمی سۆسیالیستی، کە ئاماژەمان بۆ کرد، نموونەی لە ئەدەبی کوردیدا زۆر دەگمەنە، چونکە ئەمە جیایە شاعیرێك لە شیعرێکی دا داوای سۆسیالیستی بکات، لەگەلّ بنەماکانی ڕێبازەکە خۆیدا.

[179] خالد دلێر، بەهاری ژین، گ. هیوا، ژ۱۰، س۱، ل۳٦.

کــارگــەرانـــمان، چیـنـی پێشڕەو هەڵگرانی بیری ڕوون
ڕەنجـخـــوراوو مـــایـــە پووچ بوون خاوەنی نانێ نەبوون
مـــافـی ژینیـــان ونـکـــرابـــوو زۆربەیـــان زارو زەبوون
ڕەهبەرانیان دیل و بەندبوون یا بەکوشــــتن تیا ئەچوون
ئێســــــــتە کارگەر مافی دیارەو بیری خۆی بەرپائەکا
دوژمنـــانـــی کـــۆن و تازەی ســـــەر کزو بەرپائەکا[180]

لەم وێنە شیعرییەدا، دەروونی شاعیرو کەف و کوڵی شۆرشگێڕی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز بەئاسانی خۆی دەنوێنێ و لەخۆشەویستی جووتیارو کرێکاری وڵاتدا خۆی دەدۆزێتەوە. تەنانەت وشەکان گەواهی بۆ بیری سۆسیالیستی پێشکەوتنخواز دەدەن. (کارگەر، چینی پێشڕەو، هەڵگرانی بیری ڕوون، ڕەنجخوراو). ئەم وشانە لەو ڕۆژگارەدا لەلایەن حیزبی شیوعییەوە، لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا زۆر دووبارەدەبوونەوە. لەهەمان کاتدا، لەم وێنەیەدا ئیشارەت بۆ لەسێدارەدان و لەناوچوونی ڕابەرانی ئەو بیرە، (بیری کۆمۆنیستی) دەکات، کە کرێکار بەچینی پێشڕەو لەقەڵەم دەدات، لەلایەن ڕژێم و دارو دەستەی کۆنەپەرستی پێش شۆڕش.

شاعیرێکی دی بەنازناوی (م. ڕ) گفتوگۆی نێوان بەگ و حسەشەل وەك جووتیارێکی کلۆڵی بێ دەرەتان و هەژار لەوێنەیەکی شیعریی دا دەردەبڕێت، کە بەتەواوی ژیانی جووتیاری کورد پیشان دەدات:

حسە شەل:

| | |
|---|---|
| چۆڵ کز نەبم، چۆن کز نەبم؟ | ئەی ڕووخۆش بم وەك تۆ بەگم؟ |
| هەموو ڕۆژێ بەبێ پشوو | هەتاکو شەو، بەیانی زوو |
| ئەرز ئەکێڵم، جۆگا ئەبڕم | لە برسیشا ئەوا ئەمرم! |

بەگ:

هەی نارەسەن! هەی سەرسەری! بەشی خوا تۆ ناشکوری؟[181]

شاعیر لەشیعرێکی درامی دا وێنەی نارەزایی جووتیارێك و چۆنیەتی بیر کردنەوەی ئاغایەك دەردەبڕێ و پەنجە لەسەر زامی جووتیارەکە دادەنێت، کەلەگەڵ ئەرك و ماندووبوونی

---

[180] حسیب قەرەداغی، بیرەوەری یەکەم ساڵی شۆرشی ١٤ی تەمووز، گ. هیوا، ژ(١٢،١١)، س٢، ل٥٧.

[181] م. ڕ، نموونەیەك لەرابردوو، گ هیوا،ژ٣١، ل٤٤.

زۆر بەرهەمەکەی بۆخۆی نییە و بۆ باخەڵی ئاغایەك و خۆیشی وا لەبرسان دادەمرێ، کەئەمە بێ گومان نموونەیەکی کۆمەڵگای دەربەگایەتییەو خاوەنداریەتی تایبەتی و تاکەکەس تێیدا بەرکەماڵەو هۆشمەندی دەرەبەگەییشیان دەدات لەوەی، کەمەسەلەکە ئاوەژوو دەکاتەوەو پەیوەستی دەکات بەشتێکی ئەزەلییەوەو خوا بەشی کردووە، ئەویش خۆشبەختی و بەدبەختییە.

ئەم شیعرە لەرووی کێشەوە لەسەر کێشی خۆماڵییەو هەشت بڕگەییەو لەسەر پەیڕەوی شیعری نوێ جووت قافیەیەو بەزمانێکی کوردی پەتی نووسراوەو دژە وشەکانیش توانیویانە مەبەستی شاعیر بپێکن:

کز ⟵ ڕووخۆش

شەو ⟵ ڕۆژ

ئەمە سەرباری ئەوەی هەڵبژاردنی نازناوی (حسەشەل) بۆ پاڵەوانەکە (جووتیارەکە)یش هێمایە بۆ باری دوواکەوتوویی کۆمەلاَیەتی کوردەواری[182].

لە هەمان سەدەدا شێخ حوسێنی قازی (١٧٩٠-١٨٦٨)یش (مەولودنامە)ەکەی خۆی نووسیوە. ئەم مەولودنامەیە ناوەڕۆکەکەی باسی دروست بوونی گەردوون و بوونەوەر دەکات، کە لە خۆشەویستی پێغەمبەر دروست بووە. لە ڕووی ڕووخساریشەوە زۆربەی مەولوودەکە بەپەخشانی سەروادار نوسراوەتەوە. سەرەتا ئەم پەخشانە وا دەست پێدەکات: ((ئەی موسڵمانینە ئەم مانگە مانگی مەولودە، مانگێکە زۆر عەزیمە، زۆر شەریف و کەریمە، لەتەرەفی خوداوەندی عالیمەوە، چونکە تێیدا بەوەلەدا داهاتبێ نەبییەکی کەریمی وەك محەمەدولمستەفا بێت (ص) ئەم مانگە مانگێکە تێیدا نازل بووە ڕەحمەتێکی عامەن عوموەمەن بەسەبەبی ئەم مانگەوە بۆمان حاسل بووە کەیف و سروور، بەسەبەبی ئەم مانگە ڕۆییوە لەلامان حوزن و غەم و خەفەت بەسەبەبی ئەم مانگەوە دەفع بووە لەسەرمان بەلاَو موسیبەت.))[183]

---

182 لە گۆڤاری هیوادا ژمارەیەکی زۆر لە شیعری ڕیالیزم بلاَو کراوەتەوە، بڕوانە:دلزار، بۆ فریشتە ئاسایش، گ. هیوا، ژ٤، س٢، ل١٤-١٧؛ میکائیل ڕەشید، کووداچوو، گ. هیوا، ژ٥، س٣، ل٦٣؛ هۆشەنگ، نوێژی جووتیار، گ. هیوا، ژ٣٠، س٤، ل٦٤-٦٧.

183 مەولود نامە بزبان کردی، ترجمة مصطفی شێخ حسین قاضی، ١٣٠٢، ص١. (دەسنووس).

گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی یە مانگی جارێک دەرئەچێ

**ژمارە ــ ٨ ــ سال ــ ١ ــ رەشەمی ــ شوبات ١٩٥٨**

دیمەنێکی کوێستانی شەقلاوە

**لەم ژمارەیەدا**

# بەشی سێیەم

## گۆڤاری هیواو پەخشانی کوردی

### ئاوڕێکی مێژوویی لە پەخشانی کوردی

پەخشانی نووسراو لەئەدەبی کوردیدا چەند سەدەیەك دوای شیعر دەرکەوتووە، بێ گومان مرۆڤ هەر لەسەرتاوە بەقسەو پەخشان دەستی پێ کردووە، بەلاّم پەخشانی هونەری لەرووی نووسینەوە دیارە وەك شیعر نەتوانراوە کورت و چڕ بێ و مۆسیقی بێ و ئەزبەر بکرێ، بۆیە سەرەتاو سەرهەلّدانی ڕاستەقینەی پەخشان نەوەك هەر لەئەدەبی کوردی دا؛ بەلّکو لەئەدەبی میللەتانی دیکەشدا پابەندە بەدەرکەوتنی چاپەمەنی و ڕۆژنامەو گۆڤار، بۆیە ئەدبی کوردی بەگشتی قەرزار باری ڕۆژنامەوانییە.

کۆنترین دەقی پەخشانی نووسراو، کەلەبەر دەست دابێ، کتێبەکەی عەلی تەرەماخییە لەبارەی دەستووری زمانی عەرەبی بەکوردی[١٨٤]. گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە یەکەمین کتێبی کوردییە، کەبەپەخشان نووسرابێتەوەو مێژوویەکی کۆنی هەیە، ئەگینا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شتێکی زیاد نەکردووە، لەم ڕووەوە کتێبی کۆنتر زۆرە بەزمانی عەرەبی.

دوای ئەو، (عەقیدەی کوردی) مەولانا خالیدی نەقشبەندی یە (١٧٩-١٨٢٧)، ئەم نامیلکەیە بەشێوەی پەخشان نووسراوەتەوەو ناوەڕۆکێکی ئاینی هەیە، وا دەست پێ دەکات: ((ئەگەر کەسێ دەپرسێت ئیسلام چی یە؟ ئیسلام پێنج ڕوکنی هەیە، لەسەر هەموو موسلّمانی عاقلّ و بالغ بێ واجبە بیزانێت، عەمەلیشی پێ بکا، ئەووەل ئەوەتە (اشهد): بەدەلّ دەزانم بەیەقین، بەزووبان دەلّێم بەئیختیار (ان لا اله): هیچ مەعبودێ بەحەق لایق پەرستن بێ (الا الله) ئیللا ئەو زاتە نەبێت واجبی بوونی، ئیسمی ئەللایی.))[١٨٥].

---

[184] د. مارف خەزنەدار، دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی عەلی تەرەماخی بەغدا، ١٩٧١. هەروەها: ڕەشید فندی، عەلی تەرەماخی، بەغدا١٩٨٥.

[185] محمدی مەلا کەریم، عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گ. کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کورد) ب٨، ل٢٠٦.

گرنگی ئەم پەخشانە لە ڕووی ئەدەبییەوە لەوەدایە، کە ئەو کورتە چیرۆك و پەندو عیبرەتانەی بەشێوەیەکی سادە خراونەتە ڕوو لەلای هەندێ نووسەر و ڕەخنەگران بەسەرتایەکی سادەو ساکاری چیرۆك کوردی لەقەڵەم دەدەرێن.[186] بلاوبوونەوەی چاپ و ڕۆژنامەو گۆڤار لەمێژووی کەلتووری میللەتاندا ڕووداوێکی گەورەیەو شایانی گرنگی پێدانێکی زۆرە.

لە ڕێگەی ڕۆژنامەوانیی کوردییەوە پەخشان گەشەی کردو چەندین لق و پۆپی لێ بووەوە[187] لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا ڕۆژنامەی (کوردستان ١٨٩٨-١٩٠٢) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بوو، وشەی کوردی بەهەموولایەکدا بلاو کردەوەو بووە سەرەتایەك بۆ ڕۆژنامەوانیی کوردی و هونەرەکانی پەخشانی بەرەو پێشەوە برد. پاشان گۆڤاری (ڕۆژی کورد-١٩١٣)، وتارو چیرۆك و بەشەکانی دیکەی پەخشانی ئەدەبی چەند هەنگاوێك بردە پێشەوەو تەنانەت بەسەرەتایەك دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوەی چیرۆکی هونەریی کوردی. دوای جەنگی جیهانی یەکەمییش ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی- ١٩١٨) و (گۆڤاری زاری کرمانجی - ١٩٢٦) و (ڕۆژنامەی پێشکەوتن- ١٩٢٠) و (گۆڤاری گەلاوێژ-١٩٣٩) و (گۆڤاری هیوا-١٩٥٧) و (گۆڤاری شەفەق- ١٩٥٨)... هتد، هەموویان لەدایك بوون و لەهەمەچەشنیی هونەرەکانی پەخشانی کوردی دا ڕۆڵێکی دیارو بەرچاویان هەیە.

بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی پەخشانی ئەدەبی (هونەری)، کەمەبەستی ئێمەیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، لەچەشنە سەرەکییەکانی دەکۆڵینەوە، کەئەوانیش (وتارو ژیاننامەو چیرۆك)ن.

---

[186] بۆ ئەم ڕایە بڕوانە: د. عزالدين مصطفى رسول، الواقعية في الادب الكردي، ص٢٠٦؛ د. معروف خزندار، القصة الكردية، مجلة الثقافة الجديدة، العدد الثاني، بغداد، ص٩٤؛ د. جمشيد الحيدري، تاريخ تطور النثر الفني الكردي في العراق، مجلة دراسات كردية، العدد الاول، السنة الاولى، ١٩٨٤، ص٥٨.

[187] پەخشانی نووسراو بەشێوەیەکی گشتی دابەش دەبێتە سەر دوو جۆر: ١- پەخشانی ئەدەبی (هونەری)، ٢- پەخشانی زانیاری. پەخشانی ئەدەبی (هونەری) چەند لقێکی لێ دەبێتەوە - وتار - خوتبە چیرۆك شانۆگەری، ژیاننامە، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق، بیرۆکە، دانان، لێکۆڵینەوە، نامە، وەرگێران، مێژوو، وتووێژ. بەلام پەخشانی زانیاری ڕاستییەکی زانیاری دوور لە سۆزو خەیاڵ دەردەبڕێ و بیری نووسەری تیا دەرناکەوێ، بەپێچەوانەی پەخشانی ئەدەبی (هونەری) کە پشت بە وشەی ڕازاوەو خەیاڵی فراوان دەبەستێ و نووسەر ڕای خۆی دەردەبڕێ. بڕوانە: د.شوکریە ڕەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، ل١٣٥.

## هونەرە سەرەكییەكانی پەخشانی كوردی

### یەكەم: وتار

(وتار) چەندین پێناسی جیاجیای بۆ كراوە. چەند پێناسەیەك بۆ نموونە دێنینەوە بۆ ئەوەی لە ناوەرۆكی ئەو پێناسانەوە چەند خاڵێكی گرنگ دەستنیشان بكەین. لە (ritannicaEncyclopaedia B) دا هاتووە: ((هونەرێكی ئەدەبییە بەشێوەیەكی سادەو كورت لەسنورێكی دیاریكراودا نووسەر لێی دەكۆڵێتەوەو بیروڕای خۆی تێدا دەخاتە ڕوو.))[188]

لە فەرهەنگی (لارۆس)ی فەرەنسیشدا نووسراوە: ((وتار بەو نووسینە دەوترێ، كە نووسەرەكەی تێیدا قووڵ نە بۆتەوەو وەڵامی تەواوی نەداوەتەوە.))[189] د. ناصر الحانی دەڵێ: ((شێوەیەكە لە شێوەكانی ئەدەبی پەخشان، ئامانجی گەیاندنی هەواڵێكە یان ڕوون كردنەوەیەكی زانستییە.))[190] د. شوكریە ڕەسوڵ دەڵێ: ((نووسینێكی ئەدەبییە لایەنێ لەلایەنە دیاریكراوەكانی ژیان دەگرێتە خۆ یا بابەتێكی تەسكی ژیان لێك دەداتەوە.))[191]

لە هەمان كات دا لێكۆڵەرەوەكان هەوڵیان داوە جیاوازی لەنێوان وتاری ئەدەبی و غەیرە ئەدەبی دا بكەن، یوسف نجم دەڵێ: ((وتاری ئەدەبی پارچە پەخشانێكی سنووردارەو بەشێوەیەكی خێراو عەفەوی بێ زۆر لەخۆ كردن و ماندوو بوون دەنووسرێ و یەكەم مەرجیشی ئەوەیە دەبێ گوزراشتێكی ڕاستگۆیانەی كەسیەتی نووسەر بێ.))[192]

((وتاری ئەدەبی دەبێ جۆرە شاعیریەت و بەهرەیەكی تیابێ و نووسەر زۆر لەخۆی نەكات بۆ نووسینی و لەمەرجە سەرەكییەكانی تەكنیكی هونەریو خودی نووسەر دەربڕینە، لەوەشدا لەگەڵ وتاری فێركردندا یەك دەگرنەوە، كەهەردووكیان سیفەتی كورتیو باسكردنی بابەتێكی دیاریكراویان هەیە، بەڵام ئەوەی دووەمیان (وتاری فێركردن- هـ) تەنها پێویست بەوە دەكات نووسەر ماددە زانستییەكان بەشێوەیەكی ڕوون و بەزمانێكی چاك دەربڕێت.))[193] ((وتاری

---

[188] Encyclopaedia Britannica .

[189] عبداللطیف حمزة، المدخل في فن التحریر الصحفي، ص١٧٣.

[190] الدكتور ناصر الحانی، المصطلح في الادب الغربي، ص١٥٢.

[191] د. شوكریە ڕەسول، ئەدەبی كوردیو هونەرەكانی ئەدەب، ل١٣٨.

[192] محمد یوسف نجم، فن المقالة، ص٩٥.

[193] د. علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، ص ٢٦٣.

ئەدەبی لەسەر بەرنامەیەکی دیاریکراودا ناڕوات، بەڵام لە ئەوەی تر پێشەکی و خستنە ڕوو و کۆتایی و بابەتی و گرنگی دان بە مەبەستی فێرکردن سیمای وتارەکەیە.))[194]

هەروەها جیاوازیەکی دیکەش لەنێوان هەردوو وتاردا بەدەی دەکرێت، ئەویش ئەوەیە: ((وتاری ئەدەبی ناتوانێ درێژەی پێ بدەیت و بیکەیتە بەرهەمێکی درێژ یان کتێبێك، بەڵام دەتوانرێ ئەوە لەگەڵ وتاری تەعلیمی دا بکرێت، لێکۆڵینەوەیەکی کورت بکەیتەوە لێکۆڵینەوەیەکی درێژ یان کتێبێك.))[195] ئەمە بێجگە لەوەی وتاری ئەدەبی کەسایەتی نووسەری تێدا دەردەکەوێت وتاری تەعلیمی ڕۆشنایی دەخاتە سەر بابەتەکەو بە وردی شی دەکاتەوەو جێگەی سۆزو خەیاڵی تێدا نابێتەوە.

وتار بەبەرزترین هونەری ئەدەبی دەژمێردرێت، ئەمەش ڕەنگە لەوەوە بێت بەپلەی یەکەم، چونکە وتار بۆی دیار نەکراوە، کە چ بابەتێك بخاتە ڕوو وە چی دەگرێتەوە، ژیان و زیندەگی مرۆڤ بەهەموو بوارەکانیەوە دەشێن ببنە ماددەی وتار نووسین، کەوابێ وتار پەل پۆی زۆری لێ دەبێتەوەو سیفەتی گشتی وەردەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بۆزیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست دەکرێ چەند بابەتێکی وتار جیا بکەینەوە:

١- **وتاری کەسیەتی:** دەربڕینێکی هونەری ڕاستگۆیانەیە نووسەر لەمیانەی ئەزموونەکانی ژیانی خۆیەوە هەڵیهێنجاوەو ڕەنگدانەوەی سروشت و ناخی خۆیەتی.

٢- **وتاری کۆمەلاَیەتی:** ئەو وتارەیە، کەنووسەر تیایدا ڕەخنە لەناهەمواریەکانی کۆمەڵ دەگرێ و هەوڵ دەداتـ((زۆر جاران بەجۆرە تەوس و پلارێکیشەوە)) بیروڕای خۆی لەمەڕ هەژاریو داب و نەریت و نەخوێندەواریو شتە تازە داهاتووەکانی کۆمەڵ دەربڕێ.

٣- **وتاری وەسفی:** نووسەر وەسفی ژیانی سروشتی و کۆمەلاَیەتی دەکات، وەسفی سروشت دەکات، بەچیاو دارو دەوەن و چینەکانی کۆمەڵ، هەموو ئەم وەسفانەش لەپێناو خستنە ڕوو و

---

194 قدام سعيدة، المقالة في الادب الجزائري الحديث،(رسالة ماجستير) جامعة بغداد، كلية الاداب، ص١٧. بەلاَم نووسەرێکی تر بیروڕای جیای هەیە، کەوتاری ئەدەبیش بەرنامەی هەیە، بڕوانە: مر الدسوقي، نشأة النثر الحديث وتطوره، القاهرة، ص٨١.

195 د. علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، ص٢٦٤؛ الدكتور فائق مصطفى والدكتور عبدالرضا علي، في النقد الادبي الحديث ومنطلقات و تطبيقات، الموصل.

هەروەها مامۆستا عەزیز گەردی هەڵاێلیشانەی وتاری هونەریی چاکی دەست نیشان کردووە، بڕوانە: عەزیز گەردی، پەخشانی کوردی، زانکۆی سەلاحەدین، مەنهەجی پۆلی سێیەمی بەشی کوردی لە کۆلیژی ئەدەبیات، هەولێر، ١٩٧٩، ل٣٥-٣٦

ڕوونکردنەوەی مەبەست، واتا ((لێرەدا وسف کردن هۆکارە و ئامانج نیە. هۆکارێکە بۆ چەسپاندنی ئەو ڕایەی، کەدەیەوێ بیخاتە ڕوو ڕەنگە بابەتەکە سروشت بێ یا هەندێ زیندەوەر بێ. نووسەر لەسرنج دانی و دەست نیشان کردنی دا مەبەستی ئەوەیە ببێتە یارمەتی دەرێك بۆ ئاشکرا کردنی ئەو ڕایانەی کەدەیەوێ پێشنیاری بکا.))[196]

٤- **وتاری فەلسەفی:** نووسەر سەرنجی خۆی لەمەڕ بوون و کێشەکانی ژیان و فەلسەفەی بوونی خوداو دروست بوونی مرۆڤ دەردەبڕێن بەجۆرێك کەورد بوونەوەو ڕامانی قووڵی تیایە بۆ ڕاڤە کردنی ئەم گەردوونە.

٥- **وتاری زانستی:** ئەو نووسینانەن کە نووسەر دەیەوێ بەکورتی کۆمەڵێ زانیاریی، جا چ لە بواری زانستە ڕووتەکان، وەك بیرکاری و فیزیاو کیمیا یان زانستە کۆمەلایەتیەکان و مرۆییەکان وەك جوگرافیاو مێژوو و کۆمەڵناسی بەخەڵك بگەیەنێ لەسەر بەرنامەیەکی زانستی و گونجاو.

٦- **وتاری ڕەخنەیی:** ئەو پارچە نووسینانەیە، کە نووسەرەکەی بابەتێکی ئەدەبی وەردەگرێت و هەڵیدەسەنگێنێ و ڕەخنەی لێ دەگرێت و لایەنە ڕاست و ناڕاستەکانی دەخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە.

سەرەتاو سەرهەڵدانی وتار لەئەدبی کوردیدا، هەروەك میللەتانی دی پەیوەستە بەلەدایك بوون و بلاوبوونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو چاپەمەنییەوە.[197] بلاوبوونەوەی چاپەمەنی و ڕۆژنامەیش پەیوەندە بەرادەی هۆشمەندی و ڕووناکبیریی ئەو میللەتەوە، ڕۆژنامە لەنێو میللەتانی خوێندەواردا زووتر بلاو بۆوە و هەر لەوەێشەوە وتارو سەروتار وەك کۆڵەکەی پشتی ڕۆژنامەنووسی گەشەی کردو بەرەو پێشەوە چوو. لەگەڵ دەرکەوتنی پرشنگی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان) لە ٢٢ی نیسان ١٨٩٨ دا، دەبینین وتار خۆی دەنوێنێ، لەوتارێکدا کەخەڵکی بۆ خوێندن هان دەدات، دەڵێ: ((حەزرەتی پێغەمبەر (علیة الصلاة والسلام) گوتی: ((العلماء ورثة الانبیاء))

---

[196] د. شوکریە ڕەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، ل١٤٠. هەروەها قدام سعیدة، المقالة في الادب الجزائري الحدیث، ص١٨ د. دواد سلوم، النقد الادبي، القسم الثاني، ص٢٧.

[197] سەبارەت بەگرنگی وتار لەئەدەبی عیراقی هاوچەرخ و سەرهەڵدانی لەباوەشی ڕۆژنامەدا بروانە: د. منیر بکر، اسالیب المقالة وتطورها في الادب العراقي الحدیث والصحافة العراقیة، ط١، ص٧-١٠؛ الدکتور محمد حسن عبدالله، فنون الادب دار الکتب الثقافیة،ط٢،الکویت، ص٢٦١.

ئانكو عولەما وارسین ئەنبیانە ژ تەرەفی خودیدە مەئموون وەعزو نەسیحەتی بدەن، خەلكی رێیا قنج نیشان وان بکەن لەوما گەلی عولەمایێن کوردا چاوە ئەوان وەعزو نەسیحەتا نیـژی ددەن وەلی دڤیٚ ئەوان میرو ئاغاو کرمانجین دناسن وان تەشویقا زانینان عیلم و مەعریفەتی بکەن رێیا قنج نیشا وان بکەن هەکی ئەوان وی نەکەن گونەهی حەمیا ستۆی وەیە.))[198]

لە کوردستانی عیراقیشدا، ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە ژمارەیەکی: سیٚ شەممەی یەکی کانوونی دووەمیدا، چەند وتارێك بەرچاو دەکەوێت. لە وتارێکیدا، کە دێتە سەر باسی پەیوەندی نێوان ئەڵەمان و عوسمانیی (تێگەیشتنی ڕاستی) دەڵیٚ: ((... بەڵی ئەڵەمانیا حکومەتێکی جەلادە، ئەمما کوشتنی تورکی لە پێش عەرەب و کورد ئارەزوو دەکردو لەژێریشەوە بۆ کوشتنی عەرەب و کورد دەستی بەتورکەکانەوە دەنا.))[199] ئەگەر سەیری باری خوێندن و خوێندەواریش لە باشووری کوردستاندا بکەین، تا سەرەتای ئەم سەدەیەش ژمارەی خوێندنگاو قوتابخانەکان لەپەنجەی دەست تێپەڕی نەکردووەوە خوێندەوار کەمبوون. پیرەمێرد دەڵیٚ: ((کە لە ئەستەمبول هاتمەوە، ئەم سلێمانییە پەپوو تیا ئەیخوێند، شارێکی وێران، قەومێکی پەرێشان، نەخەستەخانە، نەقوتابخانە، نەمامۆستا هیچی نەبوو، زیوەر، مەلا سەعید بیٚ پارەو پوول دە دوانزە منداڵیان گردکردبووەوەو دەرسیان پیٚ دەوتن.))[200]

حاڵی میللەتێك لە ڕووی خوێندەوارییەوە وابیٚ بیٚ گومان ڕۆژنامەو گۆڤار درەنگ دەردەکەویٚ. ئەگەر ڕۆژنامەو گۆڤار لە مێژووی میللەتان دا وەك سەرچاوەی یەکەم سەیر نەکرێت، ئەوا بۆ مێژووی کوردو باری کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری بە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەپێز دادەنرێت لەمەیدانی لێکۆڵینەوەدا، چونکە توانای چاپ و چاپەمەنی بەتایبەتی کتێب هەردەم کۆسپ بورە. ڕەنگە ئەمەش بەپلەی یەکەم نەبوونی قەوارەی سیاسی و دەوڵەتی سەربەخۆی خاوەن دەسەلات هۆکارەکەی بیٚ. بۆیە وتارە

---

198 د. کەمال فواد، کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی،١٨٩٨–١٩٠٢، ل١٢.

199 د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا، ل١٦٢.

200 غەفوور میرزا کەریم، تەقەللایەکی دڵسۆزانە بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری لە کوردستانا و کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، ل١٤.

جیاجیاکانی ناورۆژنامە و گۆڤارەکان تا ڕادەیەك ئەو کەلێنە بەر فراوانەیان پڕ کردۆتەوە، وتـار لـە ئـەدەبی کوردیـدا، ئەوەنـدە گرنگـی پـێ نـەدراوەو لێکۆڵینـەوەی بـەرفراوانی زانـستیانەی دەربارەی نەکراوە، بەشێوەیەك لە مێژووی ئەدەبی هاچەرخ دا وەك هونـەرێکی ئـەدەبی لایەنـە ئیـستاتیکاکانی وەك داهێنـانێکی ئـەدەبی نەخراوەتـە ڕوو، ئەمـەش وەنـەبێ هـەر لەئـەدەبی کوردیدا، بەڵکو لە ئەدبی عەرەبی و میللەتی تریشدا ئەم دیاردەیە بەر چاو دەکەوێ.[٢٠١]

دیاردەیەکی دیکە لە وتار نووسەکاندا سەرنج ڕادەکێشێ. ئەویش ئەوەیە، هەروەك پێشتر ڕوونمان کردەوە، ژمارەی ڕۆناکبیرە کوردەکان لە سەرەتای ئەم سەدەیەو تا چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیە کەم بوون، بۆیە وتارەکان لەلایەن شاعیرو ئەدیب و ڕۆشنبیرانەوە نووسـراون، بەهـەموو جۆرەکانییەوە، وتاری سیاسی و ئەدەبی و کۆمەلآیەتی و زانستی... هتد، شـێوازی هـەموویان زیاتر شێوازی ئەدەبی یان بەسەر دا زاڵە لە ڕووی شێوازو زمانەوە.

گۆڤاری (هیوا) هەروەك ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی پێش خۆی، وتاری بـەبڕبڕەی پـشتی خـۆی زانیوەوە گرنگی تایبەتی پێداوە، لەگەڵ تێکەلآوییەك لە نووسینی وتارەکان لەلایـەن ئـەدیب و ڕۆشنبیرو پزیشك و ئەندازیارانەوە، واتا ڕوناکبیرەکان بێ گوێدانە ئەوەی، کە خـۆی ئەدیبـە بـۆ نموونە، کەچی وتاری سیاسیشی نووسیوەو لە چەندین مەیـدانی دی وتـاری نووسـیوە، ئەمـەش بەپلەی یەکەم هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کەژمارەی ڕۆشنبیرو خوێندەوار لەو کاتەدا کەم بووە، هەر ئەو چینە لە مەیدانەکەدا بوون و کاروباری سیاسـی و ئیداریـشیان بـەڕێوە بـردووەو کۆمەڵیان لە ئەو ئاستەنگانەی بەردەمی هۆشیار کردۆتەوە. لە پاڵ ئەوەشـدا گۆڤـاری (هیـوا) بڕوای تەواوی بە پسپۆریەتی هەبووە[٢٠٢] و هەوڵی داوە سوود لە شارەزایی و پـسپۆری کەسـانی دیار وەربگرێ و بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی پێوە کـردوون. هـەروەها گۆڤارەکـە کۆشـشی زۆری کردووە، لەبەر نەبوونی گۆڤاری بلاکراوەی تایبەت بە زانست و سیاسەت و مێژوو و فۆلکلۆر و ڕەخنەو ئەدەبی منداڵان و شانۆ و جوگرافیا و ئابووری، وتارەکان هەمە جۆرە بن و هەموو ئەو

---

[201] بروانە: فاضل ثامر، في جماليات المقالة الحديثة في الادب العراقي، مجلة الاقلام، العدد ١٢، ص٣٧-٤٦.

[202] لە ژمارەکانی گۆڤارەکەدا چەندین وتاری زانستی و تەندروستی بلاو کراوەتەوە، کە هەموویان بە قەڵەمی کەسانی پیسپۆر و پزیشکەکان نووسراون، لەوانە دکتۆرەکان ئەحمەد عەلی عوسمان و ت. ب مەریوانی و عەبدولرەحمان عەبدوڵلآ و نامق قادرو...هتد.

مەیدانانە بگرێتەوە، بە تایبەتی لە سالآنی یەکەم و دووەمی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا چەندین وتاری سیاسیی بلاّو کردۆتەوە.[٢٠٣]

## وتارەکانی گۆڤاری هیوا بەپێی مەبەست و ناوەرۆك

وتارەکانی گۆڤاری هیوا بەپێی مەبەست و ناوەرۆك بەم شێوەیە دابەش دەکەین:

### وتاری ئەدەبی هونەری:

وتاری ئەدەبی ئەو بیروڕایانەیە، کە ئەدیب بە زمانێکی پاراوو وشەی ڕازاوە و بۆچوونی پڕ لە سۆزو ئەندێشەو خەیالّی داهێنەرانە لەو بابەتانە دەدویّ، کە پەیوەندە بەرێبازەکانی ئەدەب و چۆنیەتی پێش خستنی ئەو ئەدەبە بۆ ئاستێکی بەرزوجوان لە ڕێگەی لێکۆلّینەوەو ڕەخنە.

وتارە ئەدەبییەکانی گۆڤاری (هیوا) چەندین بابەتی زیندووی ئەدەبی بەخۆوە گرتووە، هەر لە گرنگی وێژەو ژانرەکانی ئەدەبی و دەوری نووسەران و پێوەندی ئەدەب بە کۆمەلّەوە. شێخ محەمەدی خالّ چەند وتارێکی لەمەڕ وێژە بلاّو کردۆتەوە، لە وتارێکدا بە ناوی (وێژە) دا دەلّیّ: ((ئاشکراو عەیانە لە هەموو کەسێکەوە کە وێژەی هەموو گەلێك ئەگۆڕیّ بەپێی گۆڕانی وێژەر -ادیب-ەکایان، وە بەپێی خوێندەوارییان و ئارەزوویان و پەی دەستییان لەگەلّ ئەو بیروباوەڕانەی، کە هەیانە هەروەك ئەگۆڕیّ بەپێی ناوچەیان، ئەنجا ئەم ناوچەیە ناوچەی کۆمەلآیەتی بیّ لە سیاسەت و ئایین و باوی ناوخۆیان، یا ناوچەی سروشتی - طبیعي- بیّ لە سەرماو گەرماو شاخ و داخ و دەشت و دەرو چەشمەنداز. هەموو وێژەیەك ئەگۆڕیّ بەگۆڕانی گەل، وە لەگەلّ ئەوا ئاوێتە ئەبیّ. وە هەردوو لاکار لەیەکتریی ئەکەن.))[٢٠٤]

بەوپێیە تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە هەموو ئەدەبێك لەدایکبووی سەردەمەکەی خۆیەتی و بەو پێیە لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە هەموو ئەدەبێك لەدایکبووی سەردەمەکەی خۆیەتی و بەو پێیە مامەلّەی لەگەلّ دەکریّ، هەروەها ئەدەب دیاردەیەکی نەتەوەییە. ئایا

---

[203] گۆڤاری (هیوا) لەسەروتاری ژمارە (٩، ١٠) ی سالّی دووەم، نیسان و مایسی ١٩٥٩ ئەوەی ڕوون کردۆتەوە: ((هەر لەسەرەتای شۆڕشەوە، (هیوا) بوو بە دەنگێکی شۆڕش بۆ ناو گەلی کورد. وە بەم پێیە لەبەر نەبوونی ڕۆژنامە و گۆڤاری سیاسی کوردی لە سەرەتای شۆڕشدا (هیوا) توانی ئەو ئەرکە بگرێتە شان و لە سنووری خزمەتی گەل لە ڕووی ئەدەبەوە بچێتە دەریّ بۆ خزمەتی سیاسی)).

[204] شێخ محمدی خالّ، وێژە، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٧.

نووسینی (هونەر بۆ هونەر) یان (هونەر بۆ کۆمەڵ) کامیان ڕاستە؟! ئەمە مەسەلەیەکی ڕەخنەییە و پێوەندی بە ئایدیۆلۆژیا و جۆری بیرکردنەوەی نووسەرەوە هەیە.

لە مەسەلەیەکی ئاوا کاریگەری ئەدەبیدا وتارێک بەناونیشانی (ئەدەب بۆ کێ ئەنووسرێ؟!) نووسراوەو ئەو دوو ڕێبازە شی دەکاتەوە و دەڵێ: ((سەرچاوەی ئەدەب لە کۆمەڵەوەیە وەخۆی کردەوەیەکی کۆمەڵایەتیە نەك کردەوەی تەنها کەسێ وە هەموو کارەسات و ڕووداوێك لە تەبیعەت و ژیاندا کاری تێ نەکات. یانی کردەوەیەکی زیندووەو بەستراوەتەوە بەقانوونی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیەوە وە ئەدەب وێنەیەکی ڕاستەقینەی هەست و هۆش و بیرباوەرو شێوەی ژیانی و پەیڕەوی کۆمەڵێك یا چینێك ئەنوێنێ لە قۆناغێکی تایبەتیدا.))[205]

قۆناغی پەنجاکانی ئەم سەدەیە نەوەك هەر لە ئەدەبی کوردیدا، بەڵکو لە ئەدەبی عەرەبیی عیراقیشدا بە قۆناغی کامڵبوون و گەشە کردنی هونەری چیرۆك ناوەدبرێت، شیکردنەوەی مەرجەکانی چیرۆکی سەرکەتوو و چۆنیەتی نووسینی ئەو هونەرەو جۆرەکانی چیرۆك لە وتارێکی بەنرخدا بلاوکراوەتەوەو دەڵێ: ((... پێویستە چیرۆك بەشێوەیەك دابڕێژرێ کە زنجیرەی خەیاڵی خوێندەوار نەپسێنێ، پچڕ پچڕ نەبێ، نووسەر بەهەموو ئارەزوویەکەوە هەوڵ بدات ئەو بیرەی مەبەستیەتی دەری بڕێ و بەپێی توانای خۆی دووری نەخاتەوە، لێرەدا چیرۆك نووسی چاك وەك سوار چاك وایە کە توند جڵەوی ولاخەکەی ئەگرێ و هەرگیز بۆی شل ناکا کە هەڵیگرێ. کەواتە پێویست لەسەر نووسەر دوای قەڵەمی نەکەوێ هەرچۆنێکی دایە بەر بۆی شل کا، چونکە ئەگەر دڵسۆزیەکی وای بەرامبەر - فیکرەو موچوع - پیشان دا ئەو کاتە چیرۆکەکە بینایەکی قەشەنگ دەرئەچێ.))[206]

(گۆران) لەسەر خواستی (هەڵبەست دۆستێك) وتارێکی لەمەڕ کۆنی و تازەیی لە هەڵبەستا نوسیوەوە دەڵێ: ((هەڵبەستی کۆن دوایی هەموو بەیتەکانی بەدرێژیی کشانی قەسیدە یان غەزەل لەسەر یەك قافیە ئەڕوا، بەلاّم یەك قافیە لە هەڵبەستی تازەدا دێڕەکان - زۆرتر - دوو دوو ئەبەستێ پێکەوە، لای ئەوپەڕی لەقافیە بەندی دێڕەکانی یەك بەند زیاتر تێ ناپەڕێ.))[207]

---

[205] احمد دڵنیا، ئەدەب بۆ کێ ئەنووسرێ؟!، گ. هیوا، ژ(١٢،١١)، ل٣٠.

[206] مصطفی صالح کریم، چیرۆك نووسین و هونەری چیرۆك، گ. هیوا، ژ١٢، س١، ل٤١.

[207] گۆران، کۆنی و تازەیی لە هەڵبەستا، گ. هیوا، ژ٣١، ل٧.

ج. بابان چەندین وتاری هەمە چەشنەی سەبارەت بەهونەری مۆسیقاو گۆرانی بلاو کردۆتەوە، لەوتارێك دا سەبارەت بەمەقامە کوردییەکان و گۆیندەو هونەرمەندە دەنگ خۆشەکان دەڵێت: ((لە کوردەواری دا دەنگ خۆش و گۆیندەی وا هەڵکەوتوو هەبوون و هەن کە پێویستە هەرگیز هەر بەشانازیەوە ناویان ببرێ و لەهەمان کاتدا هەوڵی ئەوە بدرێ کە نەهێڵرێ ناوی ئەوانەی ڕۆیشتون لەبیر بچنەوە پێویستە ناوی ئەوانەی ئێستاش هەن بخرێنە پێش چاو خۆ ئەگەر بۆ شانازیش نەبێن باهەر بۆ مێژوو بێت و بەس.))[208]

علاءالدین سەجادی لە چەمکی ئەدەب دەکۆڵێتەوەو لە وەڵامی پرسیاری ئەدەب چییەو چۆن لەناو کورد دا ئەو گوزارەیەی پەیدا کردووە، دەنووسێ: ((ئەدەب بەجۆرێکی تێکڕایی بەمانا زیرەکی و شەرم و ڕاگرتنی هەر شتێکە لە ئەندازەی خۆیا. عیلمی ئەدەب شت زانین و زانیاریە کە هەر کەس بەهۆی ئەوەوە ئەتوانێ خۆی بپارێزێ لەو شتە ناشایستانە کە بەهۆی زمان وە یا کردەوەیەکەوە بەسەریا دێت بەجۆرێکی تایبەتیش (ناوە) نایاب و مۆزیقای دڵرفێن و پیشەی قەشەنگ ئەگرێتەوە.))[209]

### وتاری زانستی

مەبەست لە وتاری زانستی ئەوەیە، کە لە ناوەرۆکەکەیدا ڕاستییەکی زانستی بەمرۆڤ دەگەیەنێ بەزمانێکی سادەی دوور لە خەیاڵ و فانتازی و لەسەر بنەمای ژیرییە. گۆڤاری هیوا هەروەك لەسەر بەرگەکەی نووسراوە (گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستییە)، دیارە وتاری زانستیش شوێنی تایبەتی خۆی لەسەر لاپەرەکانی ئەو گۆڤارەدا بینیوە. وتارە زانستییەکان زۆربەیان لەلایەن کەسانی پیسپۆڕو شارەزاوە نووسراون، لەپاڵ ئەوەدا گۆڤارەکە خۆیشی لەلایەن دەستەی نووسەرانەوە گۆشەیان بۆ هەواڵی زانستی تازە کردۆتەوە، کە تیایدا تازەترین هەواڵی زانستییان بە خوێنەران ڕاگەیاندووە. وتارە زانستییەکان ناوەرۆکەکانیان (تەندروستی و کشتوکاڵ و ئەلکترۆنیك و مانگی دەستکردو تەلەفۆن و چەندین بابەتی دی گرتۆتەوە.)

لە وتارێکدا سەبارەت بەنەخۆشی (سوتانەوەی پەردەدی مێشك وەیا تای مێشك **(ذات السحايا)** و چۆنیەتی بلاوبونەوەو خۆپاراستن و دەرمان کردنی ئەم نەخۆشییە ترسناکە، نووسراوە: ((نەخۆشی سوتانەوەوی پەردەی مێشك زۆر توندو تیژەو وە ئێجگار بەوئاسانی بلاو

---

[208] ج. بابان، گۆیندە دەنگ خۆشەکانی ناوچەی سلێمانی، لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل١٤.

[209] علاءالدین سجادی، ئەدەب و گوزارەی ئەدەب، گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل٧.

ئەبێتەوە، لەپڕ بەتاو سەرێشەیەکی بێ ڕەزا و دڵ تێك هەلاتن و ڕشانەوەوە پەڵەی سووری پێستەوە خۆی دەرئەخا. میکرۆبی ئەم نەخۆشیە لە پارچەی سەروی جهازی هەناسەدا وەك قوڕگ و گەروو خۆی دا ئەکوتێ و لەوێوەو تەشەنە ئەکاتە ناو خوێن و ئیتر بەهۆی خوێنەوە خۆی ئەگەیێنێتە پەردەی مێشك و لەوێدا دەست ئەکا بە تێکدان- ئەم نەخۆشیە تا ك تاك هەمیشە لەشارە گەورەکاندا ڕوو ئەدا.))[21]

بە حوکمی ئەوەی کوردستان لەو ڕۆژگارەدا کشتوکاڵ کۆڵەکەی سەرەکی بنەمای ئابووری بووەوە ژمارەی جووتیاران زۆرینەی پێکدەهێنا، بۆیە بلاوکردنەوەی زانیاری بەکەڵك سەبارەت بەکشتوکاڵ و چۆنیەتی بەرەو پێشەوەبردنی و زانیاری لەبارەی دەورەی کشتوکاڵییەوە کارێکی سوودمەند بووە، لە وتارێکی ئەکرەم جاف دا هاتووە: ((دەورەی کشتوکاڵ ئەوەیە کە زەوییەك بە نۆرە ئەکرێت بە کشتوکاڵ. بە جۆرێکی وا کە ئەرزەکە بێ هێز نەبێت و بەرهەمی زۆر بێت هیچ مەگەزو نەخۆشی و گیای خراپی لەناو نەبێت. چونکە ەوڵاتی ئێمەدا پەینی کیمیاوی ناکەینە زەویەکانمانەوە، جا ئەگەر بە جۆرێکی تر خزمەتی ەرزەکانمان نەکەین ئەوا زیانمان ئەبێت.))[21]

لە بابەت گەشتی ئاسمانی و نهێنییەکانی بۆشایی ئاسمان، کە تاوەك ئەمڕۆیش زانیاریمان کەمەو وتاری لەو بابەتەمان کەمە، گۆڤاری هیوا وتارێکی درێژی سەبارەت بە ەانگی دەستکرد و جیهانی ئەلکترۆنیك و ئامێرەکانی گەیاندنی بێتەل و تەلەفۆن، داهێنانی زانست و تەکنەلۆژیای نوێن، چۆنیەتی ئیشکردنی ئەو ئامێرە سەیرەی (تەلەفۆن)، کە لە بەند ساتێکی کەم دەنگت بە دوورترین شوێنی جیهان دەگەیەنێ، بلاو کردتەوە: ((تەلەفۆن یشەکەی ئەوەیە، کە دەنگ ئەگۆڕێ بە کارەبا، وە ئەم کارەبایە بە تەل دا ئەنێردرێت دوای ەمە بەهۆی جیهازێکی تایبەتیەوە کارەباکە ئەبێتەوە بەو دەنگەی لە پێشەوە نێرراوە. بەم ۆرە دەنگە ئەبیسترێت، وە بۆ ئەم ئامانجەش دوو جیهازی تایبەتی هەیە: یەکەم (نێرەر)، ووەهەم (وەرگر).))[21]

---

[21] دوکتور عبدالرحمن عبدالله، سوتاننەوەوی پەردەی مێشك وە یاتای مێشك (ذات السحايا)، گ. هیوا، ۱، س۱، ل٥٢. پاشان دکتۆری ناویراو ئەم وتارەو چەندین وتاری دی لە کتێبێکی سەربەخۆدا بلاو ردەوە، بڕوانە: دکتۆر عبدالرحمن عبدالله، تەندروستی گشتی، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، ۱۹۷۲.

[21] ئەکرەم جاف، دەورەی کشتوکاڵ، گ. هیوا، ژ۷، س۱، ل۷۲.

[21] ف.ع، تەلەفۆن، گ. هیوا، ژ۹، س۱، ل٥٤.

بەم شێوەیە گۆڤاری هیوا زۆربەی وتارە زانستییەکانی بە کوردییەکی پەتی و لەلایەن کەسانی شارەزاوە نووسراوە، تا ئەو کاتە گۆڤارێکی زاستی نەبووە، بۆیە گۆڤارەکە بە پێویستی زانیوە بەشداری لە بەرەو پێشەوە بردنی کاروانی زانست لە کوردستاندا بکات بەشێوەیەك کە لەگەڵ ژیان و بیرکردنەوەی میللەت و ئاستی ڕۆشنبیریاندا بگونجێت.[٢١٣]

### وتاری کۆمەڵایەتی:

بابەتی وتاری کۆمەڵایەتی هەموو ئەو دیاردانەی ڕۆژانەیە، کە پەیوەندییان بە چینەکانی کۆمەڵەوە هەیە، نووسەری وتار، ئەندامێکە لە کۆمەڵەکەیدا لەبەر ئەوە دەوری کارلێکەر و کارتێکراو دەبینێ، هەم کار لە خەڵکەکە دەکات و هەم کۆمەڵیش کاریگەری لە دەروون و بیرکردنەوەی ئەودا هەیە و کەرەسەو هەوێنی سەرەکی نووسینەکانیەتی. وتار کۆمەڵایەتییەکان هەموو ئەو دەردو ژان و ناهەمواریيانەی گرتۆتەوە، کە لە کۆمەڵی کوردەواری هەستی پێ کراوەوە ئەو ڕێگەچارانەی، کە دەبنە هۆی ئەوەی ڕادەی هۆشمەندی ئینسانی کورد بەرزبکاتەوە، بەرامبەر بەدەورو پایەی لە کۆمەڵدا. تەوەرە سەرەکییەکان، (ژن و منداڵ و گەنج و پیاو)ی گرتۆتەوە، هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا و چەند ساڵێك دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیی لە شارەکانی کوردستان قوتابخانەی کچان کرایەوە.[٢١٤]

لەوکاتەوە ڕووناکبیرانی کورد بە شیعرو وتاری کۆمەڵایەتی بەپێز هانی خەڵکیان داوە بۆ ئەوەی کچەکانیان ڕەوانەی قوتابخانە بکەن و هەست بەبوونی خۆیان بکەن و دەوری شیاوی

---

[213] ژمارەیەك وتاری زانستی لە گۆڤارەکەدا بلاّو کراوەتەوە، لەوانە: وردی، ئەتۆم و هێزی ئەتۆم، ژ١، س١، ل٥٦-٦٠؛ عوسمان قادر شالی، قەڵەوی، ژ٢، س١، ل٦٣-٦٩؛ وریا ئەمین ڕواندزی، شێرپەنجە ژ٤، س٤، ل٣٦-٤٠؛ مصطفی امین، مەمك زۆری، ژ٤، س٢، ل٣٩-٤٥؛ احمد عوسمان، لێکۆڵینەوەی ئەتۆم، ژ(٣،٢)، س٣، ل٤٢-٤٨.

[214] لە سلێمانی ١٩٢٦، لە سلێمانی قوتابخانەی (زهراء) بۆ کچان کرایەوە. بڕوانە: د. کەمال مەزهەر چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل٦٢. هەروەها: غەفور میرزا کەریم تەقەللایەکی دڵسۆزانە بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری لە کوردستانا و کۆمەڵی زانستی کوردان لە سلێمانی، ل٦٤. لە هەولێریش ساڵی ١٩٤٣ یەکەم قوتابخانەی کچان کرایەوە، بڕوانە: کەریم شارەزا زانای ناوداری کورد، مەلا ئەفەندی، بەشی دووەم، ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٤٥، یەك شەممە ١٩٩٤/٩/١٨، ل٣.

خۆیان لە کۆمەڵەکەیاندا بگێڕن و لە هەندێ کۆت و پێوەندی کۆمەڵایەتی ڕزگاریان ببێ. گۆڤاری هیوا لە ژمارەکانی بەرایی لە وتارێکدا سەبارەت سەربەستی (ئافرەت) دەڵێ: ((کچەکانتان بنێرنە قوتابخانە... با بخوێنن، تا خۆیان هەست بکەن کە ئەبێ سەربەست بن، دیل تا خۆی ڕانەپەڕێت ڕزگاری نابێت... خوێندەواری: یەعنی زانستی، پیشەسازی، پاك و خاوێنی، پێشکەوتن، بەگژ نەخۆشیدا چوون.))[215]

مەسەلەی گرنگیدان بەژیانی ژنان و منداڵ و پەروەردەی منداڵان لەنێو وتارە کۆمەڵایەتییەکاندا هاتووە. دیارە ئەمەش لە ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی قووڵی ئەوتۆوە دێت، کە منداڵ هیوای پاشەڕۆژی نەتەوەشەو بۆئەوەی لە پاشەڕۆژدا ئەندامێکی بەسوودی بۆ کۆمەڵ لێ دەربچێت دەبێ لەسەر ڕێوشوێنی دروست پەروەردە بکرێ، (هەر کەس تۆزێ شارەزایی لە وەزعی ئافرەتانی عیراق و کوردەواری هەبێ، ئاشکرایە لای کە زۆربەیان هەمیشە گیرۆدەی جۆرە دەردێکن، وە لە ژیانیانا تووشی ئازارو چەرمەسەری وا ئەبن کە هەر بەناو بردنیان ئادەمیزاد موچڕکەی دێ بە لەشیا. خۆ وەزعی ساوایان و ماوەی شیرخواردن و پێ گرتن و گەوتنە ناو کۆلان و تا چوونە قوتابخانە یان، هەر دەمێکی مایەی هەزار چەشنە ناڕەحەتییە چ بۆ ساواکان خۆیان و چ بۆ دایکەکانیان!))[216]

تەنانەت ((یەکێك لە بەڵگە گرنگەکانی پێشکەوتنی گەلان و هۆی سەرکەوتنیان لە ژیاندا، پێگەیاندنی منداڵە و پەروەردەکردنیەتی لەسەر ڕەوشتی باش و خووی پاك و بناغەیێکی بەتینی تەندروستی فسیۆلۆجی وە بەرزکردنەوەی هەست و گیانیەتی.))[217]

ڕۆحی هەرەوەزی لەرووی پێوەندی کۆمەڵایەتییەوە دژی گیانی خۆپەرستی و تاکڕەوییە، کەچی ((داخی گرانم کورد دوژمنی هەولدانی بە کۆمەڵە بۆ پێکهێنانی فرمانێك کە چاکەی گەلی تیابێ، هەرچەندە لە پێشەوە بە گەرمی دەست ئەدەینە ئیش بەلام زۆری پێ ناچێ هێزی خۆپەسندی بەسەرمانا زاڵ دەبێ وە هەریەکە لە ئێمە بە هەموو هێزیەوە هەولدەدا بۆ ئەوەی قسەو بیرو باوەڕی خۆی سەرکەوێ.))[218]

---

[215] کامەران، سەربەستی ئافرەت، گ. هیوا، ژ٤، س١، ل٦٠.

[216] پرشنگ، پاراستنی دایك و منداڵ، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٤٤.

[217] عزالدین ابراهیم، منداڵی کورد، گ. هیوا، ژ١١، س١، ل١٣.

[218] عبدالقادر قزاز، هەندێ دەردی کۆمەڵایەتی کە تەگەرەیان داوە لە پێشکەوتنمان، گ. هیوا، ژ١٠، س١، ل٥٣.

سروشت و دەروونی مرۆڤ وا هەڵکەوتووە لە کاتێکدا کە خۆی کۆمەڵێ خەوشی تیایەو خەوشی خەڵکی بەرامبەر دەردەخات[219]. بۆیە ((ئەمرۆ پێویستمان بەوریاییە، پێویستە عاتیفە کارمان تێ نەکات و بە هەڵەماندا نەبات، ڕابردووی زۆر نزیکمان لەبیر نەچێتەوە، ئەبێت بەچاوێکی زۆر وردەوە بڕوانینە هەموو کەسێك، بڕوانینە ڕەوشت و کردارەکانی پێشوویان، هیچ پێویست نییە لە خۆمانەوە قاقەزی سپی بخوێنینەوەو گومان لەئیش کەرێك، لە کەسێکی ڕابردوو باش پەیدا بکەین بەهاندانی هەندێك کەس کە مەبەستیان داپۆشینی عەیبی خۆیانە.))[220]

## وتاری سیاسی

ئەگەرچی ئیمتیازی گۆڤارەکە ئەدەبی و زانستی بووە، بەلاّم خۆ بەدوورگرتن و دوورە پەرێز وەستان لەو هەموو ڕووداوانەی ئەم ڕۆژگارە بەتایبەتی ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و ڕاگەیاندنی جمهووری عیراق و پەیوەندییەکی تازەی نێوان کوردو عەرەب لە مەسەلە سیاسییەکان و حوکمی وڵاتدا کارێکی ئەستەم بوو. ئەمەش جارێکی تر وامان لێدەکات بڵێین: ((ئەدەب و سیاسەت وەك دوو قوتبی کارەبان پێکەوە نەبێ ڕووناکی نادەن. لەپێویستییشدا ئاگر هەڵناکەن.))[221]

بەو پێودانگە گۆڤارەکە هەرچەندێك بۆی لوابێ وتاری سیاسیشی بلاّوکردۆتەوەو بەشداری بۆنە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی کردووە، بە تایبەتی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز، ژمارەیەکی زۆر وتاری سیاسی بلاّوکردۆتەوە، ئەمەش نیشانەی سەربەستی و ئازادی بیروڕا بووە لەو کاتەدا، وتارەکان ناوەرۆکێکی پێشکەوتن خوازانەیان هەیەو زیاتر پێ داگرتنن لەسەر مافی کوردو پشتگیری گەلی کورد لە کۆماری عیراق و سوود وەرگرتنە لە ئەزموونی سۆشیالیستی لە جیهاندا.

---

[219] عیسا پێغەمبەر (د.خ) لە ئینجیل دا دەڵێ: ((بۆچی سەیری پووشی ناوچاوی براکەت ئەکەیت و ئاداگاری تەلاّشە گەورەکەی ناوچاوی خۆت نیت؟ ٤٢ یان چۆن ئەتوانی بە براکەت بڵێیت/ نابرا، بیەڵە با ئەو پووشە لەچاوت دەربهێنم لە کاتێکا تۆ خۆت تەلاّشەکەی ناوچاوی خۆت نابینیت؟)) بڕوانە (ئینجیلی لوقا، بەزمانی کوردی شێوەی سۆرانی، چاپی سوید، ١٩٩٠، ل٢٤.

[220] ڕشید عارف، ئیش کەری ڕاست، گ. هیوا، ژ(٦،٧) س٢، ل١٦.

[221] محمد مولود مەم و تاقی کردنەوەی لە چیرۆك نووسیندا، گ. کاروان، ژ١، ل١٨.

دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (هیوا) خۆیشیان ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە: ((هیوا لەبەر نەبوونی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی سیاسی لە سەرەتای شۆڕشدا ئەرکی گۆڤارێکی سیاسی گرتەئەستۆ، وەکاتێك کە ڕێگەی گۆڤار و ڕۆژنامەی سیاسی درا، هیوا هاتەوە جێگەی خۆی و ئالآی بەرەوپێش بردنی ئەدەب و زانیاری کوردی هەڵکردەوە.))[222]

لە سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزدا، چەندین بەڵێن بەکورد دراو ڕۆژگارێکی تازە بوو بۆ گەلی عیراق بەگشتی و کوردییش بەتایبەتی.[223] بۆیە ڕۆشنبیرەکان کەوتنە نووسینی وتاری سیاسی بۆ پشتگیری لە حکومەتی جمهووری و مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد. لە وتارێکدا هاتووە: ((دەرچونی حکومەتەکەمان لە یەکیەتییە ساختەکەی عیراق و ئەردەن، بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ یەکیەتی شورەوی، قەلآی ئازادی و ئاسایش و پشتیوانی میللەتانی ژێر دەستە، بەستنی پەیوەندی لەگەڵ چینی میللی و هەموو ولآتە سۆشیالیزمەکاندا، بەردانی بەندییە سیاسییەکان، دانەوەی جنسیە بە دەرکراوەکان، بانگ کردنەوەی پاڵەوانی کورد و دوژمنی ئیمپریالیست و نۆکەرانی، تێکۆشەری خۆشەویست مستەفا بارزانی و هاوڕێکانی بۆ نیشتمانی نازار، لەپێش هەموو شتێکدا داننان بەمافی نەتەوایەتی نەتەوەی کورد لە عیراقدا و بەهاوبەش دانیان لە جمهوریەتا.. ئەمانە چەند هەنگاوێکن نایاب و مایەی سوپاسن.. هیوامان زۆر بەهێزە کە گەلیٚ هەنگاوی تر بنیٚ وەك سنوور دانان بۆ ملکیەتی زەوی و زار، و زیاتر ماوەدان بەسەربەستی دیموکراسی و سەربەستی نووسین و بلآوکردنەوە، کە ئەمانە ئەبن بەهۆی ئەوەی میللەتی تینووی ئازادی، میللەتی برسی و ڕەش و ڕووت، گەلی ڕەنج کێش، خاوەن خامەی خاوێن، خاوەن بیری ئازاد زیاتر هۆگری جمهوریەتە خۆشەویستیەکەی بیٚ و بەدڵ و بەگیان بیپارێزیٚ.))[224]

بەهۆی سەربەستی بیروڕا لە سالآنی بەرایی شۆڕشدا، (هیوا) لەسەروتاریدا دەنگی هەڵ بڕیوەو داوای هەوڵدان بۆ یەکگرتنەوەی هەر چوار پارچەی کوردستان و بلآوبوونەوەی بیری نەتەوەیی دەکات، ئەمەش بەوە دەبێت ((یەك بگرن و هێزتان کۆبکەنەوە بۆ بەردەوام بوونی

---

[222] هیواو شۆرش و سالّی سییەمی ژیانی، گ. هیوا، ژ(١٢،١١)، س٢، ل٣.

[223] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[224] فاتح عبدالکریم، نەتەوەی کوردو یاسای جمهوریە، گ. هیوا، ژ٣، س٢، ل٧.

تێکۆشـان و بـەهێزکردنی لـە پێنـاوی سـەربەخۆیی و یـەکگرتنی نیـشتمانی خۆشەویـستمان کوردستاندا.))[225]

پاشان دەڵێ: ((ئێمەش نیشتمانێکمان هەیە پێی ئەڵێن کوردستان، ئـەم کوردسـتانە هـی نەتەوەیە کە هەموو مەرجێکی نەتەوایەتی تیا هەیەو مافی سەربەخۆیی و ئازادیی هەیە، بەڵام ئیمپریالیزمی داگیرکەر بۆ سوودی ناشایستەی خـۆی چـنگی تـێ خـستووەو کـردوێتی بەچـەند پارچەیەکەوە، جا وەرن ئەی ڕۆڵەکانی کوردی دلێر، وەرن خەباتێکی سەختی بەردەوام بکەین بۆ یەکگرتن و یەکخستنەوەی پارچەکانی کوردستانی خۆشەویستمان.))[226]

حمدی مەلا کریم مەسەلەیەکی گرنگی وروژاندووە، ئەویش شوێنی خەباتی نەتـەوەیی لـە بیرو بۆچوون و تێڕوانینی کۆمۆنیزمەوەو بـیروڕای مارکـسیزم- لینینـزم بەرامبـەر بـە نەتـەوەو داکۆکی کردن لە تێڕوانینی ڕاست و دروستی ئەوان، بەوەی کە، مارکسیزمی - لینینزم بانگی هەموو ئادەمیزاد دەکا بۆ برایەتی، وە دەڵێ لەژێر سێبەری یاسای چینایەتی دا مرۆڤ یـا ڕەنـج خۆرە یا ڕەنج خوراوە، وەلای وایە، کە دەسکەوتنی ڕاستی مافی هـەر نەتەوەیـەك بەسـتراوە بـە ڕزگاربوونی ئەو نەتەوەیە لە چنگی یاسای چەوسـانەوەو خـوێن مـژین، وە هاوارئـەکا کـە ئـەی کرێکارانی جیهان یەك بگرن: بۆ ئەوەی یاسای چەوساندنەوەی ئادەمیزاد لە لایەن ئـادەمیزادی برایەوە هەڵگیرێ لەسەر ڕووی زەوی و ڕەنجی شانی ڕەنجکێشان بۆ خۆیان بێ.))[227]

گۆڤاری هیوا لە سەرووتارەکانیشیدا بـەدەوری بابـەتی سیاسـیدا سـووڕاوەتەوە، بەبۆنـەی تەقە کردن لە ساڵی دووەمی کۆماری عیراق دا لە عبـدالکریم قاسـم سـەروتارێکی توندوتیـژی بلاوکردۆتەوەو خەڵکی کوردستان لە مەترسی سـەرکەوتنی نەتـەوەیی شـۆڤینییەکانی عـەرەب ئاگادار دەکاتەوەو وەك بیرخەرەوەیەکیش ڕەفتـاری ئـەوان لـە سـوریا بەرامبـەر بەگـەلی کـورد دێنێتـەوەو پـشتگیری لـە شۆڕشـی ١٤ی تـەمووز دەردەبڕێ، کـە خواسـتی کـوردو عـەرەب بـووەو دەنووسێ: ((جا ئەگەر بەوردی سەیرێکی ئەو دەستە ناپاکانە بکەین کە ئەیانەوێ کۆمارەکەمان قلـپ بکەنەوەو ئەیانەوێ ڕۆڵەی دڵسۆزی گەل عبدالکریم قاسم لەناو بـەرن، ئەگـەر وردبینـەوە لـەوەی کـە

---

[225] یەك بگرن و هێزتان کۆبکەنەوە، گ. هیوا، ژ(٧،٦)، س٢، ل١.

[226] سەرچاوەی پێشوو، ل٢.

[227] محمدی مەلا کریم، کۆمۆنیزم و نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری، گ. هیوا، ژ(١٢،١١)، س٢، ل١٩.

تەیارێکی کوێرانەی عەرەب لە کایەدایەو ئیستیعمار کردویەتی بەدەس کەلا، ئەگەر وردبینەوە لەوەی کە عبدالناصر و پیرەکەی ئەمڕۆ ئەگرین بەسەر گۆڕی هیتلەرو مۆسۆلینیداو بە هەموو جۆرێ هەوڵ ئەدەن فاشیەت ببوژێننەوە دەرئەکەوێ کە چ پاشە ڕۆژێکی تاریك و نالەبار لە ڕێمانایە، ئەگەر - خوانەخواستە - ئەم ڕەگەزە ناپاکانە سەربکەون و بگەنە ئامانجی بەدیان.))[228]

بێجگە لەو وتارانەی کە لەسەر سیاسەتی عیراق و جمهوریەت پەیوەندی بە کوردەوە، چەندین وتاری دی سەبارەت بەتیۆری سیاسەت و دروست بوونی نەتەوەو لیبرالی و فیدرالیزم بلاوکراوەتەوە، دیارە ڕوون کردنەوەی ئەم مەسەلانەیش لە بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی و هەست بە بوونی خۆکردن بێ کەڵك نەبووەو هەستیان بەوە کردووە، کە ((کوردەواری بەو ڕێگایەدا ئەڕوا کە هەموو جوێ کەرەوە (ممیزات)ێکی نەتەوایەتی مان ببوژێنینەوە، بۆ ئەوەی خرمان بناسینەوە، وەچە خۆمان و و چە خەڵك، هەموو لایەك بزانین لە چی یا لە نەتەوەی تر جوێ ین، وەبەچی یا کوردین؟ من لەو باوەڕەدام ناتوانین بە تەواوی بەم ئامانجە بگەین تا نەتوانین قەوارەیەکی تایبەتی بۆ وڵاتەکەمان دروست بکەین، بەلاّم دروست کردنی ئەم قەوارەیە ئەمڕۆ کۆسپێکی گەورەی لەرێ دایە هەرچەند لە زۆر شتی گرنگیشدا وەك یەکن، بەلاّم ئاخۆ لەپێش ئەوەدا کە بگەینە ئەوە خۆمان سەروکاری کاروباری خۆمان بکەین، نابێ ئەوەندەی لە تواناداا بێ هەوڵ بدەین بۆ بوژاندنەوەی ئەو جوێ کەرەوە نەتەوەییانەمان؟))[229]

## وتاری مێژوویی

بە مەبەستی دەرخستنی نهێنییەکانی مێژووی کوردو ڕۆشنایی خستنەسەر لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژووی نەتەوەییمان، کە ببێتە چرایەکی بەتین بۆ ڕووناك کردنەوەی پاشەڕۆژ، گۆڤاری (هیوا) چەندین وتاری مێژوویی لەمەڕ میرنشیەکان و هۆکارەکانی ڕووخانیان و ڕوون

---

[228] کوردو سەرۆکی دڵسۆز و کۆماری دیموکراتی، ژ١، س٣، ل٣-٤.

[229] بەختیار، لە پێناوی بوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتیماندا، گ. هیوا، ژ٦،س١، ل٧٤.

زۆر وتاری سیاسی لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاوکراوەتەوە، بروانە: احمد غفور، میللەت چی ئەوێ؟ ئیستیعمار چی ئەوێ؟ گ. هیوا، ژ٢، س٢، ل١٠-١٣؛ حافظ مصطفی قاضي، چاردی تیرمەهین ژمارەی پێشوو، گ ٣٢-٣٦؛ هەوری، شۆرشی پیرۆز، گ. هیوا، ژ٤، س٢، ١٩٥٨، ل٤٨-٥٢؛ احمد غفور، شۆڕشی ئۆکتۆبەر و مەسەلەی نیشتمانی کورد، گ. هیوا، ژ٥، س٢، ل٦٣-٨٩؛ فاتح عبدالکریم، ئاشتی هۆیەکانی جەنگ چۆن ئاشتی ئەپارێزین؟ گ. هیوا، ژ٤، س٣، ل٥-٢٤.

کردنەوەی مێژووی شارەکانی کوردستان بلاّوکردۆتەوە، لە سالاّنی یەکەم و دووەمی دا بە نۆرە هەرجارەی وێنەو مێژووی شارو شارۆچکەیەکی کوردستانی بلاّو کردۆتەوەو بە برا کوردەکانی ناوچەکانی تری ئاشنا کردووە. ئەگەر مێژوو یەکێك بیّ لە مەرجەکانی دروست بوونی (نەتەوە)دا، بێگومان دیارە چ دەورێکی گرنگی هەیە. مێژوو بەو مانایەی کە ((باسی ڕابردووی ئادەمیزاد و ئالّوگۆڕەکانی ناو کۆمەلّگەکانی و لایەنی جیاوازی ژیانی ئەو کۆمەلّگایانە پێکڕاو و بە جیا بە نیازی تێگەیشتنی ئیمڕۆی و دیارکردنی ڕێبازی گشتیی دوارۆژی.))[230]

وتارە مێژووییەکانی ناو گۆڤارەکە، مێژووی کۆن و نوێی گرتۆتەوە، بۆ ئەوەی وەك زنجیرەیەکی نەپچڕاو خوێنەر لە سەرجەم سەردەمە مێژووییەکاندا ئاگاداربیّ. دەربارەی دینەوەرییەکان نووسراوە: ((شەست میل لەخوارووی (سنە)، لەلای خۆرئاوای (کوناگاور، - کەنگەوەر- قصر اللصوص)دا بەدوورایی (٢٥) میل، وە بەلای ڕۆژهەلاّتی کرماشانەوە، شارێکی کۆن هەیە، ئەم شارە ناوی (دینەوەر) بووە، وە یەکیّ: بووە لە شارە کوردەوارییەکانی هەرێمی شاخاوی کە بە (بیلاد ئەلجەبەل)وە (عیراقی عەجەمی) ناسراوە. ڕەنگە ناوی ئەم شارە لەپێشدا (دینارەوەند) بووبیّ - کەناوی عێلێکی زۆر گەورەی کورد بووە- وە لە دواییدا گۆڕابیّ.))[231]

دەربارەی میرنشینە کوردەکان و سکەلێدان و چەندین هەنگاوی دی بۆ یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان، کە بەهۆی هاوکاری نەکردنی میرو دەرەبەگەکانی ناوچەکانی دی و لاوازی هۆشیاری نەتەوەیی و زالّ بوونی دەستەلاّتی ئایین بەئاکام نەگەیشت،[232] نووسراوە: ((چاوگێڕانێك بەمێژووی نەتەوەی کوردو، مێژووی میری گەورەی ڕەواندزا، بە ئاشکرا بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە میری گەورە میر محمد، یەکەمین کەسێکە کە هەولّیدابیّ ئەمارەتە دەرەبەگییەکانی کوردستان پاك بکاتەوەو، کوردستانێکی گەورەی یەك گرتوو پێك بێنیّ.))[233]

---

230 دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، ل٨.

231 جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، دینەوەریەکان، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل١٤.

232 بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی شۆڕشی میر محمدی ڕەواندزی بڕوانە: ن. أ. خەلفین، خەبات لەڕێی کوردستانا، وەرگێڕی لە ڕووسییەوە جەلال تەقی، ل٦٤-٧٤.

دکتۆر جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دوکتۆر کاوس قەفتان لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، ل١٣٢-١٦٥.

233 محمود محمد، جێگای میری گەورەی ڕەواندز لە مێژووی نەتەوەی کوردا، گ. هیوا، ژ٤، س١، ل٦.

کوردستان بەپێی سەرچاوە مێژوویی و شوێنەوارناسییەکان لانکەی مرۆڤایەتییەو مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە، شاری هەولێریش کۆنترین شارە، کە تاوەك ئێستا ژیانی تێدا بەردەوامەو ئاوەدانە: ((لە سەدەکانی ناوەندا هەولێر دانیشتوانی هێجگار زۆر بووەو گەورەترین شار بووەو شارەکە دووبەش بوو، بەشی خوارەوەی لای ڕۆژئاوای قەلاّ (موزەفەرەدین) بینای کردووە، و ئەم بەشە مەرکەزێکی بازرگانی وەئاوەدان بووە، وە بازاڕو میوانخانە و چەند بینایەو مزگەوتێکی گەورەو منارەیەکی بەرزی بووە کە (٥٣٠) پێ بەرز بووەو ئەستووری ٤٨ پێیە بە خەتێکی جوان لەسەری نووسراوە کە (موزەفەرەدین) ئەم منارەیەی بیناکردووە بەشی ژوورووی کە قەلاّی هەولێرە بەرزییەکەی ٦٥ پێ زیاتر نیە بەدەوری قەلاکەدا بە بەرزی ٤٨ پێ شوورەیەك بیناکراوە شوێنی سەنگەر و مەتەرێزی بەدەورا دروست کراوە)).[234]

لە مێژووی تازەیشدا، سەبارەت بە درانەپاڵی کوردستانی عیراق بۆ حکومەتی عیراق، ئەحمەد خواجە، وەك بینەرێکی ئەو ڕۆژگارە سەبارەت بەریفراندۆمەکەی ئەو کاتە بۆ ئەوەی ئایا کوردستانی عیراق بدرێتە پاڵ حکومەتی عیراقەوە، بە وەلامی (لام باش نییە) و (لام باشە) وەلاّم بدرێتەوەو هەلّوێستی خەلّکی سلێمانی ڕوون دەکاتەوە، لەگەلّ هێنانی فیصلی یەکەمدا لە لایەن پیاوە درۆزن و دەس بڕەکانی بەرتانیاوە لە سلێمانی، کە ئەو وەختە ناوچەی هەرە بەهێزی داوای سەربەستی و ئازادی کورد بوو لە کوردستاندا، کەوتنە تەلّەکەبازی و ئەم پرسیارانەیان دروست کرد.

١- پرسیاری یەکەم: (لام باش نییە)

ئ- تێکەلّ بوون بە عەرەبی عیراق.

ب- باوەڕکردن بە فیصلی یەکەم.

٢- پرسیاری دووەم: (لام باشە)

بە پێچەوانەی پرسیاری یەکەم.[235]

سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووز خالّی وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ کۆمەلّگای عیراق ڕووەو سەربەستیو دیموکراسی، ((شۆڕشی عیراق گەلێ شتی گەورەی کرد وەك ڕووخاندنی

---

[234] مێژووی شاری هەولێر، گ. هیوا، ژ٦، س١، ل٧.

[235] احمد خواجە، مێژووی لام باش نیەی سلێمانی تا ١٤ی تەموزی ١٩٥٨، گ. هیوا، ژ ٦-٧، س٢، ل٤٩-٥٠.

ڕژێمی پاشایەتی و مەحکەمەکردنی نیشتمان فرۆشەکان و بەرەڵلاکردنی بەندییە سیاسییەکان و ڕێگادانی ڕۆژنامە نیشتمانییەکان و ئاشکرا کردنی جوولانەوەی قوتابییان و سەندیکاکانی کرێکاران و دابەش کردنی زەوی و هەرزان کردنی نرخی هەندێ شتی پێویست و سڕەواندنە پەیمانی بەغدا و پڕۆژەی ئایزنهاوەر و بەستنەوەی ڕێکەوتنی ئابووری لەگەڵیان کە کەڵکێکی باشی لێ وەرگیرا بۆ ئازادکردنی ئابووری عیراق.))[٢٣٦]

### وتاری زمانەوانی

گۆڤاری (هیوا) هەر لە یەکەم ژمارەیەوە پاکژکردنەوەی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە و دانانی زاراوەی شیاوو دۆزینەوەی‌و خستنەڕووی ڕێنووسێکی یەکگرتوو بۆ نووسینی کوردی لە ئەستۆگرتووەو پەیوەندی بە شارەزایان و خوێنەرانەوە کردووەو داوای لە خەڵك کردووە بەشداری لەم خزمەتە پیرۆزەدا بکەن.

عبدالقادر قزاز لە بارەی زمانی کوردی و گرنگی زمانەوە وتارێکی نووسیوەو تیایدا هاتووە: ((زمان بۆ گەل وەك هەناسە وایە لە لەشی ئینساندا، چوونکە بەکزبوونی ناونیشانی گەلیش بەرەو کزی ئەڕوا تاوای لێ دێت، کە دەچێتە خوارەوەو تەئریخ پڕە لەو دەرسانە کە باش پیشانمان دەدات چۆن گەلی ناودار بەهۆی هەندێ ئەسبابەوە کە یەکێ لەوانە بێ باکییە بەرامبەر بە زمان لەناواندا نەماون وە تووانەوە وە تێکەڵ بە میللەتانی دەوروپشتی خۆیان بوون.))[٢٣٧]

ئیبراهیم ئەحمەد زۆر بەگەرمی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری هیوا لەژێر ناونیشانی (چۆن زمانەکەمان بنووسین؟) چەندین ڕاو پێشنیاری بەسوودی دەربڕیوە بۆ لێکۆڵینەوە لە پڕۆژەی نووسینی کوردی بەپیتی لاتینی یان عەرەبی؟ و ڕەخنەی لە هەردوو بیرەکە گرتووە، چونکە

---

[236] صلاح الدین محمد سعدالله، شۆڕشەکەی عیراق و مەسەلەی کورد، وەرگێڕ محمدی مەلا کەریم، گ. هیوا، ژ٨، س٢، ل٢٨.

چەندین وتاری مێژوویی دیکەش بلاو کراونەتەوە، لەوانە: وەرزێر، لینین گەورەترین پیاوی مێژوو لە سەردەی بیستەمدا، گ. هیوا، ژ٢، س٢، ل٨٤–٨٩؛ مستەر ئەدمۆنس، کوردو کوردستان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، وەرگێڕی انور محمد قەرەداخی، گ. هیوا، ژ٤، س٢، ل٤–٨؛ محمدی مەلا کەریم، ڕووخانی باستیلی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، گ. هیوا، ژ(٦،٧)، س٢، ل١٧–٣٢.

[237] عبدالقادر قەزاز، زمانی کوردی، گ. هیوا، ژ١، س١، ل١٥.

((هەردوو ئەلفوبێ کە، چەلاتینی، چە عەرەبی وەك هەن، واتە وەك لە لاتینی وە عەرەبیدا بەکارئەهێنرێن زمانی کوردی یان نەبە ئاسانی پێ ئەنووسرێ وە بەرەوانی پێ ئەخوێندرێتەوە. بەلاّم ئەگەر بێتو ئەم پیتانە وەك (کەرەسەیەکی خاو) وەرگرین و بەپێی پێویستی زمانەکەمان دەستکاریان بکەین و ناویان لێ بنێین، و ئیشارەتیان بۆ دابنێین ئەتوانین بەهەریەکەیان هەموو ئەو دەنگانەی لە دەمی کوردێك دێنە دەرێ بە ئاسانی پێی بخەینە سەر کاغەز، لەگەلّ هەموو ئەو وشە بێگانانەشدا کە لە کوردیدا بەکاریان ئەهێنین. هەروەها ئەتوانین بەرەوانیش نووسراوی پێ بهوێنینەوە بەبێ ئەوەی پێویست بە پێشەکی زانینی ئەو وشانە بکات کە نووسراون.))[238]

سەبارەت بە یەکخستنی زبانی نووسینی کوردی و چۆنیەتی هەلّبژاردنی دیالیکتێك بۆ زمانی یەکگرتووی نووسینی کوردی وەك مەسەلەیەکی زیندوو ماوەیەکی زۆر بیری نووسەرانی بەلای خۆیدا کێش کردبوو، بە تایبەتی هەلّبژاردنی هەردوو دیالێکتی کرمانجی سەروو و خواروو بیرورای جیاوازی لەسەر هەبوو و ژمارەی دانیشتووان و چەندین هۆکاری ئەدەبی و جوگرافی و هۆکاری تری پێوە دەلکێندرا.

نووسەری ناسراو (عصمت شریف وانلی) لە سویسرەوە بەشداری ئەو گفتوگۆیەی کردووە: ((گیروگرفتی ئێستەمان بریتی نیەو لەوەی، کە گوایە پێویستە زاراوێك دیاری بکرێ، بەلّکو ئەبێ بەدوای ئەوەدا بگەرێین کە چ رێگایەك بگرین بۆ زۆر نەکردن و پەرەسەندنی ئەو جیاوازییانەی کە هەیە لە میانی کرمانجی و سۆرانیدا، چ رێگایەك بۆ کەم کردنەوەی ئەو جیاوازیانەو یەك خستنی زبانی نووسینی کوردی بکەین بەشتێکی وەها، نەك تەنها لە تواناادا بێ، بەلّکو لەوانەبێ کە بەزووترین کات بهێندریتەدی.))[239]

---

[238] ب. چۆن زمانەکەمان بنووسین؟ بەپیتی عەرەبی یا لاتینی، گ. هیوا، ژ٦، س١، ل٩.

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیەو بەم ناونیشانە چەند کەسێك گفتوگۆیان لەسەر ئەم وتارەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کردووە، لەوانە بڕوانە: م.م، نووسینی زمانی کوردی، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٩–١٥، جەمیل بەندی رۆژبەیانی، چۆن زمانەکەمان بنووسین؟، گ. هیوا، ژ١٠، س١، ل٨–١٢.

[239] عصمت وانلی، مەسەلەی یەکخستنی زبانی نووسینی کوردی، کرمانجی، یا سۆرانی؟ وەرگێرانی فاتح عبدالکریم، گ. هیوا، ژ٣٠، س٤، ل٢٩.

تاهیر صادق باسی هەردوو پیتی (ك) و (گ)ی کردووە لە کاتێکدا، کە دەکەونە پێش هەندێ لەپیتە بزوێنەرەکانی کوردیدا وەك (یی)، (ی)، (وی)و پێی وایە دەبێ ئەم دەنگانە وێنەیان بۆ دابنرێ[240]، بەلاّم ئەم ڕایە لەلایەن زۆر شارەزاوە بەرپەرچی درایەوە.

پاکیزە ڕەفیق حلمی دەلّێ: ((جارێ لەپێش هەموو شتێکدا تکام وایە کاك صادق دلّگیر نەبێ لە هەوەلّ تێبینیم لە سەرەتای باسەکەی کە ئەلّێ: ((دوو پیتی بێ وێنە. ئەم لێرەدا ئەبوو بلّێ (دوو دەنگی بێ وێنە) نەك (دوو پیتی بێ وێنە) چونکە پیتی خۆی وێنەی دەنگە= وێنەی دەنگە کەوابوو کە وتمان دوو پیتی بێ وێنە هەروەك ئەوەیە بلّێین دوو پیتی بێ پیت.. چونکە پیت شتێکە دروست کراوە بۆ ئەوەی ئەو دەنگە کە هونەرێکی بووەیە (موجود) وە لە خۆیەوە بەپێی ئەو توانا سروشتییەی لە ئینساندا هەیە پەیدا بووە بخاتە وێنەیەکی هەست پێکراوەوە (محسوس)[241] لە ئەنجامی وردبوونەوە لە وتارە زمانەوانییەکانی ناو گۆڤاری هیوا دەگەینە ئەوەی بلّێین، کە ڕێرەوی گۆڤارەکە ئەوەبوو بتوانێ دیالێکتی خواروو بۆ زمانی یەکگرتووی ئەدەبی (ستاندارد)ی کوردی هەلّبژێرێ، ئەوەش لە ناوەرۆك و پشتگیری دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەدا دەردەکەوێ، بەشێوەیەك کە بتوانرێ لەگەلّ دیالێکتەکانی دی زمان کوردی موتوربە بکرێت.

لە دانانی زاراوەو پاکژکردنەوەی زمانی کوردییش لە وشەو زاراوەی بێگانەدا گۆڤارەکە گۆشەیەکی تایبەتی بۆ خوێنەرانی بەناوی (پرسیار)یان (چیت نەزانی پرسیار بکە) کردبووەوە، کە تیایدا هەموو جارێك چەند وشەو زاراوەیەکی عەرەبیی بلاّودەکرایەوەو داوا لە خوێنەران دەکرا ئەو وشانە بکەن بە کوردی بۆ هاندانی خوێنەرانیش گۆڤارەکە دیاریی بۆ سەرکەوتووەکان تەرخان کردبوو، بۆ نموونە ئەم وشەو زاراوانە بلاّو کراونەتەوە: استغلال- قورخ، رواج- برەو، قاعدە- بنکە، مناقشە- پیلە، لێکۆلّینەوە، نجار- دارتاش، نظرة- نیگا.

---

240 تاهیر صادق، دوو پیتی بێ وێنە، گ. هیوا، ژ٣١، س٤، ل٥٢-٥٤.

241 پاکیزە ڕفیق حلمی، وەلاّمێکی زمانەوانی، گ. هیوا، ژ٣٢، س٤، ل٢٨-٢٩.

هەروەها مارف خەزنەدار و جەمال جەلال وەلاّمی ئەم ڕایەی (تاهیر صادق)یان داوەتەوە، بڕوانە: معروف خەزنەدار، دوو تیپی بە وێنە، (نەك بێ وێنە)، گ. هیوا، ژ٣٢،س ٤،ل٤٢-٤٣؛ جمال جلال عبدالله، دوو پیتی بە وێنە، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٣٩-٤١.

لەبارەی ڕێنووسیشەوە گۆڤارەکە دەرگایەکی ڕەخنەیی بۆ نووسەران و شارەزایان ئاوەڵا کردبوو سەبارەت بەچۆنیەتی نووسینی زمانی کوردی بە ئەلف و بێی لاتینی یان عەرەبی، بەڵام وادەردەکەوێت بەهۆی باروزروفی سیاسییەوە ڕای زۆرینە لەگەڵ ئەوەدابووە، کە بە ئەلف و بێی عەرەبی بمێنێتەوەو چارەسەری ئەو دەنگانە بکرێت کە تا ئەوکاتە وێنەیان لە ئەلفبای عەرەبی بۆ دانەنرابوو.

**دووەم: ژیاننامە**

کورتترین پێناسەی ژیاننامە ئەوەیە: (ژیاننامە واتا ژیانی مرۆڤ)،[242] انیس المقدسی دەڵێ: ((جۆرێکە لە ئەدەب لێکۆڵینەوەی مێژوویی و چیژوەرگرتنی چیرۆك بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، بۆ دیراسەکردنی ژیانی کەسێك و وێنەکێشانێکی وردی کەسایەتی ئەو.))[243]

ئەگەر بەوردی لەڕووی مێژووییەوە لە هونەری ژیاننامە بکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت، بەشێوە سادەو ساکارەکەی بۆ سەردەمێکی زوو دەگەڕێتەوە، ((لە باوەشی مێژوودا، ژیاننامە سەری هەڵدا و چەکەرەی کرد، بووە ڕێبازێکی روون و ئاشکرا، چەمك و بۆچوونی خەڵك بەدرێژایی مێژوو کاری تێکرد، بووە تۆمارێك بۆ کار و ڕووداوو جەنگی پاشاکانی چین و میسری و ئاشوورییەکان، هەروەها بووە شی کردنەوەی هەندێ پرنسیپی سیاسی، لای **(فلوطارخس)** لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە پیاوە مەزنەکانی یۆنان و ڕۆمان.))[244]

زۆربەی ئەو تۆمارانە، کە وەك ژیاننامەیەك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نووسراوەو پاشان لای موسڵمانەکان بووە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەدەب، هەموو هەوڵێکیان دەرخستنی لایەنی مێژوویی بوو لە پێناو خستنەڕووی چاکەو سوارچاکی، تەنانەت ((مێژوونووسێکی شارەزاو قووڵ بووەوەی نێو فەلسەفەی وەك (ابن خلدون) مەبەستی لە مێژوونووسینەوە دۆزینەوەی ڕەوشتی چاك بووە.))

مێژووی هونەری ژیاننامە لە رۆژئاوایش بۆ مێژوویەکی دێرین دەگەڕێتەوە، هەر لە سەرەتاوە قەشەو پیاوانی ئایینی کەوتنە نووسینەوەی کەرامات و پیاهەڵدانی قەشەو لایەنە ئایینییەکان، بەڵام لێکۆڵەرەوەکان ئەو قۆناغە بەخراپترین قۆناغی ژیاننامەی ڕۆژئاوا دادەنێن،

---

242 الدكتور ناصر الحاني، المصطلح في الادب الغربي، ص٧٦.

243 انيس المقدسي، الفنون الادبية واعلامها في النهضة العربية الحديثة، ط٢، ص٥٤٧.

244 الدكتور احسان عباس، فن السيرة، ط٢، ص٩.

چونکە لە هەموو ئەزموونێکی مرۆڤایەتی بەدوور بوو. لە پاڵ ئەو قۆناغەدا نووسینەوەی ژیاننامەی پاشاکانیش باوبوو.

((لە ئەدەبی ئینگلیزی، سەدەی هەژدەهەمدا لە کاتی جەنگی ناوخۆیی ئینگلیزو فەرەنسەدا چینی ناوەڕاست حاڵیان بەرەوباشی دەڕۆیشت و خەڵکی حەزی بە خوێندنەوەی ئەم شێوە ئەدەبییە دەکرد، دیارترین ژیاننامەی سەدەی هەژدەم، کە ناوبانگییەکی زۆری هەیە)) (ژیاننامەی دکتۆر جۆنسۆن D. Johnson، کە هاوڕێی خۆشەویستی (بۆزوێل Boswell) نووسیەوە).

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە مەبەست لە نووسینەوەی ژیاننامە چییە؟ نووسینەوەی هەموو ژیاننامەیەك هۆکارێك وای لە مێژوونووس کردووە، کە تۆماری بکات، چونکە ژیانی ئەو کەسانە دەنووسرێتەوە، کە خاوەنی ئەزموونێکی فرەن لەژیانداو لە گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی ژیانی کۆمەڵگاکەیاندا دەورییان هەیەو ڕەنگە هەندێ ئاکار و تایبەتی ژیانی ئەو کەسە بەشێکی زیندوو لە ژیانی کۆمەڵەکە ڕوونبکاتەوە، بۆ نموونە، کە ژیاننامەی ئەدیبێك دەنووسرێتەوە، بەخۆشحاڵییەوە دەخوێنینەوەو بە وردی سەرنجی دەدەین، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو ژیاننەمەیە دەروون و ڕەوشتی هەندێ لە پاڵەوانی چیرۆکەکان و سۆزی ڕاستەقینەی شیعرەکانیمان بۆ دەربکەوێت، چونکە بیەوێ و نەیەوێ هەندێك لە لایەنی بیرکردنەوەو بۆچوونی نووسەر لە پاڵەوانەکانی ڕەنگ دەداتەوە.

بەهەر حاڵ، بەهەر هۆو مەبەستێك ژیاننامەکە نووسرابێتەوە، پێویستە یەکیەتی بیناو هەستکردن بە بەرەوپێشەوەچوونی زەمەن و یەك دوای یەکی قۆناغەکانی گەشەکردنی کەسایەتی ئەو کەسەی ژیانی نووسراوەتەوە لە ژیاننامەکەدا بەدیبکرێت و لە هەموویشی گرنگتر (ڕاستگۆیی)یە لە دەربڕین و خستنەڕووی بابەتەکاندا، بە پێچەوانەوەی هونەرەکانی تر، کە ڕەنگە نووسەر زیاتر جڵەو بۆ خەیاڵی شل بکات و بەئارەزووی خۆی و دەوری باشی هەبێت لە تێکەڵاوکردنی ڕووداوەکان و چۆنیەتی دروست کردنی پاڵەوانی خەیاڵیدا، بەلام لە ژیاننامەدا بەڵگەنامەو حەقیقەتی ڕووداوەکان و زەمەن سەروەرن.

کە دەڵێین ڕاستگۆیی، زۆر زەحمەتە ڕاستگۆیی وەها بەدی بکرێت، هەموو کەسێك وەك (جان جاك ڕۆسۆ) بێ شەرم هەموو نهێنییەکانی ژیانی دەربڕێت، ئەمە لە لایەك؛ لە لایەکی

دیکەشەوە ڕەنگە زۆربەی کات سەردەمی منداڵی بە تەواوی هەموو شتێك لەبیر نووسەر نەمێنێتەوە یان بە ئەنقەست بیەوێ لەبیر خۆی بەرێتەوە.

لێکۆڵەرەوەکان ژیاننامە دابەش دەکەنە سەر دوو چەشن:

١- ژیاننامەی خودی.

٢- ژیاننامەی بابەتی.

مەبەست لە ژیاننامەی خودی، ئەو ژیاننامەیە، کە نووسەر خۆی دەربارەی ژیانی خۆی دەینووسێ.

ژیاننامەی بابەتی، ئەو ژیاننامەیە کە نووسەرێك دەربارەی کەسایەتییەکی دیار دەینووسێ، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێتەوە پەنا دەبەینە بەر دابەش بوونێکی تر، ئەویش ئەوەیە:

لە ئەدەبی کوردیشدا، وەك ئەدەبی میللەتانی دی، ئێمەیش ژیاننامەمان هەیە، هەندێك لە ئەدیب و نووسەرو زاناکانمان ژیاننامەی خۆیان نووسیووەتەوە، بەڵام لە کوردیدا کێشەیەکمان هەیە ئەویش تێکەڵاوییە لە نێوان (ژیاننامە)و(یادداشت)[٢٤٥] و (گەشتنامە) یان (گەشتی ژیان)[٢٤٦] و (بیرەوەری)[٢٤٧] و (چیم دی)[٢٤٨]دا.

---

[245] بۆ وێنە بڕوانە: ڕەفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨، بەرگی سێیەم، ١٩٩٢

[246] بۆ نموونەی گەشتی ژیان بڕوانە، مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، بەشی یەکەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢.

[247] بۆ نموونە بڕوانە: مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، بەغدا، ١٩٩٤.

[248] ئەحمەد خواجە، یادگارییەکانی ڕۆژانی حوکمی شێخ مەحموودی نەمری نووسیووەتەوە، بڕوانە: ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب١، چاپخانەی شەفیق، ١٩٨٦، ب٢، سلێمانی ١٩٧٢.

هەندێك لەو زاراوانە تارادەیەكی زۆر لەیەكەوە نزیكن، هەندێك وای بۆ دەچن، كە یادداشت بۆ خۆی بەشێكە لەژیاننامە)[249]، نەوەك یادداشت تەنانەت (بیرەوەری) و (چیم دی)یش بەشێكی بچووكی ژیاننامەن. چونكە ژیاننامە لە ساتی هاتنە دنیاوە دەگرێتەوە، تا ئەو ساتەی كە كەسەكە تیایدا دەژیت، ئەگەر ژیاننامەی خودی بیت، بە هەموو یادداشت و بیرەوەرییەكەوە، لە پاڵ ئەو نهێنییانەی نووسەرەكەی بە ڕاستگۆیی و بە زنجیرەی مێژووییەوە ئاشكرایان دەكات.

ئەگەر لە ئەدەبی كوردیدا بۆ ژیاننامەی گشتی، كە عەرەبەكان (فن التراجم)ی پێ دەڵێن بكۆڵینەوە، سەربردەی ژیانی ئەو شاعیرانەی، كە لە كتێبی سەربەخۆیدا بەیەكەوە بڵاوكراونەتەوە نموونەی ئەم بابەتەن بەهەموو كەم و كوورییەكیانەوە.[250]

بە هەمان شێوە لە ئەدەبی كوردیدا چەندین نموونەی ژیاننامەی تایبەتی بەخودی و بابەتییەوە بەرچاو دەكەوێت. چەند شاعیرو نووسەرێكی كورد ژیاننامەی خۆیان نووسیوەتەوە، ئەگەرچی ڕاستەوخۆ ناویشیان نەنابێت ژیاننامەو لەژێر ناوی (بیرەوەری)یان (یادداشت)دا بڵاویان كردبێتەوە یان لەدوای خۆیانەوە بەو ناوەوە بڵاوكراوەتەوە.

(زێوەر)ی شاعیر لە یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەریدا، كۆمەڵێك بیرەوەری و یادگاری ژیانی خۆی بڵاوكردۆتەوە، كە بەشێكن لە ژیاننامەی شاعیر، بەڵام تەنها خاڵە دیارو گەشەكانی وەرگرتووە بێ چوونە ناو ڕوون كردنەوەی زۆرو زەوەند.[251] (شیخ سەلام)ی شاعیر بەدەست خەتی خۆی بەشێكی كەم لە ژیانی خۆی هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونییەوەو چوونە قوتابخانە وسەردەمی لاوی و نازناوی شیعری و هاوڕییەكانی نووسیوەتەوە، بەڵام هەمووی بەسەرەیەكەوە لە (١٢) لاپەڕە زیاتر نییە، بۆیە تەنیا لە قاڵبی پێناسێك زیاتر نیە.[252]

---

[249] محمد فاضل مستەفا، زێوەر ژیان و بەرهەمی، زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر، ل١٤٧، (نامەی ماجستێر).

[250] بۆ نموونە بڕوانە: علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی كوردی، چ٢، هەروەها، صادق بهاءالدین ئامێدی، هۆزانتڤانێت كورد،، بەغدا، ١٩٨٠.

[251] بڕوانە: گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری مەلا عەبدوڵڵای زیوەر، محمدی مەلا كەریم هێناویەتییە سەر شێوەی نووسینی نوێ و پێشەكی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٨٥.

[252] بڕوانە: دیوانی سەلام، ئامادەكردنی ئومێد كاكەڕەش، ب٢، بەغدا، ١٩٩١، ل٣٢–٤٤.

یونس ڕەئوف -دڵدار-ی شاعیر، یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی خۆی زۆر بە وردی و ڕاستگۆیی و بەهرمەندانە ژیاننامەی خۆی نووسیووەتەوە، ڕەنگە کەم کەس ئەوەندە بەدەست ڕەنگینی و کارامەییەوە لەو هونەرە گەیشتبێ و بەپێی ئەو زنجیرە مێژووییە ڕووداوو خاڵە درشت و وردەکانی ژیانی کەسیەتی خۆی نووسیبێتەوە. خوێنەر وا بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، کە تامەزرۆی خوێندنەوەی بێت، لە هەمان کاتدا وێنەیەکی زیندوی ڕۆژگاری خۆیەتی.[253]

گۆڤاری (هیوا)، ژیاننامەی ژمارەیەکی زۆر لە ناودارانی مێژووی لەپاڵ کەڵە پیاوانی مێژووی کوردو زانایانی ئاینی و شاعیرانی کۆن بڵاوکردۆتەوەو بەمەش خزمەتێکی باشی ئەو هونەرەی ئەدەبی کردووە. لە گۆشەی (کوردانی بەناوبانگ)دا، کە هەر درێژە پێ دەری گۆشەیەکە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دان مەلا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ژیان سەربردەی هەندێك لە زانایانی ئایینی دینەوەرییەکانی تۆمارکردووە، بەکورتی ناوی کەسەکە و ساڵی لەدایك بوون و مردن و دانراوەکانی و ئەو زمانانەی زانیویەتی و شارەزایی لە بوارە جیاجیاکان دا نووسیوە و لەبارەیەوە دواوە.

لەبارەی ژیانی (ئەبو حەنیفەی دینەوەری)یەوە نووسیویە: (ناوی ئەحمەد کوڕی داوود کوڕی وەنەند- وەند)ە، ساڵی لەدایك بوون و چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی گەنجیەتی نەزانراوە تەنها بەهۆی بلیمەتی و زرنگی خۆیەوە ناوبانگێکی بەرزی وەرگرتووە. لە دەستووری زمانی عەرەبی (نەحو)وە لە فەرهەنگ (لوغە)وە لە ئەندازە (هندسە)وە لە ئەستێرە شوناسی وە لە گیاناسی وە لە مێژوونووسیدا زۆر شارەزابووە.

ئەستێرەی بەختی لە ڕۆژگاری دەسەلاتی (بویهی)یەکانا کەوتۆتە پرشنگ دان، ساڵی ٢٣٥ ی کۆچی لە ئەصفەهان دووربین خانەیەکی (رەصەد)ی دامەزراندووە بۆ پەیدۆزی جووڵانەوەی قەبارەکانی ئاسمان، وە هەروەها ڕۆژگاری بەسوودو بەکەڵك بووە، کۆچی دواییشی بەڕاستی ساغ کراوەتەوە کە کەی بووە؟ ساڵی (٢٨١ یا ٢٨٢، یا ٢٩٠)ی کۆچی؟)[254]

لە ژمارەکانی تری گۆڤارەکەدا ژیانی هەندێ زانای دیکەش نووسراوە ئەگەر بەیەکەوە هەموو کۆبکرێنەوە نموونەیەکی باشن بۆ (فن التراجم). لەبارەی ژیانی مامۆستای بەناوبانگ

---

253 بڕوانە: عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، بەغدا ١٩٨٥، ل١١– ٦٢.

254 جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، دینەوەریەکان، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل١٦–١٧.

(خواجە ئەفەندی)یەوە، کە وەك هەڵگری چرای زانستی تا کۆتایی تەمەنی خزمەتی زانستی لە سلێمانی کردووە، نووسراوە: ((ناوی عزیز کوڕی وەسمان ئاغای لە نەوەی عەلی بانوو لە بنەماڵەی ناوداری دێی گەلاڵەیە، کە چ لە (قەلاچوالان) وە چ لە سلێمانی لە پێشتر پیاوبوون لەلای بابانەکان، وە هەر بە سەرۆکی هاتوون تا دوارۆژی ڕۆژانی بابانەکان.

لە ساڵی ١٨٤١م لەدایك بووەو لەساڵی ١٩٤٢دا لەپاش ١٠١ ساڵ ژیان هەر لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. خواڵێ خۆشبوو لە تەمەنی ٧ ساڵیدا خوێندەوار بووە لەلای مامۆستا مەلا سعیدی گەورە خوێندوویەتی و ڕوشدیەی مولکی تەواو کردووە. لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا لەسەر وتەی مامۆستای لەلایەن- کاك ئەحمەدی شێخەوە پێی فەرمووراوە بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك.))[255]

وەك لەو ژیاننامەیەدا سەرنج دەدەین، کەم و کوڕی زۆرە، هەرە دیارییان ئەوەیە بەپێی زنجیرەی مێژوویی و زەمەن دا تێ ناپەڕێ و لە حەوت ساڵییەوە یەکسەر بۆ ١٨ ساڵی، ئەمە بێجگە لەوەی هیچ شتێك دەربارەی ژیانی کەسایەتی و دەوروبەری ئەو کەسە نازانین، کە تاچەند لەگەڵ دەوروبەرو ژینگەکەی کاریان لەیەك کردووە، بۆیە دەشێ ئەم نووسینە کورتانە بچنە خانەی (بیرەوەری)یەوە.

لە زاناو نووسەرو فەیلەسوفەکانی دونیایش، کە لە گۆڤاری (هیوا)دا لەبارەی ژیانیانەوە نووسراوە، (برناردشۆ)یە، لە برگەیەکی ئەو ژیاننامەیەدا هاتووە: ((برناردشۆ لە شاری (دبلن) کە پایتەختی جمهوریەتی ئێرلەندەی سەربەخۆیە، لەرۆژی ٢٦ی مانگی تەمووز لەساڵی ١٨٥٦دا لە کاتی حوکمڕانی شاژن ڤیکتۆریا دا هاتۆتە دونیاوە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا خراوەتە قوتابخانە، لە دە ساڵیدا لە شاری دبلن چۆتە کولیییەی (وسلی)، لەو کاتەدا باوی فێربوونی ئایین پەرستی پرۆتستانی بووەو بەشێك لە سەرەتای دەرسی مێژوو وە جوگرافیا خوێنراوە.))[256]

دەربارەی ژیانی زانای بەناوبانگ (ئەنشتاین)یش، لە چەند خاڵێك دا کورت کراوەتەوەو پێناسێکی ژیانی کەسیی و تیۆریە زانستەکانی کراوە: ((لە ١٤ی مایسی ١٧٨٩ لەشاری (تولم) لە ئەڵمانیا لەدایك بووە، لە پانزە ساڵیدا هەموو نووسینەکانی یوکلید- دانەری اصولی

---

255 هەلگری چرای زانستی خواجە ئەفەندی، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٥٦.

256 برناردشۆ، گ. هیوا، ژ١، س١، ل٣٤.

هەندەسە- و نیوتن و سپینۆزای خوێ، دەوەو تێـی گەیـشت. نـاونرا (گیژۆکـە) لەبـەر شـەرم و سەبرو قووڵ بیرکردنەوەی، پاش ئەوەی قوتابخانەی هونەری هەندەسی تەواوکرد چووە دانیشگای (زیۆریخ)ەوە هەروەها، بووە مامۆستای قوتابخانەی بەرز، وە لە دوایبدا بوو بـەهی قوتابخانـەی (شانهاوزن)یش.))[257]

ئەم نووسینانەیش هیچ پەیژەیەکی زەمەنییان پێوەدیار نییە هـیچ قـووڵی و وردییـان تیـا بەدی ناکرێت، دیارە نەبوونی ئـەم خاڵانـەیش وامـان لـێ دەکـات بڕیـاری ئـەوە بـدەین، کـە ئـەم نووسینانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ناوی (ژیاننامە)یان لێ نانرێت، بـەڵکو هەوڵدانـە بـۆ پێناسەکردن و دەرخستنی چەند خاسیەت و سیمایەکی دیارو بەرچاوی کەسایەتیەکی مێـژوویی یان سیاسی یان ئەدەبیی...هتد).[258]

## سێیەم: چیرۆکـی کـوردی

### ناوەرۆکی چیرۆکەکانی گۆڤاری هیوا:

چیرۆك لە ناوەڕاستی پەنچاکاندا وەك هونەرێك (چـەند هـەنگاوێکی پێـشکەوتووانەی نـا بەتایبـەتی بەدەرکـەوتنی هەنـدێ گۆڤـاری خزمـەتگوزاری وەك (پێـشکەوتن) و (شـەفەق) و (هیوا)، کە دەرگاییێکی ڕۆشنیان خستە سەرپشت بۆ نووسەران و پشتگرتنیان لە ڕێگـەی بـڵاو کردنەوەی بەرهەمەکانیان.[259]

ئەگەر چیرۆکی کوردی لە قۆناغـەکانی پێشوودا، لە ڕووی شێوەو ناوەرۆکەوە شێوەی وتارو ڕیپۆرتاژو چەند بابەتێکی سـواوی بـەخۆوە گرتبـوو، لـە ناوەڕاسـتی پـەنجاکان بـەدواوە لەسـەر ڕووپەڕەکانی گۆڤاری (هیوا)دا، بۆ ماوەیەك تاکە گۆڤاری گۆڕەپانی ئـەدەبی کـوردی بـوو، کـە ژمارەیەك چیرۆکی کوردی سەرکەوتووی بڵاو کردۆتەوە.

بابەتە سەرەکییەکانی ناوەرۆکی ئەو چیرۆکانە بەسەر چەند بابەتێکدا دابەش دەبـن. زوڵـم و زۆرداری دەرەبەگ دەرهەق بـەجووتیاری کـورد لـە چـەندین وێنـەی جۆراوجـۆرداو مەسـەلەی

---

257 ئەنشتین ئەو مێشکەی بناغەی لەناوچوونی دانا، وەرگێڕی ف.ك، گ. هیوا، ١٣٤، س٥، ل١٩.

258 ژیاننامەی زۆر کەسایەتی ناسراوی کوردی و جیهانی بلاّوکراوەتەوە، بڕوانە: کۆنفۆشیۆس، ژ١، س١، ل٦٠-٦٨؛ بایرۆن، ژ٢، س١، ل٤٣-٤٤؛ کەریم خانی زەند، ژ٣، س١، ل٧-١٠؛ میری سۆران، ژ٤، س١، ل٦ -١٠؛ گۆتە، ژمارەی پێشوو، ل٦١-٧٠؛ دانتی، ژ٥، س١، ل٦٠-٦٢؛ لۆرکا، ژ٨، س١، ل٣٤-٤٤.

259 عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی، ل٧٥.

ئافرەت وەك دایك و ژن و خەباتکەرو چەندین شێوەی جیاوازو مەسەلەی نەتەوایەتی و سیاسی گەلی کورد، بە زەقی لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا خۆی نواند. هەژاری و نەبوونی و دەست کورتی و کارەساتی سروشتی و چەندین دەردی کۆمەڵایەتی بوونەتە کەرەستەی ئەو چیرۆکانەی گۆڤارەکە، کە هەوڵ دەدەین لێرەدا شیيان بکەینەوە.

بەهۆی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراقداو نەبوونی یاسایەکی تایبەت بەزەوی‌و زار لە بەرژەوەندی جووتیاران دا هەمیشە چینی دەرەبەگ باڵا دەست بوون و بە ئاشکرا جووتیاران دەچەوساندەوەو هەموو داهاتەکەیان لێ زەوت دەکردن و میرییش بەرگری لێ دەکردن.. ئاغا سەرانەی وەردەگرت و زۆر جاریش دەست درێژیان بۆ سەر نامووسی جووتیارانیش دەکرد، ئەم حاڵەتە بەلای ڕۆشنبیرانەوە گرییەکی دەروونی بۆوەو هەوڵیان داوە بە شێوەیەکی هونەری لە چیرۆکدا دەریبڕن و گیانی شۆڕشگێڕی بە بەر چینی چەوساوەدا بکەن و پاڵەوانی چیرۆکەکانیان لەو چینە هەڵبژێرن.

عەبدوڵڵا میدیا لە چیرۆکی (دڵسۆزی نەمر)[260] دا نموونەی خێزانێکی جووتیاری هەژار هەڵدەبژێرێ، کە خێزانی (مام ڕەسوڵ)ە، چیرۆکنووس لە وەسفی ماڵەوەیاندا دەڵێ: ((تاقە خێزانێکی کەل‌و کۆم و دارو خاو بوون لەژوور ئاواییەوە...))[261] لە وەسفی کەلوپەلی ناوە ماڵەکەشیاندا دەڵێ ((ئەو تاکە بەرە شڕو لبادە کۆنەی هەیانبوو هەر ئەوە بوو، لە نانی جۆو جلی پیناوی و شۆربای ساوەرو دۆینە بەولاوە زیاتریان نەبوو...))[262] دیارە لە خێزانێکی هەژاری ئاوادا (دڵسۆز)ی تەمەن حەڤدە ساڵ و خوێندەواری دێ هەستی بە ئێش‌و ئازاری هەژاری کردبوو و چاك لەوە گەیشتبوو سەرچاوەی کلۆلییەکان، چەوسانەوەی ئاغایە، بۆیە کە ئاغا بانگی دەکاو زۆر بەڵێنی پێ دەدا، ئەو لە ڕووی ئاغا دەوەستێتەوەو چاونەترسانە دەڵێ: ((ئاغا من نۆکەری ناکەم و نامەوێت کەسیش ژنم بۆ بێنێت، ئەگەر من ئەوەی پەیای ئەکەم خۆم بیخۆم، هەژاریش نابم و ژنیش دێنم، بەڵام کێ ئەی کاو کێ ئەی خوا!)).[263]

---

[260] مامۆستا، ع.دڵسۆزی نەمر، گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٧٤-٨٦.

[261] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

[262] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

[263] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤.

کۆتایی چیرۆکەکەش، لەژێر سێبەری ڕژێمی پاشایەتی و زەبری ئاغـادا (دڵسۆز) دەبێتـە قوربانی و مام ڕەسوڵی باوکە دوانزە جار جەرگ بڕاو بۆ جاری سیانزەهەم لەگـەڵ خێزانەکەیـدا کەوتەوە فرمێسك ڕشتن.

(حەسەنی قزڵجی) هەمان بارودۆخی جووتیاران دەخاتە ڕوو، بـەڵام بەشـێوەیەکی دیکـە، کە ئەمجارەیان لە جیاتی کۆتاییەکی تراژیدی و خەمناك بۆ جووتیاران، بـە پێـچەوانەوە سـەری ئاغا دەپلیشێتەوەو وێنەی جیهانێکی گەشتر دەنەخشێنێ، لە قاڵبێکی ئەفسانەییدا، (وەیـسە) کە کوڕە جووتیارێکە (فەرەیدوون) بەگ زوڵمـی لـێ دەکـات و کەشـکۆڵی یەکـەمی لـێ زەوت دەکات، کەشکۆڵەی دووەمی لێ زەوت دەکات، دوو دەست لە کەشکۆڵەکەوە دەردێـن و سـەرو پۆتەڵاکی فەرەیدوون بەگ وەبەر مستان دەدەن، کە ئاغا سەیر دەکات لێی نووسراوە: ((زەوی بۆ وەرزێرو مەرگ بۆ دەرەبەگ.))[٢٦٤]

تەوەرێکی دیکەی ناوەرۆکی چیرۆکەکان مەسەلەی ئافرەتە، ئەم بابەتەش لە چەند وێنەیەکی هونەری جوداوازدا خۆ دەنوێنێ. محەمەد مەولوود مـەم لـە چـیرۆکی (قینـی لـێم بـوو)،[٢٦٥] باسـی چیرۆکی جنسی نێوان (نەسرین و کوڕێك)مان بۆ دەخاتە ڕوو و گوفتاری هەردوو پاڵەوانەکە لەگەڵ ناخ و دەروونیاندا جیاوازە، ((چیرۆکنووسیش بەسەرکەوتوانە و شـارەزاییییەوە توانیـوێتی وێنـەکان بکێـشێ، بـۆ ئەمـەش گرنگییـەکی چـاك و زیرەکانـەی بـە هـەموو لایەنـەکانی چـیرۆکەکە داوەو هەریەکەیان خاوەنی کەسایەتی و دیوی ناوەوەو زمان و بیرکردنەوەی تایبەتین.))[٢٦٦]

کوڕەکە بەوەیکە نامـەی کـچێکی بەدەست دەگـات لـووت بـەرزو لـە خۆبـایی دەبێت، کچەش سەرەتا خۆی بەپاك و بێ گەرد پیشان دەدات، بەڵام زۆر ئاڵۆشی حەزو ئـارەزووە خەفـە کراوەکـانی هـورژمی بـۆ دێنـی و بـۆ چـەند سـاتێك ڕادەبـوێرێ، بـەو شـێوەیە لـە دیـالۆگ و مەنەلۆگەکاندا کەسیەتی پاڵەوانەکانمان بۆ دەردەکەوێت، کە هەردوکیان لاوازن.[٢٦٧]

---

264 حسن قزلجی، کەشکۆڵی جادوویی، گ. هیوا، ژ ٣١، س٤، ل٧١-٨١.

265 محەمەد مەولوود (مەم)، قینی لێم بوو، گ. هیوا، ژ ٦، س ١، ل٨٢-٩٢.

266 صەباحی غالب، ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل٢٩١.

267 چیرۆکنووس بیرۆکەی ئەم چیرۆکەی لە چیرۆکی (دڵداری بەهێزترە)ی چیرۆکنووس و ڕۆماننووسی ڕووسی (تۆرگینێڤ)ەوەو وەرگرتووە، بڕوانە: تالب محمد احمد، لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە چیرۆکەکانی محەمەد مەولوود (مەم)، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٣، ل٢١٤، (نامەی ماجستێر).

مستەفا ساڵح کەریم لە چیرۆکی (بریا نەهاتیتایەوە)[268] پەیوەندی خۆشەویستی و دڵداری نێوان (سوارەو زێڕین)مان بۆ دەردەخات، کە داب و نەریتی کۆمەڵایەتیو کەللەڕەقی باوکی زێڕین دەبێتە کۆسپی بەردەمیان. ناوەڕۆکی چیرۆکەکە لە هەقایەتێکی فولکلۆریی دەچێت و زۆر ڕووداوی ناخۆشی وا لە کۆمەڵ دا ڕووی داوە، بەڵام هەندێك شتی دژ بەیەك لە هەڵوێستی پاڵەوانەکاندا بەدی دەکرێت. زێڕین کە سوارە داوای لێ دەکات ڕەدووی بکەوێت دەڵێت: ((... ئۆی سوارە گیان ئەوە چ دەڵێی؟ گوێی شەیتان کەڕ بێ. چی وا ڕوو نادا بەپشتی خودای، بەڵام بەخودای من وای بەچاك دەزانم (دڵداریە دوور بەدوورەکەمان بمێنێ بە بەرزی شەرەفەوە چاترە لە پێك گەیشتنمان بەسووکیو دەربەدەری و حەیا چوون))[269] کەچی لە کۆتایی چیرۆکەکەدا (زێڕین)یش لەگەڵ سوارە لە پاڵەوانەکەدا دەسوتێ. بەیەکەوە دڵنیا بوونیانە لە یەکتری، بەڵام لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکەدا هەست بەو خۆشەویستییە گەورەیە ناکرێت و تەنانەت سوارە وەك هەموو هەڵوێستە سەرەڕۆیی و هەرزەکارەکانی دیکەی ئامادەیە زۆر بە سووكو سانایی واز لە (زێڕین) بهێنێت و لە کاتی ڕەدوونە کەوتنی زێڕین دا، پێی دەڵێ: ((واتە ئیزنم دەدەی؟))[270] ئەمە بێجگە لەوەی هیچ هۆیەکی مەنتقی هەبێت و نازانین بۆچی ئەو پاوانە سووتاو پاڵەوانەکانیش بوونە قوربانی ئەو کۆتاییە تراژیدییە.

محەمەد مەولوود (مەم)، لە چیرۆکی (داپیرەم)[271]دا، بە پیرەژنێکی مەزنمان دەناسێنێ، ئەم پیرەژنە لەگەڵ ئەوەی تووشی چەندین چەرمەسەری و جەرگ سووتان و ماڵ کاول بوون هاتووە، کەچی هەر ورە بەرزەو هانی نەوەکانی دەدات دژی شەڕو دووبەرەکی و لایەنگری ئاشتی بن، تەنانەت وەك مرۆڤێکی بیر کراوەو تێگەیشتوو بۆ بەردەوامی ژیان و نەوەی نوێ داوا لە کوڕەکەی دەکات، کە ژن بێنێ و پێی دەڵێ: ((کوڕم... ژن بێنە...))[272]

ئەو پیرەژنە مرۆڤ دۆستە دژی ڕووخان و ڕمانەو بە توندی ڕووبەڕووی بەرەی شەڕخوازان دەبێتەوەو دەڵێ: ((ئێمەش... هەر ئەو ئادەمیزادەین... ئەو دڕندە ڕوخێنەرەین..و ئەو گیانە

---

268 مستەفا ساڵح کەریم، بریا نەهاتیتایەوە، گ. هیوا، ژ ۲، س۱، ل۵۲–۶۲.

269 گ هیوا، ژ۳، س۱، ل۵۷.

270 ژمارەی پێشوو، ل۵۷.

271 مەم، داپیرەم، گ. هیوا، ژ ۹، س۱، ل۵۷–٦٤.

272 ژمارەی پێشوو، ل٦٤.

پیرۆزە وەستا دروستکەرەشین، تامیی سوێری... و تاڵی... و ناخۆشیمان زۆر چێشت، ئینجا ئێستا ئەتوانین سەرلەنوێ.. دەست بکەینەوە بە ئاوەدان کردنەوەی دونیاکەمان...))[٢٧٣]

مستەفا ساڵح کەریم لە گۆشەیەکی دیکەوە دەوری ئافرەتێکی مەزنمان بۆ دەردەخاو ئەو ئافرەتەی، کە لە پێشەوەی خۆ پیشاندان و ڕاپەڕینەکانی سەرەتای پەنجاکاندا لەپاڵ براکانیدا ڕووبەڕووی ڕژێمی پاشایەتی دەبووەوە، ئەویش لە کەسیەتی (پرشنگ)ی قارەمانی چیرۆکی (چۆن لەبیرم بچێتەوە)[٢٧٤]دا دەردەکەوێت.

(پرشنگ)ی خۆشەویستی (ئامانج) لەسەر پاسێکەوە بە وتارو هوتاف لێدانەوە هاواری دەکرد، کە قوتابییان دان بە خۆیانا بگرن و بڵاوەی لێ نەکەن یا کوشتن... یا سەرکەوتن، بەڵام پرشنگ بەر دەسرێژ کەوت، لە سەرەمەرگێشا بە ئامانج دەڵێ: ((بەڵام کە خوێنی ئێمە داری ئازادی بۆ میللەت ئاو ئەداو لێم ڕوونە کە (ئەو گەلەی قوربانی بدات هەرگیز نامرێ).))[٢٧٥]

تەوەرەیەکی دیکەی ناوەرۆکی چیرۆکەکان، چەوسانەوەی نەتەوەیی و کوردایەتی و خەباتی هاوبەشی نەتەوە ژێر دەستەکانە. دوابەدوای جەنگی جیهانی دووەم مەسەلەی نەتەوەیی زەقتر لە مەسەلەکانی دی خۆی دەنواند، بەتایبەتی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزو کارە ناپەسەندەکانی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق دەرهەق بە گەلی کوردو سەرکوت کردنەوەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەیی کوردیی. ئەم حاڵەتە وای لە چیرۆکنووسەکان کرد مەسەلەی خەباتی سیاسی و نەتەوەیی لە چیرۆکەکانیاندا ڕەنگ بداتەوە.

عەبدوڵڵا میدیا لە چیرۆکی (یەکی خاکە لێوە)دا[٢٧٦]، بە شێوەی خەون ڕەخنە لە کاربەدەستانی ڕژێمی پاشایەتی دەگرێت، کە نایەڵن گەلی کورد بەخۆشی و شادییەوە یادی جەژنێکی نەتەوایەتیان بکەنەوە، کە جەژنی نەورۆزە، وتار بێژەکەی ناو حەشامەتەکە، کە فەرمانی کاربەدەستی شار دەخوێنێتەوە دەڵێ: ((لەبەر ئەوەی زۆر بە تەنگ پارێزگاری کردنی ژیان و سامانی خەڵکی شارەوەین وە نامانەوێ هیچ ئاژاوەیەك بقەومێ، بڕیارماندا کە ئاهەنگی نەورۆز نەکرێت.))[٢٧٧]

---

[273] مەم، داپیرەم، گ. هیوا، ژ ٩، س١، ل٣٦.

[274] مستەفا ساڵح کەریم، چۆن لەبیرم بچێتەوە، گ. هیوا، ژ١، س٣، ل٨٧–١٠٣.

[275] ژمارەی پێشوو، ل١٠٢.

[276] میدیا، یەکی خاکە لێوە، گ. هیوا، ژ ٩، س١، ل٤٣–٤٨.

[277] ژمارەی پێشوو، ل٤٧.

(فاضل نظام الدين)، بە شێوەیەکی ڕەمزی خەباتی تێکۆشەرێکی ڕێگای ئازادی میللەتەکەمان دەگێڕێتەوەو شەهیدەکە زیندوو دەکاتەوە بۆ ئەوەی خۆی سەربردەی ژیانی خۆیمان پێشکەش بکات، کە لە مەیدانی خەبات دا گیانی خۆی بەخت کردووە. بۆ ئەم مەبەستەیش چیرۆکەکەی (یەکێ لە شەوەکانی گردی سەیوان)٢٧٨ هەڵبژاردنێکی سەرکەوتووە، کە گردی سەیوان مەزاری شەهیدانە.[279]

(هۆگر گۆران) لە چیرۆکی (سەردار)٢٨٠ ڕۆشنایی دەخاتە سەر لایەنێکی تری خەباتی نەتەوەیی، ئەویش خەباتی ڕۆشنبیرانە لە ڕێگەی نووسینەکانیانەوە بۆ وریا کردنەوەی جەماوەرو خرۆشانی گیانی شۆڕشگێڕی تیایاندا.

(سەردار)ی قارەمانی چیرۆکەکەی بەهۆی نووسینێکییەوە دەخرێتە زیندان، ئەمەش دووپاتی نەبوونی سەربەستی و دیموکراسی و سانسۆری سەخت و دژواری ئەو ڕۆژگارە دەکاتەوە، کە حکومەت تەنگی بەهەموو چین و توێژە پێشکەوتنخوازەکانی گەل هەڵچنی بوو.

(مەم) لە چیرۆکی (نامەیێك بۆ بەندیخانە)دا[281] نامەی منداڵێك دەکا بەهۆیەك بۆ دەرخستنی هەست و سۆزێکی بەکوڵ بۆ منداڵە بارزانییەکان، کە ڕژێمی پاشایەتی ئاوارەی کردن و بەهۆی خەباتی نەتەوەیی بۆ ڕزگاری کوردستان بێ باوك ماونەوە، تەنانەت ڕژێم دییەکەشی لێ کاول کردن و سووتاندی، لە نامەکەدا هاتووە: ((باوکی خۆشەویستم.. ڕۆژ باش، سەلاوت لێ بێت، باوکە گیان چۆنی؟ کەنگێ ئەگەڕێیتەوە لامان، ئێستا لە بەندیخانە چۆن ڕائەبوێری؟ ئایا ئەزانی من و نازێ لەگەڵ دایکمان ئێستا لە شاری (....)ین دایکم ئەڵێ پاش گرتنی تۆ... ئێمەش بەزۆری زۆردار لە گوندەکەی خۆمان گوێزراینەوە ئەم شارە... دایکم لێرە بەتەنیا هەموو ڕۆژێ ئەم ماڵ و ئەو ماڵ خەبات ئەکات هەتا نزیك ئێوارە، بەم جۆرە نان و خۆراکمان بۆ پەیدا ئەکات...)).[282]

---

278 فاضل نظام الدين، یەکێ لە شەوەکانی گردی سەیوان، گ. هیوا، ژ ١٢، س١، ل٥٨-٦٤.

279 سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی ئەم چیرۆکە محرم محمدامین لە ژ١، س٢، ل٨٧دا هەندێ سەرنجی وردی لەسەر تەکنیکی هونەری چیرۆکەکە دەربڕیوە.

280 هۆگر گۆران، سەردار، گ. هیوا، ژ٨، س٢، ل٥١-٥٣.

281 مەم، نامەیێك بۆ بەندیخانە، گ. هیوا، ژ (١١، ١٢)، س٢، ل٧٩-٨٦.

282 ژمارەی پێشوو، ل٨٠-٨١.

چیرۆکنووس سەرکەوتووانە باری دەروونی منداڵێکی بێ باوکمان بۆ شی دەکاتەوە، کە هەستی چییە بەرامبەر باوکە نەدیوەکەی و بینینی منداڵانی دی،کە دەست دەخەنە دەستی باوکیانەوە. هەمان چیرۆکنووس لە چیرۆکی (ئاوارەکان)دا بەشێك لە مێژووی شۆڕشەکانی بارزان بۆ ڕزگاری نەتەوەیی کوردیی بەشێوەیەکی هونەریی دەخاتە ڕوو و (مام سێودین)و (پوور مامز) دەکاتە هێمای کۆڵنەدان و نەبەزین و وەك دوو پاڵەوانی ڕق ئەستوور بەرامبەر بەدوژمن دەوەستنەوە.

ئەم خێزانە بارزانییە لە ئەنجامی زەبرو زۆرداری دوژمن بەرەو کوردستانی ئێران دەچن، بەڵام ئەوەندە هیوا لەگیان و دەروونیاندا گەورەیە هەر بەتەمای ئەو ڕۆژەن کە تۆڵەی خۆیان لە دوژمن بکەنەوەو ئەو ئاوارەییەش بەشتێکی ئاسایی دەزانن، چونکە ڕۆڵەو کەس و کاری تریشیان لەو ڕێگەیەدا شەهید بوونە. باوکی (مام شێودین)یش لە کاتی بریندار بوونی لە شەڕی عوسمانیدا تفەنگەکەی داوەتە (سێودین)، ئەو کات پازدە ساڵانەو پێی دەڵێ: «کوڕێ من... نەگری، شەرمە بۆ مرۆیان گریان.. ها ئەمە تفەنگی من... کوڕی باوکی خۆت بە.. تۆلەیا ولاتا خو... بستینەو ڕێ مەدە دوژمن خاکی کوردستانت بشێای و... ملەتی مە... دیل بکەن و بچەوسێننەوە.»[283] ئەم خێزانە هەژارە چاویان لە دەستی کوڕە تاقانەکەیان (ڕەشکۆ)یە، کە لەسەر جێگا کەوتووەو نەخۆشە، درێژە بە خەباتی کوردایەتی خێزانەکەیان بدات.

(قەڵەندەر ئالانی)یش لە چیرۆکی (دیمەنێکی سامناك لەسەر سنوور)دا[284] باس لە کوردایەتی و ئاوارە بوونی خێزانێکی کوردی بەئەسل و بنەچەی پشدەری گیرساوە لە ناوچەی (سەردەشت)ی کوردستانی ئێران دا، دەکات، کە لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزدا دەیانەوێ بەدزییەوە لە ئێرانەوە بەمەرزدا بپەڕنەوەو چۆنیەتی پەڕینەوەو زامدار بوونی کوڕەکەیان بەهۆی کەوتنە خوارەوەی لەسەر پشتی وڵاخەوە پیشان دەدات.

مارف بەرزنجی لە چیرۆکی (شەتل)دا[285] ململانێی بەینی نەزانی و نەخوێندەواری و مامۆستای گوندێکی دوور پیشان دەدات، کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لە پێناو بڵاو بوونەوەی خوێندەواری و گیانی هۆشیاری و وریا بوونەوەی منداڵە جووتیارەکانی دێ تێدەکۆشێت و

---

283 مەم، ئاوارەکان، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٨٦.

284 قەڵەندەر ئالانی، دیمەنێکی سامناك لەسەر سنوور، ژمارەی پێشوو، ل٩٢-١٠٠.

285 معروف بەرزنجی، شەتڵ، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٦١-٧٠.

بەرگەی ئەو گوزەرانە تاڵە دەگرێت، ((چەوساوەییەکی کوردی بێ دەرەتانی دەربەدەر کراوی خۆڕاگرو جەنگاوەر بەرامبەر بەناحەزان و خوێندەوارێکی بیر خاوێنی جەزرەبەدراو کەرەسەی بابەتەکانی بووە، ئاوات و ئومێدی ڕاستەقینەی هەردوو کیانی موتووربە کردووەو بەستوونی بەیەکەوە، کە مەسەلەی مرۆڤایەتی و بەختەوەری میللەتی کوردە.))[286]

کە لەکۆتایی چیرۆکەکەدا قوتابییەکان، لەبەر هەژاری دەست لە خوێندن هەڵدەگرن، چیرۆکنووس هەوڵەکەی خۆی وا دێتە بەرچاو، کە (شەتڵ)ێك لە باخچەیەکی ڕەنگین، کە ژیانە هەڵدەکەنرێ و پەیوەستی دەکات بە خەیاڵێکی ڕابردووی سەردەمی منداڵی خۆیەوەو لەسەر ئەم کارە ناپەسەندە باوکی لێی داوە. هەروەها چیرۆکنووس هەوڵ دەدات ئەو هەژارییەو نەبوونی قوتابخانە لە گوندەکان و بەزۆر سەپاندنی زمانی عەرەبی لە کاتی خوێندندا بخاتە ئەستۆی حکومەتەوەو پەیوەستی بکات بەبارودۆخی سیاسی و چەوسانەوەی نەتەوەییەوە.[287]

(حەسەن قزڵجی)یش توانج و پلار لە دووبەرەکی و ناکۆکی نێوان کوردان دەگرێت لە نێوان پارچەکانی کوردستان دا زیرەکانە هۆیەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ پلانی ئیمپریالیزم و ڕژێمە داردەستەکانی لەو وڵاتانەی کە کوردستانی بەسەردا دابەش کراوە. لە چیرۆکی (شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ)دا[288] هەباسەی وەرزێر لە وەڵامی مجێوری مزگەوتدا، کە دەریدەکاو هەڕەشەی گرتنی لێدەکات، چونکە ئاوارەیەو لەکوردستانی ئێرانەوە هاتووەدا دەڵێ: ((بۆچی من و تۆ هەردوکمان کوردنین، هەردووکمان وەك یەك هاوڕەگەزو خوێن نین؟ ئێرەش هەر کوردستان نییە، من و ئەم خەڵکەی لە ئەم شارەدا گشتمان کورد نین و لە کوردستان نین؟ ئیتر بۆچی ئەم گرن؟ ئەم منو تۆیی و دووبەرەکی یە چی یەو، ئەم جیاوازی و قینەبەرییە شوورەیی نییە.))[289]

---

286 عومەر مارف بەرزنجی، پشکۆو چیرۆکی کوردی، گ. ڕۆژی کوردستان، ژ١، س٢، ١٩٧٢، ل٥٤.

287 د. ١، س٢، ١٩٧٢، ل٥٤؛ عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، دەربارەی مارف بەرزنجی نووسیویە: ((چیرۆکنووسێکی سەرکەوتووی کوردە))، بڕوانە: د.عزالدين مصطفى رسول، الواقعية في الادب الكردي، ص١٨.

288 حسن قزڵجی، شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٥٦–٦١.

289 حسن قزڵجی، شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٥٨.

(مەم) گۆڕانکاری و ڕووداوەکانی دەست درێژییە سیّ قۆلّییەکەی سەر گەلی میسر دەکاتە چیرۆکێك و تیایدا لەسەر زاری پالّەوانی چیرۆکەکە، کە ئافرەتێکە و وەك هاوبەشی خەمی گەلی عەرەبی میسر بە رۆژوو بووە هاودەردی کورد پیشان دەدات و خەباتی نەتەوەیی هەردوو گەلەکە بەیەکەوە گریّ دەدات.

چیرۆکی (کە دایکم بەرۆژوو بوو)،[290] نموونەی خەباتی هاوبەشی و بڕوا بوونی کوردە بەرامبەر بە ئاشتی و تەبایی و وەستان دژی شەڕو پلان. سیّ کەسایەتی سەرەکی لە چیرۆکەکەدا دەردەکەون، پیرەژنێك کە لە رۆانگەی ئایینەوە بۆ مەسەلەکە دەڕوانیّ و پێی وایە مادام میسر موسلّمانن هەرگیز نابەزن. خوشکی کوڕەکە، لە ڕوانگەی سۆزو ویژدان و بەزەیی هاتنەوە بەمندالّی ساوا دژی دەست درێژییەکەیە. کوڕەکە لە روانگەی بەستنەوەی خەباتی کوردایەتی و شۆرشگێڕییەوە هەلّوێستی خۆی دەردەبڕیّ، کە هاوبەشی خەباتی میللەتە دیل و ژێر دەستەکانە، بۆیە دەلّیّ: ((لەناو مونجی ئەو تورەیی‌و قینەدا ولاّتە دیلەکەی خۆم... کوردستانی خۆشەویستی زۆرلێکراوم... لە تەك میسری زۆر لێکراو هاتە بەرچاو.. کە سالّەهای سالّە وا لەژێر پێی ئیستعمارو نۆکەرە خوێنخۆرەکانی ئەتلێتەوە...))[291] بەم شێوەیە دایکیان بڕیاری داوە تا میسر ڕزگاری دەبێت بەرۆژوو بێت.[292]

تەوەرەیەکی دیکەی ناوەرۆکی چیرۆکەکان هەژاری‌و دەست کورتی خێزانییە، (مەم) لە چیرۆکی (پەنجا فلس)دا[293] بە ژیانی هەژاری و نەبوونی خێزانی دوو قوتابی ئاشنامان دەکات، کە خەریکە لەبەر هەژاری و دەست کورتی واز لە خوێندن و قوتابخانە بهێنن، بەلاّم دوایی حەزو ئارەزووی خوێندن هانیان دەدا بچن بۆ قوتابخانە. لە ڕێگەدا ئەو دوو قوتابییە پەنجا فلس دەدۆزنەوەو لە خۆشیاندا لە پۆلیش (س)ی قوتابی لەوەلاّمی پرسیارێکی مامۆستادا بە (پەنجا

---

[290] مەم، کە دایکم بەرۆژوو بوو، گ. هیوا، ژ ٤، س٢، ل٢٢-٣٠.

[291] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

[292] طالب محمد احمد، لە نامەی ماجستێرەکەیدا، دەربارەی ئەم چیرۆکە هەندیّ سەرنجی وردی دەربڕیوە، بڕوانە: لێکۆلّینەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە چیرۆکەکانی محەمەد مەولوود (مەم)، (نامەی ماجستێر)، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٣، ل٥٦-٦٠.

[293] مەم، پەنجا فلس، گ. هیوا، ژ ٤، س١، ل٧٨-٨٤.

فلس) وەڵام دەداتەوە. لە وەسفی هەژاریی خۆیاندا چیرۆك گێڕەوە دەڵێت: ((ئەو بەیانییە چ خۆراکمان نەبوو.. نە.. نان.. نە شەکرو چا، کە تاکە خواردنە خۆشەویستەکەکان بوو.))[294] لە وەسفی دۆزینەوەی پەنجا فلسەکەشدا دەڵێت: ((کە لەناو قوڕەکەی پێش دەمم.. چاوم بە پەنجا فلسێکی سپی کەوت!! بە هێزێکی سەیر.. وەك پشیلەکە پەلاماری نێچیر ئەدا.. وا پەلامارم دا.. وام ئەزانی لە دەستم ڕائەکا.. هەڵم گرت و.. مستێك قوڕییشم لەگەڵ هێنا!!))[295]

ساجد ئاوارە لە چیرۆکی (هێزی برسێتی)دا[296] دوو سواڵکەری کلۆڵی لە کۆمەڵ وەرگرتووە، کە برسیەتی بە جۆری هورژمی بۆ هێناون دەریشیان دەکەن نارۆن و لە ماڵی چیرۆککگێڕەوەدا نان دەخۆن، ئەگەرچی دایکی پێی خۆش نییە، بەڵام چیرۆککگێڕەوە بەزەیی پێیان دا دێتەوە. کابرای سواڵکەریش بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە، کە ئاوارەی دەستی ئاغان.

فاضل نظام الدین لە چیرۆکی (لەتێ نان و شیشێ کەباب)دا[297] هەژاری و مەینەتی خێزانێك دەردەخات، کە قوتابییەك هەموو ڕۆژێ خواردنەکەی لە قوتابخانە ناخوات و دەیباتەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خوشکەکەی بیخۆن، داهاتیان تەنیا لەسەر ئەو سنییەیە کە لەبەر دەرگا شتی لەسەر دەفرۆشن، کە مامۆستا لێی دەپرسێ، بۆی دەردەکەوێ، کە زۆر هەژاران و قوتابییەکە باوکی نەماوەو دایکیان بەخێویان دەکا، مامۆستا دەیەوێ چارەگە دینارێکی بداتێ و یارمەتیان بدات، بەڵام قوتابییەکە لێی وەرناگرێ و دەڵێ: ((ئاخر مامۆستا ئەمرۆ تۆ ئەمەم ئەدەیتێ ئەی سبەینێ، ئەی دوو سبەی؟))[298] ئەو دیالۆگەی کۆتایی چیرۆکەکە هێزی چیرۆکەکە دەردەخاو کۆتاییەکی بەهێزە، کە هەژاری بە بەزەیی چارەسەر ناکرێت و لە ئەستۆی دەستەڵاتی سیاسییە، کە ئابووری وڵاتی بۆ بەرژەوەندی خۆی و بە شێوەیەکی یەکسان دابەش نەکردووە.

تەوەرەیەکی دیکەی ناوەرۆکی چیرۆکەکان لەخۆ گرتنی هەندێ دەردی کۆمەڵایەتییە، کە کاریگەریەکی خراپیان بەسەر نەریتی کۆمەڵدا هەیە، دەبنە هۆی دواکەوتن و لە نیشانەکانی

---

294 گ هیوا، ژ٤، س١، ل٧٨.

295 مەم، پەنجا فلس، گ. هیوا، ژ ٤، س١، ل٨٠.

296 ساجد ئاوارە، هێزی برسێتی، گ. هیوا، ژ ١٠، س١، ل٦١–٦٩.

297 فاضل نظام الدین، لەتێ نان و شیشێ کەباب، گ. هیوا، ژ (٦، ٧) س٢، ل٣٢–٣٧.

298 گ. هیوا، ژ (٦،٧)، س٢، ل٣٦.

دواکەوتنی شارستانین. یەکێ لەو دەردانە دەردی قومارە، کە لەو ساڵانەدا بەهۆی بێ کاری و بڵاوبوونەوەی هەژاری بەنێو ڕیزەکانی خەڵك دا شیرازەی زۆر خێزانیان لەبار بردووەو تێك داوە.

(مستەفا ساڵح کەریم) بە چیرۆکی (فرمێسکی پەشیمانی)دا[299] بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئاکامی پیاوێکی قومارباز دەردەخات، کە تازە گەنجە و تازە ژنی هێناوەو تازەش دامەزراوە. وەك مامۆستایەکی چالاك لە سەرەتای ژیاندا پەرۆشی بنیاتنانی خۆی و لە خەمی بڵاوبوونەوەی خوێندەوارییە لە کوردستاندا، پاشان بەهۆی چەند برادەرێکیەوە دەخزێتە نێو کۆڕی شەوانەی قومارەوەو لەگەڵ ژنەکەیشی خەریکە نێوانیان تێك دەچێت، شەوێکیان دوای ئەوەی سوێند دەخوات نەیەتەوەو شەو لە دەرەوە دەمێنێتەوە پەشیمان دەبێتەوەو بۆ یەکجاری واز لە قومار دەهێنێت و ژنەکەیشی لە خۆشیاندا دەڵێت: ((دڵم خەبەری دابوو، کە هەر دێتەوە گیانەکەم، بۆیە ئەم شەو خەو نەهاتە چاوم شەوگار کردی و من کردم... بەڵام ئەمزانی کەهەر دێیتەوە..)).[300]

چیرۆکنووس ئەم خووە ڕیسوا دەکات و بۆ ئەم مەبەستەیش نموونەیەك دەهێنێتەوە بۆنەفامی کەسەکان، کە چیرۆك گێڕەوە دەڵێت: ((هەتا ماوم ئەوەم لەبیر ناچێتەوە، کە شەوێ لە شەوان کچێکی شۆخ و شەنگ هەیاسەکەی ناو قەدی هێنابووەوەو یەك دووچاوی ڕەشی گەشی جوان فرمێسکی قەویان هەڵنەڕشت وەك بارانی بەهار کە بەقوڵپی گریانەوە خۆی کرد بە ژووراو ڕووی کردە ڕۆستەمی برای:- نەختێ وازبێرە لەم قومارە بێ فەرە بۆ خاتر خوا وا لەوێ ئەول کەریمی برام وا گیان ئەدا.))[301]

محەمەد نوری تۆفیق لە چیرۆکی (بەرەحمەت بێ خەتای باوکی بوو!)[302] هەمان مەسەلەی قومار دەخاتە ڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی ناهەمواری ئەوتۆ، کەتیایدا دەکەوێتە دواندەری و چیرۆکنووس خۆی دێتە گۆو دەڵێ: ((ئەرێ ئێوە شەرم ناکەن لەم دەورەدا قومار ئەکەن؟؟؟ ناشوکری نەبێ ئەبێ گەلی کورد هەر ئەمە بەشی بێ!! وا میللەتان مانگیان تاقی کرۆدەوە، بە

---

[299] مستەفا صالح کەریم، فرمێسکی پەشیمانی، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل٢٤.

[300] ژمارەی پێشوو، ل٣٠.

[301] گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٢٧.

[302] محمەمەد نوری تۆفیق، بەرەحمەت بێ خەتای باوکی بوو، گ. هیوا، ژ(٢)، ل٦٣-٧٦.

فرۆکە لە دێیەکەوە ئەچن بۆ دێیەکی تر...))[303] کە ئەمەش زۆر لە بەهای هونەریی چیرۆکەکەی هێناوەتە خوارەوە.

(ساجد ئاوارە) لە چیرۆکی (مانگ گیران)[304] دا، کە لە نەریتێکی کۆمەڵایەتی دەدوێ، ئەویش تەپڵ لێدانە لەلایەن خەڵکەوە لە کاتی مانگ گیران دا، چیرۆکنووس تەپڵ لێدانەکە لای دوو منداڵی هەژارو پێخاوس نمایش دەکات و تیشك و تریفەی مانگەگە پەیوەست دەکات بە هیوای هەژارانەوەو شەوەزەنگیش بەنائومێدی، واتا گەڕانەوەی بۆ ئەو بڕوایەی کە هەردوو هێزی چاکەو خراپەو تاریکی و ڕووناکی لە جیهان و ژیان دا بەرقەراران.

حەسەنی قزلجی لە چیرۆکی (نوشتەکەی ئامینەخان)دا[305] مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی دەخاتە ڕوو، باوەڕهێنانی دەشتەکییەکان بەنووشتە و شێخ و مەلا. چیرۆکنووس زۆر بەوردی پەردە لەسەر فرت و فێڵی نوشتەو شێخ هەڵدەداتەوەو لە کۆتاییشدا ئەو دەستەو تاقمە ڕیسوا دەکات و فێڵەکانی ئامینەخان، کە وەك کیژە شێخێك نوشتە دەکات، کوڕێکی گەنجی فێڵزان لە خشتەی دەبات، بەلاَم ئامینە خان دڵی بەو جەواڵە گەنمە خۆشە کە لە کوڕەکەی وەرگرتووە.

(عەبدوڵلا میدیا)یش لە چیرۆکی (شاڵلاّ سواری کەریشیان بکردایە)دا[306] لە دەروون پاکی و ڕەوەشت بەرزی خەڵکی لادێ دەدەوێ و کابرای دەشتەکی قێزی لە ڕەفتارو ڕەشت نزمی گەنجەکانی نێو چایخانەیەك دێتەوە، کە چۆن ڕێگەیان بەکیژێك گرتووە لێدانیان خواردووە.

کارەساتی سروشتیش بۆتە هەوێنی چەند چیرۆکێك و ئەو ماڵوێرانی و نەهامەتییەی بەسەر خەڵکی بێ تاوان دا هاتووەو ویژدانی چیرۆکنووسانی هەژاندووە، کارەساتی لافاوەکەی شاری سلێمانی لەساڵی ١٩٥٨ دا بووە هۆی مردنی چەند منداڵ و گەنج و پیرێك و چەندین خانووی ڕووخاند و زەرەرو زیانی بە هاوڵاتیانی شارەکە گەیاند.

مستەفا ساڵح کەریم لەچیرۆکی (کوا کوڕەکەم)دا،[307] بەسەرهاتی پیاوێك دەردەخات کە لە تاو (سزا)ی کوڕی خەریکی دارو پەردووی خانوویەکی ڕووخاو دەبێت و خۆیشی دەکەوێتە

---

303 ژمارەی پێشوو، ل٦٥.

304 ساجد ئاوارە، مانگ گیران، گ. هیوا، ژ٧، س١،، ل٩٣-٩٦.

305 حسن قزلجی، نوشتەکەی ئامینە خان، گ هیوا، ژ٣٠، س٤، ل١٠١-١١٠.

306 میدیا، شاڵلاّ سواری کەریشیان بکردایە، گ هیوا، ژ٣٤، س٥، ل٧٣-٧٨.

307 مستەفا سالح کەریم، کوا کوڕەکەم، گ هیوا، ژ ٥، س١، ل٥٥-٦٠.

خەستەخانەو حاڵی شڕەو لە سەرەمەرگە، بەڵام ئەو لاشەیەی لەژێر خانووی ڕووخاو دەریدەهێنن کوڕەکەی ئەو نییەو کوڕەکەی بێ سەرو شوێنەو منداڵێکی ترە بە ناوی (سیروان) وتـی (دارا)ی قارەمانی چیرۆکەکە ئـەم ڕاستییە بـە دکتـۆری خەسـتەخانەکە دەڵـێ. ((ئەمـەش نموونەیـەکی قوربانییەکانی ئەو لافاوەیە، کە (عەبدوڵلاّ میدیا) یش لە چیرۆکی (لافـاو)دا[308] لـەو لافـاوەی شار دەدوێ و پەیوەستی دەکات بە هاتنەوەی تەرمی شێخ مەحموودی نەمرو شـەڕەکەی بـەردە قارەمان. مامۆستـا (ع) وردە وردە بـەدەم ڕۆیـشتنەوە بـۆ مـاڵ کاولکـاری لافاوەکـە و شـین و شەپۆڕی ژنانی لە کۆڵانەکان گوێ لێ دەبێت، لە دیمەنێکدا هاوڕێیەکەی پێی دەڵێ:

((- چاوت لێیە؟

- لە چی ؟!

- لەسەری ئەو مناڵە لەژێر ئەو خانووە ڕووخاوەدا دیارە واخەریکن دەری ئەهێنن))[309]

دوای بەدوای خستنە ڕووی تەوەرە سەرەکییەکانی ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی گۆڤاری (هیوا)، لەمەودوا هەوڵ دەدەین لەئاست تەنکیکی هونەری وز مانی چیرۆکەکان هەڵوەستەیەك بکەین.

## زمان و تەکنیکی هونەریی لە چیرۆکەکاندا

تەکنیکی هونـەری تـا ڕادەیـەکی زۆر هونـەری چیرۆکنووسین لـە هونـەرەکانی دی وەك وتـارو ڕیپۆرتاژ نووسین جیا دەکاتەوە. دەست کورتی لە تەکنیکەکانی هونەری ئاسـتی چـیرۆکە لاواز و بـێ بەها دەکات. هونەری چیرۆکنووسین هەر لە زووەوە لە لایەن شارەزاو پیـسپۆرانەوە چـەند مـەرجێکی سەرکەوتوویان بۆ داناوە، بە تایبەتی سەرەتاو گرێ و لووتکەو کۆتاییەکی بەهێزو باوەڕهێنەر.[310]

سەرەتا لەرووی هەڵبژاردنی پاڵەواندا دەتوانین پاڵەوانەکان بۆ چەند جۆرێك دابەش بکەین. جووتیـاری هـەژاری زوڵـم لێکـراو لەلایـەن ئاغـاوە لـە بەشـێکی زۆری چـیرۆکەکاندا دووبـارە دەبێتەوە، بەو شێوەیەی سەری بۆ واقیعە تاڵەکـە داوەو ئاسـتی ڕۆشنبیریـشیان زۆر لاوازە. لـە

---

[308] مامۆستا –ع، لافاو، گ هیوا، ژ٥، س١، ل٧٦–٧٧.

[309] ژمارەی پێشوو، ل٦٧.

[310] د. عیزەدین ئیسماعیل ڕەگەزەکانی چیرۆکی هونەری وا دەست نیشان دەکات: ١– ڕووداو. ٢ – گێڕانەوە ٣– بنیات. ٤– پاڵەوان. ٥– کات و شوێن. ٦– بیر.

بڕوانە: د. عزالدین اسماعیل، الادب وفنونە، ط٢، ص١٨٥–١٩٧.

هەندێ چیرۆکیشدا کوڕی جوتیار بەهۆی گەشە کردنی بیری چینایەتی و ئایدیۆلۆژیەوە ڕوو بەرووی ئاغاو داروودەستەکەی دەبێتەوە، هەروەك (دڵسۆز)ی کوڕی مام ڕەسوڵ لە چیرۆکی (دڵسۆزی نەمر)دا.

پاڵەوانێکی دیکەی ناوچیرۆکەکان، ژنی کوردە، کە لە چەند وێنەیەکی جیاوازدا خۆ دەنوێنێ" ئافرەتی دنیادیدەو بەئەزموون و بنیات نەر هەروەك داپیرەی چیرۆکی (داپیرەم)، یان کچ و ژنی شۆڕشگێڕو پەروەردەکراو بە بیری سیاسی و نیشتمانییەوە هەروەك لە چیرۆکی (چۆن لەبیرم بچێتەوە)، یان پاڵەوان نموونەی ئافرەتێکی داوێن و پیس و سۆزانی و لەخشتەبراوە لە لایەن کەسانی نەفس نزمەوە بوونەتە قوربانی پەیوەندییە ناجۆرەکانی کۆمەڵ، هەروەك (خەجێ)ی پاڵەوانی چیرۆکی (دەروازەکەر)ی عەبدوڵڵا میدیاو (نەسرین)ی چیرۆکی (قینی لێم بوو)ی مەم.

جۆرێکی دی لە پاڵەوانی ئافرەتانە، ئەوانەن لەگەڵ قەزاو قەدەر و قسمەتو نسیب دا دەڕۆن بێ ئەوەی هیچ هەڵوێستێکیان هەبێت و مل کەچی پەیوەندییە دواکەتووەکانی کۆمەڵی ڕۆژهەلاتین و لە کاتی پەیوەندی دلدارییش دا چارنووسییان بەدەست خۆیان نییەو دەچەوسێنرێنەوە، (لە هەر کۆمەلگایەکی فرە چیندا، جا پێوەندی کۆمەلایەتی، کۆیلایەتی بێت، یا دەرەبەگایەتی یا سەرمایەداری، مولکایەتی تایبەتی بەرکەماڵە، تا مولکایەتی تایبەتیش بەردەوام بێت، چەوسانەوەی ئافرەت هەر بەردەوامە، تەنیا شێوەکەی دەگۆڕێ.)[311]

شێوەیەکی دی لە پاڵەوانی چیرۆکەکان کەسانی شۆڕشگێڕو گۆش کراون بەبیری نەتەوەیی پێکشەوتنخوازو لە بەها چەسپاوەکانی کۆمەلایەتی و ڕژێمە سیاسییە دیکتاتۆرییەکان یاخین، یاخی بوو مەبەست (ئەو کەسەیە ئامانجێك بۆ ژیان بەدی دەکا، بڕوای بەوە هێناوە کە ژیان هەرگیز ناوەستێ و هەر بەرەو گۆڕانێکی باشتر دەڕواو هەوڵدەدا، کە لەو گۆڕانە بەشداری بکات)،[312] نموونەی ئەو پاڵەوانانەش لە کەسایەتی (سەردار)ی قارەمانی چیرۆکی (سەردار)و مامۆستای چیرۆکی (شەتڵ)ی مارف بەرزنجی دا بەرجەستە دەبن.

---

311 حەمەسەعید حەسەن، ئافرەت لە چیرۆکی کوردیداو کۆمەڵێ پرس، گ. نووسەری کورد، ژ٦، ١٩٨١.

312 محەمەد مەولود (مەم)، تاقیکردنەوەم لە چیرۆك نووسیندا، گ. کاروان، ژ١، س١، ١٩٨٠، ل١٨.

- شوێن و کات بە شێوەیەکی هونەری و مەنتیقی لە هەندێ لە چیرۆکەکاندا مامەڵەی لەگەڵ کراوەوە شوێن و کات گرنگییەکی تایبەتیان لە سەرکەوتنی چیرۆکدا هەیە. شوێن لە چیرۆکەکاندا بەزۆری گوندەکانی کوردستانەو لەناو جەرگەی ژیانی جووتیار و زەحمەتکێشی کوردستانە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ تا کۆتایی پەنجاکانیش لە پێکهاتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵی کوردەواری جوتیارو زەحمەتکێش زۆرینەی گەلیان پێك دەهێنا، کەچی لە ژیانێکی تاڵ و کولەمەرگیدا دەژیان.

لە دوای شۆرشی ١٤ی تەمووزەوە چیرۆکنووسەکان وردە وردە شوێن و دیمەنی چیرۆکەکانیان لەناو کۆمەڵانی خەڵکی شارەکان هەڵدەبژاردو کێشەکانی ژیانی ڕۆژانەی خێزانی هەژارو مامۆستاو قوتابی لە قوتابخانەو کۆلیژەکانیان دەخستە ڕوو. شوێن لە چیرۆکەکانی (دڵسۆزی نەمر) و (بریا نەهاتیتایەوە) و (کەشکۆڵی جادویی) و (فرمێسکی پەشیمانی) گوندەکانە و چیرۆکەکانی (کە دایکم بەرۆژوو بوو) و (کوا کورەکەم) و (لافاو)و (قینی لێم بوو) (سەردار) شارەکانەو (چۆن لەبیرم بچێتەوە) لە خۆپیشاندانی خوێندکارانی کۆلیژەکانە.

هەڵبژاردنی شوێن و ئەو کەلوپەلانەی لەوێدا چیرۆکنووس پەنایان بۆ دەبات پەیوەندییان بەدیدو تێروانینی جوانناسی (ئیستاتیکا)ی نووسەرەوە هەیە، چونکە هەڵبژاردنی شوێن بەقەد فەلسەفەی کەلوپەلەکان گرنگە. هەڵبژاردنی (ماڵ وەك یەکەم گەردوون)[313] بە تەنیا بەس نییە. مامەڵە کردن لەگەڵ کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکەدا جوانییەکی تایبەتی بەچیرۆکەکە دەبەخشێ. دیوار، دەرگا، پەنجەرە، ڕووناکی، کورسی، کەنتۆر، جل...هتد، هەموو ئەمانە پێکهاتی سەرەکی و جوانکاری ماڵن.

لە چیرۆکی (فرمێسکی پەشیمانی)دا، لە وەسفی کەلوپەلەکانی ناو ماڵی مامۆستاکەدا دەتوانین بەروون و ئاشکرایی وێنەی ماڵەکە بکێشین. (ژووری دانیشتن، مێزی نان خواردن، مێزی نووسین، کتێبخانە، گوڵ و ئینجانەی سەر مێز)، تەنانەت دەتوانین گەورەیی و ڕووبەری خانووەکەش بەمەزندە لە مێشکی خۆماندا نەخشە بکێشین:

---

[313] غاستون باشلار، جماليات المكان، ترجمة غالب هلسا، ط٢، ص٦١.

## ماڵ

ژووری دانیشتن ژووری نووستن کتێبخانە موبەق

کورسی و پەردە وێنەی ژن و مێرد گوڵ و مێزی نان خواردن ئینجانەی سەرمێز

لە چیرۆکی (دڵسۆزی نەمر)دا، لە وەسفی چیرۆکنووس بۆ ماڵی (مام ڕەسوڵ)ی باوکی (دڵسۆز)دا هەست بەبوونی دیمەنی ناوماڵەکە دەکەین، کە نموونەی خانوویەکی شڕو شەپڕێوو لە قوڕ دروستکراوی بچووکی دوو ژووریی و لە ژووری دانیشتنیان دا، حەسیرێك و بەڕە شڕێك و لبادە کۆن و کەندووی ئاردو لە ناوەڕاستی ژوورەکەشدا ئاگردانێك هەبوو.

هەندێك چیرۆکنووس مامەڵەیەکی سەرکەوتوویان لەگەڵ (زەمەن - کات)دا کردووە. لێرەدا دەبێ بە وریاییەوە جیاوازی نێوان زەمەنی مێژوو زەمەنی گێڕەرەوی چیرۆك و زەمەنی ساتی نووسینی دەقی چیرۆکەکە لەبەر چاو بگرین و تێکەڵ بەیەك نەکرێن. هەروەها وەسفی زەمەن بەپێی ڕۆژ و شەوو وەزرکان و ساتەکانی ڕۆژو شەو مەسەلەیەکە پەیوەندی بە جوانکاری و وردەکاری نێو دەقی چیرۆکەکەوە هەیە.

لە چیرۆکی (شەتڵ)دا، ئەگەر بمانەوێ زەمەنە جیاوازەکان دەست نیشان بکەین لەم خشتەیەدا بۆمان دەردەکەوێت:

| زەمەن | ساڵ | شوێن |
|---|---|---|
| زەمەنی مێژوو | ١٩٥٧ | قوتابخانەی گوند |
| زەمەنی چیرۆك | ١٩٥٨ | ناو جێب |
| زەمەنی گێڕانەوە | ١٩٥٩ | نووسینی دەق |

هەر لێرەوە دەتوانین ئاماژە بۆ مەسەلەیەکی هونەریی گرنگ بکەین، ئەویش (زەمەنی گێڕانەوە)یە و خۆی لە چوار شێوەی سەرەکی دا دەدۆزێتەوە:

١- گێڕانەوەی پاشکۆ

٢ گێڕانەوەی پێش وەخت.

٣- گێڕانەوەی ئێستا.

٤- گێڕانەوەی نێوان.[٣١٤]

ئەم (زەمەنی گێڕانەوە)یش خۆی لە پەیوەندی نێوان (چیرۆکگێڕەرەوە) بە دەقی چیرۆکدا دەنوێنێ، چونکە پەیوەندی نێوان چیرۆکگێڕەوەش بە دەقی چیرۆك لە دوو حاڵەتدا بەرجەستە دەبێت:

١- چیرۆك گێڕەوەی دەرەوەی چیرۆك.

٢- چیرۆك گێڕەرەوەی ناو چیرۆك.[٣١٥]

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە هونەرییە لەم خشتەیەدا بە شێوەیەکی پراکتیکی هەندێ لە چیرۆکەکانی گۆڤاری (هیوا) ڕوون دەبێتەوە:

| چیرۆکەکان | شێوەکانی گێڕانەوە | پەیوەندی چیرۆکگێڕەوە بە چیرۆك |
|---|---|---|
| بریا نەهاتیتایەوە | پاشکۆ | لە ناوەوە |
| دڵسۆزی نەمر | پاشکۆ | لە دەرەوە |
| مانگ گیران | پاشکۆ - ئێستا | لە ناوەوە |
| یەکی خاکە لێوە | پاشکۆ | لە ناوەوە |
| هێزی برسێتی | پاشکۆ | لە ناوەوە |
| چۆن لەبیرم بچێتەوە | پاشکۆ - پێشکۆ — ئێستا | لە ناوەوە |
| بەرەحمەت بێ خەتای باوکی بوو | پاشکۆ | لە ناوەوە |
| ئاوارەکان | پاشکۆ | لە دەرەوە |
| شەتڵ | پاشکۆ — نێوان | لە ناوەوە |
| شەهیدی زوڵمە | پاشکۆ | لە دەرەوە |
| کفن و شۆردنی ناوێ | | |
| شاڵلا سواری | پاشکۆ | لە ناوەوە |

314 بۆ ڕوون کردنەوەی زەمەنی گێڕانەوەو شێوەکانی بڕوانە: سمیر المرزوقي و جمیل شاکر، مدخل الی نظریة القصة تحلیلاً وتطبیقاً، ص٩٧-١٠٠.

315 بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتر بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٢.

کەریشیان بکردایە

دوژمنەکەی پاشکۆ- ئێستا لە ناوەوە

مام قیتەڵ[316]

بە سەرنجدانی ئەم خشتەیە بۆمان دەردەکەوێت، چیرۆکەکانی گۆڤاری (هیوا)، کە چیرۆکی قۆناغی پەنجاکانە، پشتیان بە باوترین جۆری گێڕانەوە، کە (گێڕانەوەی پاشکۆ)یە بەستووەو پەیوەندی چیرۆکگێڕەوەش بە چیرۆکەکان بەزۆری لە ناوەوەی چیرۆکەوە تێ هەڵکیش کراوەو بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە چیرۆکگێڕەوە بە ئەرکی خۆی هەڵساوە، کە گێڕانەوەو گونجاندن و پەیوەست کردنی ڕووداوەکانە.

دەکرێ لێرەوە پەنجە بۆ هەندێ وردەکاری ناو چیرۆکەکانیش ڕابکێشین:

هەڵبژاردنی ناونیشانی چیرۆکەکان مەسەلەیەکە دەتوانرێ لای لێ بکرێتەوە ناونیشانی چیرۆك تا ڕادەیەکی باش خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و وای لێ دەکات چیرۆکەکە بخوێنێتەوە، لە هەمان کاتدا زیرەکی و لێهاتوویی و ڕۆشنبیریی چیرۆکنووس دەست نیشان دەکات، بۆیە هەڵبژاردنی ناونیشانی بەهێزو جوان بۆ چیرۆك ئەو جوانکاری و وردەکاریانەیە، کە سەرکەوتوویی بە چیرۆکەکە دەبەخشێت.

مستەفا سالح کەریم ناونیشانی چیرۆکەکانی بیرکردنەوەیەکی قووڵیان پێوە دیارەو سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیاندا کێش دەکەن. (چۆن لەبیرم بچێتەوە) و (فرمێسکی پەشیمانی) و (کوا کوڕەکەم؟)، یان محەمەد مەولود (مەم) ئەم ناونیشانانەی بۆ چیرۆکەکانی هەڵبژاردووە: (پەنجا فلس)، (قینی لێم بوو)، (نامەیێك بۆ بەندیخانە)، (کە دایکم بەرۆژوو بوو)... بە پێچەوانەی ئەوەشەوە هەندێ ناونیشانی لاواز بەرچاو دەکەوێت، کە خوێنەر لە یەکەم خوێندنەوەو سەرنجدا کۆتایی و ناوەڕۆکی چیرۆکەکەی بۆ دەردەکەوێ، وەك (بەرەحمەت بێ خەتای باوکی بوو)، (مانگ گیران)، (لافاو)، (ژنیش هەیەو ژانیش هەیە)٣١٧، (بۆ پێشەوە)[318]، (یەکێ لە شەوەکانی گردی سەیوان).

---

316 حسێن عارف، دوژمنەکەی مام قیتەڵ، گ. هیوا، ژ ٣٤، س٥، ل٤١–٤٧.

317 محمد مصطفی کوردی، ژنیش هەیەو ژانیش هەیە، گ. هیوا، ژ١٠، س١، ل٣١–٣٥.

318 مەجید ئاسنگەر، بۆ پێشەوە، گ. هیوا، ژ ٣٦، ل٣٤–٤٠.

مەسەلەیەکی دی لە وردەکاری چیرۆکەکاندا، (هەست ردن بە کۆتایی)یە، لە هەندێ چیرۆکدا، کۆتاییەکی مەنتیقی هەستی پێ دەکرێ، چیرۆکنووس بە شێوازی تایبەتی خۆی باوەڕ بە خوێنەر دێنێ. هەندێکیان کۆتایی چیرۆکەکانیان بە وتەیەك یان ڕستەیەکی بەهێز یانە پەندی پێشینان تەواو دەکەن وەك لە چیرۆکی (شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ) یان (زەوی بۆ وەرزێرو مەرگ بۆ دەرەبەگ)، لە هەندێ چیرۆکی دیکەدا خوێنەر بە ناچارییەوە شوێن پێی ڕووداوەکان دەکەوێ و حەزو ئەلهایەکی زۆر ڕاپێچێ دەدەن بۆ ئەوەی بگاتە کۆتایی و ئەنجامێکی دەست بکەوێ یان بە بۆچوونی خۆی ئەو ئاکامە لە خەیاڵی خۆیدا بنەخشێنێ. نموونەی ئەم جۆرە کۆتاییە سەرکەوتووەش لە چیرۆکەکانی (شەتڵ) و (نوشتەکەی ئامینەخان) و (لەتێ نان و شیشێ کەباب) و (پەنجا فلس) دا خۆی دەنوێنن بەلآم شایانی سەرنجە لە هەندێ چیرۆکدا بێ ئەوەی چیرۆکنووس هەستی پێ کردبێ زوو بەزوویی ئەنجامی چیرۆکەکەی بە دەستەوەداوەو ئەو پەرەگرافانەی دوای کۆتاییەکە بوونەتە درێژدادڕی و بار بەسەر چیرۆکەکەوە، بەمەش تارادەیەکی زۆر لە تەکنیکی هونەریی چیرۆکەکەی هێناوەتە خوارەوە. نموونەی ئەم کەموکورییەش لە چیرۆکەکانی (لافاو) و (بریا نەهاتیتایەوە) و (شەهیدی زوڵمە کفن و شۆردنی ناوێ) و (فرمێسکی پەشیمانی)دا دەردەکەوێت.

لایەنێکی دیکەی وردەکاری نێو چیرۆکەکان، غەفڵەت و ئامۆژگاری و ڕێکەوت و بەزۆر مراندنی پاڵەوانی چیرۆکە بۆ خۆدەرباز کردن لە ئاڵۆزی ڕووداوەکان و کۆتایی هێنان بە چیرۆکەکە، کە ئەمەش خاڵێکی لاوازی ئەو قۆناغەی چیرۆکی کوردی بەگشتی و چیرۆکەکانی گۆڤاری (هیوا)یە بەتایبەتی.

مستەفا ساڵح کەریم لە چیرۆکی (فرمێسکی پەشیمانی)دا مامۆستامان وا پێ دەناسێنێ کە قەت یاری قوماری نەکردووە، کەچی هەر ئەو شەوە یەکسەر دادەنیشێ و دەست بە قومار دەکا. دواییش کە زۆر خووی پێوە دەگرێ، بێ هیچ هۆیەك وازی لێ دەهێنێ.[319] هەمان چیرۆکنووس لە چیرۆکی (کوا کوڕەکەم؟)دا، ڕووداوەکانی چیرۆکەکە بۆ ژنەکەی

---

[319] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ڕەئوف حسن، فرمێسکی پەشیمانی و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ زماندا، پاشکۆی عیراق، ژ(١٢-١٣)، ١٩٧٨، ل٢١.

دەگێڕێتەوە بێ ئەوەی ئاگای لەوە بێت، کە ژنەکەی ئاگای لە هەموو ڕووداوەکانەو بە بەرچاوییەوە ڕوویان داوە.[320]

زۆر جار (ڕێکەوت) دەوری لە ژیانی پاڵەوانەکاندا بینیوە، لە چیرۆکی (چۆن لەبیرم بچێتەوە)، بەرێکەوت (پرشنگ) و (ئامانج) یەکتر دەناسن و دەبنە خۆشەویستی یەکتر. لە چیرۆکی (قینی لێم بوو) نەسرین و کوڕەکە (پاڵەوانەکە) بەرێکەوت یەکتر دەناسن. لە چیرۆکی (پەنجا فلس)دا بەرێکەوت پەنجا فلس دەدۆزنەوە... هتد. بەڵێ دەشێ ڕێکەوت لە ژیاندا ڕۆڵی هەبێ، بەلاّم هەڵبژاردنی ئەو هەموو ڕێکەوتە بۆ چیرۆکی هونەریی جۆرێك لە لاوازی پیشان دەدات. بەزۆر مراندنی پاڵەوانی چیرۆك و قەزاو قەدەر خاڵێکی لاوازی چیرۆکەکاندا پاڵەوان بەشێوەیەکی تراژیدی دەمرێت، لە چیرۆکی (بریا نەهاتیتایەوە) هەر سێ پاڵەوان لە دارستانێکدا دەسووتێن.

لە چیرۆکی (شەهیدی زوڵمەکفن و شۆردنی ناوێ) هەباسی وەرزێر لە قەراغ شار سەر دەنێنەوە، لە چیرۆکی (دڵسۆزی نەمر)دا، (دڵسۆز)ی کوڕی مام ڕەسوڵ دەمرێ، دواشت، کە دەمانەوێ هەڵوەستەیەکی لەسەر بکەین، مەسەلەی زمان و شێوەزارەکانی کوردییە، کە لە کاتی دیالۆگی پاڵەوان و گێڕانەوەی چیرۆکگێڕەوەدا بەکار هاتووە، بەشێوەیەکی گشتی زمانی چیرۆکەکان تا ڕادەیەکی باش کوردییەکی ڕەوانە، ئەگەر چی جار جار وشەی بێگانەی تیا بەدی دەکرێت، بەلاّم تا ڕادەیەکی زۆر هەوڵی ئەوەیان داوە پەیڕەوی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی بکەن و شێوەی سلێمانی بەسەردا زاڵەو تەنانەت هەندێ چیرۆکنووس شێوەی قسەکردنی بەکار هێناوە، لە چیرۆکی چیرۆکنووسانی کوردستانی ئێرانیشدا شێوەی موکریانی زاڵە، ئەمە مەسەلەی زمان و لە شێوەی (گشتی)دا، بەلاّم ئەوەی ئێمە لە چیرۆکدا مەبەستمانە لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ شێوەزارەکان و زمانی پاڵەواندا خۆی دەبینێتەوە، ئایا چۆنیەتی بیرکردنەوەو قسەکانی پاڵەوان لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبیرییدا دەگونجێ؟

مستەفا ساڵح کەریم لە چیرۆکەکانی (بریا نەهاتیتایەوە)و (فرمێسکی پەشیمانی)دا مامەڵەیەکی جوانی لەگەڵ زماندا کردووەو پاڵەوانەکان بە شێوەزاری ناوچەکەی خۆیان دەدوێن، ئەمەش لە هونەری چیرۆکدا بە کارێکی سەرکەوتووانە دەژمێردرێ و زیاتر خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و لە واقیعی نزیك دەخاتەوە. لە چیرۆکی یەکەمیاندا (زێڕین) بە

---

[320] بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانەی: حسێن عارف، چیرۆکی هونەریی کوردی، ل١٤١.

(سواره)دەڵێ: ((ئەو.. سوارەی ناو سوارانم، چ ڕایەم دەکەوێ ئیزنت بدەم، بەو پیرۆتە سووری مەرگەیەی قەسەم لە تۆ زیاتر مێرد بەکەسی دی ناکەم، بەلاّم دەڵێم هەرو هەولێ بدەو دراوان خڕ کەرەوەو بینێ مستێ بابمەوە تا پێی تێر بخوا... ئەدی من هەر نوێژان دەکەم بۆ خوای و دەپاڕێمەوە کە بە سەلامەتی بۆم بگەڕێیتەوە..))[321]

لە چیرۆکی دووەمیشدا، (کوێخا) دەڵێ: ((قورروان تۆ گەرەکتە خۆت دیل کەی لەناو چوار دیوارەکەی مەکتەب و ماڵەوەدا، ئەی ناوێ کەمێ ڕابوێری...))٣٢٢ هەروەها محەمەد مەولود (مەم) لە چیرۆکی (ئاوارەکان) دا لەسەر زاری (مام سێودین)، کە پیاوێکی بارزانییە دەڵێ ((خودێ مەزنە... ڕۆژەك هەر دێت میللەتامە... تۆلەیا خو بستینیت.. بەلّی.. دێهیت ئەو ڕۆژە.))[323] بەهۆی ئەم شێوەزارانەوە خوێنەر دەتوانی (ژینگە)ی چیرۆکەکە دەست نیشان بکات و شوێنی ڕووداوەکە دەست نیشان بکات و یارمەتی باشتر تێگەیشتنی خوێنەر دەدات.

## بەشی چوارەم

# گۆڤاری هیواو هەندێ هونەری ئەدەبیی دی

### یەکەم: ڕەخنەی ئەدەبی

ڕەخنەی ئەدەبی وەك بەشێك لە ئەدەبیاتدا، مێژوویەکی دێرینی هەیەو لەپێش یۆنانییەکانەوە ڕەخنەی ئەدەبی بەشێوەیەکی ساکارو پاشان لە سەردەمی یۆنانییەکان گەیشتە قۆناغێکی پێشکەوتوو و فەیلەسوف و زاناکانی بەخۆیەوە خەریك کرد٣٢٤. لە یەکەم ڕامانی وشەکەدا بیر بۆ لای وەدەرخستنی کەموکوڕی بەرهەمێکی ئەدەبی دەڕوات، ئەگەر ئەوە بۆ ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بشێت، ئەوا لە بواری ئەدەبیات دا، ڕەخنەی ئەدەبی بە واتای هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی دێت، بە شێوەیەك بەپێی ڕێبازو پرۆگرامێکی دیاریکراو

---

321 مستەفا سالح کەریم، بریا نەهاتیتایەوە، گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٥٧

322 مستەفا سالح کەریم، فرمێسکی پەشیمانی، گ. هیوا، ژ٢، س١، ل٢٦.

323 مەم، ئاوارەکان، گ هیوا، ژ٢٣، س٥، ل٩١.

324 بۆ سەرەتای بیری ڕەخنەیی لە یۆنان بڕوانە: الدکتور شوقي ضیف، في النقد الادبي، ط٣، ١٩٦٢.

ڕەخنەگر سەرکەتوویی و ناسەرکەوتوویی دەقێك دەست نیشان بکات، کەوابێ ئەگەر ئەدەب شیکردنەوەی ژیان بێت لە چەند وێنەیەکی ئەدەبی هەمە جۆردا، ئەوا ڕەخنە دەتوانرێ بە شیکردنەوەی شیکردنەوە پێناسە بکرێت، واتا ئەو وێنە هونەرییانەی کە ئەدەب پێك دەهێنن.

بە وردبوونەوە لەگرنگی و بایەخی ڕەخنەی ئەدەبی لە ئەدەبی هەموو نەتەوەیەکدا دەبێ لە ئاست ئەو ئەرکە قوورسەی سەرشانی ڕەخنەگر هەڵوەستەیەك بکەین. ڕەخنەگر دەبێ بەو چاوەسەیر بکرێ، کە شارەزایە و توانایەکی تایبەتی هەیە. (بە تایبەتی ئەگەر ڕەخنەگر خاوەن کەسیەتیەکی بەهێز بێت - وامان لێ دەکات، بە تێڕوانینی ئەو سەیری بەرهەمە ئەدەبییەکە بکەین، نەوەك لە تێڕوانینی خۆمان، وای لێ تێ بگەین کە ئەو خۆی لێی تێ گەیشتووە، بکەوینە ئەو هەلانەیشەوە کە ئەو تێی کەوتووە..)،[٣٢٥] بەلام لەڕاستی دا ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ ئەرکی ڕەخنەگر بە هەڵەماندا دەبات، بەتایبەتیش ئەگەر ڕەخنەگر مەرجەکانی ڕەخنەگری سەرکەوتووی تیانەبێت.[٣٢٦]

ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە سەرەرتا و بنەماکانی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری شاعیرە کۆنەکاندا دەبینرێت، ئەویش لە ستایشێ وپیاهەڵدانی خۆیان و شیعرەکانیان وشانازی کردنیان بە زمانزانی وردەکاری و جوانکاری نێوشیعرەکانیان دا.[٣٢٧] ڕەخنەی ئەدەبی وەك زۆر هونەری ئەدەبی تر لە باوەشی ڕۆژنامەو گۆڤارو لەگەڵ بلاوبوونەوەوی چاپ و چاپەمەنی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە باشووری کوردستاندا گەشەی کردو چەکەرەی کرد، چونکە نووسینی پەخشان پێویستی بە ڕۆژنامە هەیە بۆ ئەوەی بلاو بکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩٢٠ دا ئەمین فەیزی بەگ (ئەنجومەنی ئەدیبان)ی چاپ کرد و دەقی شیعریی چەند شاعیرێك و چەند دێرێکی لە ژیانیان بلاو کردەوە.[٣٢٨] (شێخ نوری شێخ سالح)،

---

325 الدکتور عزالدین اسماعیل، الادب وفنونه، ط٧، ص٦٧.

326 د. احمد کمال زکی، زۆر خاڵی بۆ ڕەخنەگری چاك دەست نیشان کردووە، بڕوانە: الدکتور احمد کمال زکی، النقد الادبي الحديث اصوله واتجاهاته، ص٢٤-٢٥.

327 لە نموونەی ئەم شاعیرانە، ئەحمەدی خانیو نالی و حاجی قادرو کۆییو مەحوی و زۆری دی هەن.

328 لە نموونەی ئەم شاعیرانە، ئەحمەدی خانیو نالیو حاجی قادری کۆیی و مەحوی و زۆر دی هەن.

وەك ڕەخنەگرێکی بەتوانا و شارەزا لە هونەرەکانی ئەدەبدا چەند وتارێکی ڕەخنەیی گرنگی لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوکردەوە[329] و تیایدا چەندین مەسەلەی گرنگی ئەدەبی وەك (هونەری جوان و هونەری بەسوود و سۆزی ویژەیی و پێناسەی ویژەو مەسەلەی فۆرم و ناوەرۆك لە ویژەدا و کێش و سەرواو کەسایەتی ویژەو چەندین بابەتی دیکەی لەو زنجیرە وتارەدا شی کردۆتەوەو (بۆ یەکەمجار لە مێژووی ڕۆشنبیری ویژەی کوردیدا ئەم نووسەرە کوردە دروشمی ڕێبازی زانستی لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازی و ویژەییدا بە چەشنێکی تیۆریی و پراکتیکی بەرز کردۆتەوە.).[330]

پاشان لە ڕۆژنامەی ژیان و گۆڤارەکانی (زاری کرمانجی) و (دیاری لاوان) و (یادگاری لاوان) دا ژمارەیەك وتاری ڕەخنەیی سادە بلاو کراونەتەوە، کە ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ هەنگاوی جددی و ڕاستەقینە بۆ گەشەکردنی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی.[331]

قۆناغی گۆڤاری (گەلاوێژ)، قۆناغێکی پێشکەوتوو ترەو بە حوکمی کۆبوونەوەی ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمە لە دەوری گۆڤارەکەدا، چەندین گفتوگۆی ڕەخنەیی بەسوود لە خزمەتی شیعری کوردیدا دروست بوو، تەنانەت هەندێکیان ململانێ و ڕق و هەڵچوونی زۆریان پێوە دیارە.[332]

---

[329] بۆ ئەو زنجیرە وتارە بڕوانە، ڕۆژنامەی ژیان، ژ٢٠، س١، ١٠ی حوزەیرانی ١٩٢٦؛ ژ٦٠، س٢، ٣١ مارتی ١٩٢٧، کە لەژێر ناوی (ئەدەبیاتی کوردی) دایە.

[330] دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر، شێخ نوری شێخ صالح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی ویژەیی و ڕەخنەسازیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠، ل٨٤. لەم کتێبەدا دکتۆر کامل بەدوورو درێژی ئەو زنجیرە وتارەی شی کردۆتەوەو پاشان لە کتێبی (ڕەخنە سازی مێژوو و پەیڕەوی کردن)یشدا دووپاتی گرنگی ئەو زنجیرە وتارە دەکاتەوە کە لە (٢٦) ئەلقەدا بلاوی کردۆتەوەو بە نوێنەری بزووتنەوەی ڕەخنەسازیی ڕاستەقینەی کوردی لە قەڵەم دەدات. بڕوانە: دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر، ڕەخنەسازی مێژوو و پەیڕەوی کردن، ل١٣٠.

[331] دەربارەی ئەو وتارە ڕەخنەییانە بڕوانە: محمد دلێر امین محمد ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لە گەشەسەندن و پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا، (نامەی ماجستێر)، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٩، ل١٦٣-١٦٥.

[332] بۆ وتارە ڕەخنەییەکانی گۆڤاری گەلاوێژ، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥-١٧٩.

له ڕووی زۆری بەرهەمی ئەدەبی و ڕەخنەی ئەدەبیەوە دووبارە بەهۆی درێژی تەمەنی گۆڤارەکەوە (١٩٣٩-١٩٤٩ز) دەتوانرێ هەوڵەکانی گۆڤاری (گەلاوێژ) بەسەرەتاو بنەمایەکی بەسوودو زێڕین دابنرێ بۆ دانانی بناغەی ڕەخنەی زانستی بی کوردی لە بواری شیعری کوردی دا، بە تایبەتی زنجیرە وتارەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی، کە پاشان هەر لەو قۆناغەدا (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) بەچاپ گەیاند.[٣٣٣]

ئەگەر (گەلاوێژ) هەوڵە ڕەخنەییەکانی تەرخان کرد بۆ شیعری کوردی، ئەوا گۆڤاری (هیوا)یش تەواوکەری گۆڤاری (گەلاوێژ)ەو ئەم لە بواری ڕەخنەی چیرۆکدا دەست پێشکەر بوو و لە ڕێگەی کردنەوەی دەرگای ڕەخنەی چیرۆك و وتاردا، چیرۆکی هونەری و تەکنیکی تازەی بەچیرۆکنووسان ناساندا هەر لە ژمارەکانی هەوەڵەوە هەڵسوڕێنەرانی گۆڤارەکە پەرۆشی ڕەخنەی ئەدەبی بنیاتنەر بوون و بەمەبەستی بەرەو پێش بردنی ئەدەبی کوردی دەرگای ڕەخنەیان کردەوە، چونکە زۆر چاك لەوە گەیشتبوون، ڕەخنە ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای بیری ڕاستەو هەوڵ دەدات کەم و کوڕی لایەنی سەرکەوتوویی و ڕادەی داهێنانی هونەرەکانی ئەدەب دەربخات.

لە ژمارە (٢)ی گۆڤارەکەدا هاتووە: ((ئەوەی کەم و کوڕی لەناو بەرێت، تەنها، هەر ڕەخنە گرتنە؟! بەلاّم، کام ڕەخنە؟! ئەو ڕەخنەیەی، کە لە دڵێکی پاکی دڵسۆزانەوە، هەڵ ئەقوڵێت و چرای دوا ڕۆژی ئامانجی ئەم گۆڤارە هەڵ ئەگرێت. بەڵێ چەن جوانە! کە لە دڵی تەنگ و چەڵەمەو ناتەواوی ژیانی کۆمەلاّیەتیمانەوە شەلاّو بێنێت، نەك هەر شوێن خەیاڵ کەوین دەست خەرۆی خۆپەرستی بین)).[٣٣٤]

پاشان دەستەی نووسەران ڕووی دەم لە خوێنەران دەکەن و دەڵێن: ((ئاشکرایە کە بەبێ لێکۆڵینەوەو ڕەخنەو ڕاوێژ، هیچ کارێك ناگاتە ئەنجام و کەڵکێکی ئەوتۆی نابێت، ئەدەبیش لەم بارەیەوە بگرە لەهەموو فەرمانێکی تر، پێویستی بە لێکۆڵینەوەو ڕەخنە

---

[333] ڕەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی یەکەم، بغداد، ١٩٤١، بەرگی دووەمی لە ١٩٥٦ چاپکراوە. پاشان لە ساڵی ١٩٨٨ هەردوو بەرگ لە هەولێر، بە پێشەکییەکی د. عیزەدین مستەفا ڕەسول چاپکرایەوە.

[334] لێکۆڵینەوە، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٧٨.

هەیە. چونکە ئەدەب ژیانەو ژیانیش هەموو شتێکەو ئەبێ بەوردی و هوشیارانە بژین و دووربین لە هەڵەوە)).[335]

لە ڕێگەی ئەو گۆشانەی گۆڤارەکەوە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی والاَی کردبوو، ژمارەیەك شاعیر و چیرۆکنووس و نووسەری دیار بەشداری گفتوگۆکانیان کردووە، بەتایبەتی لەو کارە پیرۆزەی، کە گۆڤارەکە دوای دەرچوونی هەر ژمارەیەکی، کەسانی پسپۆرو شارەزای هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی هەریەکە لە بواری خۆیان (بە تایبەتی شاعیرو چیرۆکنووسەکان) شیعر و چیرۆکەکانیان هەڵبسەنگێنن، ئەمەش ڕێ خۆشکەر بوو بۆ دروست بوونی بیرو تێڕوانینی زانستی بۆ ڕەخنەی ئەدەبی، کە تا ئەو کاتەش لە سەرەتادا بوو. مەرجەکانی ڕەخنەگری سەرکەوتوو کەم بەدی دەکراو ڕەخنەکان سەرنجی ڕاگوزاری و بۆچوونی شەخسی بوون بێ ئەوەی لەسەر پەیڕەو و پرۆگرام و قوتابخانەیەکی ڕەخنەیی دیاریکراو بڕۆن.

کامل ژیر لە هەڵسەنگاندنی دوو شیعری (رووناك محمد)دا[336] دوای چەند ڕستەیەکی ئەدەبی بەسۆز بە پەخشانێکی ئەدەبی بەهێز هاتۆتە سەر بابەتەکەو دەڵێ: ((رووناك وەك لەدانانی بیر (فکرە)کانی دا وەستایەتێکی باشی نواندووە، لە دارِشتن و ڕازاندنەوەی جۆری شیعرەکانیشیا چاپووکی خۆی دەرخستووەو تیا سەرکەوتووە، بە ئاسانی واتە (معنا) و ڕەوانی وشە. ئێمە بەم دوو پارچە شیعرە بۆمان دەردەکەوێت کە رووناك پاشەرۆژێکی گەلێ ڕووناکی هەیە لە هونەری شیعریدا وە هیوا وایە ببێتە مامۆستای قوتابخانەیێکی نوێ.))[337]

لێوردبوونەوە لەو بڕیارە سەرپێییانە، ئاستی ڕۆشنبیریی ڕەخنەگرەکەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە لە هەڵسانگاندنەکەیدا، بە چەند ڕستەیەکی کورت، بێ ئەوەی پەنا بۆ حاڵەتی دەروونی شاعیرو وێنەی شیعری و شیکردنەوەی زمان و تەکنیك و شیکردنەوەی ناوەرۆك و فۆرمی شیعرەکان ببات، یەکسەر بڕیاری ئەوە دەدات، بەو دوو پارچە شیعرە هیوای ئەوەی بۆ دەخوازێ ڕابەرایەتی قوتابخانەیەکی نوێ لە شیعردا بکات. کام قوتابخانە؟! لە کاتێکدا زیاتر لە چل ساڵ بەر لەو مێژووە تازە کردنەوە لەشیعری کوردیدا دەستی پێ کردبوو.

---

[335] لێکۆڵینەوە، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٧٨.

[336] پاشان دەرکەوت (کاکەی فەلاح)ی شاعیرەبەو نازناوە شیعرەکانی بلاَو کردۆتەوە.

[337] کامل ژیر، ڕووناك محمد، گ. هیوا، ١٢، س١، ل٥٨.

لەناو ژمارەکانی گۆڤارەکەدا (عبدالرزاق بیمار) وەك گەنجێکی چالاکی ئەو سەردەمە زۆر بابەتی ڕەخنەیی و زۆر چاپکراوی ئەو ڕۆژگارەی هەڵسانگاندووە[٣٣٨] دەربارەی ئیلتیزام و سەربەستی لە هەڵبژاردنی بابەتەکانیدا، چەند سەرنجێکی ڕەخنەیی لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی (ئەدەب بۆ کۆمەڵە) یەکلا دەکاتەوەو دەڵێ: ((ئەو کەسانەی دەیانەوێ - نووسەر - سەربەستیەکی بێ گێڕانەوەوی نەبێت و بێ پەروا نەبێت وە دەیانەوێ نووسەر دیلیش بێت.. بیانوویان - واقیعیەیتە -!.. بەلام واقعیەتیش هەرچەندە ئامانجێکی بەرز و پیرۆزەو ڕێگایەکی پاکە نووسەر دەیگرێ.. ئەگەر نەزانرا بە ڕێگەی ڕاستی خۆی بەکاربهێنرێت ئەوە نووسەر پێی ئەگوترێ - دییل - بە هەموو مانایەکەوە..))[٣٣٩].

لێرەدا، ڕەخنەگر ئاماژە بۆ مەسەلەیکەی گرنگ دەکات ئەویش - پەیامدارییە - الالتزام، کە وەك ڕەگەزێکی ڕەخنە لە سەردەمی ڕەخنەی پێش یۆنانییەکانەوە لە جەژنەکانی (لینیا)و (داینویسیا) پێڕەوی دەکراو تا وەك ئەم سەدەیەش گفتوگۆی لەسەر دەکرێت.[٣٤٠]

هەمان ڕەخنەگر، لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی گرانبەهای لەسەر ژیان و بەرهەمە شیعریەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاوکردۆتەوە. ئەگەرچی بە خێرایی بەسەر باسەکەدا تێ پەڕیوەو باسەکەشی بەنیوە چڵی بەجێ هێشتووەو تەواوی نەکردووە، بەلام شارەزایی و وردبینی پێوە دیارە.[٣٤١]

---

338 بۆ وێنە بڕوانە: عبدالرزاق محمد، خەبات و ژیان، گ. هیوا، ژ٤، س٣، ل٧٩-٨٩؛ عبدالرزاق محمد، فۆلکلۆری کوردی و گەشتی خەوو چیترا و فرە وە گیانم خۆشە، گ. هیوا، ژ٣٣، س٥، ل٤٨-٥٤.
عبدالرازق محمد، شەهیدانی قەلای دمدم، گ. هیوا، ژ ٣٢، س٤، ل٥٥-٦٣.

339 عبدالرزاق بیمار، سەربەستی نووسەر، گ. هیوا، ژ٨، س١، ل٦٥.

340 بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: الدكتور محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث،ط ٥، ص٢٥-٢٧.
دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر، ڕەخنەسازی مێژوو و پەیڕەوی کردن، ل٨-١٤.

341 ڕەخنەگر لەبەشی یەکەمی وتارە ڕەخنەییەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کەوتارەکەی لەسێ بەش پێك هاتووە، بەلام تەنها بەشی یەکەم و دووەمی بلاوکردۆتەوەو بەشی سییەم کەتەرخانە بۆ هەجووەکانی شێخ ڕەزاو گیانی گاڵتە جارِی لای شاعیر بلاوی نەکردەوە. بەشی یەکەم لەژمارە (٣٠)و بەشی دووەم لەژمارەی (٣١)ی گۆڤاری (هیوا)دا بلاوکرایەوە. دەربارەی نرخی ئەم وتارە. د. عیزەدین مستەفا ڕەسول دەڵێ: (بەشی یەکەمی هەوڵدانێکی سەرکەوتووە بۆ تێگەیشتنی ئەدەبیاتی سەدەی

وەك لەپێشتر ئاماژەمان بۆ کرد لە ڕووپەڕەکانی گۆڤاری (هیوا)دا چەندین وتاری ڕەخنەیی و وەڵامی ئەو ڕەخنانە بلاۆ کراونەتەوە، کە هەندێکیان لە داب و نەریتی ڕەخنەی بەسوود و زانستی لایان داوە، بۆیە مامۆستا (أ.ب. هەوری) بەناوی ڕەخنەو ڕەخنەگر لە تێڕوانینی خۆیەوە ئەرکی پرۆسەی ڕەخنەو ڕەخنەگری شی دەکاتەوەو دەڵێ: ((ڕەخنەگری ڕاستی لێ هاتوو هەروەك وەزیرێك وایە فەرمانەکە گێڕەو شەن و کەو ئەکات و ئەیداتە بەر قەلبیری بیرو گێژو تەتەڵەی هۆش بۆ ئەوەی سەرکوزەر و کۆتەڵە پووچەکەی بگرێ و فرێی بدات تاوەك دانەوێڵەیەکەی بە جوانی دەردەکەوێت و بیخاتە بەر چاوی خوێندەواران و ئەوانیش بەچاوی کڕیار لێی وردبینەوە)).[٣٤٢] ئەم وشە فۆلکلۆرییانەی مامۆستا و تێڕوانینە سادەیەی بۆ پرۆسەی ئاڵۆزی ڕەخنە دیارە بایەخێکی ئەوتۆی نیە، کە لەگەڵ پەیڕەوی ڕەخنەدا بگونجێ.

بۆ یەکەمجار گۆڤاری (هیوا) گرنگی بەرەخنەو لێکۆڵینەوەی چیرۆکی کوردیدا و چەندین کۆمەڵە چیرۆك، کەوەك کتێبێکی سەربەخۆ بلاۆ کراونەتەوەو یان ئەو چیرۆکانەی لە ژمارەکانی (هیوا)دا، بلاۆکراونەتەوە کەوتنە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە.

ئەگەر چی چیرۆکی هونەریی کوردی تا ئەو کاتەیش بە تەواوی کامڵ و پێ گەیشتوو نەبوو، تازە خەریکی خۆچەسپاندن بوو، بەلاَم ئەو ڕەخنانەی، کە لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاۆ دەکرانەوەو پاشان بوونە بناغەیەکی بەهێز بۆ زیاتر چەسپاندن و گەشەکردنی شێوازو تەکنیکی هونەریی چیرۆکی کوردی.[٣٤٣]

---

تۆزەدهەممان)، پاشان بەردەوام دەبێ: ((بۆ چوونەکانی زانستیانەن، بەلاَم وەك وترا کورتن و سروشتی بڕیار دانیان پێوەیەو دەبوو بکرانایە بەباسێکی فراوان.) دەربارەی بەشی دووەمی وتارەکەش دەڵێ: (لە لایەکەوە هەوڵێکی باشی بەستنی ژیانی شێخ ڕەزای بەباری ئابووری و کۆمەلاَیەتییەوە داوە، واتە لایەنە مەوزووعیەکەی گرتووەو هەوڵێکی لێکدانەوەوی سایکۆلۆژیی بوونە شاعیر، یا هەجوو کردنی شێخ ڕەزای داوە، واتە لایەنی خۆیەتی (زاتیەت)ی شاعیەر گرتووە، دیسان ئەوەی لێی دەگیرێت کورتیەو خەستیی باسەکەیە، کە دەشیا زۆر فراوانتر بنووسرێت.))

ڕوانە: دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ل٢٠-٢١.

342 أ. ب. هەوری، ڕەخنەو ڕەخنەگر، گ هیوا، ژ١٠، س١، ل٥٧.

343 حسێن عارف، ئەو قۆناغە بە قۆناغی (کامڵبوون) بەرەو پێگەیشتن (١٩٥٠-١٠٦٩) ناو دەبات، بڕوانە: حسێن عارف، چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، ل٩٢.

یەکێك بەنازناوی (س)[344] و بە ناونیشانی (ژمارە دووی -هیوا- لە تای تەرازووا) لە هەڵسەنگاندنی بابەتەکان دا، کە دێتە سەر چیرۆکی (فرمێسکی پەشیمانی) مستەفا سالح کەریم دەڵێت: ((... کاتێ کەوتمە خوێندنەوەی (فرمێسکی پەشیمانی) زۆر دڵخۆش و مەست بووم بەو دارشتنە جوانە، بەراستی چیرۆکێکی دەرچوو بوو، چ لە (شێواز - اسلوبیا) وە چ لە گفتوگۆیا (حوار)... تا لە خوێندنەوەی ئەبوویتەوە هەستت بە گەلێ (انفعالات) ئەکرد، بەلام بەبیری من کۆتایی چیرۆکەکە لەسەر شێوەی چیرۆك نووسە ئەمریکاییەکان بوو. جگە لەوەش زۆر بەئەمانەت واتەی پاڵەوانەکانی خستبووە سەر کاغەز، زۆر سەرسام بووم بە وەسفی سەر بەردەکەی سەرقەبران بە کورتی، هەندێ راستی تیا بوو وەك ئەڵێن (ابداعی) بوو..))[345].

لەم چەند دێرەدا ئاستی رۆشنبیریی رەخنەگرەکەمان بۆ دەردەکەوێ، کە شارەزایە لەوەی دەبێ دیالۆگ و رەگەزی هاندان و سۆز و کۆتایی بەهێز و دوانی پاڵەوانەکان بێ ئەوەی نووسەر خۆی تێکەڵ بکات، لە مەرجە سەرەکییەکانی داهێنانن لە چیرۆکنووسیدا. ئەگەر چی رەخنەگر بەفراوانی نەچۆتە ناو چیرۆکەکەوو شی نەکردۆتەوە، بەلام سەرنجەکانی مایەی لێ وردبوونەوەن.

(محرم محمد امین) وەك رەخنەگرێك لە ئاست چیرۆکی (یەکێ لە شەوەکانی گردی سەیوان)دا[346] نووسیوویەتی: ((کە لە خوێندنەوەی بوومەوە هەستم کرد کە فاضل بەهرەی چیرۆك نووسینی تیا هەیە، چونکە لە سەرتاوە ناواخنەکە یا جارو بار شێوەی چیرۆك دەر ئەکەوێ وە لەو باوەرەدام کە ئەگەر نووسەر نەختێ خۆی ماندوو بکردایە ئەیتوانی ئەم رووداوە بکا بە چیرۆکێکی نەمر. تەنها نووسینی شتێکی رووداو با لە قالبێکی ئەدەبی جوانیشا بێ نابێ بە چیرۆك، چونکە ئەگەر وابێ هیچ جیاوازییەك نامێنێتەوە لە نێوان چیرۆك و وتاردا. بەلام ئەگەر هاتوو نووسەر توانی رووداوەکە تێکەڵ بەهۆشی خۆی بکاو بەهەوێنی خەیاڵێکی دڵسۆزی راست هەڵی بهێنێ، لە پاشا چوارچێوەیەکی هونەریدا دای رێژێ، ئەوسا بەرهەمەکەی پێی ئەوترێ چیرۆك))[347]

---

344 بەپێی قسەی کامل ژیر، (س) نازناوی (سعید شفیق)ە.

345 س، ژمارەی دووی (هیوا) لە تای تەرازووا، گ هیوا، ژ٣، س١، ل٦٤.

346 فاضل نظام الدین، یەکێ لە شەوەکانی گردی سەیوان، گ هیوا، ژ١٢.

347 محرم محمد امین، ژمارەی پێشوو، ل٨٧.

ئەمە ئەو دەگەیەنێ ڕەخنەگر شارەزای مەرجە هونەرییەکانی چیرۆکە وەك هونەرێکی ئەوروپی نوێ لە ڕووی تەکنیکەوە، بۆیە لەسەرەتای هەڵسەنگاندنەکەیدا دەڵێ: ((گێڕانەوەی مێژووی ژیانی نیشتمانپەروەرێکی جوانەمەرگ بێ دەستکاری و کەموکوڕی، بەواتە زیاتر ئەچێتە ڕیزی وتارەوە نەوەك چیرۆك)) [348] چەندین لێکۆڵینەوەی دی دەربارەی چیرۆکە بلاوکراوەکانی ناو گۆڤارەکە بلاوکراوەتەوە. [349]

رەخنەکان تەنها ژانری چیرۆکی نەگرتەوە، بەڵکو وتارو شیعرو شانۆو هونەری جوان و لایەنە ئەدەبییەکانی دیکەشی گرتۆتەوە. لە بارەی وتارێکی ئەدەبیی مستەفا سالح کەریم لەمەڕ چیرۆك، ئەمیر حەوێزی، بە درێژی بەتان و پۆی وتارەکەدا چۆتە خوارەوەو دەڵێ: ((لەخوێندنەوەوی ئەو باسەدا چەند هەڵەیەکم بەرچاو کەوت، ئەمەوێ بەکورتی لە خوارەوە لێی بدوێم، ئومێدم وایە مامۆستای بەڕێز بە سنگێکی فراوانەوە وەری بگرێ...)) [350] یەکە یەکە هەڵەکانی بەپێی واقیعی و ناواقیعی و پەیامداری لە ئەدەب و جیاوازی پاڵەوان لە کورتە چیرۆك و ڕۆمان دا دەکات و سەرنجەکانیشی بەنموونەی چەندین بەرهەمی چیرۆکنووسە ناسراوەکان دەوڵەمەند کردووە.

مارف بەرزنجی [351] یەکێکە لە نووسەرە پێشکەوتنخوازەکانی کورد، چیرۆك و شیعرەکانی، کە بە نازناوی (پشکۆ) بلاوکردۆتەوە، لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (شەفەق) بووە، وتارێکی ڕەخنەیی بەپێزی لەسەر وتارێکی (هەژار موکریانی) نووسیوە [352] لە زۆر ڕووەوە گفتوگۆ لەسەر بیروڕاکانی (هەژار) دەکات و بە گیانێکی دۆستانەو دوور لە وشەی ڕەق و ناپەسەند وەڵامی دەداتەوەو دوور لە هەموو دڵگرانییەك.

---

[348] محرم محمد امین، ژ١٢، س١،ل٨٧.

[349] بڕوانە: گ هیوا، ژ١، س٢، ل٨٦؛ ژ٣٢، س٤، ل٥٥-٦٢.

[350] گ. هیوا، ژ١، س٢، ل٨٣.

[351] (معروف عبدالکریم) کوڕی شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەمە، (١٩٢١-١٩٦٣)، لە١٩٦٣دا لە لایەن بەعسییەکانەوە لە سێدارەدرا. بۆ بەهرەو سەرجەم نووسینەکانی نووسەر بڕوانە، سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ) کۆکردنەوە ڕێکخستنی سامان ڕەوف بەرزنجی و عومەر مەعروف بەرزنجی، هەولێر، ١٩٩٣.

[352] هەژار،ئەدەبی کوردی سەر بەرەو ژێر دەڕوا، گ ڕوناهی، ژ١، س٢، بەغدا،١٩٦٠.

سەرەتا بەرگری لە شاعیرانی چینی زەحمەتکێش دەکات و دووپاتی دەکاتەوە، کە هەر ئەدیبەو نوێنەری چینەکەی خۆیەتی و ئەدەبەکەی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی چینەکەیەتی، بۆیە ئەدیبانی کورد کە سەر بەچینی هەژارو پرۆلیتاریان، نموونەی بەرزی داهێنانن: ((لە کۆمەڵێکی دووبەرەکی دا کە چەوساوەو چەوسێنەر، زۆردارو زۆرلێکراو، داگیرکەرو داگیرکراو هەبێ، هەڵکەوتوو بۆ گەل لە کام چین دەرئەپەڕێ؟ هەڵکەوتووی گەلی میللەت کێن؟ با خۆت و (گۆران) بکەم بەنموونە. لە چ چینێکەوە هاتوون و کێ ئازارتانی داوەو ئەدا؟ کێ دەربەدەری کردوون؟)) [٣٥٣]

پاشان سەبارەت بە زۆربوونی کۆلکە بوێژ لەو سەردەمەدا نووسیوویەتی: ((... چەند ناوداری وەك شێخ ڕەزا لەو سەردەمە ماوەتەوە بۆ ئەمرۆ؟ وا بزانم دەستوورێکی سروشتی هەیە بۆ پالاوتن و تەتەڵە کردن: سووك ئەڕواو گران ئەمێنێ، سەرکوزەر فڕێ ئەدرێ و دانەوێڵەی پوخت گل ئەدرێتەوە.)) [٣٥٤]

دەربارەی ئەدەبی نوێ و شیعری تازەش (شیعری ئازاد)، بەرپەرچی وتەکانی هەژار دەداتەوەو ئەو گاڵتە پێ کردنەی ئەوی پێ قەبووڵ نییە، بۆیە دەڵێ: ((مامۆستا ئەم باسە وا بەئاسانی نادرێتە قەڵەم. چونکە نموونەیەکی تازەو پەسندی زەوق و پێویستی ژیانی ئەم سەردەمە بەجارێك ناکرێت بە لاسایی و گاڵتەی منداڵان...)). [٣٥٥]

دوای بەرگری کردن لە نوێخوازی ئینجا دەڵێ: ((لە فێرگەی کۆن و تازەدا پەسەند و نا پەسەند هاتووەتە مەیدان، بەڵام کە فەژیلکە ئەڕوا و گەوهەر ئەمێنێتەوە. دەستورێکی سروشتی یە کە هەر تازەیەکیش بەئاسانی جێگای خۆی ناکاتەوە. ئەبێ تەلبەندو شوورای کۆن بڕوخێنێ تا شوێنی خۆی ئەکاتەوە...)). [٣٥٦] بەم شێوەیە ڕەخنەگر بەشارەزایی و سەرنجی هەمەلایی و گیانی نوێخوازییەوە هاتۆتە مەیدان.

لە ژمارەکانی دواتردا هەمان ڕەخنەگر لەسەر داوای عەبدولرەزاق بیمار، کە داوای لێ کردووە کتێبی (شانۆی کوردستان) هەڵسەنگێنێ و بەرەخنە شەڕفناکی بکات، زۆر بەلێ

---

[353] معروف بەرزنجی، سەرنجێك لە وتارەکەی مامۆستای هەژار لە ژمارە(١)ی ڕووناهی، گ. هیوا، ژ٣٢، س٤، ل٣٤.

[354] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦

[355] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.

[356] سەوچاوەی پێشوو، ل٣٩.

بووردییەوە دەنووسیێ: ((.. بەش بەخۆم لـە پێشەوە زۆر سوپاسی ئەکـەم، ئـەمجارە ئـەڵێم مـن شەرمم بەخۆ دێ کە خۆم بەرەخنـەگری شـانۆ دابنـێم. کـاکی خۆشەویـست: خـۆت ئـەزانی بـێ گۆماو کەس بـە مەلـەوان نـابێ، هـەروەها بـێ شـانۆیش زۆر گرانـە ڕەخنـەگری شـانۆو درامـا هەڵکەون. دیسانەوە دراماتیستی پوختیش لەناو شانۆدا هەڵ ئەکەوێ. جا بۆیە خـۆم وەك ئـەو کەسە دێتە بەرچاو کە لەکتێبان فێری مەلەوانی بووبێ)).[357]

دوای لێکۆڵینەوە لە لایەنـە هونەریـەکانی ئۆپەرێتـەکان ڕەخنـەگر ڕۆشـنایی و قورسـایی باسەکەی دەخاتە سەر شیکردنەوەی دوانی پاڵەوانەکان و سەرنجی خـۆی لـەو خاڵانـەدا دەخاتـە ڕوو: ((ئەبێ دراما دەستوورە بنچینەییەکانی پارازتبێ کە بریتییە لە:

١- سەرەتا یا (فکرە)، سەرەتای ڕوون و پوخت و بایەخدار.

٢- کەس (الشخصية-کارەکتەر).. کەس ئەبێ نموونە بێ.

٣- دووبەرەکانی (صراع).

لە دەستووری ئەمرۆی شانۆدا (کەس) گەلێ نرخدارە، کەس سەرچاوەی هەموو جموجـووڵ و بزێوو دووبەرەکایەتییە، کە سەرچاوەی گرێیە..))[358]

دەتوانین بەخوێندنەوەی ئەو خاڵانە بۆچـوونی ڕەخنـەگر تـێ بگـەین، کـە بـڕوای بـە سـێ ڕەگەزە سەرەکییەکانی دراما هەیە، کە لە یۆنانییەکانەوە تا ماوەیەکی زۆر برەوی هـەبوو. بـە تایبەتی پێناسەی ((ئەرسـتۆ ٣٨٤ - ٣٢٢ پ. ز)) بـۆ درامـا.[359] چـەندین کتـێبی چاپکراوی دیکەی ئەو سەردەمە لە نـاوەوەو دەرەوەی وڵات کـە چـاپکراون و بـڵاو کراونەتـەوە لـە لایـەن نووسەرو ڕەخنەگرانەوە لە گۆڤاری (هیوا)دا خراونەتە ڕوو، هەڵسەنگێندراون.

معروف خەزنەدار وەك خوێندکارێك لە یەکێتی سـۆڤیەتی پێـشوو[360] دیـوانێکی شـیعری کوردەکانی سـۆڤیەتی خـستۆتە ڕوو و هـەڵی سـەنگاندووە[361] لـە بـەرایی دا ژمـارەی لاپـەڕەو

---

[357] معروف بەرزنجی، شانۆی کوردستان، گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل٤٨.

[358] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

[359] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

[360] د. مارف خەزنەدار لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٤/١١/٤ لە ماڵی خۆی وتی: (من پەیامنێری گۆڤاری هیوا بووم لە یەکێتی سۆڤیەت).

شوێنی بڵاوکردنەوەی وشە گرانەکانی شی کردۆتەوەو مانایانی لێك داوەتەوە. ئینجا دەڵێت: «چاوپێخشاندنێك بە ناوی شیعرەکان، فراوانی بیروباوەڕی شاعیری سۆڤیەتیمان بۆ دەرئەکەوێ، کەهەرگیز وڵاتە بچووکەکەی خۆی، کە ناوچەی کوردەکانە بە ئەرمەنستان و هەموو سۆڤیەت گرێ ئەدا ئەمەش بەهەموو جیهان گرێ ئەدا، چونکە ئامانجی ئەو شاعیرە ئامانجێکی گشتییە.»[٣٦٢]

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەتوانین بڵێین زۆربەی ڕەخنەکان، لەسەر بەرنامەیەکی زانستی و سەر بە ڕێبازێکی دیاریکراوی ڕەخنەیی نین، کە لە لایەن لێکۆڵەرەوەکانەوە بناغەو بنەمای بۆ دەست نیشانکراوە، زیاتر سەرنجی تاکە کەسی ڕووناکبیرەکانن، بەڵام تەکان و هەوڵی سەرکەوتوون بۆ بناغەی ڕەخنەیەکی ئەدەبی پێشڕەو، کە لە سایەیدا پایە و بەهای ڕاستەقینەی بەرهەمی ئەدەبی پێ شی بکرێتەوە. ڕەخنەکان بەگشتی لەسەر پێڕەوی ڕەخنەی کۆن، سەر بە ڕەخنەی بڕیاردانن (النقد الحكمی)، لە خەوشەکانی ئەم پێڕەوەش ئەوەیە، ڕەخنەگر خۆی وەك قازی و ناوبژیوانێك دێتە بەرچاوو بەپێی بەراورد کردن لەگەڵ هەندێ شاکاری دیکەدا بڕیاری چاك یان خراپ بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکدا دەسەپێنێ و ئەرکی ڕەخنەگریش وەك هەموو کەسێکی دی تەسك دەبێتەوە، کە لە ژیاندا ئەرکی بڕیاردان دەبینێ.

**دووەم: ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی**

مێژووی کۆکردنەوەی فۆلکلۆر لە جیهاندا بۆ سەردەمی ڕێنیسانس دەگەڕێتەوە لە ئەوروپا لە سەدەی شازدەیەمدا، واتا لە سەردەمی بووژانەوەی زمان و ئەدەبی نەتەوەییدا، بەڵام بەشێوەیەکی فراوان و ئەکادیمی لە سەدەی نۆزدەیەمدا برەوی سەندو گەشەی کردو نەتەوەکانی ئەوروپا بەشێوەیەکی فراوان خستیانە بەرنامەکانیانەوە.

ئەوا بۆ نزیکەی سەدەو نیوێك دەچێت زاراوەی فۆلکلۆر بەسەر زاری ڕۆشنبیرانەوەیە.[٣٦٣] فۆلکلۆر وەك زانستێك «زانستێکی ڕۆشنبیریی پەیوەندار بە بەشێکی ڕۆشنبیری، (ڕۆشنبیری

---

[361] دیوانەکە بە ناوی (قالچیچەك) و شیعری (شکۆی حەسەنە) و لە ١٩٦١ بڵاوکراوەتەوە.

[362] معروف خەزنەدار، دیوانی قالچیچەك، گ. هیوا، ژ٣٦، ل٩٧.

زۆر کتێبی تر لە گۆڤاری (هیوا)دا خراوەتە ڕوو، لەوانە: شەهیدانی قەڵای دمدم، ژ ٣٢؛ کۆیەو شاعیرانی، ژ٣٢؛ فەرهەنگا کوردی جگەرخوێن، ژ٣٦؛ دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی، عەرەبی، فارسی، ژ٣٦؛ سەرنجێك لە دەروازی فۆلکلۆری کوردەوە، ژ ٣٦؛ دیاری و یادگار، ژ٣٦.

[363] بۆ یەکەم جار لە کۆنگرەی (ئەرنهایم) لەساڵی ١٨٤٦ (ولیەم جۆن تۆمز) پێشنیاری ئەم زاراوەیەی کردو پاشان بەزمانەکانی ئەوروپا و جیهاندا بڵاوبووەوە. پێش ئەوەش لە وڵاتانی ئەسکەندەناڤیادا

میللی) دەیەوێ لە گۆشەنیگای مێژوویی و جوگرافی و کۆمەلآیەتی و دەروونییەوە ڕووناکی بخاتە سەر بابەتەکانەوەو وەك هەموو زانستەکانی کۆمەڵێ دەرئەنجامی زانستی بەدەست هێناوە بۆ ئەو کەسانەی خەریکی کاروباری سیاسی و کۆمەلآیەتی و ڕۆشنبیریین.))[٣٦٤]

فۆلکلۆر چییە؟ ئەم پرسیارە دەمانخاتە گێژاوێك، چۆنیەتی تێڕوانین و بۆچوونی فۆلکلۆر لە ولآتە سۆسیالیستەکانی پێشوو ولآتی تری ئەوروپا جیاوازە. بۆیە پێناسە کردنی فۆلکلۆریش کارێکی ئاسان نییەو ژمارەیەکی زۆر پێناسەی بۆ کراوە و هەر یەکەی لە ڕوانگەیەکی تایبەتییەوە بۆی چووە، ئەمە سەرباری ئەوەی تا ڕادەیەکی زۆریش لەگەڵ ئەدەبی میللی تێکەلآو بووە.[٣٦٥]

((کێ لە پێناسەکانی فۆلکلۆر ئەوەیە: ((ئەو ماددەیە کە لە نەوە بۆ نەوە دەگوازرێتەوە))[٣٦٦] یان بەدەستەواژەیەکی دی: ((ئەو حیکمەت و ئەدەبەیە کە گەل لە کتێبەوە فێری نابێت.))[٣٦٧] جۆناس بالیز دەڵێ: ((فۆلکلۆر واتا زانستی میللی جێماوو شیعری میللی.))[٣٦٨] ئەم زانایە تەنها جەخت لەسەر ناوەرۆکی فۆلکلۆر دەکات و پێی وایە فۆلکلۆر هەموو ئەو شێوازانە دەگرێتەوە کە بەوشە دەردەبڕێن، جا ئەو وشانە خەڵکی سادە یان شارستانی دەریبڕن. (چارلس فرانسیس پۆتەر)یش خاوەنی ئەو دەستەواژەیە، کە دەڵێ: ((فۆلکلۆر بەرهەمی هەزاران ساڵی پاشکەوتوویی زانستی و ڕۆشنبیرییە.))[٣٦٩]

---

زاراوەی (فۆلکسکەندە) بەکار دەهات، بەلآم لەڕووی چەمکەوە جیاوازن و ئەوەی دواییان مەودایەکی فراوانتری هەیەو پیشەو لایەنە ماددیەکەیش دەگرێتەوە. بڕوانە: الكزندر هجرتي كراب، علم الفلكلور، ترجمة رشدي صالح، ص١٧.

دکتۆر شوکریە ڕەسول، بزووتنەوەی کۆکردنەوەی فۆلکلۆر لە ئەوروپاو (دەروازەیەك لە فۆلکلۆری ئیرلەندی)، گ کاروانی فۆلکلۆر، ژ١، ل٢٤.

364 الدكتور محمد الجوهري، علم الفلكلور، دراسة في الانثروبولوجيا الثقافية، ج١، ط٣، ص١٩.

365 بۆ جیاوازیی نێوان ئەدەبی میللی و فۆلکلۆر و خاسیەتەکانیان بڕوانە: کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشی یەکەم، ل٦–٨.

366 P.882..Webster's

367 الدكتور احمد مرسي، مقدمة في الفلكلور، ط٢، ص٨٥.

368 سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠.

369 سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

ئەنپرۆپۆلۆجییەکان، بە تایبەتی زانای بەناووبانگ ولیەم پاسکۆم دەڵێ: ((فۆلکلۆر واتە ئەفسانەو هەقایەتی میللی بە هەموو جۆرەکانیەوەو مەتەڵ و پەند و هۆنراوەی میللی و هەموو جۆرەگوزارشتە هونەرییەکانی دی، کە پشت بە وتە (قسە) دەبەستێت))[370]

(چیرنشیڤسکی)یش وەك زانایەکی ڕووس تێڕوانینی بۆ فۆلکلۆر وایە: ((هونراوەی گەل و گۆرانیەکانی، ژیان و مێژوو ڕەسم و عادەتی خەڵکی پاراستووە.))[371] لە ئەنجامی ئەم کۆمەڵە پێناسەیەدا دەگەینە ئەوەی بڵێین، دوو تێڕوانینی جیاواز بۆ فۆلکلۆر هەیە، لە وڵاتە سۆسیالیستییەکاندا لەژێر کارتێکەری فەلسەفەی ماددیدا، فۆلکلۆر تەنها بەئەدەبی سەرزاری دادەنێن و لە پیشە دەستییەکان و کەلوپەلە ماددییەکەی جیا دەکەنەوە.[372] بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەوروپاو ئەمریکادا فۆلکلۆر لایەنە سەرزاریی و مادییەکەی دەگرێتەوە، لە پاڵ ئەوەشدا بیرورای زاناکانیان زیاتر گرنگی بە تاکە کەس و داهێنانی تاکەکەس دەدەن و دەوری (کۆمەڵ) فەرامۆش دەکەن.

فۆلکلۆر پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ زانستەکانی دیکەدا هەیە، بە تایبەتی مێژوو و کۆمەڵناسی و ئەنپرۆپۆلۆجیا و جوگرافیاو زانستە مرۆڤایەتییەکانی دی، ئەمەش وایکردووە کە ڕۆژە بەرۆژ گەشە بکات و لەگەڵ زەمەن دا بڕوات و لە نهێنییەکانی ڕۆحی مرۆڤ بکۆڵێتەوە، بە پێچەوانەی هەندێ بیرورا، کە پێیان وایە فۆلکلۆر ڕوو لە کزییەوو بەرەو نەمان دەچێت و لەگەڵ بەرەو پێشەوە چوونی زانست و تەکنەلۆژیادا بواری فۆلکلۆر تەسك دەبێتەوە، کە ئەمە ڕایەکی هەڵەیەو (بە گۆڕانی بوارەکانی ژیان و بابەتەکانی کەرەستەی فۆلکلۆرەکەش دەگۆڕێت.)[373]

---

370 الدکتور احمد مرسي، مقدمة في الفلکلور، ص٧١.

371 د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ٢، زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩، ل٩.

372 بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەدەبی فۆلکلۆری سەرزاری لە وڵاتانی سۆسیالیستی، بڕوانە: یوري سوکولوف، الفلکلور قضایاه وتاریخه، ترجمة حلمي شعراوی و عبدالحمید حواس، القاهرة، ١٩٧٢.

373 هیمدادی حوسێن، چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر، ل٩.

مێـژووی کۆکردنـەوەی فۆلکلـۆری کـوردییش، مێژوویـەکی کـۆنی هەیـەو بەهێمـمـەتی مەردانەی ژمارەیەك لە ڕۆژهەلاتناسـەکان پەنـدی پێـشینان و بـەیت و گـۆرانی و هەقایـەت و داستان و مەتەڵ کۆکراوەتەوە.[٣٧٤]

لە باشووری کوردستانیشدا دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، هەندێك لە نووسەران و ڕووناکیران بەهەستی نەتەوەیی و ئەدەبیتی نوێی تـورکی لـە ڕێگـەی ڕێبـازی ڕۆمانـسییزمەوە کەوتنە لاکرنەوە لە فۆلکلـۆرو کەلـەپووری نەتەوەییـەوە، لـە سـاڵی ١٩٢٧ی زایینیـدا دامـاو (حوسـێن حـوزین موکریـانی) کورتـە چـیرۆکێکی فۆلکلـۆریی گیانـدارانی بـۆ منـدالأن چـاپکردووە[٣٧٥]. پاشـان (کـوردی و مـەریوانی) لـە نامیلکەیەکـدا لـە هەنـدێك لـە یاریـیە فۆلکلۆرییەکانی کوردەواری دواون.[٣٧٦]

ئیسماعیل حەققی شاوەیس ژمارەیەکی زۆر پەندی پێشینانی لە ساڵی ١٩٣٣ی زاینی لە کتێکێکدا بلاوکردەوە، کە ئەمە بۆ یەکەمجار بوو پەنـدی پێـشینان لـە کوردسـتانی عـیراق لـە کتێبێکی سـەربەخۆدا بلاوکرایـەوە[٣٧٧]، بۆیـە ئـەم کتێبـە گرنگییـەکی تایبـەتی هەیـەو ((ئـەو شێوەیەی کە مامۆستا شاوەیس کتێبەکەی پێ ڕێکخستووە نیشانەی شـێوەیەکی زانستیانەی بیرکردنەوەو کارکردنە.))[٣٧٨]

---

[374] لە ساڵی (١٧١١)ی زایینیدا، لە دەستنووسێکدا کە ئێستا لە ماتێنەدەرانی ئەرمینیا سۆڤیەتی بەناونیشانی (میسرۆب ماشتۆسە) پارێزراوە، ژمارەیەك پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی تیا تۆماکراوە، بڕوانە: د. شوکریە ڕەسوول ئیبراهیم، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، دکتۆر شوکریە ڕەسوول و جەلال تەقی لە زمانی ڕووسییەوە کردوویانە بە کوردی، هەولێر، ١٩٨٤، ل١٩، هەروەها بۆ لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی فۆلکلۆریش لەلایەن ڕۆژهەلاتناسەکانەوە بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

[375] داماوی موکریانی، خۆشیی و ترشیی، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٤.

[376] کوردی و مەریوانی، یاری، چاپخانەی (دار السلام)، بەغداد، ١٩٣٢.

[377] اسماعیل حقی شاوەیس، قسەی پێشینان، گوستاو لۆبۆن، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا، ١٩٣٣.

[378] دکتۆر شوکریە ڕەسووڵ ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی، ب٢، ل١٣، لەم کتێبەدا نووسەری ناوبراو بە درێژی لەم کتێبەی مامۆستا شاوەیس دواوەو کەم و کوڕیەکانی دەرخستووەو هەڵیسەنگاندووە، ل١١–١٥. هەروەها د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ لە کتێبی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ٢، ل١٠١ لێی دواوە.

لە بواری گاڵتەوگەپیشدا (پیرەمێرد) چەند چیرۆکێکی کۆمیدی وەك خەوەکەی لالە سەرحەدو بێ مەسلەکی و فس فس پاڵەوانی لە کتێبێکی سەربەخۆدا بلاَو کردەوە.[379]

سەبارەت بەکۆکردنەوەی گۆرانی فۆلکلۆری کوردییش دکتۆر محەمەد موکری لە ساڵی ١٩٥١ی زایینیدا (گۆرانی یا ترانەهای کردی) بەچاپ گەیاند، کە چەندین گۆرانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی لەخۆ گرتووەو بەشێوەیەکی زانستیش دەربارەی کێشی هۆنراوەی گۆرانییەکان دوواوەو لەگەڵ زمانە دێرینەکانی ئێرانی بەراوردی کردوون، گۆرانییەکانیش بەئەلف و بێی عەرەبی و لاتینی لەگەڵ وەرگێڕانی گۆرانییەکان بۆ سەر زمانی فارسی بلاَوکردۆتەوە.[380] لە میانەی کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی ڕۆژنامەوانیی کوردیش دەورێکی دیارو بەرچاوی بینیوە، زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان لە دووتوێی لاپەڕەکانیاندا چەندین بابەتی فۆلکلۆرییان لە فەوتان ڕزگارکردووەو هانی خوێنەرانیان داوە بۆ تۆمارکردنی ئەدەبی سەرزاری باوو باپیران و پاراستنی پیشە دەستییەکان و بەرەوپێشەوەبردنیان.[381]

بەلاَم ئەوەی جێی سەرنجە، بەشێکی زۆر لەو کەسانەی، کە ئەدەبی سەرزارییان تۆمارکردووە بەشێوەیەکی ئەکادیمی و زانستی بابەتەکانیان کۆنەکردۆتەوە، بەپێی ڕادەی ڕۆشنبیری و ئارەزووی خۆیان دەسکارییان کردووە، کە ئەمەش لە بەهای ڕاستەقینەی بابەتەکەی هێناوەتە خوارەوە.[382]

---

379 پیرەمێرد، گاڵتەو گەپ، ١٩٤٧.

380 دکتر محمد مکری، گۆرانی یا ترانەهای کردی، کتابخانە دانش، ١٣٢٩.
بۆ زیاتر شارەزابوون دەربارەی ئەو کتێبە فۆلکلۆرییانەی لە ماوەی ١٨٦٠–١٩٥١ز دا دەرچوون، بڕوانە: عومەر ئیبراهیم عەزیز، بیبلۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی، گ. لاوك، ژ١، س١، ل٩١–١٠٤.

381 لەو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییانەی زۆر گرنگییان بە فۆلکلۆر داوە، بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان و گۆڤاری گەلاوێژ و ڕۆژنامەی بڕواو گۆڤاری ڕۆژی نوێ.

382 سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی مەیدانی کۆکردنەوەی فۆلکلۆر و مەرج و پێویستییەکانی بڕوانە: الدکتور احمد مرسي، مقدمة في الفولکلور، ص١٦٩–٢٢٩؛ دکتۆر شوکریە ڕەسوڵ، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی، ل١٥٧–١٧١.

## گۆڤاری (هیوا)و ئەدەبی فۆکلۆریی کوردی

گۆڤاری (هیوا) لە پاڵ ئەدەبی نووسراوی نووسەران دا، ئەدەبی فۆلکلۆری و میللیشی فەرامۆش نەکردووە، چونکە (دوورکەوتنەوە لەو فەرهەنگەی دایك، پشت کردنە بەها مرۆڤایەتییەکانی، واتا دوورکەوتنەوە لەسروشت، ئەو ڕۆژەی کۆمەلانی خەڵك دەگەنە ئەو هەقیقەتە، دنیایەکەشمان زۆر پاك و بێگەرد و سەلامەتتر دەبێت)،[383] لەم ڕوانگەیەوە هەڵسوڕێنەرانی گۆڤاری هیوا لەبانگەوازەکانیاندا دووپاتیان دەکردەوە: ((... وتەی پێشینان و قسەی نەستەق و گاڵتە وگەپ ئەوانەی لەچاپ نەدراون بڵاوئەکرێتەوە.))[384]

گۆڤارەکە گرنگی بە چەند بەشێکی فۆلکلۆر داوە، لەوانە پەندو قسەی نەستەق و گاڵتەوگەپ و هەقایەت و فۆلکلۆری ناوی مانگە کوردییەکان (کەش و هەوا)و پرۆپاگەندە. لە پاڵ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردییدا، چەندین پەندو قسەی نەستەق و هەقایەتی میللی نەتەوەکانی دیکەش بڵاوکراوەتەوە.

### پەندو قسەی نەستەق

ئەگەر فۆلکلۆر ئەزموون و ئاوێنەی ژیانی میللەت بێ، بێگومان پەندی پێشینانیش، کە ژانرێکی فۆلکلۆرە، فەلسەفەو تێڕوانین و هۆشمەندی میللەت بە ڕستەیەکی کورتی پڕ مەعنا دەردەبڕێت. پەندی پێشینانی کوردی (ڕستەیەکی کورتەو مانایەکی فراوانی هەیەو زۆر جاریش لە شێوەی (سەجع) یاخود (هۆنراوە)دایە)[385] پەند لەڕووی ناوەرۆکەوە بەسەر بابەتی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری... دابەش دەبێت، بەتێڕوانین و وردبوونەوە لە پەندەکانی ناو گۆڤاری (هیوا)یش ئەزموون و فەلسەفەی بیری کوردەواریمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

هەر لە ژمارە (١)ی گۆڤاری هیوادا ئەم پەندانە بڵاوکراونەتەوە:

١- ئەگەر لە دڵسۆزان یەکێك بێنێ، تۆڵەی بەرودوا ئەسێنێ.

---

چۆنیەتی کۆکردنەوەی بابەتی فۆلکلۆری، وەرگێڕانی ئەحمەد حەیران، گ. کاروانی فۆلکلۆر، ژ١، س١، ١٩٩٠، ل١٢٤-١٣٣.

[383] یاشار کمال، افسانه اغری، ترجمەی ڕحیم ڕئیس نیا، انتشارات دنیا، تهران، ٢٥٣٦، ص٢.

[384] گ. هیوا، ژ٢، س١، ل٣٨.

[385] دکتۆر شوکریە ڕەسول، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، ل٨.

٢- شێر بمشکێنێ، نەك ڕێوی بم خوات.

٣- لە هەر لایەکەوە بابێ شەن ئەکات.

٤- گەر هەموو مەلێك میوە خۆر بوایە میوە بە دارەوە نەئەما.

٥- تیر لەکەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە.

٦- پاروو بۆ دەم نەبێ بۆ کۆش چاکە.

٧- ئەم کاسەیە بێ ژێر نیە.[386]

بە وردبوونەوە لەو پەندانە چەندین بیروبۆچوونی جوان و شایستەمان بۆ دەردەکەوێ، لە پەندی یەکەمدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە تاوەك ئێستا زوڵم و زۆرداری فرەمان لێکراوە، بەڵام گەشبینین، چونکە دڵسۆزی ڕاستەقینە تۆڵەی هەموو ئەو زەبرو زەنگە لە ستەمکاران دەکاتەوەو هێزی ستەمدیدان سەر دەکەوێ، ئەم پەندە بۆ ئازایەتی و بوێری بەکار دێت.[387]

لە پەندی دووەمدا گوزارشت لەوە دەکات، کە مرۆڤ بشکوژرێ با بە دەستی پیاوی مەردەوە بکوژرێ، نەوەك پیاوی نامەرد و ناپاك، کە ئەمەش غیرەت و پیاوەتی و ئازایەتی کوردپیشان دەدات. لە پەندی سێیەمدا، مەبەست یەکێکە خۆی لەگەڵ ڕۆژگار بگونجێنێ و هەر یەکێك دەستەڵاتی بێ ئەو پشتگیری لێدەکات و لەگەڵیدا ڕێ دەکات، کە ئەمەش سیفەتێکی خراپەو کورد پەسەندی ناکات و هەلپەرستی و بەرژەوەندخوازییە.

لە پەندی چوارەمدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە، ئەگەر هەوو کەسێك ئیش زان بووایەو بە چاکی سەری لە کاری خۆی دەرچووایە، ئیش دەست نەدەکەوت، واتا کەس نییە تەواو شارەزاو پسپۆڕ بێ و بێ هەڵە بێ.[388] لە پەندی پێنجەمدا ئامۆژگارییەکی بەسوودە بۆ مرۆڤ، کە وردبین و دووربین بێ لە قسەو گوفتاریدا، قسە، کە لە دەم دەرچوو ناگەڕێتەوە، بۆیە ژیری و هێمنی گەرەکە.[389]

---

[386] بۆ ئەم پەندانە بڕوانە: گ. هیوا، ژ١، س١، تەمووزی ١٩٥٧، ل١٤.

[387] ئەم پەندە شێخ محمدی خاڵ وای تۆمار کردووە: «(١٩١- ئەگەر لەجافان یەکێك بمێنێ حەقی بەرودوا لەگەشت ئەستێنێ..)» بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٢، ل٣٦.

[388] ئەم پەندە بەم شێوەیە دەوترێت: «هەموو مەلێ هەنجیرخۆر بووایە، هەنجیر بە دارەوە نەئەما»، بڕوانە شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل٤٩٦.

[389] ئەم پەندە زیاتر بەم شێوەیە باوە «تیر لەکەوان دەرچوو، ناگەڕێتەوە». بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل١٦٢.

پەندی شەشەم گوزارشت لە پەیوەندی نێوان و خێزان و خزمایەتی و هاوکاری دەکات، ئەگەر مرۆڤ خێری هەبێت، نۆژەن بۆ خزم و خوێش، پاشان بۆ خەڵکی غەیرە و لایدە و نەناس، واتا گیانی هەرەوەزی و پەیوەندی خزمایەتی توندو تۆڵ کردن.[390] پەندی حەوتەم، بە کارو کردوەیەك دەوترێ، کە بۆ نیازێکی تایبەتی ئەنجام بدرێ جیا بێ لەگەڵ مەبەستە ڕوکەشەکەی، هەروەك دەوترێ (ئەم ماستە موویەکی تیایە)، کە هەمان مەبەست دەگەیەنێ[391]. بێجگە لەم پەندانە چەندین پەندی پێشینانی دی بلاو کراوەتەوە:[392]

## گاڵتەوگەپ

ژانرێکی دیکەی ئەدەبی فۆلکلۆریی لە گۆڤاری هیوا دا گاڵتەوگەپە. گاڵتەوگەپ لە گۆڤارەکەدا لە شێوەی نوکتەدا خۆی دەنوێنێ و پەخشانێکی چیرۆك ئامێزە.

گاڵتەوگەپ و قسەی خۆش لە ئەدەبی هەموو میللەتاندا هەیەو لای هەموو چینەکانی کۆمەڵ بەکار دێت، لە هەموو ئاستەو تەمەنێك دا و بۆتە هۆیەك بۆ دەربڕینی ناهەمواریەکانی کۆمەڵ و ڕەخنەگرتن لەو چەوتیانەی کۆمەڵ. مێژووی گاڵتەوگەپ لەگەڵ مرۆڤ خۆیدایە، یۆنانییەکان مەسەلەی پێکەنینیان وەك مەسەلەیەکی فەلسەفی سەیر کردووە و (کۆمیدیاو تراژیدیا)یان کردووە بەدوو شتی دژ بەیەك و بە هەردووکیان مرۆڤ ئازار و ئەشکەنجەی ژیانی خۆی پێ دەردەبڕێ. ئەرستۆتالیس (٣٨٤-٣٢٢ پ. ز) لە کتێبی (هونەری شیعر)دا دەڵێ: «کۆمیدیا بریتییە لە پێناسەکردنی شتێك یاخود دەرخستنی بەجۆرێکی وا کەمتر لە خۆی بنوێنێ.»[393]

بۆ ئەم مەبەستەش پاڵەوانەکانی نێو حەکایەت و نوکتە یان خۆماڵین یان لە نێوان چەند میللەتێکی دراوسێدا هاوبەشن.

---

[390] ئەم پەندە بەم شێوەیەش دەوترێت: (پاروو لەدەم دا کەوێ، بۆ کۆش باشە بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل١٣٠.

[391] پەندەکە وایش دەوترێ: (ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە) بڕوانە: شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، ل٥٢.

[392] بۆ پەندەکانی دی، بڕوانە: گ. هیوا، ژ٣،ل٢٠، ٦١، ٦٣. ژ٦، ل٣٩. ژ٨،ل٣٠. ژ١٠، ل٣١، ٥٢. ژ١١، ل٥٣. ژ١٢، ل١٩،٣٧.

[393] Classical Literary Critioism، Translated with An Introduction by T.S Doroh، pengun Books، 1965، p.37.

پاڵەوانی خۆماڵی وەك کفر ئەحمەد و خاڵە ڕەجەب، پاڵەوانی وەك مەلای مەزبوورە یان مەلای مەشهوور کە لە نێوان چەند میللەتێکی ڕۆژهەڵاتیدا هاوبەشە، بەڵام پاڵەوانەکان هەر کامێکیان بن گرنگ ئەوەیە  زۆربەی کات ئەو نوکتەو هەقایەتە کورتانە دەبنە ئاوێنەیەکی ڕۆژگاری سەردەمی خۆیان، جا ئەو پاڵەوانە مرۆڤ یا ئاژەڵ بن.[٣٩٤]

ئەگەر گاڵتەوگەپ وەك هۆیەکیش خواستەکانی کۆمەڵ دەرنەبڕێ، ئەوا بێ گومان دیسان بۆ ڕەواندنەوەی خەم و پەژارەو حەسانەوەی دەروونی مرۆڤ مەبەستێکی باشە.

لە نوکتەو قسە خۆشەکانی ناو گۆڤاری (هیوا)یش کە لە گۆشەی (قسەی فێنك) و (بۆ پێکەنین) دا بلاوکراوەتەوە، چەندین ناهەمواری کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری وڵات بەشێوەی نوکتەو هەقایەتی کورتی گاڵتە ئامێز خراوەتە ڕوو.

لە یەکێ لەو نوکتانەدا هاتووە: ((کابرایەك بەدراتاشێکی وت کە تاکێ قەنەفەی لە چاکترین دار بۆ دروست بکات وە پێشەکی پارەکەی دایە، لە پاش ماوەیەکی دوورو درێژ کابرای دارتاش قەنەفەکەی تەواو کردو بۆی ناردەوە زۆری پێ نەچوو کابرا بە تووڕەییەکەوە گەیشتە سەر دارتاشەکەو وتی: خۆقەنەفەکە شکا!  کابرای دارتاش زۆر لەسەر خۆ وتی: بێ گومان ئەبێ لەسەری دانیشتبن)).[٣٩٥]

ئەم نوکتەیە لەژێر پەردەی پێکەنیندا ڕەخنەیەکی کۆمەلایەتییەو ئیش وکاری کەسانی فێڵزان و ساختەچی دەردەبڕێ، کە بۆ ماڵی دنیاو زوو دەوڵەمەند بوون، کارەکەیان بەپاکی و بەچاکی ئەنجام نادەن و بە زۆر شتەکە پێك دەهێنن. لە نوکتەیەکی دیکەدا هاتووە: ((پیاوێك: تۆ ئەم هەموو خانوانەت هەیە بۆ چ ئەگەڕێیت خانوو بەکرێ بگری؟ دەوڵەمەند: چونکە خانووەکانی خۆم گرانن)).[٣٩٦]

ئەم نوکتەیەش گوزارشت لەپیسکەیی و ڕژدی و چاوچنۆکی هەندێ دەوڵەمەند دەکات، کە خۆی دەزانێ خانووەکانی خۆی گرانەو خەلکی هەژار دەچەوسێنێتەوە، لە لایەکی ترەوە، گوزراشت لە ساویلکەیی و کەم ئەقلی هەندێ دەوڵەمەند دەکات.

---

394 دەربارەی قارەمانی خۆماڵی گاڵتەوگەپو هەندێك لە نوکتەکانیان بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ٢، ل١٧٨-١٩٧.

کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ل٩٢-٩٧.

395 گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٨٦.

396 گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٨٦.

## کەش و هەوا:

بابەتێکی دیکەی فۆلکلۆریی، کە لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاۆکراوەتەوە، ئەویش فۆلکلۆری کەش و هەوایە. ٣٩٧ بەشیر موشیر دەربارەی ناوی مانگە کوردییەکان و پەیوندییان بەکەش و ئاووهەواوە، بابەتێکی نووسیووەو بیر و بۆچوونی کوردەواری دەخاتە ڕوو، دەربارەی مانگەکانی بەهار دەڵێ: ((هەرمێ پشکوان (مارت) ٣١ ڕۆژ، لەم مانگەدا درەخت ئەپشکوێ و جرِوجانەوەر، دەس بەبزووتنەوە ئەکات.

شەستە بارانِ (نیسان) ٣٠ ڕۆژە، ناوەکەی بەخۆیەوەیە باران وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر ئەبارێ. کێچ زۆر ئەبێ خەڵك ئاوی باران ئەخۆنەوە بۆ شیفا.

بەختەباران (مایس) ٣١ ڕۆژە، ئەگەر باران باری ئەوە لەبەختی خاوەن دەغڵ و دان و درەخت و کشت و گیاو سەوزەواتە، عێل ئەکەوێتە خۆی بۆ کوێستان چوون.))[٣٩٨]

ئەمەش نموونەی بیروباوەڕی کوردەواری یە بۆ ڕێکخستنی کاتیان بە پێی زانیاری ساکاری خۆیان و لە هەمان کاتدا فراوان و گشتیەتی و هەمەلایەنی فۆلکلۆر دەردەبڕێ لەوەی، کە پەیوەندی بە جوگرافیاشەوە هەیە.

## پرۆپاگەندە:

بابەتێکی دیکەی فۆلکلۆریی مەسەلەی پرۆپاگەندەیە، کە فرۆشیاران بە ئاوازێکی تایبەتی دەیڵێن بۆ ئەوەی کڕیار بۆ میوەو کەلوپەلەکانیان زیاد بکەن، بێجگە لەوەی لە ئەنجامی ئەزموونی درێژخایەن گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەو هەر ناوچەیەکی کوردستان بەناوبانگە.

(ج. بابان) هەندێ بیروباوەری کۆکردۆتەوەو تیایدا هاتووە: ((لە شیرینی یا وەك شەکر گوندۆرەی پردێ و ئەلقوش، وە لە دەما ئەبێ بەئاو کالەکی قەلاچوالان، لە مێخۆشی و دەنگ گەورەیی دا هەناری نازەنین و شارەبان و هەورامان. خۆگرانە، زۆریشی نەخۆی چاکە، قۆخی

---

397 بۆ زیاتر شارەزایی دەربارەی فۆلکلۆری کەش و هەوا بڕوانە: د. شوکریە ڕەسول، وەرزو ساڵنامەی کوردی لە پەندو قسەی نەستەقی کوردیدا، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١١٧، ل١١١–١٢٦.

398 بەشیر موشیر، ناوی مانگە کوردیەکان لە چییەوە هاتووە؟ گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل٦٠.

شەقلاوەو هیران، ئینجا وەرە سەر هەڵووژەی چنگنیان و، ترێی گەورەو گوێژی دارەقیتەڵەو، ناسکە هەرمێ ی وەرازو خەیاری هەوەل زەلان.))[399]

لە پاڵ ئەم بابەتانەدا چەند هەقایەتێکی فۆلکلۆریی کوردی و گەلان، کە (بەرەو پێش چوونێکی مێژوویی و ئەفسانەیەو لە ڕووی فۆرم و دارشتنەوە لەو ئەچێت، هەرچەندە لە ڕووی کەرەسەو ناوەرۆکەوە هەندێ جیاوازییان هەیە) گرنگی پێ دراوە.

پاڵەوان لەو هەقایەتانەدا مرۆڤ خۆیەتی و هەندێ جاریش خۆی لە قالبێکی ڕەمزیدا دەدۆزێتەوەو گفتوگۆکان لەسەر زاری هەندێ ئاژەڵ دەخرێتە ڕوو. ئەو پەڕەوڕو ئاژەڵانەیش زۆربەیان سیفاتەکانیان دیارو نەگۆڕە. بۆ نموونە، شێرو کەڵەشێر هەردەم نموونەی پاشایەتی و گەورەو ڕەمزی زۆردارن و چەقەڵ و ڕێوی و سمۆرە ڕەمزی فێڵبازین و بە تایبەتی ڕێوی وەك وەزیری دەستە ڕاست خۆی نواندووە.[400]

لە هەقایەتێکی فۆلکلۆریی ڕەمز ئامێزدا، گۆڤارەکە مەسەلەیەکی سیاسیی گرنگی ئەو ڕۆژگارە دەخاتە ڕوو. هەقایەتەکە ئەوەیە: ((کۆمەڵێ کەڵەشێرو مریشك لەدەست مرۆڤی دڕندە ڕادەکەن نەوەك بیانخۆن. لەناوچەیەکی شاخاویدا دوو هەڵۆ تاقیبیان دەکەنە، کە دەزانن ئەمانە لەناو خۆیان دا ناکۆکن و کەڵەشێرەکان هەموویان خۆیان بەسەرکردە دەزانن، دەکەونە خواردنیان تا چی وایان لێنامێنێتەوە، ئەوەی دەمێنێتەوە بە پەلە دەگەڕێنەوە شوێنی هەوەڵی خۆیان و ناو خەڵك.)) ناوەرۆکی ئەم چیرۆکە دووپاتی چەند شتێك دەکاتەوە، ئەوانیش ئەوەن کە زوڵم و زۆرداری لە هەموو شوێنێکدا هەیە وە بەهێز بێ هێز دەچەوسێنێتەوە، لە هەمان کات دا ناکۆکی و ناتەبایی و خۆ بەزل زانین و یەك نەگرتن لەنێوان ئەندامانی هەر کۆمەڵگایەك

---

399 ج. بابان، بەناوبانگترین شتی لای خۆمان، گ هیوا، ژ٣٣، س٥، ل١٥.

هەر لەم ڕووەوە بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی پرۆپاگەندەی ئەو شتە فۆلکلۆرییانە بڕوانە: د. شوکریە ڕەسول، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی، ل١٢٧؛ ڕۆستەم باجەلان، پرۆپاگەندەو بانگەوازی میللی لەبازاڕی کوردەواریدا، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٣، ل٢٨٤-٢٩٠.

400 بۆ نموونەی ئەم جۆرە ئەدەبە (کەلیلەو دیمنە) دەتوانرێ ئاماژەی بۆ بکرێ، کە نموونەیەکی بەهێزەو هەقایەتەکان لەسەر زاری ئاژەڵان دەخرێتە ڕوو، ئەم کتێبە زادەی ئەزموونی میللەتانی ڕۆژهەڵاتەو مێژوویەکی دێرینی هەیە، بڕوانە: بەیدەبا، کەلیلەو دیمنە، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە عومەر تۆفیق، چ٣، چاپخانەی بابل، بەغدا، ١٩٧٥.

دەبێتە هۆی دواکەتن و لەناوچوونی ئەو کۆمەڵە، دواجار ئەوەش ڕوون دەکاتەوە، کە مرۆڤ لە جێگەو شوێنی خۆی سەنگینەو بەنرخە.

لە گۆڤارەکەدا، لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری میللەتان بلاوکراوەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەری کورد بە کەلەپووری میللەتان و ڕادەی هاوبەشیەتی و چوون یەکی ئەو بابەتانە ئاشنا بکات.[401] بەم شێوەیە گۆڤاری (هیوا) لە خزمەت کردنی کەلەپوورو سامانی نەتەوەیی کوردیدا درێغی نەکردووەو لە پاڵ ئەدەبی نووسراودا لەرابردوو دانەبڕاوەو ڕەگ و ڕیشەی ئەدەبی نووسەرانیشی بە سەرچاوەکە بەستۆتەوە، کە فۆلکلۆری گەلە.

### سێیەم: وەرگێڕانی ئەدەبی

دەستنیشان کردنی مێژووی وەرگێڕان لە جیهاندا، کارێکی ئەستەمە، لەو ڕۆژەی میللەتە جیاوازەکان تووشی یەك بوون پێویستیان بەوە بووە لەیەکتر تێ بگەن، لەوێوە زانینی زمان و وەرگێڕان دەوری خۆی گێڕاوە.[402] لە سەردەمی جەنجاڵ و ئاڵۆزیی کاروباری لایەنە جیاجیاکانی مرۆڤی سەردەم وەرگێڕان دەورێکی گرنگ دەگێڕێ لە نزیك کردنەوەی کەلتووری نێونەتەوەییدا و وەرگێڕەکان بوونەتە پەیامبەری نێوان گەلان. ئەگەرچی بە هۆی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا مرۆڤ بیری لەوەیش کردۆتەوە وەرگێڕان بخاتە کاری کۆمپیوتەرەوەو یارمەتی بدات زووبەزوویی کاری خۆی ڕاپەڕێنێ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کاری وەرگێڕان بەردەوامە.

## بایەخی وەرگێڕان

هەرچەندە ڕۆشنبیری میللەتان زیاتر کار لەیەك دەکەن لە ڕێگەی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی هاوچەرخەوە وەك چاپەمەنی و ڕۆژنامەو ئێستگەو تەلەفزیۆن و پەیوەندی بێ تەل و کۆنگرە

---

[401] بڕوانە: ئەدەبی میللی کۆن و ئەدەبی کلاسیکی ڤێتنام، وەرگێڕ عاصم حەیدەری، گ. هیوا، ژ٣٤، س٥، ل٦٥–٦٩.

[402] خەڵکی شاری بابل نزیکەی ١٨٠٠ ساڵ (پ.ز) بە چەند زمانێکی جیاواز دەدوان، ئەو وڵاتانەشی داگیریان کردبوو بە چەند زمانێکی جیاواز دەدوان، بۆیە چەند کەسێکی شارەزایان لە زمانی بابلی و ئەو زمانانە دانابوو بۆ ئەوەی بە کاری وەرگێڕان هەڵسن، بڕوانە: یوجین أ. یندا، نحو علم الترجمة، ترجمة ماجد النجار، ص١٩؛ د. یوئیل یوسف عەزیزو کەسانی تر، وەرگێڕانی ئەدەبی، وەرگێڕانی غازی فاتح وەیس، ل٢٨.

نێودەوڵەتییەکان بە تایبەتی دوای کزبوونی دەسەڵاتی ڕۆشنبیری ئیستیعماری. وەرگێڕان دەورێکی باڵاو بەرچاوی لە هەموو ئەو مەیدانانەدا بینیوە، تەنانەت لە نێو هەندێکیان دا بۆتە دیاردەیەکی ستراتیژی)[403]

## وەرگێڕان چییە؟!

ڕەنگە لە سادەترین پێناسەیدا، بڵێین گەیاندنی زانیارییە لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی دی... یان ((وەرگێڕان چالاکییەکی ژیری و سۆزییەو کارێکی لێکدراوە، جا گەر بمانەوێ ئەو چالاکییە پێناسە یەکی یەك گیرو بێ مشت و مڕ بخەینە ڕوو ویستەمەنیەکەمان بە ئاسانی نایەتە دی.))[404] بەکورتی واتا گواستنەوەی زانیاری لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی دی.

## وەرگێڕان بۆچی؟!

((لێکۆڵەرەوە عەرەبەکان هەندێکیان لەو باوەڕەدان، کەوەرگێڕان لە ڕۆژگاری (المأمون)یشدا کە زۆر بەهەرمێن بووە، ڕەنگە ئەو پرسیارەیان لەخۆ نەکردبێ، یان کردبێتیان بەڵام ئەو وەڵامەیان بۆ ئێمە بەجێ نەهێشتووە. خەریك بوونی عەرەب و موسڵمانەکان بۆ وەرگێڕانی کتێبی فەلسەفەو لۆجێك بۆ ئەوە بووە، کە پێویستیان پێ بووە، کە بەرگری پێ لە ئایین بکەن و بەڵگەی بەهێزیان هەبێت لە ڕێگەی فەلسەفەی یۆنانییەوە، پاشان ئەو خەریك بوونە بەفەلسەفەوە بۆ لەززەتی عەقڵی و وەرزشی بیر بووە لەو باباتانەی، کە لای عەرەب نەناسراو بوون.))[405]

ئەو پێویستییە لە چییەوە سەر هەڵدەدات؟مرۆڤ خۆی ڕەها نییەو نەگەیشتۆتە حاڵەتی (الکمال)، کەوا بێ هەمیشە لە زانیاریدا هەژارە. زانیاری خۆی لەخۆیدا سیفەتی گشتی هەیەو زۆر بە ئاسانی ئەو سنوورە دەستکردانەی نێوان وڵاتان دەبڕێ، کە سیاسییەکان دایانناوە. خۆ هەر چەندە هەموو میللەتێك خاوەن ڕۆشنبیرییەکی نەتەوەیی خۆیەتی، کە سیماو شەقڵی تایبەتی خۆی هەیەو لە میللەتانی دی جیا دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ((هیچ نەتەوەیەك نییە بتوانێ واز لە وەرگێڕان بهێنێ، هەرچەندە سامانێکی نەتەوایەتی کۆن و بەنرخیشی هەبێ.))[406]

---

403 یوجین. أ. یندا، نحو علم الترجمة، ص١٥.

404 د. امین علی سعید و د. کامل حسن البصیر، وەرگێڕان، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٠.

405 محمد عبدالغني حسن، فن الترجمة في الادب العربي، ص٧٦.

406 جەمال نەبەز، وەرگێڕان هونەرە، ل٢.

ئەگەر ئەدەبی هەموو نەتەوەیەك پێویستیی بەوە هەبێ لە هەوای ئەدەبی میللەتانی دی هەناسە هەڵمژێ، ئەوا بۆ ئەدەبی کوردییش بەهەمان شێوەو هەر لە زووەوە مەلاو زانایانی ئایینی و ڕووناکبیرو ئەدیبەکانی بەرایی لە پێویستی و گرنگی ئەو ئەرکە تێگەیشتوون و کۆششیان بۆ کردووە. لە سەدەکانی ڕابردوودا هەندێ مسیونێری بیانی کتێبە ئایینییە پیرۆزەکانیان وەرگێڕاوە بۆ کوردی. شاعیرانی کلاسیکیش شیعری شاعیرانی فارس و تورك و عەرەبیان وەرگێڕاوەو لەگەڵ شیعرەکانی خۆیاندا تێ هەڵکێشیان کردووە.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەشدا، بە تایبەتی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی چاپ و چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانیی کوردی بزووتنەوەی وەرگێڕان زیاتر پەرەی سەندو پێویستی ڕۆژنامەوانیی وایکرد بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبێتەوە، وەك چۆن چەندین هونەری ئەدەبی لە باوەشی ڕۆژنامەوانییەوە ڕسکان، پێویستی زانیاری و هەواڵی جیهانی و پەیوەندی کارلێکەرانەی نێوان میللەتانییش هونەری وەرگێڕانی ئەدەبی گەیاندە ئاستێکی بەرز.

گۆڤاری هیوا لە وەرگێڕانی ئەدەبیدا، گرنگییەکی زۆری بە وەرگێڕانی شیعرو چیرۆك و وتارو وتەی گەورە پیاوان داوەو بە دەگمەن ژمارەیەکی گۆڤارەکە هەیە کۆمەڵێ بابەتی وەرگێڕاوی تیا نەبێت، وەرگێڕانەکان بە پلەی یەکەم لە زمانی عەرەبی و فارسییەوەن، ئینجا ئینگلیزی و زمانانی ترەوەیە. ناوی چەند وەرگێڕێکی چاك بەرچاو دەکەوێت[407]، کە وەرگێڕانەکانیان لە ئاستی دەقە ئەسلییەکان کەم بایەختر نین و توانیویانە بە سەلیقەو زمانێکی پاراوەوە داهێنانی تێدا بکەن.

هەڵبژاردنی دەقەکانیش ڕادەی ڕۆشنبیری وەرگێڕەکان پیشان دەدات[408]. ئەو دەقانەی هەڵبژێردراون، شاکاری شاعیرو چیرۆکنووسە مەزن و ناسراوەکانی جیهانیین و لە زۆر نەتەوەی جیاوازن.[409] بەرهەمە وەرگێڕاوەکان لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەمە چەشنەن: سیاسی و

---

[407] لەوانە ناوی ئەو وەرگێڕانە بەرچاو دەکەوێ: حەسەنی قزڵجی و عبدالرزاق بیمارو فاتح عبدالکریم و محەمەدی مەلا کەریم و مستەفا ساڵح کەریم.

[408] بۆ وەرگێڕی سەرکەوتوو بڕوانە: یوئیل یوسف عزیز واخرون، الترجمة الادبية، جامعة الموصل، ١٩٠٨١، ص١١، چاپی کوردییەکەی: وەرگێڕانی ئەدەبی، وەرگێڕانی غازی فاتح وەیس، ل٤٩–٥٨.

[409] لەوانە: جبران خليل جبران و خیام و شیلی و لۆرکاو مەکسیم گۆرگی و نازم حیکمت و ولیەم بلێك...بەڵام خەوشێکی گەورە لە بابەتە وەرگێڕاوەکاندا ئەوەیە زۆر جار ناوی نووسەری ئەسڵی و سەرچاوە ئەسڵییەکەو ئەو زمانەی لێی وەرگێڕراوە دەست نیشان نەکراوە.

کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ڕۆشنبیریی و ئابووری و هونەرین. خەباتی نەتەوەیی و تێکۆشان لەپێناو ڕزگاری نیشتمان وای لە (حەمە) کردووە ئەم شیعرە بەزمانێکی کوردی پاراو لە عەرەبییەوە وەربگێڕێ:

**بێبەزەیی وجدان**

پەراگەندەی زۆرداران
گوندەکەمیان سووتاند
بێ شەرمانە
ئەو ترسنۆکانە
کە وەك مێش و مەگەز وانە
گوندەکەم ڕوخێنرای
گوندەکەم سووتێنرای[410]

خەباتی هاوبەشی میللەتان و وەستان دژی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی، کە سنووری بڕی بوو، (کامەران موکری)یش هەر بەهەڵبەست، ئەم هەڵبەستەی بوێژی ئەمریکی (ماك کری)ی تەرجەمە کردووە:

من ڕەشم وەك کینیا
ئەمرم لەرێی ئازادیا
وەك ڕەنگی شەوێکی ڕەش
با وڵاتی منی بێ بەش
وەك جەرگی ئەفریقاکەم
نیشتمانە بێ نەواکەم
ڕەنگم ڕەشە، پێستم ڕەشە
ئەم دەنگە هی قولە ڕەشە[411]

لە چوارینە بەرزەکانی خەیام، کە ناوەرۆکەکەیان بە دەوری مەیگێڕیدایەو گوزارشت کردن لە جیهان بە(هیچ) و تێڕوانینێکی فەلسەفیانەی عومەری خەیامە، شێخ سەلامی شاعیر بە شیعر وەریگێڕاوە:

---

410 گوندەکەم فرمێسك مەڕێژە، وەرگێڕانی حەمە، گ. هیوا، ژ۱، س۱، ل۲۹.

411 ماك کریا، من ڕەشم، وەرگێڕانی کامەران، گ. هیوا، ژ۲، س۱، ل۳٦.

به هەوری نەورۆز گوڵ چاوی شۆریا
تــۆو پیـاڵە شەراب دامێنی چیا
ئیمرۆ تێر سەیری سەوزە گیا بکە
سبەی لەخاکت سەوز ئەبێ گیا[412]

لـە پـاڵ ئـەم شـیعرانەدا، ژمارەیـەکی زۆر وتـارو کورتـە چـیرۆك و ژیاننامـەی ئـەدیب و نووسەران و پیاوە مەزنەکانی جیهان لە گۆڤارەکەدا وەرگێـڕدراون. وتـەی گـەورە پیـاوانی وەك (جمال الدینی ئـەفغانی و جیڤەرسـۆن و سـوقرات و شکـسپیر و ڤـۆلتێرو کۆنفۆشـیوش و لیـون تۆلستۆی و...هتد بلاۆ کراوەتەوە، لەوانە:

- گەل بەبێ ڕەوەشت و خووی جوان سەرناکەوێ، ڕەوشت و خـووش بـەبێ ئیمـان و بـاوەڕ نابێ، ئیمان و باوەڕیش بەبێ تێگەیشتن نابێ. (مال الدینی ئەفغانی)[413]

- ژیان لە ولاتێك دا ڕۆژنامەی تیابێ و قانوونی تیا نەبێ خۆشترە، لەوەی لـە ولاتێـك دا بژیم قانونی تیابێت و ڕۆژنامەی تیا نەبێت. (جیڤەرسۆن)[414]

- پیاوی چاك ئەخوا بۆ ئەوەی بژی، پیاوی خراپ ئەژی بۆ ئەوەی بخوات. سوقرات

چەندین وتاری ئەدەبی لە زمانە جیهانییەکانەوە بە خامەی نووسەرو وەرگێڕە بـەتواناکان تەرجەمـەی کـوردی کـراون، لـە وتارێکـدا سـەبارەت بـە بابـەتێکی زینـدووی ئـەدەبیی ئـەو سـەردەمە، ئـەویش گیروگرفتـەکانی ئـەدەبی واقیعـی وململانێـی ئـەو ڕێبـازە لەگـەڵ ڕێبـازە ئەدەبییەکانی دوای خـۆی، وتـارێکی بـەنرخ لـە لایـەن (احمـد عثمـان ابـوبکر)ەوە لـە زمـانی ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی و لە چوزەرەکانی واقیعیەت لـە نووسـینەکانی ئـەنتۆن چـیخۆف دەدوێ، کە چۆن ((نامەو چیرۆکەکانی دەوری زووی چیخۆف بەئاشـکرا مەسـئەلەی کامـەرانی ئادەمیزاد و مەسئەلەی پەیوەنـدی شـارەوانی و خوورەوشـتی مـرۆڤ لـەنێو گەلەکـەیا، ئەخەنـە بەرچاو، بەرامبەر بەمانە، چیخۆف ئەوەسـتێ نـەك وەك نووسـەرێکی (متـشائم) بـەڵکو وەك نووسـەرێکی پـڕ لـە بـەزەیی بەرامبـەر بـەمرۆڤی کـەم دەسـەلات، کـەبێ دادی کۆمەڵەکـەی

---

[412] لە شیعری خیام، وەرگێرانی سەلام، گ. هیوا، ژ٧، س١، ل٧٧.

[413] وتەی بەجێ، گ. هیوا، ژ٣، س١، ل٢٠.

[414] وتەی بەجێ، گ. هیوا، ژ٧، س٢، ل٢٠.

چەوساندبیتەوەو، کەساسی کردبێت، ئەو مرۆڤەی کە هەروەك لە ئەنجامـدا دەرئەکـەوێت هـیچ جۆرە دەردەسەری یەك سەری پێ شۆڕ ناکات و بێ بـەری نابێـت لـە کامـەرانی، چـیخۆف بـەم جۆرە وێنەی ئەم تەرحە مرۆڤانە ئەکێشێت، ئەوانـەی کـە ئـەتوانن پـشتی چـەماوەیان ڕاسـت بکەنەوەو بەرگری کامەرانیی ژێر پێ کەوتوویان بکەن.))[415]

چیرۆك بەگشتی، خۆماڵی و وەرگێڕدراو، لە گۆڤاری (هیـوا) دا شـوێنی سـەنگینی خـۆی هەبووەو گۆڤارەکە گۆشەیەکی تایبەتی بە ناوی (چیرۆکی ژمـارە) کردبـووەوە، لـەو گۆشـەیەدا لەپاڵ چیرۆکی چیرۆکنووسانی کورد ژمارەیەکی زۆر چیرۆکی چیرۆکنووسە ناسراوەکانی جیهـان بلاّودەکرانەوە، ئەمەش هەوڵدانێك بوو بـۆ زیـاتر گەشـە پێـدانی ئـەو هونـەرەو ئاشـنا کردنـی نووسەران بەتەکنیکە هونەرییە تازەکـانی جیهـانی چـیرۆك لـە دەرەوەدا، چـیرۆکەکانی ئارسـەر میللەرو ئەنتۆف چیخۆف وسۆمەرست مۆم، ڤیکتۆر هۆگـۆ، ماکـسیم گـۆرگی و...هتـد بـلاّو کراونەتەوە.[416]

بەم شێوەیە وەرگێڕان خەمی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بووەو داوایـان کـردووە ((تکـا لەو نووسەرە بەڕێزانە ئەکەین ئەوانەی حەز ئەکەن نووسراوەکانیان لەم گۆڤـارەدا بلاّوبکرێتـەوە پەیڕەوی ئەم ئامۆژگاریانەی خوارەوە بکەن:

١- بەپێی توانا بۆیان ئەکرێت نووسراوی تازەی عیلمی لە زمانـە بێگانەکانـەوە بگـۆڕن بە کوردی بۆ ئەوەی سوودی گشتی ببێت.))[417] بۆیە دەتوانین بلێین، ڕۆڵی گۆڤـاری (هیـوا) لـە پێشخستن و گەشەکردنی وەرگێڕانییش لەژانرەکانی تر کەمتر نییە.

---

415 ئەنتۆن چیخۆف و نووسینەکانی و گیروگرفتی واقعیەت، وەرگێڕانی احمد عوسمان، گ. هیوا، ژ٣٠، س٤، ل٧٨.

416 لەسەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری (هیوا) دا (٦٥) چیرۆك بلاّو کراوەتەوە کە (٢٢) چیرۆکیان وەرگێڕراون، بۆ نموونەی چیرۆکی وەرگێڕاو بڕوانە: گ. هیوا، ژمارەکانی ساڵی یەکەم، ١، ٢، ٧، ٩، ١٢؛ ژمارەکانی ساڵی دووەم، ٤،١٢، (٦-٧)، ٨، (٩-١٠)، (١١-١٢)؛ ژمارەکانی ساڵی سێیەم، (٢-٣)، ٤، ٥؛ ژمارەکانی ساڵی چوارەم، ٣٠، ٣٣؛ ژمارەکانی ساڵی شەشەم، ٣٦، ٣٧.

417 گ. هیوا، ژ١٠، س١، ل٧.

## ئەنجام

١- گۆڤاری (هیوا)، کە گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و زانستی بووە، یانەی سەرکەوتن خاوەنی ئیمتیازی بووەو (٣٨) ژمارەی لێ دەرچووە، ژمارە یەکی لە تەمووزی ١٩٥٧ دەرچووەو سەرجەمی لاپەڕەکانی ئەو (٣٨) ژمارەیە (٣٠٠٥) لاپەڕەیە. لە ژمارەی (١)ەوە تاوەك ژمارە (٨)ی ساڵی دووەم مودیری مەسئولی (حافظ مصگفی قاچی) بووەو پاشان (د، هاشم دۆغرەمەچی) بووە بەمودیری مەسئول، زۆربەی ئەوانەی ئاماژەیان بۆ گۆڤارەکە کردووە بێ ئەوەی دوا ژمارەی ببینن، ساڵی ١٩٦٣ یان نووسیووە، کەچی دوا ژمارەی (٣٨) لە حوزەیرانی ١٩٦٢ دا دەرچووەو لەساڵی ١٩٦٣ بڕیاری داخرانی گۆڤارەکە و یانەی سەرکەوتنی کوردان دراوە.

٢- ناوەرۆکی بابەتە بڵاوکراوەکانی ناو گۆڤارەکە لە ساڵانی بەر لە شۆرشی ١٤ تەمووزدا مۆرکی نەتەوەییان پێوە دیارە، کەچی دوای شۆرش بیری مارکسیزم - لینینزم و چەپگەری بەسەر بابەتەکاندا زاڵە، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی بیری دەستەی نووسەران و هەڵسورێنەرانی گۆڤارەکەیە.

٣- ژمارەکانی بەر لە شۆرش ڕۆشنبیری گشتییە و بابەتی ئەدەبی و زانستی هەمە چەشنەی تیایەو لاساییەکی تەواوی گۆڤاری گەلاوێژی کردۆتەوە، کەبەر لەچەند ساڵێك لەپێش خۆی وەك گۆڤارێکی ئەدەبیو ڕۆشنبیریی دەرچووە، تەنانەت ناونیشانی گۆشە تایبەتییەکانیشی هەر بەو ناوانەوەیە، وەك: (گۆشەی تەندروستی) و (گۆشەی کشتوکاڵ) و (دیوانی هیوا) و (چیرۆکی ژمارە) و..هتد، بەڵام ژمارەکانی دوای شۆڕش بەتایبەتی دوای ساڵێك، تایبەتن بەئەدەب و بابەتی زانستی بەدەگمەنیش بەرچاو ناکەوێت.

٤- گۆڤاری (هیوا) لە هەموو گۆڤارەکانی پێش خۆی زیاتر گرنگی بەپەخشان داوەو کەمتر لای لە شیعر کردۆتەوە. لە بابەتە هونەرییەکانی پەخشانیشدا، چیرۆك و ژیاننامەو وەرگێڕانی ئەدەبی و شانۆی کوردی و لەسەرووی هەمووشیانەوە ڕەخنەی ئەدەبی گرتۆتەوە. هەر لە ژمارە (٢)ی گۆڤارەکەوە دەرگای ڕەخنەی کردەوەو بابەتە بڵاوکراوەکانی ناو گۆڤارەکەی بەکەسانی پسپۆڕ دەسپارد بۆ هەڵسەنگاندنیان. ئەگەر لە گۆڤارەکانی پێش (هیوا) دا ڕەخنە تەنیا بە دەوری شیعردا دەسووڕایەوە بە سەروەری هەموو هونەرەکانی تریان دەزانی، بۆ یەکەمجار ڕەخنەی چیرۆك

لە گۆڤاری (هیوا)دا گەشەیکردو بلاۆبووەوە، ئەمە بێجگە لەوەی لە گۆشەی چاپەمەنی تازەدا، ژمارەیەك کتێب و بلاۆکراوەی ئەو ڕۆژگارەی خستۆتە بەر تیشکی ڕەخنەی ئەدەبی.

٥- بە هاوکاریی دەوڵەمەندو ڕووناکبیرو نووسەران و ئەندامانی یانەی سەرکەوتن لە ڕۆژگاری سالاّنی کۆتایی ڕژێمی پاشایەتی و حەزو تامەزرۆی وشەی کوردی وەك هوشیاری و چەکی نەتەوەیی گۆڤارەکە مانگانە بەرێك و پێکی دەردەچوو، بەلاّم دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز بەهۆی زۆربوونی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی و پەرت و بلاۆبوونی نووسەران بەسەر زۆر لەشارەکانی کوردستاندا و ململانێ و جیاوازی ئایدیۆلۆژیای نووسەرانی گۆڤارەکەو نەبوونی توانای ماددی گۆڤارەکە وردە وردە لاپەڕەکانی کەم بۆتەوە بەرێکی دەرنەدەچوو تا لەگەڵ ئینقلابی (٨) شوباتی بەعسییەکاندا لەگەڵ چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری دی کوردی داخرا.

٦- گۆڤاری (هیوا) لەنەخشەی بلاۆکردنەوەیدا پشتگیری بابەتی نوێی کردووە هانی گەنجەکانی ئەو ڕۆژگارەی دەدا ڕوو لەهونەرەکانی پەخشان، بەتایبەتی چیرۆك و شانۆ بکەن، هەندێ لەی چیرۆکنووسە دیارەکانی ئێستا لەئەدەبی کوردیدا بۆ یەکەمجار گۆڤاری (هیوا) چیرۆکی بۆ بلاۆکردونەتەوە، وەك (فرمێسکی پەشیمانی) مستەفا سالّح کەریم و (پەنجا فلس)ی محەمەد مەولود (مەم) و هی دی لە هەمان کاتدا لە بلاۆکردنەوەی شیعری کلاسییزم و ڕۆمانسییزمیشدا دریغی نەکردووەو هاوسەنگیی خستبووە نێوان کۆن و نوێ و نەوەی نوێ و چێژی کۆن، بۆیە پیرو گەنج و هەموو چین و توێژەکان نووسینیان لەگۆڤاری (هیوا)دا بلاۆ کردۆتەوە.

گۆڤاری (هیوا) ئیمتیازەکەی سیاسیی نەبوو، بەلاّم نەیتوانیوە خۆیشی دوورەپەرێز لە سیاسەت بگرێت، بە تایبەتی لە دوای هەڵگەڕانەوەی عبدالکریم قاسم لە بەڵێنەکانی. هەڵوێستی دژایەتیکردنی شۆڕشی ئەیلول و سیاسەتی کورد تواندنەوە، دەستەی نووسەران و باوەڕپێکراوی یانەی سەرکەوتن بەرپەرچی وتارە نەیارەکانی دژ بەگەلی کوردی ڕۆژنامەی (الثورة)یان داوەتەوەو هەڵوێستی جوامێرانەیان نواندووە.

٨- تا دەرچوونی گۆڤاری (هیوا) هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێکی زانستیی بە زمانی کوردی نەبوو، بۆیە (هیوا) بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا، لە پاڵ بابەتە ئەدەبییەکاندا ژمارەیەکی زۆر وتاری زانستی هەمەجۆری بلاۆ کردەوەو تەنانەت گۆشەی تایبەتی بۆ زانست لەژێر ناوی (زانست و ژیان) دا بلاۆکردەوە.

٩- شیعره سیاسییەکانی (کامەران) لەسەر گۆڤارەکە ئەوەندەی دی گیانی خەبات و شۆڕشگێڕییان لای خەڵکی کوردستان گەشە پێدەدا.

١٠- گۆڤاری (هیوا) تین و تاوێکی دیدا بەهونەری وەرگێڕان و بۆ ئاشنا کردنی نووسەران لە جوولانەوەی ئەدەبی لە جیهان داو ناساندنی ئەدەبی نووسەرە جیهانییەکان بەخوێنەرانی ئەو ڕۆژگارە گرنگییەکی تایبەتی بەوەرگێڕان دەدا.

١١- ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی لە لاپەڕەکانی گۆڤاری (هیوا) دا شوێنی دیاری هەیە، دیارە ئەمە لەئەنجامی هوشیاری و پەی بردنە بەو ڕاستییەی، کە فۆلکلۆر گیانی نەتەوەیەو ئەدەبی نووسراویش لەوەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، بۆیە گۆڤارەکە لە بواری فۆلکلۆردا، بە تایبەتی پەندو قسەی نەستەق و گاڵتەو گەپدا، ویستویەتی چەندین ناهەمواری کۆمەڵایەتی دەربڕێت و بەشداری لە چاك کردنیاندا بکات.

١٢- ئەگەر سەرەتاکانی ڕێبازی ڕیالیزم لە شیعری کوردیدا لە گۆڤاری (گەلاوێژ) سەریان هەڵدا، ئەوا لە گۆڤاری (هیوا)دا گەشەی کردو لاپەڕەکانی ئەو گۆڤارە بوونە زەمینەیەکی پتەو بۆ پێشخستن و بەرەو پێشەوە بردنی ئەو ڕێبازە ئەدەبییە لە ئەدەبی کوردی بەگشتی و شیعری کوردی بە تایبەتی و زۆر شاعیری پێگەیاند.

## سەرچاوەکان

### ١- کتێب:

### أ- بە زمانی کوردی:


١- ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب١، ٢، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧٢.

٢- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی هەژار، ئەنستیتۆتا کوردی یا پاریسێ، ١٩٨٩.

٣- د. ئەمین علی سعید و د. کامل حسن عزیز البصیر، وەرگێڕان زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٠.

٤- ئەمین فەیزی، ئەنجوومەنی ئەدیبان، تۆژینەوەی لیژنەی وێژەو کەلەپوور، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٣.

٥- ئیسماعیل حەقی شاوێس، قسەی پێشنان - گۆستاو لۆیۆن، بەغدا، ١٩٣٣.

٦- ئینجیلی لۆقا، بەزمانی کوردی شێوەی سۆرانی، چاپی سوید، ١٩٩٠.

٧- باریو، یادگاری یانەی سەرکەوتن، ژمارە (٢)، پەیامی تبرعات، هەیئەتی ناوچەی یانەی سەرکەوتن، چاپخانەی نجاح، بەغدا، ١٩٤٣ - ١٩٤٤.

٨- بەیدەبا، کەلیلەو دیمنە، وەرگێڕانی عومەر تۆفیق، چ٢، چاپخانەی بابل، بەغدا، ١٩٧٥.

٩- پیرەمێرد، گاڵتەوگەپ، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٤٧.

١٠- د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی دکتۆر کاوس قەفتان، بەغدا ١٩٨٧.

١١- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.

١٢- جەمال نەبەز، وەرگیڕان هونەرە، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٥٨.

١٣- حەسەن جاف، کامەران موکریی چیرۆکنووس، چاپخانەی سومر، بەغدا، ١٩٨٨.

١٤- حەسەن قزڵجی، پێکەنینی گەدا، چ٢، چاپخانەی علاء، بەغدا ١٩٨٥.

١٥- حەمە سەعید حەمەکەریم، دیداری شیعری کلاسیکی کوردی، بەغدا، ١٩٨٦.

١٦- حسین حوزنی موکریانی، خۆشی و ترشی - بزنۆکەو مەڕۆکە، چ٢، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٤.

١٧- حسين عارف، چیرۆکی هونەری کوردی، ١٩٢٥ - ١٩٦٠، دار الحرية، بەغدا، ١٩٧٧.
١٨- خاناى قوبادى، خوسرەو شیرین، محمدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.
١٩- خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیك لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا، ١٩٨٩.
٢٠- دیوانی بێکەس، محمدی مەلا کەریم ڕێکی خستووەو سەرەتای بۆ نووسیوە و سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە، چ٣، بەغدا، ١٩٨٦.
٢١- دیوانی پیرەمێرد، ب١، کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی فائق هوشیارو کەسانی تر، چاپخانەی الزمان، بەغدا، ١٩٩٠.
٢٢- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار میران و کەریم مستەفا شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦.
٢٣- دیوانی سەلام، ئامادەکردن و پێداچوونەوەو پێشەکی بۆ نووسین، ئومێد کاکەرەش، چ٢، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٩١.
٢٤- دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی، عەلی تالەبانی، بەغدا، ؟.
٢٥- دیوانی شێخ نوری شێخ سالح، ئازاد عبدالواحد کۆی کردوەتەوەو ساغی کردوەتەوەو لەسەری نووسیوە، ب١، بەشی یەکەم، چاپخانەی دار الجاحف، بەغدا، ١٩٨٥.
٢٦- دیوانی شێخ نوری شێخ سالح، ئازاد عبدالواحد کۆی کردوەتەوە و ساغی کردوەتەوەو لەسەری نووسیوە، ب١، بەشی دووەم، چاپخانەی دار الجاحظ، بەغدا، ١٩٨٩.
٢٧- دیوانی گۆران، محمدی مەلا کەریم کۆی کردۆتەوە و ئامادەی کردووەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ نوسیوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، ١٩٨٠.
٢٨- دیوانی مەولەوی، مەلا عبدالکریمی مدرس (کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەو لەسەر نووسینی)، چاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٦١.
٢٩- رەشید فندی، عەلی تەرماخی ئێکەمین ڕێزمان نڤیس و پەخشان نڤیسی کوردە، بەغدا، ١٩٨٥.
٣٠- رەفیق حلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، ب٢، بەغدا، ١٩٥٦.
٣١- رەفیق حیلمی، یادداشت، ب(٢،١) چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٨.

٣٢- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، چ٨، مطبعة التعليم العالي، هەولێر، ١٩٨٥.

٣٣- زێوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری مەلا عەبدوڵڵای زێوەر، محمدی مەلا کەریم هێناویەتە سەرشێوەی نووسینی نوێ و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپخانەی شركة مطبعة الاديب، بەغدا، ١٩٨٥.

٣٤- د. شاکر خەسباك، کوردو مەسەلەی کورد، وەرگێڕی لە عەرەبییەوە ئەمین موتابچی، چاپخانەی کامەران، سلەیمانی، ١٩٦١.

٣٥- شاکر فتاح، خەباتی ڕۆشنبیران، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٤.

٣٦- د. شوکریە ڕەسووڵ، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی، بەشی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤.

٣٧- د. شوکریە ڕەسووڵ، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، دکتۆر شوکریە ڕەسووڵ و جەلال تەقی لە رووسییەوە کردوویانە بە کوردی، شركة مطبعة الاديب البغدادية بغداد، ١٩٨٤.

٣٨- د. شوکریە ڕەسووڵ، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، مطابع التعليم العالى، هەولێر، ١٩٨٩.

٣٩- صادق بهاءالدين ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٠.

٤٠- صەباحی غالب، ئافرەت لەچیرۆکی کوردی دا ١٩٢٥-١٩٧٠، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٩.

٤١- عبدالجبار محمد جباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧٠.

٤٢- عبدالخالق علاءالدين، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، مطابع دار الحرية، بەغدا، ١٩٨٥.

٤٣- عبدالرحمن عبدالله، تەندروستی گشتی، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)- بەغدا، ١٩٧٢.

٤٤- عبدالله احمد رسول پشدەری، یادداشتەکانم، بەشی یەکەم، چاپخانەی دار الحرية، بەغدا، ١٩٩٢.

٤٥- عەزیز گەردی، پەخشانی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٧.

٤٦- علاءالدین سجادي، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، بەغدا، ١٩٧١.

٤٧- عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردیی، ١٩٢٠-١٩٦٩، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨.

٤٨- د. عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چاپخانەی عەلاء، بەغدا، ١٩٧٩.

٤٩- د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، شیعری کوردی، ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، ب١، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٠.

٥٠- د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، مطبعة التعلیم العالی، هەولێر، ١٩٨٩.

٥١- غەفوور میرزا کەریم، تەقەللایەکی دڵسۆزانە بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری لە کوردستانداو کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، چاپخانەی دار الجاحظ، بەغدا، ١٩٨٥.

٥٢- کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، ب١، چ٢، بەغدا، ١٩٨٠.

٥٣- کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی، بەشی یەکەم، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤.

٥٤- د. کامل حسن عزیز البصیر، شێخ نوری شێخ ساڵح لە کۆڕی لێکۆڵینەوە وێژەیی و ڕەخنەسازیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٠.

٥٥- د. کامل حسن عزیز البصیر، ڕەخنەسازی مێژوو و پەیڕەوی کردن، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٣.

٥٦- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨.

٥٧- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، چاپخانەی (دار افاق عربیة)، بەغدا، ١٩٨٣.

٥٨- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی الادیب البغدادیة، بەغدا، ١٩٨٥.

٥٩- کەمال مەمەند، چەند وتارێك دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی کوردی، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨١.

٦٠- کوردی و مەریوانی، یاری، چاپخانەی دار السلام، بەغدا، ١٩٣٢.
٦١- گۆران، بەهەشت و یادگارو فرمێسك و هونەر، چ٢، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧١.
٦٢- د. مارف خەزنەدار، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی (الوفاء)، بەغدا، ١٩٦٢.
٦٣- د. مارف خەزنەدار، دەستووری زمانی عەرەبی بەکوردی عەلی تەرەماخی، چاپخانەی دار الزمان، بەغدا، ١٩٧١.
٦٤- د. مارف خەزنەدار، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا، ١٩٧٧.
٦٥- د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، چاپخانەی المؤسسة العراقیة للدعایة والطباعة، بەغدا، ١٩٨٤.
٦٦- محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٢، سلێمانی، ١٩٧١.
٦٧- دَ. محمد نوری عارف، تێکستی ئەدەبی کوردی، بەشی دووەم، زانستگای سلێمانی، ١٩٨١.
٦٨- محمود ئەحمەد، جوان، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٦٠.
٦٩- مستەفا نەریمان، بیرەوەریەکانی ژیانم، دار الحریة للطباعة، بەغدا، ١٩٩٤.
٧٠- م. أ. خەلفین، خەبات لەرێی کوردستانا، وەرگێڕانی جەلال تەقی، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٧١.
٧١- هۆنراوەی شێخ نوری شێخ ساڵح، پێشەکی کامەران موکری، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٥٨.
٧٢- یۆئیل یوسف عەزیز و کەسانی تر، وەرگێڕانی ئەدەبی، وەرگێڕانی غازی فاتح وەیس، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٤.

**ب — بە زمانی عەرەبی**

١. د. احسان عباس، فن السیرة، ط٢، دار الثقافة، بیروت، ١٩٥٦.
٢. احمد کمال زکي، النقد الادبي الحدیث اصوله واتجاهاته، دار النهضة العربیة للطباعة والنشر، بیروت، ١٩٨١.

٣. احمد مرسي، مقدمة في الفولكلور، ط٢، دار الثقافة، القاهرة، ١٩٨١.

٤. ادمون غريب، الحركة القومية الكردية، دار النهار للنشر، بيروت، ١٩٧٣.

٥. ارسطو طاليس، فن الشعر، ترجمة عبدالرحمن بدوي، دار الثقافة، بيروت ١٩٧٣.

٦. ارنست فيشر، الاشتراكية والفن، ترجمة اسعد حليم، بيروت، ١٩٧٣.

٧. الكزندر هجرتي كراب، علم الفولكلور، ترجمة رِشدي صالح، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٧.

٨. انيس المقدسي، الفنون الادبية واعلامها في النهضة العربية الحديثة، ط٢، دار العلم للملايين، بيروت ١٩٧٨.

٩. جعفر عباس حميدي، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣ - ١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٠.

١٠. جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧١.

١١. د. جميل نصيف التكريتي، المذاهب الادبية، ط١، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٠.

١٢. د. جورج حجار، نحو اخوة عربية كردية، دار القدس، بيروت، ١٩٧٥.

١٣. د. جهاد مجيد محيالدين، العراق والسياسة العربية ١٩٤١ - ١٩٥٨، منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة، (١٤٦)، بغداد، ١٩٨٠.

١٤. د. حامد محمود عيسى علي، المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، جامعة قناة السويس، مكتبة مدبولي، ١٩٩٢.

١٥. حسين رِامز محمدرضا، الدراما بين النظرية والتطبيق، المؤسسة العربية للدراسات النشر، بيروت، ١٩٧٢.

١٦. حسين عارف، عشرون قصة كردية، منشورات مجلة كاروان (١)، دار افاق عربية للصحافة والنشر، بغداد، ١٩٨٥.

١٧. د. حلمي مرزوق، الرومانتيكية والواقعية في الادب (الاصول الايديولوجية) دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٣.

١٨. حنا الفاخوري، تأريخ الادب العربي، ط٧، بيروت، بلا ١٩٤٢.

١٩. د. داود سلوم، النقد الادبي، القسم الثاني، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٨٦.
٢٠. د. سالم احمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي ومظاهرها في الادب العربي الحديث، جامعة الموصل، ١٩٨٩.
٢١. سمير مرزوق وجميل شاكر، مدخل الى نظرية القصة تحليلا وتطبيقا، بغداد، ١٩٨٦.
٢٢. ش. ج. اشيريان، الحركة الوطنية الديمقراطية في كردستان العراق ١٩٦١ - ١٩٦٨، ترجمة ولآتو، بيروت، ١٩٧٨.
٢٣. د. شاكر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، منشورات الثقافة الجديدة، بغداد، ١٩٥٩.
٢٤. د. شوقي ضيف، في النقد الادبي، ط٧، دار المعارف، بمصر، القاهرة، ١٩٦٢.
٢٥. صادق حسن السوداني، لمحات موجزة عن تأريخ نضال الشعب العراقي، الموسوعة الصغيرة (٤٥)/ بغداد، ١٩٧٩.
٢٦. عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حوادث السنة ١٩٤١، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٨٥.
٢٧. عبدالرزاق الحسني تاريخ الوزارات العراقية، ج١٠ - ط٧، بغداد، ١٩٨٨.
٢٨. عبداللطيف حمزة، المدخل في فن التحرير الصحفي، القاهرة، ١٩٦٥.
٢٩. د. عزالدين اسماعيل، الادب وفنونة، ط٧، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٧٨.
٣٠. د. عزالدين مصطفة رِسول، الواقعية في الادب الكردي، بيروت، صيدا، ١٩٦٦.
٣١. د. عزلدين مصطفة رِسول، حول الصحافة الكردية، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٣.
٣٢. د. علي جواد الطاهر، مقدمة في النقد الادبي، بيروت، ١٩٧٠.
٣٣. د. علي جواد الطاهر، خلاصة في مذاهب الادب الغربي، الموسوعة الصغيرة (١٢١)، بغداد، ١٩٨٣.
٣٤. د. عماد احمد الجواهري، نادي المثنى واجهات التجمع القومي في العراق ١٩٣٤ - ١٩٤٢، مطبعة دار الجاحظ، ١٩٨٤.
٣٥. د، عماد حاتم، مدخل الى تأريخ الاداب الاوربية، الدار العربية لكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٩.
٣٦. عمر الدسوقي، نشأة النثر الحديث وتطوره، القاهرة، ١٩٦٢.

٣٧. غاستون باشلار، جماليات المكان، ترجمة غالب علسا، ط٢، بيروت، ١٩٨٤.
٣٨. د. فائق مصطفى والدكتور عبدالرضا علي، في النقد الادبي الحديث منطلقات وتطبيقات، الموصل، ١٩٨١.
٣٩. د. فاضل حسين واخرون، تأريخ العراق المعاصر، بغداد، بلا.
٤٠. فان تيغم، الرومنطيقية، ترجمة بهيج شعبان، بيروت، ١٩٥٦.
٤١. د. كمال مظهر احمد، صفحات من تأريخ العراق المعاصر، دراسات تحليلية، بغداد، ١٩٨٧.
٤٢. ل. ن. كاتلوف و أ.فد تشنكو، تأريخ الاقطار العربية المعاصر ١٩١٧ - ١٩٧٠، الجزء الاول، اكاديمية العلوم في الاتحاد السوفيتي، معهد الاستشراق، دار التقدم، موسكو، ١٩٧٥.
٤٣. ليث عبدالحسين الزبيدي، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، دار الرشيد، بغداد، ١٩٧٩.
٤٤. ليليان فرست، الرومانسية، ترجمة د. عبدالواحد لؤلؤة، موسوعة المصطلح النقدي (٢)، بغداد، ١٩٧٨.
٤٥. د. محمد الجوهري، علم الفولكلور، دراسة في الانثروبولوجيا الثقافية، ج١،ط٢، دار المعارف، القاهرة، ١٩٧٨.
٤٦. د. محمد حسن عبدالله، فنون الادب، دار الكتب الثقافية، ط٢، كويت، ١٩٧٨.
٤٧. محمد عبدالغني حسن، فن الترجة في الادب العربي، الدار المصرية للتأليف والترجمة، القاهرة، ؟.
٤٨. د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، دار نهضة مصر للطبع والنشر، القاهرة، ١٩٧٧.
٤٩. د. محمد مندور، الادب ومذاهبه، ط٢، مطبعة النهضة بمصر، القاهرة، ١٩٥٧.
٥٠. محمد مهدي كبة، مذكراتي في صميم الاحداث، ١٩١٨ - ١٩٥٨ بيروت، ١٩٦٥.
٥١. محمد يوسف نجم، فن المقالة، دار بيروت للطباعة والنشر، بيروت ١٩٥٧.
٥٢. محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، منشورات دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦.
٥٣. معروف جياوك، القضية الكردية، مطبعة الاستقلال، بغداد، ١٩٢٥.

٥٤. معروف خزندار، موجز تأريخ الادب الكردي المعاصر، ترجمة عن الروسية الدكتور عبدالمجيد شيخو، بيروت، ١٩٩٣.

٥٥. منذر الموصلي، عرب واكراد رؤية عربية للقضية الكردية، دار الغصون، بيروت، ١٩٨٦.

٥٦. منير بكر، اساليب المقالة وتطورها في الادب العراقي الحديث والصحافة العراقية، ط١، مطبعة دار الارشاد، بغداد، ١٩٧٦.

٥٧. د. ناصر الحاني، المصطلح في الادب الغربي، منشورات دار المكتبة العصرية، بيروت، ١٩٦٨.

٥٨. نبيل زكي، الاكراد، الاساطير والثورات والحروب، مطبوعات كتاب اليوم (٨)، مطبعة مؤسسة اخبار اليوم، القاهرة، ١٩٩١.

٥٩. ويليام، ك. ويمزات وكلينث بروكس، النقد الادبي تأريخ موجز النقد الكلاسي، ترجمة: د. حسام الخطيب ومحيالدين صبحي، مطبعة جامعة دمشق، ١٩٧٣.

٦٠. هادي خسن عليوي، عبدالكريم قاسم الحقيقة، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٠.

٦١. يوئيل يوسف عزيز واخرون، الترجمة الادبية، جامعة الموصل، ١٩٨١.

٦٢. يوجين، أ. نيدا، نحو علم الترجمة، ترجمة ماجد النجار، بغداد، ١٩٧٦.

٦٣. يوري سوكولوف، الفولكلور قضاياه وتأريخه، ترجمة حلمي شعراوي وعبدالحميد حواس، القاهرة، ١٩٧١.

**پ. بەزمانی فارسی:**

١. حسن ارفع، كردها ويك بررسی تأريخی وسياسی، چاپ دانشگده اكسفرد، تهران، ١٩٦٦.

٢. دكتر خليل خطيب رهبر، گزينه نپر فارسی، بخش سوم، چ پنجم، انتشارات صفی عليشاه، تهران، ١٩٥٥.

٣. كرد در دائره المعارف اسلام، ترجمه اسماعيل فتاح قاضي، مركز نشر وفرهنگ وادبيات كردی، انتشارات صلاح الدين ايوبی، چاپ اول، اروميه، ١٣٦٧.

٤. كليات خمسه حكيم نظام گنجه‌ای، انتشارات امير كبير، تهران، تيرماه، ١٣٤٤.

٥. محمد تقی بهار (ملك الشعرا)، سبك شناسی يا تاريخ تگور نپر فارسی، جلد ٢، چاپ سوم، تهران، اژرماه، ١٣٤٩.

٦. دكتر محمد مكرى، گۆرانى يا ترانەهاى كردى، كتابخانە دانش، تهران، ١٣٢٩.
٧. وحيد دستگردى، ديوان باباگاهر عريان، چ٢، مؤسسە مطبوعاتي امير كبير، تهران، ١٣٣٣.
٨. يشار كمال افسانە اغرى، ترجمە رحيم رئيس نيا، انتشارات دنيا، تهران، ١٣٣٦.

**ت- بەزمانى ئینگلیزی**

1- Classical Literary Criticism, Translated with An Introduction by T.S Dorsch, pengun Books. 1965.
2- S.H. Longrigg, IRAQ, 1900 to 1950, Oxford University press, 1968.
3- Thomas bois, The kurds, Translated from the French by profesor M.W.Welland, Beirut, 1960.

**ج – بە زمانى ڕووسى**

١- مارف خەزنەدار، بەکورتی مێژووی ئەدەبی کوردی تازە، مۆسکۆ، ١٩٦٧.
٢- م. م. ڕۆزینتالیا، فەرهەنگی فەلسەفی، مۆسکۆ، ١٩٧٥.

**٢- نامەی ماجستێرو دوکتۆرا**

**أ – بە زمانى کوردى:**

- طالب محمد، لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانە لەچیرۆکەکانی محەمەد مەولوود (مەم)، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٣، (نامەی ماجستێر).
- عەزیز عەبدوللا گەردی، کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٤، (نامەی ماجستێر).
- محمد دلێر امین محمد، ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لەگەشەسەندن و پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ١٩٨٩، (نامەی ماجستێر).
- محمد فاضل مصطفى، زێوەر ژیان و بەرهەمی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٨٩، (نامەی ماجستێر).

**ب – بە زمانى عەرەبى:**

١. حسن علي عبدالله، الموقف الرسمي والشعبي العراقي من تطور الاحداث السياسية في مصر ١٩٥٢-١٩٥٦، جامعة البصرة، ١٩٨٦، (رسالة ماجستير).

٢. خالد محسن محمود الراوي، تأريخ الحركة العمالية في القطر العراقي ١٩٦٨ - ١٩٧٥، بغداد ١٩٨٠، (رسالة ماجستير).
٣. صالح حسين الجبوري، ثورة ٨ شباط ١٩٦٣ في العراق دراسة في التأريخ السياسي (اسبابها- مقدماتها- قيامها)، معهد الدراسات القومية والاشتراكية، بغداد، ١٩٨٦، (رسالة ماجستير).
٤. عبدالجبار كريم حمادي، الصحافة العراقية واثرها في تطور الشعر العراقي الحديث، جامعة بغداد، ١٩٨٣، (رسالة ماجستير).
٥. عبدالواحد موسى الحصونة، الحركة الطلابية العراقية ودورها في النضال الوطني والقومي ١٩٤٧-١٩٦٣، جامعة بغداد، ١٩٨٣، (رسالة ماجستير)
٦. قدام سعيدة، المقالة في الادب الجزائري الحديث ١٩٣١-١٩٥٦، جامعة بغداد، ١٩٨٥، (رسالة ماجستير).

٣- گۆڤار و رۆژنامە:

أ — بە زمانی کوردی:

١- گ. بەیان، ژ٢، ١٩٧٠.
٢- گ. پێشکەوتن، ژ١، س١، ١٩٥٨؛ ژ٢١، س١، ئابی ١٩٥٨.
٣- گ. روناهی، ژ١، س١، ١٩٦٠.
٤- گ. رۆژی کوردستان، ژ١، س٢، ئابی ١٩٧٢.
٥- گ. رۆژی نوێ، ژ٧، س١، تشرینی یەکەمی ١٩٦٠؛ ژ٣، س٢، حوزەیرانی ١٩٦١.
٦- گ. رۆشنبیری نوێ؛ ژ(١٠٣-١٠٤)، ١٩٨٤؛ ژ(١٠٣-١٠٤)، ١٩٨٤؛ ژ١٠٥، ١٩٨٥؛ ژ١٠٨، ١٩٨٥؛ ژ١١٣، ١٩٨٧؛ ژ١١٧، ١٩٨٨؛ ژ١٢١، ١٩٨٩؛ ژ١٢٣، ١٩٨٩؛ ژ١٣٠، ١٩٩٣؛ ژ١٣٤، ١٩٩٤.
٧. گ. کاروان، ژ١، س١، تشرینی یەکەمی ١٩٨٢؛ ژ٨٠، س٨، ١٩٨٩.
٨. گ. کاروانی فۆلکلۆر، ژ١، س١، ١٩٩٠.
٩. گ. کۆڕی زانیاری کورد، ب٥، ١٩٧٧؛ ب٦، ١٩٧٨؛ ب٨، ١٩٨١.
١٠. گ. کۆلیجی ئەدەبیات، ژ١٨، ١٩٧٤.

١١. گ. گەلاوێژ، ژ٧، س١، حوزەیرانی ١٩٤٠؛ ژ٣، س ٩، مارتی ١٩٤٨.
١٢. گ. لاوك، ژ١، س١، ١٩٩٢.
١٣. گ. نووسەری كورد، ژ ٦، مارت و نیسانی ١٩٧٢؛ ژ ١٢، ١٩٧٥؛ ژ ٦، ١٩٨١؛ ژ٤، خولی سییەم، ١٩٨٦.
١٤. گ. هیوا، هەموو ژمارەكانی ١٩٥٧-١٩٦٢، (٣٨ ژمارەیە).
١٥. گ. وان، ژ٣، ١٩٩٢.
١٦. گ. یادگاری لاوان، ژ١، ١٩٣٣.
١٧. ڕۆژنامەی ئازادی، ژ٢، س١، یەكشەممە، ١٩٥٩/٥/١٠؛ ژ٥٠، س١، ١٩٥٩/١٢/٢٨؛ ژ٢، س٢، ١٩٦٠/٥/٥.
١٨. ڕۆژنامەی ئالآی ئازادی، ژ٦٤، خوولی دووەم، ١٩٩٣/٣/٧.
١٩. ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٤٠، ١٩٩٤/٩/١١؛ ژ٢٠٤٥، ١٩٩٤/٩/١٨؛ ژ٢٠٥١، ١٩٩٤/٩/٢٥.
٢٠. ڕۆژنامەی پاشكۆی عیراق، ژ٥، ١٩٧٧/٧/٢١؛ژ(١٢-١٣)، ١٩٧٨.
٢١. ڕۆژنامەی خەبات، ژ١٣، ١٩٥٩/٧/٦؛ ژ١٥، س١، ١٩٥٩/٧/٢٦؛ ژ٢٣، س١، ١٩٥٩/٧/٣١؛ ژ٣٢٠، س٢، ١٩٦٠/٩/٢٣.
٢٢. ڕۆژنامەی ڕووناكی، ژ٢٩٠، ١٩٦٩/١٠/٣.
٢٣. ڕۆژنامەی ژیان، ژ٢٠، س١، ١٩٢٦/٦/١٠.
٢٤. ڕۆژنامەی ژین، ژ١١٠٣، س٢٧، ١٩٥٢/٦/١٢؛ ژ١١٠٤، س٢٧، ١٩٥٢/٦/١٩؛ ژ١١٤٨، مایسی ١٩٥٣؛ ژ١١٤٩، مایسی ١٩٥٣؛ ژ١٢٧١، س٣٠، ١٩٥٥/١١/٣؛ ژ١٢٧٣، س٣٠، ١٩٥٥/١١/١٧؛ ١٣٥٢، س٣٢، ١٩٥٧/٧/١٨.
٣٤. ڕۆژنامەی كوردستان، هەموو ژمارەكانی ١٨٩٨- ١٩٠٢، د.كەمال فوئاد، بەغدا، ١٩٧٢.
٢٥. ڕۆژنامەی كوردستانی نویٚ، ژ ٤١٤، س٢، ١٩٩٣/٦/١٦.
٢٦. ڕۆژنامەی نەورۆز، ژ١٥، س٢، ١٩٦٠/٢/١٣.
٢٧. ڕۆژنامەی هەولێر، ژ١٠٤، س٣، ١٩٥٣/١/٢٧.

٢٨. ڕۆژنامەی هەولێر، ژ(٢، ٣)، ١٩٩٢/١٢/٣١.

**ب. بەزمانی عەرەبی**

١. مجلة الثقافة الجديدة، ع ٣، السنة التاسعة، ١٩٨٩.

٢. مجلة الثقافة الجديدة، ع ٣، ١٩٦٩.

٣. مجلة الاقلام، ع ١٢، ١٩٨١.

٤. مجلة دراسات كردية، ع ١، السنة الاولى، ١٩٨٤.

٥. جريدة الاتحاد، ع ٩٠، السنة الثانية، ١٩٩٤/٧/٢٠.

**٤. دەسنووس و دیدارو نامە**

١. مەولوود نامەی شێخ حوسەینی قازی (دەسنووس).

٢. دیداری د.مارف خەزنەدار لەرۆژی ١٩٩٤/١١/٤ لەهەولێر.

٣. دیداری د.محمد محمد نوری عارف لە ١٩٩٤/١٠/١ لەهەولێر.

٤. دیداری محمد ڕشدی دزەیی (مەمی زەر) لە ١٩٩٤/١١/٨ لەهەولێر.

٥. مستەفا سلێمان (ئەندازیاری خانەنشین) لە ١٩٩٤/٩/١٣ لەسلێمانی.

٦. نامەی تایبەتی کامل ژیر لە ١٩٩٤/٩/١٤.

٧. نامەی تایبەتی د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ لە ١٩٩٤/٩/١٧.

٨. نامەی تایبەتی محمد نوری توفیق لە ١٩٩٤/٩/٢٠.

٩. نامەی تایبەتی عبدالرزاق بیمار ١٩٩٧.

١٠- نامەی تایبەتی د.نەسرین فەخری

**٥. ئینسکلۆپیدیاو بیبلۆگرافیاو فەرهەنگ**

1- The New Encylopaedia Briatannica، Macropaedia، Vol: 4، 15th Edition، 1973 - 1974.

2- The Encylopaedia of Islam، Vol: V، 1981.

3- Webster's، Third New Interantional Dictionary of the English Language Unabridgod، Editor in Chief Philip Bobcook Gove، Vol -1-، U.S.A، 1966.

٤. نەریمان، بیبلۆگرافیای دووصەد ساڵی کتێبی کوردی ١٧٨٧-١٩٨٦، بەغدا، ١٩٨٨.

٥. حسن عمید، فرهنگ عمید، ج ٥، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٦٣.

## پاشکــۆ:

### (١) نامەی مامۆستا کامل ژیر

چۆنیەتی پەیوەندیی من لەگەڵ گۆڤاری (هیوا)دا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو گرەوەی ساڵی ١٩٥٧ ساز کرا بۆ جوانترین هەڵبەست لەسەر بەهاری کوردستان.. ئەو کاتە من دوور خراوەیەکی سیاسی بووم لە ئەبوغرێب. لە ڕێگەی ڕۆژنامەی (ژین)ەوە هەواڵەکەم زانی و بە دەنگ گرەوەکەوە چووم، کاتێ نامەی لیژنەی سەرپەرشتیی گرەوەکەم بۆ هات و مژدەی ئەوەی تیا نووسرابوو کە هەلبەستەکەی من بە یەکەم دەرچووە، خەم و پەژارەی (دەس بەسەر)ییەکەی ڕەواندەوە. بە تایبەتی ئەو کاتە تەنها ٣ ساڵ بوو بە هەلبەست کاری ئاشنا بووم.

هەرچەندە ئەو کاتە بۆ من چوونە بەغدا قەدەغە بوو، بەڵام لە نێوان ئیمزای بەیانیان و ئێواران دا سەری بەغدام هەر ئەدا.

ڕۆژی دیاریکراویش بۆ وەرگرتنی خەڵاتی یەکەمییەکە چووم بۆ شوێنی دیاریکراو، لەوێ لەرێو ڕەسمێکی تایبەتیدا ئەندامانی لیژنەکە مامۆستایان ڕشید عارف و علاءالدین سەجادی و انور صائب و شەماڵ صائب خەڵاتەکەیان پێ بەخشیم هەر لەوێ مامۆستا ڕشید عارف کە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرییانەی سەرکەوتن بوو لە بەغداد، وتی: یانەکەمان ڕەزامەندیی گۆڤارێکی وەرگرتووە بە ناوی (هیوا)وەو ئێستا کە تۆمان ناسی پێمان خۆشە تۆ سەرپەرشتی دەرکردنی بکەیت. مامۆستا شەماڵ صائبیسش ڕووی ئەوەی لێ نام کە گۆشەیەکی ئەدەبی لە ئێزگەی کوردیی بەغدا وەرگرم.. هەردوو داواکەم پەسند کرد بێ ئەوەی ئەوە بدرکێنم کە من دوور خراوەیەکی سیاسیم!!

کاتی دەس بەکار بووم، ڕوانیم مامۆستا (کریم زانستی)یش بۆ هەمان مەبەست ڕووی لێ نراوە. پێکەوە نەخشەی کارمان کێشاو مانگی تەمووزی ١٩٥٧ ژمارە (١)مان خستە بەردیدەی خوێنەرانی ئازیزەوە. مامۆستا کەریم بەزۆری کاری ئیداری و ژمێریاری و سەرپەرشتیی چاپی گرتە ئەستۆی خۆی. دوای ماوەیەك برای خۆشەویست و دڵسۆزم محمد نوری عارف (د. محمد نوری عارف) هاتە پاڵمان و ئەویش دەس بەکار بوو لەگەڵمان دا چەند مانگێکیش خوشکی بەڕێزم نەسرین خان (د. نسرین فخری) کاری لەگەڵ دا کردین.

بەڵام مامۆستا کریم زانستی لەدوای ژمارە (١)ی ساڵی (١)ەوە خۆی کشانەوە. مامۆستا حافظ مصطفی قاضیش مدیری مەسئولی گۆڤارەکە بوو. مامۆستا حافظ خۆی ژمێریار بوو لە کۆمپانیاکەی مامۆستا ڕشید عارف. بەو هۆیەوە کە ئەوسا ئەو لە دەرچووانی کۆلیج بوو، کرابوو بە مدیری مەسئول. هەندێك یارمەتیشی ئەداین. بە تایبەتی لە هەڵبژاردنی ئەو نووسینانەدا کە بە بادینانی بۆمان ئەهات. خاوەنی ئیمتیازی گۆڤارەکەش یانەی سەرکەوتن بوو لە بەغدا.

ڕاستییەکەی یانەی سەرکەوتن نێوەندێکی ڕۆشنبیریی نەتەوەییانەی کوردی بوو زۆربەی ئەو کوردانەی لەخۆ گرتبوو کە لە بەغدا ئەژیان، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەپەرە پێدانی هەستی کوردایەتیدا جگە لە کۆڕو کۆبوونەوەکان قوتابخانەیەکیش بوو بۆ وتنەوەی وانەی زمانی کوردی جگە لەو کوردانەی زمانەکەی خۆیان لەیاد نەمابوو، ژمارەیەکیش عەرەب ئەهاتنە ئەو دەورانەوە کە بۆ فێر بوونی کوردی ئەکرایەوە. یانە جێگەی کۆبوونەوەی قوتابییە کوردەکانیش بوو لە بەغداد. ئەو قوتابیانە کۆبوونەوە سیاسییەکانی خۆیان لە یانەدا ئەنجام ئەدا. بەهۆی یانەوە کوردە فەیلیەکانیش لە بەغداد بە کوردی سۆران و بادینان ئاشنا ئەبوون. یانە گەلێ چالاکیی تریشی ئەنجام ئەدا. گۆڤاری (هیوا)یش قوتابخانەیەکی کوردایەتی گشتی بوو بۆ ئەو ڕۆژە پێنووسی نووسەرە گەورەو ناوداری بە برِشتەکانی ئەو سەردەمەی لەخۆ گرتبوو جگە لەنووسەرو هەستیارە لاوەکان. لە زۆربەی ژمارەکان دا ناوی ئەم نووسەرە بەڕێزانە دووبارە ئەبوونەوە: عبدالقادر قەزاز، جمیل ڕۆژبەیانی، أ.ب. هەوری، شاکر فتاح، محمد مصطفی کوردی، احمد خواجە، شێخ حسن حەمە مارف، محمد توفیق وردی، کاکەی فەللاح (بەناوی ڕووناك محمدەوە) کە سەری لێ تێك دابووین و وامان ئەزانی کچە کوردێکە کە لەو ڕۆژەدا نووسەری ئافرەت کەم بوو، منیش بۆ هاندان لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر کرد، عیمان ڕچا علی، محمد سعید جاف، شێخ محمدی خاڵ، ت.ب. مەریوانی، ج.بابان، شارەزا، حەوێزی، ناکام، احمد غفور.

لە نووسەرە لاوەکانیش: شەماڵ صائب، مصطفی صالح کریم، فاضل نظام الدین، عبداللە میدیا، غەمگین، محمد نوری توفیق، مەم، نوری تاڵەبانی، فوئاد زکی هەناری، محمدی مەلا کەریم، فاتح عبدالکریم، پرشنگ، ساجد ئاوارە، بیمار، هوشیار، وەرزێر، فوئاد عزت، ئەمین میرزا کەریم، مصطفی سلێمان، لە هەستیارانیش: کامەران، کاکەی شوان، دلزار، صالح

یوسفی، هەوری، خالد دلێر، شاربازێڕی، دیلان، خالد ڕەشید، نەسرین فەخری، م. ڕسول، غەمبار، مەدهۆش، قدری جان. لە پزیشکەکانیش: د. عبدالرحمن عبدالله، د. نامق نادر، د. قادر شالی، د. مەریوانی، د. انور کەریم، د. وریا ڕواندزی.

جگە لەوانە، ژمارەیەك نووسەرو هەستیاری تریش کە بە ناوی خوازراو یا بەپیت بەرهەمەکانیان بلاو ئەکردەوە نووسینەکانیان دووبارە ئەبوونەوە نووسەرو هەستیارێکی تریش هەبوون کە کەم کەم بەرهەمیان لە (هیوا)دا بلاو ئەکردەوەو منیش بە ناوی کامل ژیر، ژیر، هێمن و زۆر جاریش بەبێ ناو بەرهەمم بلاو ئەکردەوە. داخم ناچێ، کە من ئاگادار نەبووم لەوەی هەر جارێ بە ناوی (هێمن)ەوە ئەمنووسی، لە ئێران هەستیاری بەڕێز (هێمن مهابادی)یان ئەگرت و تووشی لێپرسینەوەو ئەشکەنجەدان ئەبوو! کە هاتە ئەمدیوو بەدەم شەڕەوە یەکترمان ناسی، بەلام من داوای لێبوردنم لێ کرد. (هیوا) گەلێ بابەتی گرتبووە خۆی وەك: ئەدەب، زانست، زمان، تەندروستی، کشت و کال، کۆمەلایەتی، مێژوو، چیرۆك، هەلبەست، توێژینەوە، هونەر، ڕەخنەسازی و... هتد.

هیوا ئەگەرچی گۆڤارێکی سیاسی نەبوو، بەلام ئێمە لەو دەرگایەشمان هەر ئەدا. بگرە هەندێ جار شتی وامان ئەوت کە ئێستاش هەموو نووسەرێك زات ناکا بیلێ. بۆ نموونە من لە پێشەکیی ژمارە (٢) سالی (٢)دا نووسی بووم: پێویستە ئەدەبەکەمان تەرخان بکەین بۆ سوودی شۆڕش و ئازاد کردنی کوردستانی تورکیا و ئێران و یەکخستنی ئەم پارچانە لەژێر ئالایەکی یەکگرتوودا لەهەلبەستی کوردستانی من دا (ل٦٣، ژمارە ٤، سالی ٢) ئەلێم:

ئەمڕۆ ئەبینم نیشتمان،
وەك گولالەی بەهاری جوان،
کولمی سوور و چاوی گەشە،
تومە زێڕێکی بێ خەشە،
تیا بلاوەو ئەلێ دەی زوو،
بۆ کوردستانی یەکگرتوو.

لە هەلبەستی (بۆ جوانێکی دیل)دا وتوومە:
چار نیە و ئەبێ ڕەوان پڕ بەدەم،
بەنەڕەی پلنگ شار و دێ پڕ کەم،

بۆ راپەڕینی هەوڵی کۆششی،
لەخەو هەڵسانی دەنگی جۆششی،
بۆ ئازاد بوون و مافی کوردستان،
زۆردار دەرەبەگ لەگۆڕ و چاڵ نان.
کە لە ژمارە (٢)ی ساڵی (١) لاپەڕە ٢٦دا بڵاو کراوەتەوە.

هەڵبەستی (بەهاری کوردستان)یش ئەگەرچی دوای سەرکەوتنەکەی لە رۆژنامەی (ژین)دا بڵاو کرایەوە، بەڵام لەسەر داخوازیی لیژنەکەو لەسەر داخوازی دەستەی بەڕێوەبەری یانەی سەرکەوتن، لە ژمارە (١)ی ساڵی (١)ی هیوادا جارێکی تر بڵاو کرایەوە، واتا تەمووزی ١٩٥٧ کە لەو هەڵبەستەش دا هاتووە:

زرمەی پێ بێ و چریکەی دەنگ،
دەنگی بیرێك قووڵ و زۆر مەنگ،
لێ ی بێتەوە ئاوازی خۆش،
ئاوازی گشت بێنێتە جۆش،
زەماوەندێ وەها ساز کەن،
داڵەکە، خۆر پەرواز کەن،
تاکو ئەوساکە کوردستان،
بۆ خۆمان بێ و هەر بۆ خۆمان

جگە لەوانە لەناواخنی هەندێ گۆشەدا وەك گۆشەی (چیت نەزانی پرسیار بکە) کە نووسەری ئەم دێڕانە سەرپەرشتی ئەکرد، بۆ ئەوەی کوردایەتییەکەی (دڵدار)ی هەستیار بخەمەوە یاد خوێنەران، پرسیومە ئەم هۆنراوەیە هی کێیە؟:

ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان،
نایشــکێنێ دانەیی تۆپی زەمــان.
کە لە لاپەڕە (١٣)ی ژمارە (٢)ی ساڵی (٢)دا بڵاو کراوەتەوە.

هیوا گرنگی زۆری ئەدا بە رەخنەسازی. لە ژمارە (١)ی ساڵی (٢)، لە لاپەڕە (٨٠)دا گۆشەیەکی تازەی کردەوە بە ناونیشانی (لە ژمارەی پێشوودا) ژمارەی پێش ئەم ژمارەیەی

سپارد بەژمارەیەك نووسەر بۆ ڕەخنەو لێکۆڵینەوە. من کە خۆم سەرپەرشتی ئەم بەشەم ئەکرد، مامۆستا سعید ناکام ڕەخنەی لەو هەڵبەستەی من گرتبوو کە وتبووم:

من کە دیم لەرەی شەپۆلی شنەی ئاڵای کوردستان،
تێکەڵاو ئەبێ لەگەڵ جریوەی ئەستێرەی بەیان،
ئەو کاتە هیواو ئامانجی دوورم هەردوو پێکەوە
ئەبن بەپرشنگ گوڵاڵەی سوورم ئەگەشێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەمانەتەوەو بە سنگێکی فراوانەوە ڕەخنەکەیم بڵاو کردەوە. بێ ئەوەی وەڵامێکی بدەمەوە ئەگەرچی ڕەخنەکەش لەجێی خۆیدا نەبوو.

گۆڤاری (هیوا) بۆ هاندانی نووسەران گرەوی ساز ئەکرد. لە ژمارە (١٢)ی ساڵی (١)ی لاپەڕە (٧١)دا، مەدالیای (هیوا)، مەدالیای زیوینی، تەرخان کرد بۆ یەکەمی ئەو نووسەرانەی لە گرەوەکانی هیوادا سەرئەکەون، خەڵاتی تریش بۆ دووەمەکان تەرخان کرد. لەو ژمارەیەدا گرەوی (چیرۆك و شانۆ) بڵاو کرایەوە بۆ جوانترین شانۆنامەی خۆماڵی و شانۆنامەی وەرگێڕراو.

وەك ڕاستیەك ئەشێ ئەوەش بدرکێنین کە گۆڤاری (هیوا) ئەتوت لە کوردستانێکی ئازاد دەرئەچێ! هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان وێنەیەکێ مەلیکی تێدا بڵاو نەکرایەوە، لە کاتێکدا هەبوو لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبێکی زمانەوانیدا یا کۆمەڵایەتیدا یا مێژوودا وێنەی مەلیکی عیراقی بڵاو ئەکردەوە. هیچ وشەیەکیش یا دێڕێك لە هیچ بۆنەیەکی ئەو ڕژێمەدا بڵاو نەکرایەوە لە(هیوا)دا، یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری هیوا، لەگەڵ دەس کورتی و کەم دەرامەتییەکەشیدا چەند جار بڵاوی کردەوە، کە ئامادەیە بۆ چاپ کردنی پەڕاوی نووسەران لەسەر ئەرکی خۆی. ئەوەبوو مێژووی کوردو کوردستان دانەری شێخ محمدی مەردۆخ وەرگێڕی محمد فیدامان چاپ کردو بڵاو کردەوە.

بیرەوەرییەکانی من لەگەڵ گۆڤاری و یانەی سەرکەوتندا ئەگەڕێتەوە بۆ تەنیا دوو ساڵی ١٩٥٧و ١٩٥٨، دوای ئەوە لە گۆڤارو یانە کشامەوە.

لەگەڵ ڕێزم دا

کامل ژیر

سلێمانی ١٩٩٤/٩/١٤

## (٢) نامەی پرۆفیسۆر د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

## گۆڤاری هیوا

لە سووریە بووم پێش شۆڕشی تەمووز ژمارەیەکی گۆڤاری هیوام بە ڕێکەوت دەستکەوت. پاش شۆڕش کە هەر لە تەمووزی ١٩٥٨دا هاتمەوە. ژمارەکانیم پەیدا کردو کەوتمە خوێندنەوەیان.

هەرچەندە تەجروبەی (گەلاوێژ) بۆ ڕۆژی خۆی تاك بووەو دووبارە نابێتەوە. بەڵام (هیوا)و (شەفەق) هەوڵی ئەو دووبارە بوونەوەیان لە ڕۆژی خۆیدا داوە.

(هیوا) گۆڤاری یانەی (سەرکەوتن) بوو. ئەو یانەیە مێژووی دیارەو دامەزرێنەرو باوەڕپێکراوی دیار بوون. ڕەحمەتی مارف جیاووك کۆڵەکەی ئەو یانەیە بوو. بەڵام دیارە لەپاش ساڵی ١٩٥٧و کۆچ کردنی جیاووکەوە ڕەشید عارف بوو بوو بە باوەڕپێکراوی یانە.

لەبەر ئەوە گۆڤاری (هیوا)ش لەژێر سێبەری یانەو کاك ڕەشیددا بوو هەر بەو پێیە کاك (حافز مستەفا قازی).. وەك لێپرسراوی گۆڤارەکە چەسپ بوو. کاك حافز ساڵانێکی زۆر بەڕێوەبەرو حسابگرو هەمە کارەی کۆمپانیای ڕەشید عارف و شەریکەکەی بوو. هەر ئەوەش ئەرکی (هیوا)ی پێ سپارد بوو و هێنایە کۆڕی ڕۆژنامەگەری و نووسینی کوردییەوە. بەڵام وەك دیار بوو چالاکترین نووسەرو کارکەر لە گۆڤارەکەدا کاك کامیل ژیر بوو، کە ئەو کات بەناوی (هێمن)ەوە بەرهەمی بڵاو دەکردەوە.

پاش شۆڕش دەبوو ڕۆخساری یانەی سەرکەوتن بگۆڕرێت. بەتایبەتی، کە هێشتا ئیجازەی هیچ حیزبێك نەدراوبوو. یانە بوو بەمەڵبەندی چالاکی قوتابییانی زانستگای بەغداو ڕۆشنبیرانی کورد. هەموو قوتابییانی کورد داوای بوونە ئەندامی یانەیان کرد، بەڵام باوەڕپێکراو کاك ڕەشید عارف خەتی بەژێر ناوی هەموو ئەو قوتابییانەدا هێنابوو کە سەر بەحیزبی شیوعین، تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا کە بەڕاستی ئازادییەکی لیبرالییانە هەبوو، ئەو برادەرێکمانی وەرنەگرت، چونکە پێی دەوت.. سمێلت لەسمێڵی ستالین دەچێت..

مەسەلە گەورە کرا، کاك ڕەشید سەفەری کرد بوو، دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی جێگری باوەڕپێکراو بوو بەبێ جیاوازی هەموو قوتابییانی وەرگرت.

کە هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری دەستی پێکرد. بڕیاردرا پارتی و شیوعی پێکەوە یەك لیستەیان لە هەڵبژاردندا هەبێت. پێڕەوی ناوخۆی یانە ئەو کاتە وابوو کە دەبێ هەمیشە سێ کەس لەئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر لەدەستەی دامەزرێنەر بن. هەردوو حیزبەکە کاری ڕێکخستنی لیستەیان دایە دەست لیژنەیەکی قوتابیانی خۆیان لەبەر ئەوە لەلایەن پارتییەوە مەحموود عەلی عوسمان (دوکتۆر)و تاریق ئەحمەد حەمەدی (دوکتۆر) هاتن و نوێنەری قوتابیانی شیوعیش جوامێر مەجید سەلیم (دوکتۆر)[٤١٨] و من بووین. لەسەر هەموو ئەندامان ڕێك کەوتن. بۆ سێ ئەندامە دامەزرێنەرەکەش لەسەر (دوکتۆر نووری فەتوحی و مامۆستا ئیحسان شێرزاد) ڕێك کەوتن. بۆ سێهەم ئەوان پێیان لەسەر کاك ڕەشید عارف داگرت، ئێمەش لەبەر ئەو هەڵوێستەی نەمانویست و شێخ مستەفا قەرەداخیمان پێ باشبوو.

سەیر ئەوەیە ئەو هەڵبژاردنە تەنیا کەوتە نێوان ئەو دوو کەسەوە شێخ مستەفای قەرەداخی دەرچوو. کاك ڕەشید خزمەتی یانەکەی زۆر کردبوو، بەڵام بوو بەقوربانی ئەو هەڵوێستە ڕەقەی.

دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی بوو بە باوەڕپێکراو. گۆڤاری (هیوا) لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشتر ڕێبازێکی کوردایەتیی جوان و ئاشکرای هەبوو. بەڵام بەپێی ئەو ئیجازەیەی پێی درابوو زیاتر لایەنی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی تێدا دیاربوو. پاش شۆڕش چەند ژمارەیەکی لێ دەرچوو بوو، لەگەڵ لێشاوی شۆڕشدا، ڕوخساری گۆڕڤارێکی سیاسی سەر بە شۆڕشی تەمووزی پێوە دیار بوو. بەڵام نەمانی کاك ڕەشید عارف لە یانە بووە هۆی دوورکەوتنەوەی دەستەی نووسەرانی کۆن. ڕەنگە لای خۆیان هۆی تریش هەبوو بێت. هەر بەپێی باری سیاسی ئەو ڕۆژە دوکتۆر هاشم بۆ چەند کەسی وا گەڕا کە گۆڤارەکەش دەربکەن وە وردە وردە بیبەنەوە سەر ڕوخسارە ئەدەبی و ڕووناکبیرییەکەی خۆی من ئەم مەبەسەم لەسەر وتاری ژمارە (٩)دا نووسیوە.

سەرەتا کاك محەمەدی مەلا کەریم ئەرکی سکرتێری نووسینی گرتە ئەستۆ، بەڵام هەر ژمارەیەکی دەرکرد. کە منیش یارمەتیم دا تێیدا. ئەو بەکاری ترەوە خەریکبوو. لەگەڵ

---

[٤١٨] هەموومان ئەوسا قوتابی بووین. من و کاك جوامێر لەخوێندن دەرکرا بووین و پاش چەند ساڵ گەڕابووینەوە دووایی هەریەکە لە رشتەیەکدا لەقەبی دوکتۆریان پێدرا.

ڕەحمەتی کاك فاتیحی برای ڕێك کەوتن بەڵام ئەویش پێی نەکرا. من بووم بە سکرتێری نووسین. لە ڕاستیدا ئەو دەمەو لەو چەشنە گۆڤارانەدا سکرتێری نووسین خۆی سەرنووسەریش بوو چونکە سەرنووسەرەکە هەر ناوی بەسەر گۆڤارەکەوە دەبوو و مەسئوولیەتی یاسایی دەکەوتە ئەستۆ.

کەرەسەیەکی زۆرم کۆکردەوە سەرووتارو پەراوێزو پێشەکیی زۆر وتارم نووسی. بە شێوەیەکی نوێ و ڕێگە نیشاندەر (پۆستەی خوێندەواران)م ڕێکخست بەو جۆرە دیارە ئەو دەمە گۆڤار کادیری ئیشکەری نەبوو. دەبوو هەر خۆشم هاتوچۆی چاپخانە بکەم و پرۆڤەی چاپ ڕاست بکەمەوە (تصحیح)ی بکەم و بەجێ هێنان کە ئەو کاتە (تبویب)ی پێدەووترا هەر لەسەر خۆم بوو. بەو جۆرە دیارە ئەوەی بیرم بێت ژمارە (١٠)ی ساڵی (٢)، ژمارە (١١، ١٢)ی ساڵی (٢)م بەتەنیا دەرکرد. کۆمەڵێك کەرەستەشم بۆ ژمارەکانی تر کۆ کردەوەو ئامادەشم کردن. بەڵام باری دەرامەتی گۆڤارەکە ڕێگەی دەرچوونی نەدان، کە بۆ ساڵی داهاتوو کۆتایی ١٩٥٩و سەرەتای ١٩٦٠ هەڵبژاردنی تازەی دەستەی بەڕێوەبەر بوو.

سەرەتا دوو لیستە هەبوو: لیستەی پارتی و لیستەی شیوعی. هەردوولا گەلە کۆمەکییەکی زۆرییان کردبوو بۆ خەڵك بەئەندام کردن و سەرکەوتن. مەسەلە دوو سوودی تێدا بوو. یەکەم مەترسیی بەیەکدادان هەردوو حیزبی وا لێکردبوو کە ڕێك بکەون و ئەو ڕۆژە هەڵبژاردن دوور بخرێت و دوایی یەك لیستەی هاوبەش دابنرێت. دووەم: کورد لە بەغداو دەورووبشتی نەما. بەڵکو لە خانەقین و مەندەلی و کفریشەوە خەڵك بوون و بەئەندام و پارەیان دا. بەمە پارەیەکی ئەوتۆ کۆکرایەوە کە توانای دەرکردنی گۆڤاری تێدا بێت، با پچڕ پچڕیش بێت.

من هەرچی کەرەسەم لابوو بۆ دوکتۆر هاشم دوغرەمەچیم بەجێ هێشت، کە بەڕاستی یەکێکە لەو ئینسانە گەورەو دڵسۆزانەی لە ژیاندا ناسیومن. شەوی ١٩٦٠/٣/١٦ بەرەو مۆسکۆ بۆ خوێندن تەواو کردن ڕۆیشتم. بەڵام پێوەندیم لەگەڵ (هیوا)دا نەبڕا، لە مۆسکۆو باکۆشەوە نووسینم بۆ ئەوێ و بۆ ڕۆژنامەی (ئازادی)یش دەنارد کە سکرتێری نووسینی ئەویش بووم. لەوانە موقابەلەیەك لەگەڵ (چەرکەز بەکاییێڤ) دابوو کە گەورەترین زمانەوانی ئەو سەردەمەی کوردی سۆڤیتی بوو. ئەگەر سەیری ئەو چەند ژمارەیەی (هیوا) بکەیت، وا بزانم تازەگەریەکی تێدا بوو. سوودم لەو دوو ساڵەی ژیانی سووریام بینی بوو ١٩٥٦ - ١٩٥٨.

ئەوەش بڵێم کە ساڵی ١٩٥٩ بەرەیەکی نیشتمانی سەر بەچەپ دامەزرا لە حیزبی شیوعی و پارتی (سەرکردایەتیی مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا)و چەپەکانی ناو حیزبی نیشتمانیی دیموکراتی و لە هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێك نوێنەرێك لەناو دامەزرێنەرانی بەرەدا ئیمزایان کردبوو. من وەك نوێنەری (هیوا) ئیمزای پەیامی ئەو بەرەیەم کردووە.

١٩٩٤/٩/١٧

**(٣) بەشێك لە نامەی مامۆستا محمد نوری تۆفیق**

ساڵی ١٩٥٦ کاتێ بیستم کە یانەی سەرکەوتن لە بەغداد ئیمتیازی گۆڤاری (هیوا)ی وەرگرتووەو داوا لە بەشداران ئەکا کە (ئابوونەی) پێشەکی بۆ بنێرن ئەو کاتە من مامۆستای (ئاغجەلەر) بووم، لەرێی بەریدی چەمچەماڵەوە پێش دەرچوونی گۆڤارەکە ئابوونەکەم بۆ ناردو هانی یەك دوو برادەریشمدا کە ئەوانیش تیا بەشدار بن و پارەکەیان بنێرن... کە ژمارەی یەکەمم وەرگرت، باوەڕبکە خۆم بەدڵخۆشترین کەس دائەناو هەر بە یەك دوو سەعات لەم بەرگەوە بۆ ئەو بەرگەیم تەواو کرد.. هەوڵیشم دا چەند کەسانێکی تر لە چەمچەماڵ و ئاغجەلەردا بکەم بە ئابوونەی و داوام لە برادەرێکم کرد (محمد سعید عبدالرحمن) خاوەنی کۆگای فریاد کە ببێ بە باوەڕپێکراوی گۆڤارەکەو هەموو مانگێك بە رێکوپێکی حسابەکەی بنێرێ. وای لێ هات شارە چەمچەماڵ یەکێك بێ لە قەزاکانی کوردستان کە ژمارەیەکی باشی گۆڤاری هیوای تیا بڵاو بێتەوە.. منیش دوای دەرچوونی چەند ژمارەیەك دەستم کرد بە نووسین، بەڵام بە(شیعر نا)، وەك زۆربەی زۆری نەوەکانی سەردەمی خۆم، بەڵکو لە پێشدا بەوەرگێڕان، کە وابزانم یەکەم بەرهەمم لە بارەی خەڵاتی (نۆبڵ)ەوە بوو، کە یەکەم بەرهەمم بڵاو کرایەوە هێندەی تر هیوام لا خۆشەویستر بوو، ئیتر هیوا بەرەو پێشەوە ئەچوو، خوێنەرەکانی زیادی کرد و ژمارەکانی زیاتر ئەبۆوە، منیش بەردەوام بەرهەمم بۆ ئەنارد ئەدەبی، سیاسی، زانستی، دوا جار لەنگەری چیرۆکم لەسەر لاپەڕەکانی داگرت.. نازانم ئەو بابەتانەی تیایدا بڵاوم کردوونەتەوە بەناو، جگە لەسەرە مەقەست، چەند بابەتن، هیوادارم کاك هیمداد لە پۆلین کردنی ناوەکاندا توانێبیتی ژمارەی بابەتی بڵاوکراوەم دەربێنێ.. بەداخەوە لە دوای شۆڕشی ١٤ تەمووزی ١٩٥٨و لەگەرمەی ململانێی پارتی و شیوعیەتدا بۆ دەست بەسەرا گرتنی یانەی سەرکەوتن و گۆڤاری هیوا، گۆڤارەکە لەو ململانێیەدا ژمارە لەدوای ژمارە، لاپەڕەکانی کزترو کەمتر ئەبووەوە، وەك جاران بە رێکوپێکی دەرنەئەچوو بەشدارانی کەوتنە رەخنە، گلەیی، باوەڕپێکراوەکانی ئەو گەرم و گوڕیەی جارانیان نەما، من لەو کاتەدا باوەڕپێکراوێکی تازەم لە چەمچەماڵدا بۆ پەیدا کرد کە (کۆگای فەرهاد- کاك ڕحیم ڕچا) بوو... هەرچەندە هەوڵ و تەقەللامان ئەکرد ئەو برە فرۆشتنەی جارانمان بۆ پەیدا نەکرایەوە... کاتێ کە دەستەی هیوا ئاگادارییەکی خەتەرناکیان لە یەکێ لەدوا ژمارەکانیا بڵاو کردەوە،

که لەبەر بێ پارەیی لەوانەیە هیوا دەرنەچێ. من یەکێك بووم لەو کەسانەی بەنامەیەك ئاگادارم کردن، تیادا بەڵێنم دانێ کە من پارەی ئابوونە کەم زیاد ئەکەم و خەڵکانی تریشم هاندا بۆ ئەوەش هیواش بەدەردی گەلاوێژ نەچێ... وابزانم ئەو نامەیەشم بڵاو کرایەوە.

١٩٩٤/٩/١٥

**(٤) نامەی بەڕێز عبدالرزاق بیمار**

کاك هیمداد حسینی بەڕێزو خۆشەویست

ڕۆژباش...

وا ئەوەی بەبیرم داهات دەربارەی پرسیارەکانت لە خوارەوە (نارێك و پێك) بۆت دەنووسم هیوادارم سوودیان لێ ببینی و ئاواتی سەرکەوتنت بۆ دەخوازم.

برای خۆت عبدالرزاق بیمار

لە کۆتایی سالّی (١٩٥٩)ەوە کە لە پۆلی یەکەمی بەشی کوردی کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا دەمخوێند پێوەندیی ڕاستەوخۆم بە گۆڤاری هیواوە بەهێز بوو، بەهۆی مامۆستا فاتحی مەلا کەریمی ڕەحمەتییەوە کە وەك کارگێڕی سەرەکی گۆڤارەکە بوو، پاشان بەهۆی محمدی برایەوە کە ئە و ئەرکی هەڵسووڕانی گۆڤارەکەی لەئەستۆ گرت، وتارم دەدانێ (بۆ بلاّوکردنەوە).. پاشانیش هاوکاریم دەکرد. ئەو وەختە مامۆستا عیزەدین مستەفام هەر لەدوورەوە دەناسی و بەدیدەنی شادنەبووم. جگە لە نووسەرێکی کارگێڕی بەتوانای (هیواو)و سیاسەتمەدارێکی ئەوسا بەختەبیێکی کاریگەرم کەوتە بەردڵ. لە کۆبوونەوەیەکی هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری (یانەی سەرکەوتن)دا کە ململانێ ئێجگار توندوتیژبوو لە نێوان لایەنگرنی (چەپ)و لایەنگرانی پارتی دا. ئەوکە وتاری خوێندەوە ئێجگار بەوردی زۆر ڕاستی ڕوون کردەوەو شێوازی قسەکانی کاری لە دڵی خەڵکەکە کرد. پاشان لەسالّی ١٩٦٠دا چووە دەرەوە بۆ خوێندن.

مـن بەپێی بڕیاری دەستەی بەڕێوەبەری (یانەی سەرکەوتن)ی خاوەنی گۆڤار لە ١٩٦١/٢/١٧دا بە ئەندامی لیژنەی دەرکردنی گۆڤاری هیوا داندرام، لیژنەکەش بریتی بوو لەمانە (جگە لەخۆم):

- مامۆستا علاوالدین سجادی - مامۆستا مکرم تالەبانی
- مامۆستا ناهیدە سلام - مامۆستا کاکە مەم بۆتانی

ئیتر لە سەرەتای سالّی ١٩٦١ەوە کەوتمە ناو مەیدانی ڕۆژنامە نووسییەوە، نەك هەر بەوێنەی هاوکارێك کە جگە لەم (هیوا) لە ڕۆژنامەی (ئازادی)شدا هاوکاریم دەکرد... بەڵکو لە ئەرکی

کۆکردنەوەو ڕێکخستنی وتارو مادەی بلاوکراوەو دانانی پلان و ڕێبازی گۆڤارەکەدا بەرپرسیاریم کەوتە سەرشان. مامۆستا محمدی مەلا کەریمیش ئەرکی چاپخانەی لە ئەستۆ مایەوەو گورج و پاك و پوخت کارەکەی هەڵدەسووڕاند، سەرەڕای هاوکاریشی لەگەڵ دەستەی نووسەراندا.

لام وابێ ئەوەی من توانیومە لە سەرەتای ساڵی (١٩٦١)ەوە لە دیاری کردنی جۆری ڕێبازی گۆڤارەکەدا هەوڵی بۆ بدەم ئەگەر نەبێتە خۆهەڵکێشان و ئەگەر لە بیرەوەریشدا بێ توانا نەبووبم. ئەوەیە ویستوومە گۆڤارەکە لە بەرگێکی ئەدەبی بێ ڕەسەن و شکۆدار دابێت.. زیاتر بەو هونەرە ئەدەبیانەوە خەریك بێت کە ئەدەبی کوردی لێی هەژارە وەك چیرۆك، شانۆیی، ڕەخنەو لێکۆڵینەوە، زمانەوانی هەڵبەستی تازەی کوردی و بیانی.

من زیاتر بەو بابەتانەوە پەیوەندی داربووم و ئەوەندە لە وتارەکانی تری گۆڤارەکە خۆم بە بەرپرسیار نەدەزانی. چەند جارێك لیژنەکە کۆدەبووەوەو سەیری سەرجەمی دوایی وتارەکانی دەکرد. هەوڵم دەدا مامۆستا علاوالدین وتار بنووسێ. بۆی نەکرا، ناچاربووم بەشێك لە کتێبە دەستخەتەکەی و ئەوەی بەدەرس بەئێمەی دەنووسیەوە (لە بەشی کوردی) بلاوبکەمەوە.

دەتوانم بڵێم لەژمارەکانی دوای ئەم مێژووەدا گۆڕانێکی هەست پێکراوی لەم جۆرە دەبینین.. واپێ دەچێ ڕێبازی ئەدەبی بەسەر ڕێبازی تری ڕۆشنبیری دا زاڵ بێت و لە ئەدەبیاتیشدا ئەو هونەرانەی دەست نیشانم بۆ کردن ئاشکرا دیاربن. بە تایبەتی دوای گۆڕانی باری ئاوو هەوای سیاسی، کە لەم ساڵە بەدواوە ئەو گوڕو گەرمی و توندوتیژییەی سەرەتای شۆرشی ١٤ی تەمووزو بە ژمارەکانی پێشووەوە دیاربوو بەمەیدانی گەل و ڕۆشنبیریدا دەبینران کزبوون.

لەم ژمارانەی دواییدا ئەوەندە بەلای وتاری سیاسی دا نەدەچووین و ڕامان بەرامبەر بە حکومەتی شۆڕش وەك جاران نەبوو. تەنانەت لە بوارەکانی تری ڕۆشنبیریشدا زیاتر بایەخ بە بواری ئەدەبیات دراوە. چونکە هەرچی شایان بێ لەم بوارانەدا بنووسرێن جاران و لە ژمارەکانی ساڵی یەکەم و دووەم دا نووسراون.

لەم وەختەشدا گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)ی سلێمانی دەرچوو خۆش بەختانە گۆڤاری هیوا توانی بەرامبەر ئەم گۆڤارە (نوێ)یەو کە لە شارێکی وەك سلێمانیدا دەربچێت. بە سەنگینی و شکۆی ئەدەبیات پەروەری خۆی بووەستێت. ناڵێم پێشبڕکێ هەبوو لە نێوانیاندا، بەلاّم (هیوا) تای تەرازووی دانەلەنگی و هەر بە گۆڤارێکی پەسندکراوو ئاست بەرز مایەوە.

دەربارەی هونەرە ئەدەبییەکان، ئەوەی پێشووتر گوتم لکەکانی چیرۆك، شانۆیی، ڕەخنە، لێکۆڵینەوە، هەڵبەستی نوێ زیاتر بایەخیان پێ دراو من خۆم هەوڵم دەدا ئەمانە پێش بکەون و زۆربن و ئاودارو گەشەسەندووبن. کۆششی منیش لەم لایەنەدا لەوەدا دەردەکەوێ کە:

- ژمارەیەك وتاری ڕەخنەگرانەم نووسیوە، هەوڵیشم داوە وتارە ڕەخنەگرانە پەیدابکەم و بلاّوی بکەینەوە:

وتارەکانی ڕەخنە (ئەوەی بەردەست بن)

- خەبات و ژیانی دلزار - ژ٤ - ادار ١٩٦٠
- شەهیدانی قەلاّی دمدم - ژ٣٢ - نیسان ١٩٦١.
- لەگەڵ شێخ ڕەزای تالەبانی - ژ٣٠- تشرینی یەکەمی ١٩٦٠.
- کتێبی فۆلکلۆری کوردی

کتێبی کەشتی خەوو چیتراو، ژمارە ٣٣ تموز ١٩٦١

کتێبی فرە وەگیانم خۆشە

- بازاڕی چاپەمەنی لە زۆر ژمارەدا.

هی تریش

شـانۆ:

- ساڵی ١٩٦١ کتێبی (شانۆی کوردستان)م بلاّوکردەوە کە چوار شانۆیی و ئۆپەرێتی بەشیعر بوون.

- شانۆیی (باوکە تۆ بڕوات بەمن نییە) لە ژمارە (٣٣)ی تەمووزی ١٩٦١دا من کردوومە بەکوردی.

- ساڵی (١٩٦٠) شانۆگەریی (یووکی پەردە)م بلاّوکردەوە.

چـیرۆك:

خانەیەکی دیاری کراو بۆ چیرۆك تەرخان کرا. لە ژمارەیەکدا چەند چیرۆکێك بلاّودەکرایەوەو هەوڵ دەدرا چیرۆکنووسە لاوەکان بۆ برەودان بە چیرۆك هان بدرێن. ڕەخنەو لێکۆڵینەوە دەربارەی چیرۆك دەوری هەبوو. هەندێ چیرۆکی حەسن قزلجی، حسین عارف، بە نموونە ناوبانگی باشیان هەبوو.

هەڵبەستی تازە:

خۆم شیعری نوێم بلاۆدەکردەوەو لە عەرەبیشەوە نموونـەی جـوانی شـیعری تـازەم دەکـردە کوردی. بەنموونە:

ژمارە (٣٤) - ایلولی ١٩٦١، نازم حیکمەت بەیاتی ولیەم پلێك.

ژمارە ١٩٦٢/٣٦.

هەڵبەست و تێکۆشان و ئافرەت - نازم حیکمەت.

پاشکۆیەکی گۆڤاری (الادیب العراقی)یشمان بەکوردی دەرکرد ئەویش لەم ڕووەوە ڕێبازی ئەدەبیات و کۆششی منی پێوەدیارەو شیعری وەرگێڕاوو تازەی تێدایە.

لەم ساڵانەی شەستەکاندا ئێمە چەند کەسێك ئەندامی یەکێتی ئـەدیبانی عـیراق بـووین، ئەوانەی لەبیرم مابن جگە لە خۆم:

عبدالصمد خانقای چیرۆك نووس (بەعەرەبی).

د. پاکیزە ڕفیق حلمی.

محمد توفیق وردی.

محمدی مەلا کەریم.

محمد ڕسول هاوار.

اسماعیل ڕسول.

چەندجار لە کۆڕە ئەدەبییەکاندا بەشداریمان دەکرد. لەوانە:

- بەشێك لەکتێبی (مذکرات طالب من کردستان)ی کامل بصیر کە خۆی خوێندیەوە.

- یادی چلەی مامۆستا گۆران کە ئەمانە وتاریان تێدا خوێندەوە:

ـ محمد ڕسول هاوار، حسین عارف...

- مەجلیسی فاتیحا بۆ پرسەی مامۆستا ڕەفیق حلمی.

- مامۆستا گۆران شیعری وەرگێڕاوی خۆی بە عەرەبی خوێنـدەوە دەربـارەی (پیرەمێـرد) لـە کۆڕێکی تایبەتیدا.

منیش وتارێکم دەربارەی شیعری پیرەمێرد بە عەرەبی هەر لە هەمان کۆڕدا خوێندەوە.

- کتێبێکمـان ئامـادەکرد بـۆ چـاپ بـە نـاوی مختـارات مـن الادب الکـردی کـەمێکی لـێ بلاۆکرایەوە.

- مامۆستایان اسماعیل ڕسول، عبدالصمد خانقاه و هی تر بەعەرەبی لە گۆڤاری (اتحاد الادباء) دەیان نووسی.

- لە کۆلیجی ئاداب دا: لە گۆڤارێکی قوتابیانی کۆلیج بەعەرەبی وتارێکی پێناسینم دەربارەی ئەدەبی کوردی بلاوکردەوە.

- لە گۆڤاری (دەنگی قوتابیان)یش دا، بەعەرەبی و بە کوردی لەگەڵ کەمال خەمبار شیعرمان بلاوکردۆتەوە.

- لەم سالانەی شەستەدا بەڕای من بناغەی چیرۆکی کوردی دارِژاو بوو بە هونەرێکی سەربەخۆو بەنرخی ئەدەبی کوردی. جگە لە کورتە چیرۆکەکانی گۆڤارەکان، کۆمەڵە چیرۆکیش (بەکتێب) بلاوکرانەوە، دیاردەیەکی هەرە گرنگ دەرچوونی ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازی بوو کە ڕۆژنامەی (ئازادی) و بە سەرپەرشتی کاکە محمدی مەلا کەریم چاپی کردو بلاوی کردەوە، کە بە بەردی بناغەی ڕۆمانی کوردی دادەندرێت و زۆرباش پەسندکراو خوێنەران بە گەرمی پێشوازییان کرد.

- لە بواری شیعرو لێکۆلینەوەشدا (دیوانی مەولەوی)ی مامۆستا مەلا کەریم کتێبی نایابی ئەم سالانە بوو.

- هەر لەم سالانەدا تۆمارکردنی فۆلکلۆری کوردی و بایەخ پێدانێ بوو بە کارێکی چەسپاو.

- لەدوا دوای سالی ١٩٦٢دا باری سیاسی عیراق ئالۆزبوو، شۆڕشی کورد سەری هەلدا. مەودای بلاوکردنەوەو نووسین وەتەنگ هات، گۆڤاری هیوا بوو بە نامیلکەیەك لەبەر بێ دەرامەتی و پشت کردنی حکومەت لە یارمەتی دانی یانەکە.. زۆر کەس لە نووسین کەوتن و داهێنان کزبوو... من لە سەرتای ژمارە (٣٦)ی سالی ١٩٦٢ی گۆڤاری هیوادا، بەناوی (ع) وتارێکم نووسی و پرسیومە (ئایا ئەبێ نووسەرەکانمان بنووسن یان نا؟) بەمەبەستی ئەوە نووسەران پشت لە نووسین و بلاوکردنەوە نەکەن بە هەر بیانویەك بێت، با ئەدەبی داپۆشراوو شێوە ڕەمزی بنووسن.

ئیتر گۆڤارەکە بە(٦) مانگ جارێکی دەردەچوو، دواژمارەشی فریای بلاوکردنەوە نەکەوت. تاسالی ١٩٦٣ بە جارێك چاپەمەنیی کوردی پەکی کەوت و تاچەند سالێکیش هەروامایەوە.

## (٥) من و گۆڤاری (هیوا) و
## یانەی سەرکەوتن و ئەوەندەی بێتەوە یادم

دیارە کە ساڵ پێش شۆرشی گەلاوێژ (تەمموز)ە بەڵام پەندە بەتەواوی نازانم بەس دیاریشە کە ساڵ (١٩٥٧)ە بەڵام کام مانگ دیار نە بێت. هەر پەند باشترە بەڵام کارناکاتە سەر ناوەرۆکی ئەو جموجۆل و تەقینەوەیەی ئەوسای تێکرایی. کە ئێمەش دەستمان کرد بەپوونە ناو پەند (لایەنێك) بۆ بە بەرپرسیار کردنەوەو ئاگاداری بوون لە خۆیان و هەڵسوکەوتیانو ورژاندنی خەڵکەکە بۆ زانینی کاروبارو پیشاندانی دەورو ئامادە بوونمان لە یاریدەدان بە هەر توانایەکەوە بێت.

چەند جارێك سەری یانەم دا، بەتایبەتی پاش ئەوەی داوام لیّ کرا، شعرێك پێشکەش کەم بە یەکەم ژمارەی (هیوا) کە هیوای گۆڤاری (گەلاوێژ) ی هێنایەوە یادو ئەستێرەیەکی گەشدار بوو لە ئاسۆی ژیانمان و بەرێکەوتیش یەکەم ژمارەش کەوتە مانگی (گەلاوێژ)، کەخۆم مندالّ بووم و لە ساڵانی یەکەمی سەرەتایی بووم کاتێك هەستم کرد بە کۆمەڵە ژمارەیێك بەربەرە زیاد دەکات لە ماڵمانەوە خودا لیّ خۆشبوو (گیو موکریانی) هەر دانەیك دەربچووایە لەگەڵ چاپکراوی تردا دەی ناردە ماڵەوە، ئیتر وردە وردە جریوەی وشەکانی لە گەڵ ئاواتە وردە گەشەکانمان دەزرینگایەوە لە گوێمدا کە باس دەکرا، یان لاپەرەکانی دەخوێنرایەوەو ناوی ئەم ئەو بەرەبەرە خۆی تۆمار دەکرد لە مێشکمدا. بۆیە هیواو (گۆڤاری هیوا) و هاتنە دنیاوەی لە مانگی (گەلاوێژدا) هەستی مندالی هەژاندو لانەکەی یانەی سەرکەوتن بە ئومێدی (سەرکەوتن)و شارەزایی زانای پایە بەرز (تۆفیق وەهبی بەگ) کە زۆر زۆر نزیك بووم لێیەوە نەك لە بەر ئەوەی تا دوا ساڵی خوێندنم لە ماڵ و کتێبخانەکەیدا تەواو کردو دانیشتن و گفتوگۆو ئاگاداری کارەکانی کە بە یەکێك لە مامۆستا بەرزەکانی خۆمی دادەنێم و ئەوەندەی تر ئاگری عەشقی (پیرەمەگروون) و (بابەگورگور)ی خۆشتر دەکرد لە دەروندا، کە شارەزاییەکی باشیشی هەبوو دەربارەی (یانەی سەرکەوتن)و لەگەڵ دەوریشیدا لە پشگیری کردم و ئامادەبوون بۆ وتنەوەی دەرسی کوردی و هەر ئەو ئومیدەشی هەبوو کە (یانە) زیندوو بکرێتەوەو دەرسی کوردیەکەشی بەو ئومێدەوە زیندوو ببێتەوەو بکرێت بە کۆرێك بۆ رۆشنبیریو رۆشنبیران سەرم کرد بە یانە داو چاوم گیرا پێداو سەردانم بوو بە چەند جارو هەواڵ

پرسی‌و کۆکردنـەوەی هەنـدێك مـەعلومات دەربـارەی خـۆی و بەڕیوەبـەرانی خـۆی و گۆڤـاری (هیوا)ی تازە هەڵهاتوو، ئینجا کەوتە کۆکردنەوە ئەم و ئـەوو بـانـگ کردنیـان و ئاگـادارکردنی ئەو گەنجە تینووە خوێن گەرمانەی کەئەوسا زۆر بەیان قوتانیانی دانشگاکان بوون) قسەو باسم بۆ کردن و ڕای خۆمیانم پیشاندا دەربارەی زیندوو کردنەوەی (یانـە) و ئاواتەکانمانـەو گەشـەدان بە گۆڤاری (هیوا) و بیرو زمـان یـەك خـت، کێـشیانە پەسـەندیان کـردوم چ ڕوو بـەڕوو چ لـە ڕێگەی ئەوانەوەی هەواڵیان دەگەیاند بە قوتابیانی تری خـاوەن هەسـتی نیـشتمانی و دەروونـی تینوو، ئینجا خەبەرمان گەیاند بە (بە کاربەدەستان و بەڕێوەبەرانی) هەردوو (یانە) و (هیـوا) بۆ تەرخان کردنی ڕۆژێك بۆ کۆبوونەوەی هەرزوو لامان، بە گەرمییـەوە پێـشوازیی داواکـەمان کرا بە تایبەتی کاك ڕەشید عارف و کاك حافز مستەفا قازی، کە بوو بەبرای گیانی بەگیانیم و لەگەڵ مامۆستاو مامی بەرێزم خوالێخۆشبوو (کەریم زانـستی) ی دڵـسۆزو دڵ بـە جۆشـکەنەك هەروەك جگەر گۆشەی خۆی‌و بەس، بەڵکو هیوای خۆشیان کرد بە بەرمداو باوەشـیان بـۆ ئـەو هیوایە کردەوە.

ڕۆژی کۆبوونەوە (میهرجانێك) بوو بۆ خۆی زۆری تر ها تبووەو خۆزگە دەهاتنـەوە یـادم، هەموو وەڵامی (بانگی نەسرین)یان دایەوە و بە پەرۆشیش بوون بۆ ڕووبەڕوو بوونـەوە لـە گـەڵ مەبەست و بینینیداو، دەریان خست کە هەموویان ئامـادەن بـۆ ئـەوەی باشـتر بـزانن، کـە بـۆ کۆکراونەتەوەو داوامان چییە... بێگومان یەکەم قسەکەر من بووم، کە خـۆم خـاوەن بڕیارەکـە بووم و ئاگادارم و هەروەها لەسـەر داوای هـەموانیش، دەنگـی خـۆم و ئـەوان بـووم، هێرشـی گەنجێکی تازە هەڵکەوتووی دەروون ئـاگراویم بـردە سـەریان،یەکەم بـۆ سـەر{یانـە}بـێ لانـەی هەتیووەکە، دوو بۆ دانانی پرۆگرامێك بـۆ ئـەم گۆڤـارە نۆبەرەیـە ـ لەوانـە زینـدوو کردنـەوەی گەلاوێژێکی تازە لە هیوادا و پڕ بە پێـستی خـۆی بێـت، چـەپڵەی بەگـەرمی و تیـشکی ڕووی دانیشتوان تێکەڵ بەیەك بوو، ئینجا ئەوەی قسەی تری هەبوو یان پرسیار پـڕ بـە دڵ ئامـادەیی خۆیان پیشان دا ئیتر پاش پیرۆزبایی، بەگـەرمی دەسـتیان دەکوشـیم و خۆیـان دەناسـاند پـێم، لەوانە کۆچ کردووی لە ناوەخت کاك دکتۆر کامل بەسیر و لـە ئامـادەبووان بـرای خۆشەویـستم دکتۆر زۆزك ڕواندوزی ـ برای منداڵی و گەورەییم ئینجا خەریك بوون هەستی داواکردنم دەرگـا پێوە بدرێت و پاك کۆبکرێتەوە بۆئەم کارەو داوی ئەوەش لەگەڵ کاك حـافز و مامۆسـتا کـەریم زانستی و کەسانی تر بەناو{یانە}و ژوورەکانیدا گەڕام و دوای پاکردنەوەو ڕێـك خـستنم کـرد،

لەگەڵ ئامادەکردنی جەند ژوورێك بۆ قوتابییە کوردە هەژارە بێ شوێن و بێ دەرامەتەکان وە ڕێك خستنی کتێبخانەیەکی کوردی وکوردی گۆتنەوە بە کوردو عەرەب، لە پاڵ {محضرات }ی ڕۆشنبیری زانستی پێویست. ئینجا لەگەڵ ماموستا کەریم زانستی بۆ ماوەیەك. چەندان ڕۆژ، ژووری گۆڤاری هیوامان هەڵرژاندو هەڵتەکاند و ژوورو گۆڤار و کاغەزو کتێبی بەسەریەکدا کەوتوومان هەموویان پاك ڕێك خستنەوە سەر لەنوێ، ئینجا پرۆگرام نەخش کرا هەر لە پرۆپاگەندەوە بۆ گۆڤارەکە و هاندانی خاوەن خامەو تازە هەڵکەوتووەکان ـ لەگەڵ بلاوکردنەوی کورتە نووسینی یان شیعر بە شێوەی ژووروو بۆ موتوربەدانی گۆڤارەکە و لێکدانەوەی وشەکانی بە وشە هاوواتاکانی شێوەی خواروو، وەك دەرگا کردنەوەیەك بەرەو زمانی ئەدەبی یەکگرتوو و نزیك بوونەوە لە شێوەی یەکتری، ئەمەیش کراو ئیتر وەك سەربازێکی نهێنی کەوتمە کارکردن و کارم دەکرد. لە یەکەم ژمارەی{هیوا }دا {لای لایەی دایکێك}م بلاوکردەوە، کە نیشتیمانی یە، هەروەها لەژمارە {١١} یازدەی هەمان سالی یەکەمیشدا و لە مانگی جۆزەردان ـ مایس ـ ئایار ـ و لە لاپەڕە {٣٣} شیعرێکی پڕ لە هەستی نیشتیمانی}م پێشکەش کرا لە لایەن {ع.ق}خالقی لە ژێر ناونیشانی: پێشکەش بەتۆیە نەسرین}، لەگەڵ نووسینی تر، یان پێشکەش کردنی کتێب هەر لە مام و مامۆستام {تۆفیق وەهبی بەگ}و {ڕەفیق حیلمی}تا ـ دلزارو هەژارو{مامۆستام صفاء خلوصی و سنووری مەلا مارف }وەك بزانم: هەربژی نەسرین کچی کاکە حەمە.

چونکە نووسینی کوردیم لەڕۆژنامەی {ژین}یشدا بلاودەکردەوە لە پاڵ نووسینی عەرەبی لە ڕۆژنامەو گۆڤاری عەرەبیدا، لەو نوسینانەش وەرگێڕانی شیعری نیشتیمانی کوردی بۆ زمانی عەرەبی.

کەوتینە خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردن دەستەیەکی نوێ بۆ هەڵبژاردنی {یانە}دوای شۆڕشی چواردەی{گەلاوێژ ـ تەمووز}و چەند لایەن پەیدا بوو، لایەنێك زیاتر دەیان ویست ڕام کێشن بەلای خۆیاندا، زۆریان هەوڵ دا لەگەڵمدا بەهەموو جۆرێك، دواجار بەوە هەڕەشەیان لێ کردم، کە ناچار یەکێك پەیدا بکەن ئەگەر بە دروست کردنیش بێت لە جیاتی تۆ}، کردیان، ڕۆژی هەڵبژاردن بە{پیکاب}خەڵکیان هێنا بۆ ئەو هەڵبژاردنە ـ من خۆم کێشایەوە ـ چونکە {عفریتیش بم هی ناو قومقوم نیم }ئاسکە کێویی شاخ ودەشت و دەری بێ پایانی نیشتیمانم}، بەلام بەردەوام لە نووسین و کارکردن لە هیوادا، هەندێك بەکردەوە دەیان ویست

دوورم خەنەوە ـ نەیان توانی ـ کە ساڵی {١٩٦٠}یش چووم بۆ دەرەوە بۆ خوێندنی باڵا هەر بەردەوام بووم لە بلاوکردنەوە، پاش بوونیشی بە گۆڤاری {روناهی}، کە کاك حافز قازی کچە تاقانەکەی بەوناوە ناو نا، واتا لێرە لە دەریشەوە هەر لەو گۆڤارە نەپچڕاوم و هەر لەگەڵیدا بووم، تا ئەستێرەی وێڵ بوو پاش {٢٨}بیست و هەشت ژمارە.

د. نەسرین فەخری

١٩٩٧\٣\٣

وێنەی دیمەنێك لە هەڵبژاردنی یانەی سەرکەوتن - ١٩٥٩ ئەوانەی لە وێنەکەدا دیارن (لەڕاستەوە بۆ چەپ): (مصطفی سلیمان، د. عزالدین مستەفا ڕەسووڵ، دکتۆر مەحموود عوسمان، جەمیل دزەیی، بەشیر موشیر، شوکت عزیز)

دیمەنێك لە کۆبوونەوەی خوێندکارانی کورد لەبەردەم یانەی سەرکەوتن

لیستی ژمارەی لاپەڕەو ژمارەی ئەو بابەتە ئەدەبیانەی لە گۆڤارەکەدا بلاّوکراوەتەوە

| ژمارە | لاپەڕە | هۆنراوە | چیرۆک | وتار |
|---|---|---|---|---|
| ژ١، س١ | ٨٠ | ٣ | ١ | ١١ |
| ژ٢، س١ | ٨٠ | ٢ | ٣ | ٨ |
| ژ٣، س١ | ٨٨ | ٨ | ٢ | ٨ |
| ژ٤، س١ | ٨٤ | ٧ | ٢ | ١١ |
| ژ٥، س١ | ٨٠ | ٣ | ٤ | ٧ |
| ژ٦، س١ | ٩٦ | ٧ | ٣ | ٩ |
| ژ٧، س١ | ٩٦ | ٦ | ٣ | ١٣ |
| ژ٨، س١ | ٩٦ | ٧ | ١ | ١٠ |
| ژ٩، س١ | ١٠٤ | ٩ | ٤ | ١١ |
| ژ١٠، س١ | ٩٦ | ٦ | ١ | ١٢ |
| ژ١١، س١ | ٩٦ | ٩ | ١ | ١١ |
| ژ١٢، س١ | ٨٨ | ٣ | ٣ | ٤ |
| ژ١، س٢ | ١٠٥ | ٤ | ١ | ٥ |
| ژ٢، س٢ | ١٠٤ | ٧ | ٢ | ٩ |
| ژ٣، س٢ | ٩٦ | ٥ | - | ٩ |
| ژ٤، س٢ | ٩٦ | ٥ | ٢ | ١١ |
| ژ٥، س٢ | ٩٦ | ٣ | - | ٧ |
| ژ(٦، ٧)، س٢ | ١٤٤ | ٥ | ٤ | ١٠ |

| ژ٨، س٢ | ٨٤ | ٢ | ٢ | ٦ |
|---|---|---|---|---|
| ژ(٩، ١٠)، س٢ | ٩٠ | ٤ | ١ | ٧ |
| ژ(١١، ١٢)، س٢ | ١٣٦ | ١٣ | ٢ | ١٠ |
| ژ١، س٣ | ١٠٨ | ٥ | ٢ | ٧ |
| ژ(٢، ٣)، س٣ | ١١٦ | ٥ | ٣ | ٥ |
| ژ٤، س٣ | ١٠٠ | ٨ | ٢ | ٩ |
| ژ٥، س٣ | ٨٤ | ٤ | ٢ | ٣ |
| ژ٣٠، س٤ | ١١٤ | ٧ | ٢ | ٨ |
| ژ٣١، س٤ | ٨٦ | ٣ | ٢ | ١١ |
| ژ٣٢، س٤ | ٨٠ | ٣ | --- | ١٠ |
| ژ٣٣، س٤ | ١٠٠ | ٥ | ٥ | ١٤ |
| ژ٣٤، س٤ | ٨٠ | ٢ | ٢ | ١٢ |
| ژ٣٥، س٥ | ٢٠ | ١٤ | --- | --- |
| ژ٣٦، س٦ | ٤٠ | ٣ | ١ | ٦ |
| ژ٣٧، س٦ | ٢٤ | ٢ | ٢ | ٢ |
| ژ٣٨، س٦ | ١٨ | ٣ | --- | ١ |
| کۆی گشتی | ٣٠٠٥ | ١٨٥ | ٦٥ | ٢٧٧ |

## بیبلۆگرافیای گۆڤاری هیوا

**وتەیەك:**

ئەم بیبلۆگرافیایە بە پێی ژمارەکانی گۆڤارەکە ئامادەکراوە، نەوەك بە پێی ڕیزکردنی بابەت و ناوی نووسەرانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، توانا دەستنیشانی ژانرە ئەدەبییەکەش کراوە لە کاتی ئامادەکردنی بیبلۆگرافیاکەدا، وام بە باش زانی، ناوی نوسەری بابەتەکان وەك خۆی بنوسمەوە، ئەگەر بەناوی خوازراویش بێت، هەروەك خۆی بینووسمەوە، بەڵام لە کۆتاییدا هەوڵمداوە ئەوەندەی زانیارییم هەبێ ناوە خوازراوەکانم دەست نیشان کردووە. هەروەها ئامارێکمان بۆ ژمارەی لاپەڕەو هۆنراوەو چیرۆك و وتار وەك سێ هونەری سەرەکی ئەدەبی ئەنجامدراوە، کە بێگومان بۆ کاروباری زانستی و لێکۆڵینەوە کارەکە ئاسانترو مەیسەرتر دەکات.

**هەندێ زانیاری پێویست**

١. گۆڤاری هیوا لە ڕووی قەوارەو، درێژییەکەی (٥١ر٢١سم) و پانیەکەی (٥ر١٤سم)ە، درێژی هەر دێرێك (١٠سم)ە و لە هەر لاپەڕەیەك دا (٢٢) دێر نووسراوە و هەندێ جاریش دەگاتە (٢٥) دێریش، بە پێی گۆڕانی چاپخانەکان.

٢. بە دەگمەن خۆشنووسی تیا بەکارهاتووە و زیاتر پشتیان بە خەتی چاپخانە بەستووە

٣. لە ژمارەی یەکەوە تا ژمارەی نۆ، هەر جارەی وێنەی شارو شارۆچکەیەکی کوردستانی لە بەرگی پێشەوەدا بڵاوکردوّتەوە. لە ژمارەی (نۆ) وە کلێشەیەکی جێگیری وەرگرتووە، ئەویش ڕیزە شاخێك و خۆر بە گەورەیی لە پشت چیاکانەوە هەڵاتووەو لە ناوەڕاستی شاخەکانەوە وەك ڕێگایەکی پێچاوپێچ گۆڤاری هیوا هاتۆتە خوارەوە تا دەگاتە کچێك کە مۆمێکی لای خۆی داناوە و ئەو ناوەی ڕووناك کردۆتەوەو لە پاڵیەوە دوو کەس کوڕو کچێك بە جلی کوردییەوە دەست بۆ خۆرو شاخەکان درێژ دەکەن و لە سەرووی شاخەکانەوە بە گەورەیی بە خەتێکی فارسی نووسراوە (هیوا)و لە سەرووی خۆرەکەشەوە بە پیتی لاتینی (HIWA) نووسراوە.

٤. هەندێ لەو نازناوانەی کە نووسەران نووسینیان پێ بڵاوکردوّتەوە، بە هەوڵ و کۆششی خۆمان ئەوانەمان ئاشکراکرد:

- ب= بله (ئیبراهیم ئەحمەد)

- پشکۆ= شەهید مارف بەرزنجی

- ت. ب. مەریوانی= تاهیر بەهجەت مەریوانی

- ج بابان= جەمال بابان

- ج غەمگین= جەوهەر غەمگین

- ڕووناك مەحەمەد= کاکەی فەللاح

- س. ش= سەعید شەفیق

- ع میدیا= عەبدوڵڵا میدیا

- ف. ع. ك= فاتح عەبدولکەریم

- وەرزێر= د. محەمەد نووری عارف

- هۆشەنگ= حەمە بۆر

- هێمن= کامل ژیر

٥- لە ناوەوەی بەرگی یەکەمی گۆڤارەکەدا ناونیشانی گۆڤارەکەو ئابونەی ساڵانە بەم شێوەیە نووسراوە:

ناونیشانی هیوا / بەغداد: شەقامی زەهاوی، یانەی سەرکەوتن، تەلەفۆن ٢٨٤٠٥

ئابوونە:

| | فلس | دینار |
|---|---|---|
| ئابوونە بۆدەرەوەی عێراق | ٢٥٠ | ١ |
| ئابوونەی ساڵێکی لە عێراق دا | ... | ١ |
| بۆ قوتابی | ٧٥٠ | - |
| دانەی بە | ١٠٠ | - |

٦- لە ڕووی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە، ئەم بابەتانەی تێدا بەرچاو دەکەوێت:

وتاری ڕۆژنامەوانیی، هەواڵ، ئاگاداری، ڕیپۆرتاژ، چاوپێکەوتن، وێنە.

باسکردنی ئەم هونەرانەیش ئەوە دەهێنێ کتێبێکی سەربەخۆی دەربارە بنووسرێ.

**ژ۱، س۱، تەمموزی ۱۹۵۷:**

- پێشەکی، ل۱
- وشەیەك، ل۳
- ئەستێرەیەکی نوێ لە ئاسۆی وێژەی کورددا، مامۆستا ع، (وتار)، ل٦٤
- رێگای کامەرانی، شاکر فەتاح، (وتار)، ل٦—١٥
- زمانی کوردی، عبدالقادر قەزاز، (وتار)، ل١٥—١٩
- بەهاری کوردستان، (هۆنراوە)، ل١٩—٢٥
- نیازێك، پێناو، (هۆنراوە)، ل٢٥—٢٧
- لای لایەی دایکێ، نەسرین فەخری، (هۆنراوە)، ل٢٧—٣١
- تێکۆشین، (وتار)، ل٣١—٣٧
- چیرۆکی ژمارە، سۆمەرست مۆم، ل٣٧—٣١
- هەموو گیانلەبەرێك خواردەمەنی خۆی هەیە، غاندی، وەرگێڕانی شێخ حەسەن،(وتار)، ل٤٥—٥٢
- سووتانەوەی پەردەی مێشك، دوکتۆر عبدالرحمن عەبدوالله، (وتار) ل٥٢—٥٦
- چەوەندەری شەکرو مێژووی دەرهێنانی،جەمال عبدالکریم فواد، (وتار) ل٥٦—٦٠
- کۆنفۆسیۆش، فازل، (وتار) ل٦٠—٦٨.
- ئەتۆم و هێزی ئەتۆم، وردی،(وتار)، ل٦٨—٧٢.
- بیر لە تۆڵەسەندن مەکەرەوە، (وتار)، ل ٧٢—٧٥.
- گەشتی مستر ریچ بە کوردستانا، وەرگێڕی شەمال صائب، (وتار)، ل٧٥—٧٩

**ژ٢، س١، س١، ئابی ١٩٥٧:**

- فرمێسکێکی صلاح الدین وەرگێڕانی محمد مستەفا کوردی، (وتار)، ل٣— ١٢
- سێ مێروولە، نووسینی جبران خلیل جبران، (چیرۆك)، ل١٢-١٤
- دینەوەریەکان، جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، (وتار)، ل١٤— ١٩
- زمان و شێوەکانی، ش. م، (وتار)، ل١٩—٢٤.
- فرمێسکی پەشیمانی، مستەفا صالح کریم، (چیرۆك)، ل٢٤—٣١

- ئاموژگاری بۆ گۆڤاری هیوا، هەوری، (هۆنراوە)، ل٣١-٣٣
- لاوی کورد، دڵزار، (هۆنراوە)، ل٣٣—٣٤
- ژیانی خێزانی، (وتار)، ل٣٩—٤٣
- بیرۆن، (ژیاننامە)، ل٤٣
- ڕێگای سەرکەوتن، شاکر فەتاح،(وتار)، ل٤٤—٥١
- ڕووناك مەحەمەد، کامل ژیر، (لێکۆڵینەوە)، ل٥١—٥٩
- بەشی تەندروستی، دوکتۆر نامق نادر، (وتار)، ل٥٩—٦٣
- دوژمنی گەنم و جۆ جانەوەری (سن)، عوسمان ڕەزا علی،(وتار)، ل٦٣—٦٩
- فەرهەنگی هیوا، ل٦٩
- ڕۆژی گواستنەوەی بووکێ، وەرگێڕی مامۆستا ع، (چیرۆك)، ل٧٠- ٧٩

**ژ٣، س١، ئەیلولی ١٩٥٧:**

- ئاکرێ، شاکر فەتاح، (وتار)، ل٥—٧
- کریم خانی زەند، (وتار)، ل٧—١٠
- چۆن چارەی دەردی کۆمەلایەتیمان بکەین، عبدالقادر قەزاز، (وتار)، ل١٠-١٥
- زمانی کوردی، فازل، (وتار) ل١٥—٢١
- ئاخ هەژاری، خوشکە (پ)، (وتار)، ل٢١—٢٤
- مەولەوی، (هۆنراوە)، ل٢٤
- بۆ جوانێکی دیل، کامل ژیر، (هۆنراوە)، ل٢٥— ٢٩
- کاروان، ع. ق، (هۆنراوە) ل٢٩
- جوانی، (هۆنراوە)، ل٣٠—٣٢
- ناکامی، شێرکۆ بێ کەس، (هۆنراوە)، ل٣٢—٣٤
- دەنگی شمشاڵ، غ. س، غەمبار، (هۆنراوە)، ل٣٤—٣٥
- بەستە بۆ مۆسیقا، غ. س، غەمبار، (هۆنراوە)، ل٣٩—٤٦
- ئاواز، غ. س غەمبار، (هۆنراوە)، ل٣٨
- نموونەی کوردی پەتی، محمد مستەفا کوردی، (وتار)، ل٣٩—٤٦

- سەربەستی ئافرەت، کامەران، (وتار)، ل٤٦—٥٣
- بریا نەهاتیتاوە، مستەفا صالح کریم (چیرۆك)، ل٧٤—٨٦
- ژمارە دووی "هیوا" لە تای تەرازووا،س، (ڕەخنە)، ل٦٢—٦٨
- قەڵەوی، دکتۆر قادر شاڵی، (وتار)، ل٦٩—٧٢
- هیواو خوێندەواری، ل٧٢—٧٤
- دڵسۆزی نەمر، مامۆستا، ع، (چیرۆك)، ل٧٤—٨٦
- بۆ پۆکەنین، ل٨٦—٨٨

**ژمارە ٤، س١، تشرینی یەکەمی ١٩٥٧:**

- مێژووی شاری کەرکوك، (وتار)، ل٤—٦
- جێگای میری گەورەی ڕەواندز، محمود محمد، (وتار)، ل٦—١٠
- چۆن زمانەکەمان بنووسین، ب، (وتار)، ل١٠—١٧
- وتەی بەجێ، ل١٧
- دینەوەریەکان، جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، (وتار)، ل١٨—٢٥
- وردبونەوەیەك لە خوێندنی شعرو ئەدەبی کوردی، وەرگێڕانی هۆمەر مستۆی، (وتار)، ل٢٥—٢٩
- بیرەوەری کاك (جەلال) ی یەك ماڵە، ئەحمەد خواجە، (وتار)، ل٢٩—٣٢
- جوانی، شاکر فتاح، (وتار)، ل٣٢—٣٦
- شێرپەنجە، وریا ئەمین ڕەواندزی، (وتار)، ل٣٦—٤٣
- نالی، (هۆنراوە)، ل٤٣
- ئەی کامەرانی، م. شاربازێڕی، (هۆنراوە)، ل٤٤—٤٥
- ئۆپەرێتی وەرزی ساڵ، أ. ب. هەوری، (هۆنراوە)، ل٤٥—٥١
- من و شەهێن، ڕووناك ڕەئووف، (هۆنراوە)، ل٥١—٥٢
- یەکێتی و زانستی، دڵدار، (هۆنراوە)، ل٥٢—٥٣
- تەپڵ و دیلان، هۆنراوە، ل٥٣—٥٥
- ئەی سروشت، ج. غەمگین، (هۆنراوە). ل٥٥—٥٦

- نموونەی کوردی پەتی، محمد مستەفا کوردی، (چیرۆك)، ل٥٧—٦٠

- سەربەستی ئافرەت، کامەران، (وتار)، ل٦٠—٦٥

- مەلا عبدواللەی بیتۆشی، (ژیاننامە)، ل٦٥

- گۆتە زاناو شاعیری نەمر، محمد نوری تۆفیق، (وتار)، ل٦٦—٧٠

- لۆکە (پەمۆ)، عوسمان ڕەزا علی، (وتار)، ل٧٠—٧٤

- بەشی هیواو خوێندەوارانی، ل٧٤—٧٦

- لێکۆڵینەوە، ل٧٦—٧٨

- پەنجا فلس، مەم،(چیرۆك)، ل٧٨—٨٤

**ژ٥، س١، تشرینی دووەمی ١٩٥٧:**

- لافاو، کامەران، (هۆنراوە)، ل٦—١٤

- لافاوی مەرگ، خالد ڕشید (زێوەر)، (هۆنراوە)، ل١٤—١٩

- لافاو، کامل ژیر، (هۆنراوە)، ل١٩—٢٥

- مێژووی ژیانی کاملی جوانەمەرگ، ل٢٥-٢٧

- کوچی دوایی، کمال غفوری، (ژیاننامە)، ل٢٨—٣٠

- بەهۆی لافاوەکەی سلێمانیەوە، عبدالقادر قەزاز، (وتار)، ل٣٠-٣٣

- حقوقی ئافرەت، کچە کورد پرشنگ، (وتار)، ل٣٣—٣٦

- هەستی ئافرەت بەرامبەر ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکان، خوشکە، پ، (وتار)، ل٣٦-٣٩

- هەڵگرتنی یاسای "دەعوای عەشائری"، نوری تالەبانی، (وتار)، ل٣٩—٤٢

- جۆرەکانی خوێنی مرۆڤ، فوئاد زەکی هەناری، (وتار)، ل٤٢—٤٧

- گیا لەسەر بنکی خۆی ئەڕوێت، محمد مستەفا کوردی، (چیرۆك)،ل ٤٧-٥٢

- شارە پیرۆزەکە، جەبران خلیل جەبران، (چیرۆك)، ل٥٢— ٥٥

- کوا کوڕەکەم، مستەفا صالح کریم، (چیرۆك)، ل٥٥—٦٠

- دانتی، دوکتۆر ت. ب. مەریوانی، (وتار)، ل٦٠—٦٢

- بەشی هیواو خوێندەواری، ل٦٢—٦٤

- کارەساتە ستەمەکە، ع. شەمال، (چیرۆك)، ل٦٤— ٦٧

- لافاو، ماموٚستا ع. (چیروٚك)، ل٦٧— ٧٨
- له میٚژووی عوسمانیدا جەلالی لی، وەرگیٚڕانی احمد خواجه،(وتار)، ل٧٨—٨٠

**ژ ٦، س١ كانونی یەكەمی ١٩٥٧:**

- میٚژووی شاری هەولیٚر، ل٥—٨
- چوٚن زمانەكەمان بنووسین به پیتی عەرەبی یا لاتینی، ب. (وتار)، ل٢٠—٣١
- شەڕو ئاشتی، شاكر فتاح، (وتار)، ل٢٠—٣١
- دینەوەریەكان، جەمیل بەندی ڕوٚژبەیانی، (وتار)، ل٣١—٣٧
- ئامان الله خانی والی، محمد امین — كاردوٚخی-، (ژیاننامه)، ل٣٧— ٤٠
- بوٚ ماموٚستایانی قوتابخانه سەرەتاییەكان، میدیا، (وتار)، ل٤٠—٤٤
- شاعری مەزن ئەحمەد موختار بەگ جاف، ل٤٤—٤٦
- كاروان، غ. س. غەمبار، (هوٚنراوه)، ل٤٦
- بەندەك د گەل (شەتی بەغدا)، صالح یوسفی،(هوٚنراوه)، ل٤٧—٤٩
- هەزار ئەفسوس، پیٚناو، (هوٚنراوه)، ل٥٠—٥١
- گولاٚله، ژیر، (هوٚنراوه)، ل٥١—٥٣
- پوختەكردنی نەفس، عبدالقادر قەزاز، (وتار)، ل٥٣— ٥٧
- گولیك، جبران خلیل جبران، وەرگیٚر دلزار، (هوٚنراوه)، ل٥٧
- زانستی كوردان، (بیرەوەری)، ل٥٨— ٦٠
- نموونەی كوردی پەتی، محمد مستەفا كوردی، (چیروٚك)، ل٦٠— ٦٥
- بەشی هیواو خویٚندەواری، ل٦٥—٦٧
- بوٚ كلاٚو كوڕە، وەرگیٚڕانی بیمار، (هوٚنراوه) ل٦٧—٦٩
- نیشتمان، وەرگیٚڕانی بیمار، (هوٚنراوه)، ل٦٩—٧٢
- له پیٚناوی بوژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتیماندا، بەختیار، (وتار)، ل٧٢—٧٦
- له كەركوكەوه داواكردنی ڕوٚژنامەكه به زمانی كوردی بلاٚوبكریٚتەوه، حەمە غەریب تالەبانی، (وتار)، ل٧٦
- ڕاپەڕینی ئاسیا، وەرگیٚڕانی محمد سەعید جاف، (وتار)، ل٨٠—٨٢

- قینی.....لێم بوو، مەم، (چیرۆك)، ل٨٢–٩٢

- پاشماوەی جەلالی، ئەحمەد خواجە، (وتار)، ل٩٤–٩٦

**ژ٧،،س١، كانوونی دووەمی ١٩٥٨:**

- مێژووی كۆیە، تاهر محمد حەوێزی، (وتار)، ل٥–٧.

- بەدرخان پاشا، حافز مستەفا قازی، (وتار)، ل٧–١١

- وێژە، شێخ محمدی خاڵ، (وتار)، ل١١–١٥

- بەرەو خوێندنەوەی، كچە كورد. پرشنگ، (وتار)، ل١٥–١٩

- نووسینی پیتی "دال" بە شێوەی سلێمانی، فواد زەكی هەناری، (وتار)، ل١٩–٢٢

- نموونەی كوردی پەتی "نازداری"، محمد مستەفا كوردی،(وتار)، ل٢٢–٢٦

- شۆپان، وەرگێڕانی فاتح عبدالكریم، (وتار)، ل٢٦–٣٢

- هیوا، م. شاربازێڕی، (هۆنراوە)، ل ٣٤–٣٧

- بۆنی گوڵ، محمود زێوەر، (هۆنراوە)، ل٣٧–٣٨

- گوڵێك لە یادا، ئەژین گۆران،(هۆنراوە)، ل٣٨–٤٠

- دڵی من، پشكۆ، (هۆنراوە)، ل٤٠–٤٥

- دینەوەریەكان، جومیل بەندی ڕۆژبەیانی، (وتار)، ل ٤٥– ٤٧

- دڵداری غەمگین، گۆڕینی كمال غەمبار، (پەخشان) ل٤٧

- ئەبراهام لنكۆڵن، ف. نەگۆڕ،(ژیاننامە)، ل٤٨–٥٢

- پاشماوەی جەلالی، ئەحمەد خواجە (وتار)، ل٥٢–٥٤

- زەحیری، دكتۆر عبدالرحمن عبدالله،(وتار)، ل٥٤–٥٨

- لە زنجی هەژارانا، گۆڕینی ع. ر. پەرۆش، (چیرۆك)، ل٥٨–٦٦

- باری ئێستای ژنە شارییەكانمان، عبدالقادر قەزاز، (وتار)، ل٦٧–٧٢

- دەوری كشتوكاڵ، ئەكرەم جاف،(وتار)، ل٧٢–٧٥

- هۆمەر، ت.ب.مەریوانی،(ژیاننامە)، ل٧٥–٧٧

- لە شیعری خەیام، گۆڕینی سەلام، (هۆنراوە)، ل٧٧

- نۆبڵ كێ یە،محمد نوری تۆفیق،(وتار)، ل٨٠–٨٤

- هیواو خوێندەواری، ل٨٤—٨٦

- یانەی سەرکەوتنی کوردان، ل٨٦—٨٨

- کاروان،محمد سعید جاف، (چیرۆکی فۆلکلۆری)، ل٨٨—٩٣

- مانگ گیران، ساجدە ئاوارە، (چیرۆك)، ل٩٣—٩٦

**ژ٨، ،س١، شوباتی ١٩٥٨:**

- مێژووی شاری کفری، هاشم بەرزنجی، (وتار)، ل٥—٧

- ویژە، شێخ محمدی خاڵ، (وتار)، ل٧—٩

- نووسینی زمانی کوردی، م. م، (وتار)، ل٧—٩

- باغچەی پەرییان، مسعود کەتانی ئامێدی، (هۆنراوە)، ل١٥—١٧

- مانگی دەستکرد، عەزیز،(وتار)، ل١٧—٢٨

- زەنگ،هێمن،(هۆنراوە)، ل ٢٨—٣٠

- ژنیش هەیەو ژانیش هەیە، محمد مستەفا کوردی،(وتار)، ل٣٠—٣٤

- لۆرکا لاپەڕەیەکی خوێناوی لە مێژوو،کامەران وەریگێڕاوە،(وتار)، ل٣٤-٤٤

- پاراستنی دایك و منداڵ، کچە کورد: پرشنگ،(وتار)، ل٤٤—٤٨

- منم نەسرین، نەسرین فەخری،(هۆنراوە)،ل٤٨—٥٢

- ئافرەتی سك پڕ، انور کریم، (وتار)، ل٥٢—٥٦

- هەڵگری چرای زانستی، خواجە ئەفەندی، (بیرەوەری)، ل٥٦—٥٩

- پێش ئەوەی بمرین، کاکە شوان،(هۆنراوە)، ل٥٩—٦١

- ملە خڕێ، دکتۆر ت.ب. مەریوانی (وتار)، ل٦١—٦٢

- سەربەستی نووسەر، عبدالرزاق بیمار، (وتار)، ل٦٢—٦

- یادو پەیمان، کرمانج، (هۆنراوە)، ل ٦٦-٦٩

- مۆزارت، باکووری، (وتار)، ل٦٦—٦٩

- لە ڕێگای یەکبوونی زمانەکەمانا،سەرکەوت هۆشیار، (لێکۆڵینەوە)، ل٧٠—٧٣

- گیانی مەولەوی، (هۆنراوە)، ل٧٣—٧٥

- پایز، لامارتین، وەرگێری دلزار، (هۆنراوە)، ل٧٥—٧٧

- هیواو خوێندەوەرانی، ل٧٧—٧٩
- نامەیەك بۆ دڵسۆزانی کورد، ڕشید عارف، ل٧٩
- پاشماوەی کاروان، محمد سعید جاف، ل٨٠—٨٣
- پاشماوەی جەلالی، ئەحمەد خواجە، ل٨٣—٨٧
- ماچی خوێناوی، گۆڕینی مستەفا صالح کریم، (چیرۆك)، ل٨٧—٩٦

**ژ٩، س١، مارتی ١٩٥٨:**

- شاری ڕەواندز، صلاح، (وتار)، ل٥ — ٧
- فرمانی ئێستەمان، ب، (وتار)، ل٧—١٩
- بەرخەکە !؟، شاکر فەتاح، (پەخشان)، ل١٩—٢٢
- بەهار، شێخ محمدی خاڵ، (پەخشان)، ل٢٢—٢٤
- بەهار نامەویٚ،بیٚکەس، (هۆنراوە)، ل٢٤
- نەورۆز، کامەران، (هۆنراوە)، ل٢٥.
- قارەمانی میرنشینی بابان عبدالرحمن پاشا، خەسرەو، (وتار)، ل٢٦—٢٩
- ئەو نەتەوەیەی، م. ڕەسول، (هۆنراوە)، ل٢٩
- گۆڤارێکی تایبەتی بۆ ئافرەت، کچە کورد، پرشنگ، (وتار)، ل٣٠—٣٥
- نامەیەك بۆ جەمیلە، ك.ح. غەمبار، (هۆنراوە)، ل٣٥—٣٨
- جگەرە کێشان، فوئاد هەناری، (وتار)، ل٣٨—٤١
- بیرەوەری شاعیری مەزن مامۆستا زیوەر، ل٤١—٤٣
- یەکی خاکە لێوە، میدیا، (چیرۆك)، ل٤٣— ٤٨
- چارلی چاپلن، وەرزێر، (وتار)، ل٤٨—٥١
- تۆلستۆی، دکتۆر ت.ب. مەریوانی، (وتار)، ل٥١ —٥٣
- تەلەفۆن، ف.ع، (وتار)، ل٥٣—٥٥
- جەژنە پیرۆزەکەی کورد، نەورۆز، غ.س. غەمبار، (هۆنراوە)، ل٥٥—٥٧
- داپیرەکەم، مەم، (چیرۆك)، ل٥٧—٦٥
- لێکۆلینەوەیەك لە وتاری، (وێژە)ی مامۆستا خاڵ،م.م. (وتار)، ل٦٥—٧٢

- شەڕ، جبران خلیل جبران، وەرگێڕان، (چیرۆك)، ل٧٣—٧٥

- جەژنی دارو درەخت، شفیق صابر، (وتار)، ل٧٥—٨٠

- کوردم، عوسمان عەوێزی، (هۆنراوە)، ل٨١— ٨٢

- نەورۆزی نوێ، أ.ب. هەوری، (هۆنراوە)، ل٨٢— ٨٥

- ئەختەر کێیە ؟، نزار، (بیرەوەری)، ل٨٦—٨٨

- کەلاهە بلیری، صالح یوسفی، (هۆنراوە)، ل٨٩—٩٢

- نامەی باوکێکی دڵسۆز، ن. تالەبانی، (وتار)، ل٩٢—٩٥

- هیواو خوێندەوارانی، ل٩٥—٩٦

- نەورۆزو جەژنی ڕزگاری کورد، کاکە شوان، (هۆنراوە)، ل٩٧

- کولوشا، مەکسیم گۆرکی، وەرگێرانی جەلال پەرێشان، (چیرۆك)، ل٩٩—١٠٤

**ژ١٠، س١، نیسان ١٩٥٨:**

- براینە جەژنتان پیرۆزبێت، (سەروتار)، ل٤

- خورماڵ، ڕشید هەورامی، (وتار)، ل٥—٨

- چۆن زمانەکەمان بنووسین، جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی، (وتار)، ل٨—١٢

- ئاهەنگی کۆەڵی ئاواز، (ڕیپۆرتاژ)، ل١٢—١٧

- بەهار، محمد شکر خلیفە، (پەخشا)، ل١٧—١٩

- کە گیران، احمد خواجە، (وتار)، ل١٩—٢٣.

- بۆ گیانی پاکی سەید عەلی ئەسغەر، محمد ملا کریم، (هۆنراوە)، ل٢٣—٢٦

- نۆبەرەی دای خەباتمان، ڕوناك، (وتار)، ل٢٦—٣١

- ژنیش هەیەو ژانیش هەیە، محمد مستەفا کوردی، (وتار)، ل٣١—٣٥

- بەهاری ژین، خالد دلێر، (هۆنراوە)، ل٣٥—٣٩

- مردووان، م.ع. جاف، (پەخشان، ل٣٩—٤٤

- لە خەوما، وەهاب کۆیی، (هۆنراوە)، ل٤٤—٤٦

- هیوا، شێخ محمد خاڵ، (وتار)، ل٤٦—٤٩

- چۆن پارێزگاری دەم ودانت دەکەی، دکتۆر احمد علی عوسمان، (وتار)، ل٤٩—٥٣

- هەندێ دەردی کۆمەڵایەتی کە تەگەرەیان داوە لە پێشکەوتنمان، (وتار)، ل٥٣—٥٧
- ڕەخنەو ڕەخنەگر، أ.ب.هەوری، (ڕەخنە)، ل٥٧—٦١
- هێزی برسێتی، ساجد ئاوارە، (چیرۆك)، ل٦١—٦٩
- لای لایەی دایکی نیشتمان، کرێکار، (هۆتراوە)، ل٦٩—٧١
- برایم پاشای بابان بنیات نەری شاری سلێمانی، ج. بابان، (وتار)، ل٧١—٧٥
- کوێستانەکانمان، هۆشەنگ، (هۆتراوە)، ل٧٥—٧٨
- بیتهۆڤن، کمال غفوری، (وتار)، ل٧٨—٨٢
- تیشکی چرایەك، کامەران، (هۆتراوە)، ل٨٢—٨٦
- مەرەزە، بێستون عوسمان، (وتار)، ل٨٦—٨٨
- پاشماوەی چۆن زمانەکەمان بنووسین، ل٨٩—٩٦

**ژ١١، س١، مایس ١٩٥٨:**

- شەقلاوە بوکی خێزانێکی هەژارە، (وتار)، ل٤—٧
- حاجی مەلا عبداللە جلیل، کریم شارەزا، (بیرەوری)، ل٧—١٠
- کۆچی (حەسەن توفیق)ی جوانەمەرگ، ل١١—١٣
- مندالی کورد، عزالدین ابراهیم، (وتار)، ل١٣—١٧
- کارگەی چیمەنتۆ، عەزیز، (وتار)، ل١٧—٢٥
- بەستە بۆ کوردستان، کاکە شوان، (هۆتراوە، ل٢٥—٢٩
- لە دەوروبەری دانی مافی سیاسی ئافراتانا، ڕووناك، (وتار)، ل٢٩—٣٣
- شوێنی کۆمەلایەتی ژن لە کوردستانا، وەرگێڕ، ج. بابان، (وتار)، ل٣٦—٤٠
- ئۆپەرێتی خوشك و برایەك، ج. دانا، (هۆتراوە)، ل٤٠—٤٢
- نەورۆز لە لەندەن— ئینگلستان، (ڕیپۆرتاژ)، ل٤٢—٤٤
- قرچە قرچا ئاگرێت گەش، صالح یوسفی، (هۆتراوە)، ل٤٥—٤٩
- شتی تازەی دۆزراوەی پزیشکی، (وتار)، ل٤٩—٥١
- کوڕی ڕۆژ، جەلال جۆبار، (هۆتراوە) ل٥٢—٥٤
- کولۆلی، محمد مستەفا کوردی، (وتار)، ل٥٤—٥٨

- هەڵبەستی مرواری، وەرگێڕانی وردی، (هۆنراوە)، ل٥٨—٦١
- قومار، حافز مستەفا قازی، (وتار)، ل٦١—٦٣
- لافی دڵداری، نەسرەو وەریگێڕاوە، (هۆنراوە)، ل٦٣—٦٥
- ئاهەنگەکانی کۆمەڵی ئاوازی کوردی، فازل، (ڕیپۆرتاژ)، ل٦٥—٧٠
- گفتوگۆی خوێندەوارو دارفرۆش،محمد امین کاردۆخی، (هۆنراوە)، ل٧٠—٧٩
- سیمفۆنی پێنجەمی "بیتهۆڤن"، سەردار ڕەمزی، (وتار)، ل٧٦—٧٩
- لاوی جوانە مەرگ، هێمن، (هۆنراوە)، ل٧٩—٨١
- وەناق، دکتۆر ت. ب. مەریوانی ، (وتار)، ل٨١— ٨٥
- بەشی دەستکرد، مەسعود سید أمین، (وتار)، ل٨٥—٨٧
- بەشی هیواو خوێندەوارانی، ل٨٧—٨٩
- دایکی ئازادی خواهان، وەرگێڕی مستەفا صالح کریم، (چیرۆك)، ل٨٩—٩٦

**ژ١٢، س١، حوزەیران ١٩٥٨:**

- سالێك لە تەمەنی هیوا، حافز مستەفا قازی، (سەروتار)،ل١—٣
- ئامانجی من، هێمن، (هۆنراوە)، ل٣
- پایەیی ئادەمیزادو باری ئێستای ژیانی نەتەوەی کورد، م.م،(وتار)، ل٤—٩
- کارخواز، وەرگێڕی محمد صدیق عارف، (چیرۆك)، ل٩—١٨
- بام وابێ، مەدهۆش، (هۆنراوە)، ل١٨—٢٠
- هونەری جوان،(ڕیپۆرتاژ)، ل٢٠—٢٧
- هونەری نەمرمان دەوێت، ساجد ئاوارە، (وتار)، ل٢٧—٣١
- قارەمانی ئافرەتێکی کورد، أ.ب. هەوری، (چیرۆك)، ل٣١—٣٥
- لەم جیهانەدا، (گۆشە)، ل٣٥—٣٨.
- چیرۆك نوسین و هونەری چیرۆك، مستەفاصالح کریم،(لێکۆڵینەوە)، ل٣٨—٤٨.
- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە) ل٤٨-٥٠
- هیواو خوێندەوارانی، ل٥٠—٥٤
- سەرگوزەشتەو بزەی لێو، ل٥٤—٥٨

- یەکێ لە شەوەکانی گرتەکەی سەیوان، فازل، (چیرۆك)، ل٥٨–٦٥
- ساتێ بەختیاری، دلزار، (هۆنراوە)، ل٦٥–٦٦
- میڤانداری، حافز مستەفا قازی، (وتار)، ل٦٦–٦٨
- چیرۆك بۆ شانۆ، ل٧١
- لە هۆنراوەی کامەران ل٧٢
- لێکۆڵینەوە، ناکام، ل٧٣
- شەرم مەکە، ل٧٦
- کاوێس ئاغا، ج.بابان، (بیرەوەری) ل٧٧–٨٥

**ژ١، س٢، تەموزی ١٩٥٨:**

- دووجاری بخوێنەرەوە، ع. س. ن وەریگێراوە، (وتار) ل٣–٧
- زانست و ژیان، (گۆشە)، ل ٧– ١١
- داری ناکۆکی لە بندا هەڵکەنن، ڕەفیق حلمی، (هۆنراوە)، ل١١–١٣
- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە)، ل١٣–١٥
- شەش پیاوی گەورەی مێژوو، وەرگێڕانی محمد سعید جاف، (وتار)، ل١٧–٢٥
- نامەیەك بۆ خوشکە ڕۆشەنبیرەکان، ڕووناك، (وتار)، ل٢٥–٣٠
- فرمێسك، محمد ڕسول، (هۆنراوە)، ل٣٠
- ژن دارك، أ.غ، (وتار)، ل٣١– ٣٤
- چیرۆکێکی کورت بۆ شانۆ، کامەران، (شانۆگەری)، ل٣٤–٣٦
- کێ تاوانبارە، میم، (چیرۆك)، ل٣٦–٤٩
- هونەری جوان، محمدی مەلا کریم وەریگێڕاوە، (هونەر)، ل٤٩–٦٢
- تەمسیلی چیرۆکی مەم و زین، (هونەر)، ل٦٢–٦٤
- ئاهەنگەکەی تیپی مەولەوی، هێمن، (هونەر)، ل٦٤–٦٩
- پیاوی ون بوو، هەوری، (وتار)، ل٦٩–٧٥
- تولستوی، ئاوات، (ژیاننامە)، ل٨٠–٩٤
- چواردەی گەلاوێژ، هێمن، (هۆنراوە)، ل٩٥–٩٨

**ژ٢، س٢، ئابی ١٩٥٨:**

- چۆن دەرسی هونەر ئەوترێتەوە لە وڵاتاندا، شاخەوان، (هونەر)، ل٨٠—٨٥

- برووسکەو نامە، (گۆشە)، ل٨٥—٨٨

- قوتابیانی کوردستان، مستەفا سلێمان، (وتار)، ل٨٨—٩٢

- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە)، ل٩٢—٩٤

**ژ٤، س٢، تشرینی یەکەمی ١٩٥٨:**

- رێگای ڕاست، (سەروتار)، ل١—٤

- کوردو کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا، وەرگێڕانی انور محمد قەرەداخی، (وتار)، ل٤—٨

- قوتابینی کورد لە ئەوروپا، (وتار)، ل٨—١٤

- بۆ فریشتەی ئاسایش، دلزار، (هۆنراوە)، ل١٤—١٧

- زانست و ژیان، (وتار)، ل١٧—٢٢

- کە دایکم بە ڕۆژو بوو، مەم، (چیرۆك)، ل٢٢—٣٠

- بۆ سوپای نەبەزی عێراق، کاکە شوان، (هۆنراوە)، ل٣٠

- کۆمەڵەی هەرەوەز، فازل، (وتار)، ل٣١—٣٩

- مەمك زۆری، مستەفا امین، (وتار)، ل٣٩—٤٥

- ڕۆژی ئازادی، نەسرین فەخری، (هۆنراوە، ل٥٨—٦٠

- لادێکانمان، فازل، (وتار)، ل٦٠—٦٨

- هەڵمەتە گەورەکەی سوپای گەلی عێراق،شەوکەت غفور،(وتار)، ل٦٨—٧١

- کێ ئازایە، محمود حاجی ڕەحیم، (هۆنراوە) ل٧١

- یەك....دوو... هەرسێکی، هێمن، (هۆنراوە)، ل٨٢—٨٤

- لینین گەورەترین پیاوی مێژوو لە سەدەی بیستەمدا،وەرزێر، (وتار)، ل٨٤—٨٨

- کە مردم، دیلان، (هۆنراوە)، ل٨٨

- گەڕانەوەی قارەمانەکان بۆ سلێمانی، (ڕیپۆرتاژ)، ل٨٩—٩٦

- نامەیەکی کراوە، (نامە)، ل٩٩—١٠٢

**ژ٣، س٢، ئەیلوولی،١٩٥٨:**

- فرمانی ئەمرۆمان، (سەروتار)، ل١—٤

- نەتەوەی کوردو یاسای جمهوریەت، فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل٤—١٠
- قوتابیانی کورد لە ئەوروپا، (ڕیپۆرتاژ)، ل١٠—١٧
- ڕێگای هیند، وەرگێڕانی محمدی ملا کریم، (وتار) ل١٧—٢٦
- عبدالکریم قاسم، کمال غەمبار، (هۆنراوە)، ل٢٦—٢٩
- گەڕانەوەی قارەمانان بۆ سلێمانی، (ڕیپۆرتاژ)، ل٢٩—٣٧
- نامەیەك بۆ بەهەشت، محمد نوری توفیق، (نامەی ئەدەبی)، ل٣٧—٤٠
- هۆنراوەی جوان، هێمن، (هۆنراوە)، ل٤٠—٤٤
- دەربارەی ئەدەبی ڕاستەقینەی نوێ، (وتار)، ل٤٤—٤٩
- ١٤ی گەلاوێژ، قەدری جان، (هۆنراوە)، ل٤٩—٥١
- سڵاوێك، نەسرین فەخری، (هۆنراوە)، ل٤٥—٤٨
- شۆڕشی پیرۆز، هەوری، (وتار)، ل٤٨—٥٢
- گۆشەی زانیاری، (وتار)، ل٥٢—٥٩
- بۆ ئافرەتی کورد، خانم زوهدی، (وتار)، ل٥٩—٦٣
- کوردستانی من، کامل ژیر، (هۆنراوە)، ل٦٣
- قوتابیانی کوردستان، عبدالکریم عبدالرزاق (وتار)، ل٦٤—٦٦
- بێ تاوان، وەرگێڕانی محمد سعید جاف، (چیرۆکی وەرگێڕاو)، ل٦٦—٧٦
- شێری وڵات بارزانی هات، قەدری جان، (هۆنراوە)، ل٧٦— ٧٨
- شۆڕشەکەمان شۆڕێکی دیموکراتی میللیە، احمد غفور، (وتار)، ل٧٨—٨٣
- هاتنەوەی قارەمانانی کورد تیرێکی ژەهراویە کە ئاراستەی چاوی ئیمپریالیزم ئەکرێت، (وتار)، ل٨٩—٩٢
- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە)، ل٩٢— ٩٥
- چاپکراوی تازە، (هەواڵ)، ل٩٥—٩٦

**ژ٥، س٢، تشرینی دووەم ١٩٥٨:**

- سەروتار، ل١-٣
- چوار وەرزی ساڵ، ل٣—٤

- ئاهەنگەکەی گەنجانی کوردستان لە هۆڵی گەل لە بەغدا، ل٤—٧

- دەمەتەقێنی بایزو باپیر، هەژار، (هۆنراوە)، ل٧—١٠

- بانگی یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق، ل١٠—١٣

- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە)، ل١٣—١٧

- دەرەبەگی، ناکام، (وتار)، ل١٧— ٢٢

- بە کام شێوەی زمانەکەمان بنووسین، محمدی ملا کریم، (وتار)، ل٢٣—٢٨

- گۆڕانی کۆمەڵ لە سەرەتای مێژوودا، نوسینی ل. سیغال، وەرگێڕانی وەرزێر، (وتار)، ل٢٨—٣٣

- لینین م.م، (هۆنراوە)، ل٣٣—٣٥

- ئاهەنگەکەی یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق لقی سلێمانی، فازل، (ڕیپۆرتاژ)، ل٣٥—٤٣

- برایەتی و دۆستایەتی نەتەوەکانی عێراق لەسەر ڕۆشنایی "نەزەریەی زانیاری"، فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل٤٣—٤٩

- پاڕاستنی جمهوریەت و کۆمەڵ و پاڕاستنی مافەکانی ئافرەتان، عالیا عبدالکریم، (وتار)، ل٤٩—٥٣

- قوتابیانی کورد لە ئەوروپا، (ڕیپۆرتاژ)، ل٥٣—٦١

- بۆ قارەمانانی بەرزان، کاکە شوان، (هۆنراوە)، ٦١—٦٣

- شۆڕشی ئۆکتۆبەرو مەسەلەی کورد، احمد غفور، (وتار)، ل٦٣—٨٨

- قوتابیانی کوردستان، م. س، (وتار)، ل٨٩—٩٤

- مەدالیای هیوا (چیرۆك بۆ شانۆ)، گرەو، ل٩٥

**ژ٦،٧، س٢، کانوونی دووەمی ١٩٥٩:**

- یەك بگرن و هێزتان کۆبکەنەوە، (سەروتار)، ل١—٤

- کوردی بوختان بۆکراو، جەمال نەبەز، وەرگێڕانی فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل٤—١٢

- سروودی لاوان، هێمن، (هۆنراوە)، ل١٣-١٥

- ئیشکەری ڕاست، ڕەشید عارف، (وتار)، ل١٥ ١٧

- ڕووخانی باستیلی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕانی محمدی ملا کریم، (وتار)، ل١٧-٢٢

- بۆ ئافرەتانی کوردستان، پەخشان، (هۆنراوە)، ل٣٢
- لەتێ نان و شیشێ کەباب، فازل، (چیرۆك)، ل٣٣—٣٧
- نامەیەك لە کوردستانی ئێرانەوە، ل٣٧—٤٥
- ئەستێرەی ئازادی، ج. بابان، (وتار)، ل٤٥—٤٨
- مێژووی لام باش نییەی سلێمانی تا ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨، احمد خوازە، (وتار)، ل٤٨—٥١
- کاری شۆڕشەکەی عێراق لە زۆرانبازی دەوڵەتەکانا، وەرگێڕانی ف. ع. ك.، (وتار) ل٥١—٦٢
- بوێژی بەناوبانگی کورد وەفایی، سکاڵا، (وتار)، ل٦٢—٦٥
- ئەنجامی یەکەم گرەوەی هیوا، ل٦٥
- چۆن بووم بە هونەرمەند، ئەمین میرزا کریم، (شانۆگەری)، ل٦٦—٧٧
- پاڵەوانێتی کچێك، محمد نوری تۆفیق، چیرۆکی وەرگێردراو، ل٧٧—٨٠
- بۆ کوردستان، جەمال شاربازێڕی، (هۆنراوە)، ل٨٠
- خەباتی کورد، (وتار)، ل٨١—٩١
- مۆسکۆی جوان، گۆران، (هۆنراوە)، ل٩٠—٩٢
- شەوێکی بەهار، فەتاح کریم کاوە، (هۆنراوە)، ل٩٦
- دیواری ئەتلەس، وەرگێڕانی صبیحە عبدالمجید، (چیرۆك)، ل٩٧—١٠٣
- نامەیەك بۆ قاهیرە، وەرگێڕانی م. م، (وتار)، ١٠٣—١١١
- بیری ئازادی ڕێگەی ڕزگارییە، هەوری، (شانۆگەری)، ١١١—١٢٩
- چیت نەزانی پرسیار بکە، (گۆشە)، ل١٢٩—١٣٢
- هیواو خوێندەوارانی، (گۆشە)، ل١٣٤—١٣٩
- چۆن لە بیرم بچێتەوە ؟!، مستەفا صالح کریم، (چیرۆك)، ل١٣٩—١٤٤

**ژ٨، س٢، شوباتی ١٩٥٩:**

- کوردینە جەژنی نەورۆزتان پیرۆز بێت، (سەروتار)، ل١—٣
- هیوا لە کۆڕی خەباتا، ل٣—٥
- لینین سەرۆك و ڕێکخەری گەورەترین شۆڕشە لە مێ ژوودا، احمد غفور، (وتار)، ل٥—١٦
- شۆڕشەکەی عێراق و مەسەلەی کورد، وەرگێڕ، محمدی مەلا کریم، ل١٧—٣٥
- جەژنی نەورۆز، (هۆنراوە)، ل٣٥—٣٧
- لاشەی بدرالدین، وەرگێڕانی عبدالرزاق حمد بیمار، (چیرۆك)، ل٣٥—٤٤

- مەولەوی و بەهار، (هۆنراوە)، ل٤٤—٤٦

- نەورۆزی ئەسالّمان، محمد نوری تۆفیق، (وتار)، ل٤٦—٤٩

ژ(٩، ١٠)، س٢، نیسان و مایسی ١٩٥٩

- هیوا لە کۆڕی ئەدەبا، (سەروتار)، ل١—٥

- لێکدانەوەی مۆسیقا بە شێوەی سیاسی، وەگێڕ، عەتا تالەبانی و فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل٥—٢٢

- نیشتمانە بچکۆلّەکەم، وەرگێڕ نەسرین فەخری، (هۆنراوە)، ل٢٢

- ئەنگلس ئەفسەرێکی سوپای کرێکارانی هەموو جیهانە، محمد نوری توفیق، (وتار)، ل٢٣—٢٨

- هۆنراوەو میللەتەکەم، عبدالرزاق حمد، (هۆنراوە)، ل٢٨—٣١

- لە ئاسمانی لوبنانا، "چیای گوێژە"، احمد خواجە، (وتار)، ل٣١—٣٦

- یادی ڕصافی نەمر، وتار، ل٣٦-٣٩

- خەیالّی خاوە ئیستیعمار، قادر ملا احمد، (هونراوە)، ل٣٩

- ئەدیب و هونەرمەندە کوردەکانمان و پێویستیەکانی ئەمڕۆی سەرشانیان، محمدی مەلا کریم، (وتار) ل٤٠—٤٥

- سێ هۆنراوەی تازەی شاعیری گەورە عبدالوهاب البیاتی وەرگێڕ عزالدین مستەفا ڕسول، (هۆنراوە)، ل٤٥—٤٨

- ڕۆژنامەو گۆڤاری تازەی کوردی، ل٤٩—٥٤

- هیواو خوێندەوارانی، ل٥٤—٦٠

- دایك وەرگێڕ، حسن قەزلەجی، (ڕۆمان)، ل٦٣-٧٠

- خەباتی ئافرەتی کورد، عالیە عبدالکریم، (وتار)، ل٧١-٧٥

- سلاوی ئافرەتانی عێراق بۆ موصلی قارەمان، ل ٧٥—٨٥

- خۆش بەختی و شادی و زەماوەندی گەل، ل٨٠—٨٧

- یەکێتی ئەدیبانی عێراق، ل٨٧—٨٩

**ژ١١، ١٢، س٢، حوزەیران و تەممووزی ١٩٥٩:**

- هیواو شۆڕش و سالّی سێیەمی ژیان، (سەروتار)، ل١—٦

- نەخۆشی تاوانکار، حسن قزلجی، (چیرۆکی وەرگێردراو)، ل١٠٦-١٢٤

- بەدرۆی خۆش باوەڕ مەکە، احمد خواجە، (وتار)، ل١٢٤-١٢٨

- هیواو خوێندەوارانی، (گۆشە)، ل١٢٨-١٣٢

**ژا، س٣ تشرینی دووەمی ١٩٥٩:**

- کوردو سەرۆکی دڵسۆزو کۆماری دیموکراتی، (سەروتار)، ل١-٦

- ئایا ئەشێ ئەدیب (بویژ) لایەنگری لایەکی تایبەتی نەبێ، احمد حامد، (وتار) ل ٦- ٩.

- شەهید،گۆران، (هۆنراوە)، ل٩-١٢

- کێ مێژوو دروست دەکات ؟، دکتۆر الفیصل السامر، وەرگێرانی فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل١٢-٢٠

- جولانەوەی تۆرانیەت لە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەدا، ابراهیم علاوی، وەرگێڕانی محمدی ملا کریم،(وتار)، ل٢٠-٢٣

- جوانی شقلاوە، وردی، (هۆنراوە)، ل٤٢-٤٥

- هەربژی یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەری نەمر، (وتار)، ل٤٥

- لاهوتی شاعیری بەناوبانگی کورد، حسن قزلجی، (وتار)، ل٤٦-٥٢

- برایەتی بەهێزی ڕەنج کێشانی جیهان، (وتار)، ل٥٢-٦١

- زۆربەی گەل، هۆشەنگ، (هۆنراوە)، ل٦٢-٦٣

- فس فس پاڵەوان، ج. بابان، (چیروك)، ل٦٣-٦٨

- هەڵبژاردە لە شعری چینی، وەرگێڕانی محمدی ملا کریم، (هۆنراوە)، ل٦٨-٧١

- کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، کمال فوئاد، (ڕیپۆرتاژ)، ل٧١-٨٤

- پەیمان، (هۆنراوە)، ل٨٤-٨٧

- چۆن لە بیرم بچێتەوە، مستەفا صالح کریم، (چیروك)، ل٨٧-١٠٣

**ژ٢،٣، س٣، کانونی یەکەمی ١٩٥٩ و کانونی دووەمی ١٩٦٠:**

- پێشەوای مەزن (سەروتار)، ل١-١٤

- هەوری پایز، گۆران (هۆنراوە)، ل١٤-١٦

- نەتەوایەتی، وەرگێڕانی فاتح عبدالكريم، (وتار)، ل١٦—٣٢

- لە ئەدەبی كوردی سۆڤیەت، ئامادەكردنی وردی، (هۆنراوە)، ل٣٢—٣٩

- خەبات بۆ پاراستنی ئاشتی خەباتە بۆ ئازادی نیشتمان، وەرگێڕانی عاصم حيدری، (وتار)، ل٣٩—٤٢

- لێكۆلینەوەی ئەتۆم، احمد عوسمان، (وتار)، ل٤٢—٤٨

- جمهوریەت، بیتۆفی، محمدی ملا كريم، (هۆنراوە)، ل٤٨—٥٠

- كۆمیونە میللیەكانی چینی میللی چۆن یارمەتی ئافرەتان دەدەن، گۆڕینی شفیقە احمد، (وتار)، ل٥٠-٥٤

- هیوا لەگەڵ مامۆستا انور مائی، چاوپێكەوتن، ل٥٤—٦١

- سوورانە! هۆشەنگ، (هۆنراوە)، ل٦١—٦٣

- بەرەحمەت بێ خەتای باوكی بوو،محمد نوری توفیق، (چیرۆك)، ل٦٣—٦٧

- چوار بەگایی، قەلەندەر ئالانی، (چیرۆك)، ل٦٧—٧٢

- قەلغانێكی پۆڵاینە، حسێن عوسان نێرگسە جاڕی، (هۆنراوە)، ل٧٢—٧٥

- زایەڵەی ڕۆژگار، (پەخشان)، ل٧٥—٧٨

- یانەی سەركەوتنی كوردان، ئاهەنگ ئەگێڕی، (ڕیپۆرتاژ)، ل٧٨—٨٧

- چارە ڕەشەكان، ویكتور هوكو، حسن قزلجی، (چیرۆك)، ل٨٧—٩٥

- كۆنگرەی مامۆستایانی كورد لە شقلاوە، (ڕیپۆرتاژ)، ل٩٥—١١٦

**ژ٤، س٣، ئازاری ١٩٦٠:**

- دیسان یەككرتنی ڕیز!، (سەروتار)، ل١—٥

- ئاشتی، هۆیەكانی جەنگ، چۆن ئاشتی ئەپارێزین، فاتح عبدالكريم، (وتار)، ل٥— ٢٤

- دوا سرنج، گۆران، (هۆنراوە)، ل٢٥—٢٨

- وێژەو چینەكانی كۆمەڵ، (وتار)، ل٢٨

- محتوم خولی شاعیری گەورەی توركمانستان، (وتار)، ل٢٩—٢٦

- لە ئەدەبی چینی، وەرگێڕانی وردی، (هۆنراوە)، ل٣٦—٤٠

- هۆشی منە، وەرگێڕانی علی بەرزنجی، (وتار)، ل٤٠-٤٣

- وێنەیەك لە ژیانی ڕابردووی قادر کەرەم، پشکۆ، (هۆنراوە)، ل٤٣—٤٩
- زەردەشت، کاکە مەم فەخری، (وتار)، ل٤٩—٥٢
- نامەیەك، ئاسۆ، (هۆنراوە)، ل٥٢—٥٥
- لین و هێرمان، (وتار)، ل٥٥—٦٠
- ئەمرۆ... یەك شەممەیە، نازم حیکمەت، وەرگێڕانی کمال غەمبار، (هۆنراوە)، ل٦٠— ٦٢
- بنیادەمی تیرخۆر (وتار)، ل٦٢—٧٠
- بەڕێم کردی،ن.(هۆنراوە)، ل٧٠
- ڕاکردوو، محمد خدا،(چیرۆك)، ل٧١—٧٧
- ڕزگاربوونی سەرۆك عبدالکریم، کریم شارەزا، (هۆنراوە)، ل٧٧—٧٩
- خەبات و ژیان، عبدالرزاق محمد، (ڕەخنە)، ل٧٩—٨٩
- نان و ئاشتی و سەربەستی، نەسرین فەخری، (هۆنراوە)،ل٨٩—٩٠
- دەرۆزەکەر،ئەنتۆن تشیکۆف،وەرگێڕانی احمد قەرەداخی، (چیرۆك)، ل٩١—١٠٠

**ژ٥، س٣، مایسی ١٩٦٠:**

- لە پێناوی بوژاندنەوەی یانەی سەرکەوتنی کورداندا،(سەروتار)، ل١—٤
- چیرۆك لە چینا لە ١٩١٩وە نوسینی وانك یاو، وەرگێڕانی محمدی مل کریم، (وتار) ل٥—١٨
- وتم بە بەختی خەوالّوو، حاجی قادری کۆیی (هۆنراوە)، ل١٨—٢٤
- نەورۆز، جمال عبدالقادر بابان، (چیرۆك بۆ شانۆ)، ل٢٤—٤٠
- بەهاری پاش باران، گۆران، (هۆنراوە)، ل٤٠—٤٢
- وتاری دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی لە ئاهەنگی نەورۆزی یانەی سەرکەوتندا، (وتار)، ل٤٢—٤٨
- نەورۆز، حسیب قەرەداخی، (هۆنراوە)، ل٤٨—٥٢
- ئەنجامی شەڕ، وەرگێڕانی محمد نوری توفیق، (چیرۆك)، ل٥٢—٦٣
- لە ئەدەبی کوردی سۆڤیەت، ئامادەکردنی وردی، (هۆنراوە)، ل٦٣—٦٨
- فەرهەنگی خالّ، تاهر صادق، (ڕەخنە)، ل٦٨—٧٠
- بەستنی کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان، ل٧٠—٧٢

- نەورۆزی ئەمساڵمان، (ڕیپۆرتاژ)، ل٧٢—٨٤

**ژ٣٠، س٤، تشرینی یەکەمی ١٩٦٠:**

- هێنانەدی ئاواتە نەتەوەییەکانی کورد لە عێراقدا، بەردی بناغەی یەکێتی نیشتمانی یە، (سەروتار)، ل١—٩

- کاروان، کاکەی فەللاح، (هۆنراوە)، ل٩—١٢

- نامەی باوکێك لە بەندیخانەوە، محمد نوری توفیق، (پەخشان)، ل١٢—١٥

- یەکخستنی زبانی کوردی، عیسمەت شریف وانلی، وەرگێڕانی فاتح عبدالکریم، (وتار)، ل١٥—٣٦

- ئەدەب بۆ گەلە، حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی، (هۆنراوە)، ل٣٦—٣٨

- بۆ دایکێکی عێراقی، ف.ع.ك، وەریگێڕاوە، (هۆنراوە)، ل٣٨—٤٠

- وەلاٌمی ڕەخنەکەی فەرهەنگی خاڵ، حەمە جەزا، (وتار)، ل٤٠—٤٤

- بۆ هیوا، بێ خەو، (هۆنراوە)، ل٤٤—٤٦

- سەردانێکی چاوەڕوانەکراو،محمد ڕشید قەرداخی وەریگێڕاوە،(وتار)،ل٤٦—٥٣

- مامۆستا ڕەفیق حیلمی کۆچی دوایی کرد !، (هەواڵ)، ل٥٣

- گۆرانی کەشتیوانێك، نازم حیکمەت، وەرگێڕانی کمال غمبار، (هۆنراوە)، ل٥٤— ٥٦

- پەتروس و گاپوچکە، یوری یانۆ ڤسکی،وەرگێڕانی هۆگر،(چیرۆك)، ل٥٦—٦٤

- نوێژی جوتیار، هۆشەنگ، (هۆنراوە)، ل٦٤—٦٧

- لەگەڵ شێخ ڕەزای تالەبانی لە دیوانەکەی، عبدالرزاق محمد،(وتار)، ل٦٧—٧٥

- ئەنتۆن چیخۆف و نوسینەکانی و گیروگرفتی واقیعیەت، احمد عوسمان ابوبکر، (وتار)، ل٧٦—٨٢

- بیرەوەری ڕۆژی ڕەشی ٦ی ئەیلول، (وتار)، ل٨٢—٨٧

- سەیرە!، نان لە ولاٌتی ناندا نەبێ!!، معروف خەزنەدار، (وتار)، ل٨٧—٩٧

- هەربژی یادی شێخ محمودی نەمر، یادەوەری، ٩٧—٩٨

- ڕووداوێکی پڕ ئازار، (هەواڵ)، ل٩٩

- ئەی شیعر، ابو القاسم الشابی، وەرگێڕانی کریم شارەزا، (هۆنراوە)، ل١٠٠

- نوشتەکەی ئامینە خان، حسن قزلجی، (چیرۆك)، ل١٠١—١١٠

**ژ٣١، س٤، کانونی دووەمی ١٩٦١:**

- یانە بۆچی دامەزراوزە،وەچۆن ئەتوانێ ئامانجەکانی بهێنێتە دی،(سەروتار).ل١-٤

- کۆنی و تازەیی لە هەڵبەستا، گۆران، (وتار)، ل٥—١٢

- بابە تاهیری هەمەدانی، عبدالرزاق بیمار،(وتار)، ل١٢—١٦

- بلبلێکی ئازاد، پشکۆ، (هۆنراوە)، ل١٧—١٩

- دەستنوسی کوردی لە "نامەخانەی ئیپراتۆری پێشووی بەرلین" معروف خەزنەدار،(وتار)، ل٢٠-٢٥

- نەخۆشیی ساری وخوڵێ پاڕاستنی،دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی،(وتار)،ل٢٥-٢٩

- گوڵی شادیم، جمال نوری، (هۆنراوە)، ل٢٩—٣٠

- یوڵیوس فاچیك ڕۆژنامەنوسی خەباتکەر، (وتار)، ل٣١—٤٢

- نموونەیەك لە ڕابردوو، م.ر، (هۆنراوە)، ل٤٣—٤٨

- لە خەوما،محمد نوری توفیق، (چیرۆك)، ل٤٨—٥٢

- دوو پیتی بێ وێنە، تاهر صادق، (وتار)، ل٥٢—٥٤

- مامۆستاوزانای کورد دکتۆر(بەکایف)، عزالدین مستەفارسول،(وتار)،ل٥٤-٥٧

- زانایانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی عەتیکەو شوێنەوارەکان چەند عەنتیکەو شوێنەواری گرنگیان دۆزیەوە، (وتار)، ل٥٧—٦٠

- بیرەوەری بێکەسی نەمر لە بارەگای یەکێتی ئەدەبیاتی عێراقدا، (وتار) ل٦٠

- لەگەڵ شێخ ڕەزای تالەبانی لە دیوانەکەیدا، بەشی دووەم، عبدالرزاق محمد، (وتار)، ل٦٠—٧٠

- کەشکوڵی جادویی، حسن قزلجی، (چیرۆك)، ل٧١-٨٠

**ژ٣٣، س، تەمموزی ١٩٦١:**

- یادی سێهەمی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی پیرۆز، (سەروتار)، ل١ ٣

- مۆسیقای کوردی لە یەکێتی سۆڤیەت بەرەو پێشەوەچوونی مۆسیقای کوردی لە ماوەی چل ساڵدا، وردی، (وتار)، ل٣—٨

- گۆرانی من، کمال غەمبار، (هۆنراوە)، ل٨

**ژ۳٤،۳٥، س٥، ئەیلولی ۱۹٦۱:**

- کوردینە...خوتان و یانەکەتان، دکتۆر صدیق ئەتروشی (سەروتار)، ل۱—۷
- ئەدەب و گوزارەی ئەدەب، علاالدین سجادی، (وتار)، ل۷—۱۰
- هەڵبەستی بێگانە،نازم حیکمەت،وەرگێڕانی عبدالرزاق بیمار،(هۆنراوە)،ل۱۰—۱٤
- گوێندە دەنگ خۆشەکانی ناوچەی سلێمانی، ج.بابان، (وتار)، ل۱٤—۱۸
- ئەنشتین، وەیرگێر ك.ف، (وتار)، ل۱۹—۲۱
- ئەی هۆنراوە، عبدالرزاق محمد، هۆنراوە، ل۲۱—۲۳
- ئاژاوەی زاراوەکان، عبدالستار کازم، (وتار)، ل۲۳—۲۸
- زمانەکەمان، جمال جلال عبدالله، (وتار)، ل۲۸—۳٥
- چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مامۆستا پاکیزە ڕەفیق حلمی، ل۳٥—٤۱
- دوژمنەکەی مام قیتەڵ، حسێن عارف، (چیرۆك)،ل٤۱—٤۷
- شانۆی کوردستان، معروف برزنجی، (ڕەخنەو لێکۆڵینەوە)، ل٤۷—٥٦
- کۆیەو شاعیرانی، صلاح علی، (وتار)، ل٥٦—٥۹
- مانگی کوردی، بەشیر مشیر، (وتار)، ل٦۰—٦۲
- ئەیلولی خوێناوی، کاکە مەم، (وتار)،ل٦۲—٦٥
- ئەدەبی میللی کۆن و ئەدەبی کلاسیکی ڤێتنام، عاسم حیدری،(وتار)،ل٦٥—٦۹
- دیپلۆمی بەرزو کوردەکانی سۆڤیەت، میکائیل ڕەشید، وەرگێڕانی وردی، (وتار)، ل٦۹—۷۲
- شاڵلا سواری کەریشیان بکردیتایە، میدیا، (چیرۆك)، ل۷۳—۷۸
- هەستێکی بەرز، (پۆستە)، ل۷۸—۸۰

**ژ۳٥، ژمارەی تایبەت بە جەژنی نەورۆزەوە:**

- جەژنی نەورۆز، ل۱—۳
- نەورۆزی من، ابراهیم احمد، (هۆنراوە)، ل۳
- جەژنی نەورۆز، شێخ سەلام، (هۆنراوە)، ل۳
- بەهار، نالی، (هۆنراوە)، ل٤
- نەورۆزی خانی (هۆنراوە)، ل٦.

- بەهار، مەولەوی، (هۆنراوە)، ل٦—٧

- نەورۆزو دڵ و یار، وەفایی، (هۆنراوە)،ل٧—٨

- بەهاری کوردستان، حاجی قادری کۆیی، (هۆنراوە)، ل٨—١٠

- گۆرانی نەورۆزەکەمان، پیرەمێرد، (هۆنراوە)، ل١٠

- هەڵبژاردەی نەورۆز، عوسمان مستەفا خۆشناو، دلزار، وردی، (هۆنراوە)، ل١١

- نەورۆزی ٦١، گۆران، (هۆنراوە)، ل١٢—١٤

- دیاری نەورۆز، کامەران، (هۆنراوە)، ل١٤-١٦

- مژدەی نەورۆز، نوری علی امین، (هۆنراوە)، ل١٧—١٩

**ژ٣٦، حوزەیرانی ١٩٦٢:**

- ئایا ئەبێ نوسەرەکانمان بنوسن یان نا؟، ع، (وتار) ل١—٥

- هەڵبەست و تێکۆشان و ئافرەت، (وتار)، ل٥—٧

- ڕێگا، کمال بیزار، (هۆنراوە)، ل٧

- دیوانی قالچی چەك، مەعروف خەزنەدار، (وتار)، ل٨—١٢

- هەڵبەستەکانی (علی تەرموکی) هاوار، (وتار) ل١٢—١٦

- مەبەست چیە لەم هەموو وشە تازانە، جمال جلال عبداللە (وتار)، ل١٦—٢١

- دونگسوژووی، وەرگێڕانی محمدی شێخ احمد، (وتار)، ل٢١- ٢٥

- هەژار، نوری علی امین، (هۆنراوە) ل٢٥—٢٨

- سکێچی گۆرانی "دروێنە"، (هۆنراوە)، ل٢٨—٣٠

- بازاڕی چاپەمەنی، ل٣٠—٣٤

- بۆ... پێشەوە، مەجید ئاسنگەر، (چیرۆك)،ل٣٤—٤٠

**ژ٣٧، تشرینی یەکەمی ١٩٦٢:**

- هەر ئەبێ بنووسن !، (وتار)، ل١—٩

- نامیێك لە شەترەوە، کەریم شارەزا،(هۆنراوە)، ل٩

- منالێك، وەرگێڕانی وردی، (چیرۆك)، ل١٠—١٢

- بەستەی جووتیار، عوسمان شارباژێڕی (هۆنراوە، ل١٢—١٥

- بۆ خۆشەویستەکەم، سالار ئەمین،(پەخشان) ل ١٥–١٦

- هەواڵی نەتەوەکەت بزانە، نورەدین زازا، (وتار) ل١٧–٢٤

**ژ٣٨، حوزەیرانی ١٩٦٢:**

- وتەیەك، ل١

- ژیاننامەی گۆران، ٢-٥

- نامەیەکی گۆران بۆ پیرەمێرد، ل٦–١٢

- سێ هۆنراوەی گۆران، ل١٣–١٦

- وتارێك لە بارەی گۆران، ج، بابان، ل١٦–١٨

## پێشەکی:

کارەساتی جەرگبڕی (ئەنفال) برینێکی هێند بەسوێیە، تا چەندین نەوەی دیکە لە دەروونی تاکی کورد دا سارێژ نابێت، باس کردن و لێکۆڵینەوە و خستنە ڕوی ئەو تاوانە ئەرکێکی نەتەوەییە. ڕۆژنامەوانیی کوردییش، کە بەشداری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتووری کوردی لە هەموو قۆناغ و سەردەمێکدا کردووە، لە خستنە ڕوو و دەرخستنی ئەو تاوانەی ڕژێمی بەعسدا بەشداری کردووە، کە بە پێی نەخشە و پلانێکی دیاریکراو بۆ لە ناو بردنی کۆمەڵی کوردەواری لە ساڵی ١٩٨٨ دا کردی.

بێگومان بەو پێیەی ڕژێمی بەعس لە کوردستانی باشوور ئەنجامیداوە و ڕەشەکوژی و ڕاگواستن و وێرانکردنی زێدومەڵبەندی ناوچەکانی قەرەداخ وگەرمیان و دەشتی کۆیە و هەولێرو بادینانی گرتەوە، بۆیە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەش لە ڕووی شوێنەوە ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، لە ڕووی کاتیشەوە ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوای (ڕاپەڕین ١٩٩١-٢٠٠٠)م بە نموونە وەرگرتووە، چونکە لە دوای ڕاپەڕین زەمینەیەکی بەرفراوان بۆ ڕۆژنامەوانیی کوردیی هاتەکایەوە و بارو زرووفی نێودەوڵتیش لەبار بوو بۆ دیار خستنی تاوانەکانی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا.

گرفتی لێکۆڵینەوەکە،گرفتەکە بە پلەی یەکەم لەوەدایە زانیاری ورد و دروست لە بارەی تاوانەکانی (ئەنفال)و هۆکارو ئەنجامەکانی لەبەر دەستدا نییە، هەروەها ڕۆژنامەوانیی کوردییش بەهۆی پەرت وبڵاوی و نەبوونی بیبلۆگرافیای پێویست، کە کاری لێکۆڵینەوە بۆ لێکۆڵەر ئاسان دەکات لەبەر دەستدا نەبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی چەندین بەرهەمی ئەدەبی لەشیعرو چیرۆك و ڕۆمان و لابەلایی لە پاڵ تاوانەکانی دیکەدا باس لە ئەنجام و هۆکارە مەرگەساتەکانی (ئەنفال) دەکەن.

میتۆدی لێکۆڵینەوەکە، ڕێبازێکی مێژوویی شیکاریی لەبەرگرتووە، بۆ ئەم مەبەستەش هۆکارە سیاسیی و مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان لەبەر چاوگیراون و کراونەتە هەوێنی بۆچوون و ڕامانەکان بۆئەوەی شێوەیەکی ئەکادیمی وەربگرێت. ستراکتۆری لێکۆڵینەوەکە، بریتییە لە پێشەکییەك و دوو فەسڵ وئەنجام وسەرچاوەکان.

بەشی یەکەم دوو باسی لە خۆوە گرتووە،باسی یەکەم بریتییە لە ناساندنی (ئەنفال) و دەنگدانەوەی کارەساتی (ئەنفال)، کە تیایدا (ئەنفال) لە دیدی ئایینی ئیسلام و یاسای نێو

دەوڵەتی و کات و ژمارەی ئەنفالەکان و ناوچەکانەوە دیار خراوە، لە باسی دووەمدا ڕەهەندە کۆمەلآیەتی و سیاسییەکانی (ئەنفال) بە شێوە نێگەتیفەکەی پیشان دراوە.

بەشی دووەم، دوو باسی لەخۆگرتووە، باسی یەکەم، سەبارەت بە دروست کردنی (ڕای گشتی) لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدایە و دەوری لە خستنە ڕووی شالآوی ئەنفالدا، باسی دووەمیش، ڕەنگدانەوەی ئەو کارەساتەیە لە بەرهەمی ئەدەبیدا، بە تایبەتی لە شیعرو چیرۆك و هونەری وتاردا خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

**ناساندن و مەبەستی ئەنفال:**

لە بنچینەدا ناونانی پەلامارەکانی حکومەتی بەعس بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان بە (ئەنفال) لە سورەتی هەشتەمی قورئانەوە وەرگیراوە، کە مەبەست و ناوەرۆکی سورەتەکە گوزارشت لەوە دەکات کەموڵك و سەروەت و سامانی کافران بۆ موسڵمانان لە ڕووی شەرعییەوە حەلاڵە، بەلآم چەمك و واتای وشەکە، کە (تالآن، دەستکەوت)[1]ە، بە تەواوی گۆڕاوەو تێکەڵ بە سیاسەت بووە، لە بەرامبەر هێرشی پێشمەرگە لە ناوچە نیمچەئازادکراوەکانی کوردستاندا، کە حکومەتی بەعس بەتەواوی دەستی بەسەریاندا نەدەشکا و لە ژێردەستی پێشمەرگەدا بوون پەلامارێکی فراوانی بە چەند قۆناغێك ئەنجامدا بۆ پاکتاوکردن و وێرانکردنی گوندەکانی سەر سنوور و پاشان فراوان کردنەوەی جوغزە جوگرافییەکەی تا فراوانترین ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە. ئەو پەلاماردانە هەروا ڕەمەکی و لەناکاو نەبوو، بەڵکو کارێکی نەخشە بۆ کێشراوی پێشتری سەردەمی جەنگی عێراق — ئێران بوو، بەڵام سەرقاڵیی سوپای عێراق بە شەڕی ئێران وای کردبوو پەلامارەکان بە تەواوی ئەنجام نەپێکن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەنامەکان ئەوە دەردەخەن هەندێ ناوچەی کوردستان بەر لە شاڵاوی (ئەنفال)یش بە چەکی قەدەغەکراو و گازی ژەهراوی بۆردوومان کراون و خەڵکی بێ گوناه بوونەتە قوربانی.

ڕێکخراوی ئەمنستی ئینتەرناسیونال ئەوەی ئاشکراکردووە: ((ئێمە ڕای دەگەنین کە کوشتنی هەزاران کورد لەو ساڵانەدا بریتیە لە پڕۆژەیەکی نەخشە بۆ کێشراوی حکومەتی عێراق بۆ لەناوبردنی هەرچی زۆرتری کوردەکان.))[2]

---

[1] المنجد في اللغة، ط ٣٥، ص٨٢٨.

[2] گ. سیاسەتی دەولی، ژ ٣، ١٩٩٢، ل١٣.

ئەم نەخشەو پلانەی ڕێکخراوی ناوبراو ئاماژەی بۆ کردووە، بە پێی یاسای نێودەوڵـەتی دەچێتە خانەی (جینۆساید- ڕەشەکوژی) [٣] یەوە ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە هەرلەبواری سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، بەپێی پەیمان و بڕیارەکانی(UN) مافی چارەی خۆنووسین بریتییە لە مافێکی زیندووی هەموو گەلان بەبێ هیچ جۆرە جیاوازیەك)، [٤] کەواتـە لـەم ڕووەوە خـەباتی چەکداریی کورد بۆ ڕزگاری و مافی چارەی خۆنووسین خەباتێکی ڕەوایـە و مـافێکی خۆیـەتی، کەچی عێراق یەکێکە لەو وڵاتانەی خۆی هەردوو بڕیاری ئەنجومەنی گشتی پەسـەند کـردووە و دانی پێداناوە بە شێوەیەکی تیۆری، بەڵام لە پراکتیکدا سەرپێچی کردووە.

پەلاماری (ئەنفال) نزیکەی شەش مانگێکی خایاند و بە چەند قۆناغێك پلانەکـە ئـەنجام درا، کە بەم شێوەیە بوو:

ئەنفالی یەکەم: ٢٣ی شوبات-١٩ی مارتی ١٩٨٨ بۆ سەر دۆڵی جافایەتی

ئەنفالی دووەم: ٢٢ی مارت-١ی نیسانی ١٩٨٨ بۆ سەر قەرەداخ.

ئەنفالی سێیەم: ٧-٢٠ی نیسانی ١٩٨٨ بۆ سەر گەرمیان.

ئەنفالی چوارەم: دۆڵی زێی بچووك (ناوچەکانی شوان و شێخ بزێنی و دەشـتی کۆیـە) ٣-٨ی مایسی ١٩٨٨.

ئەنفالی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم: ١٥ی مایس ٢٦ی ئابی ١٩٨٨ بۆ سـەر چیاکانی ڕەواندز- شەقڵاوە.

ئەنفالی کۆتایی: ٢٥ی ئاب-٦ی ئەیلولی ١٩٨٨ بۆ سەر ناوچەی بادینان [٥].

لە ئەنجامی پەلامارەکانی (ئەنفال)، ڕاستەوخۆ لـە لایـەن (عـەلی حەسـەن مەجیـد) ی، ئامۆزای (سەدام حسێن) کە بۆ ئەم مەبەسـتە هەڵبـژێردرابوو، ئەنجامـدرا، بـە پێـی ڕاپـۆرتی ڕێکخـراوی (Middle East Watch))ی سـەر بـە نەتـەوە یـەکگرتوەکان زیـان و قوربـانی

---

[٣] جینۆساید،بەڕای پرۆفیسۆر (ڕافایل لێمکین) بریتییە لە (لەناوبردنی گروپێکی نەتەوەیی، ڕەگەزی یان ئایینی) و بەڵام نەتەوە یەکگرتووەکان وەها پێناسەی جینۆساید دەکات: بریتییە لەو کارانەی ئەنجام دەدرێن، بە مەبەستی لە ناوبردنی یەکجارەکی یان ناتەواوی گروپێکی نەتەوەیی، ئەتنیکی، ڕەگەزی یان ئایینی). بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٢٢٦٩، ٥/١٠/٢٠٠٠، ل١٠.

[٤] گ. سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ٤، ١٩٩٦، ل٦.

[٥] جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، ل٦٠٠.

ئەنفالەکان لەنێوان (٥٠-١٠٠) هەزار کەس دەبن، کە تیایاندا ژمارەیەکی زۆر منداڵ و ئافرەتی تێدایە و ژمارەیەکی زۆریش لە پیر و پەککەوتەی بە خۆوە گرتووە، ئەمە سەرباری زیانی ماددی و خاپوور کردن و وێران کردنی (٢٠٠٠) گوندی کوردستان و ڕاگواستنی هەزاران خێزان لە زێد و مەفتەنی خۆیان.[٦]

کارەساتی پەلامارەکانی (ئەنفال) نمونەیەکی زیندووی ڕەشەکوژی سەدەی بیستەمە، کەدوابەدوای کارەساتی (هۆلۆکۆست) دێت، کە لە ماوەی دووەمین جەنگی گێتیدا (نازیزم) هەوڵی قڕکردنی جولەکەکانی ئەوروپای داوە و نزیکەی شەش ملیۆن جوولەکەیان بە شێوەیەکی دڕندانە سووتاندووە، ئەو شێوە قڕکردنەی جوولەکە هەروەك ڕاوڵ هیلبێرگ **Raul hiberg**) لە کتێبی (قڕکردنی جوولەکەکانی ئەوروپا) ئاماژەی بۆ کردووە، بەسێ قۆناغ ئەنجامدراوە، هەمان ئەو شێوازە لە ئەنفالیشدا کاری پێ کراوە، کە بەم شێوەیە:

سەرەتا بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧ ئەو خەڵکانە دەست نیشان کران، کە لە ناوچە قەدەغەکراوەکان یان ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی پێشمەرگەدا دەژیان و خزم و کەس و کاریان دەسگیرکران، پاشان بەناوەی پشتێنەی ئەمنییەوە و پاراستنی سنوورو بەهانەی چالاکی پێشمەرگەوە لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکاندا کۆکرانەوەو دواجار پرۆسەی بەکۆمەڵکوژیو قڕکردنی گشتییان دەرهەق کرا وجارێکی دی تاوانیجینۆساید جێبەجێ کرا.

---

[٦] ئەو ژمارەی قوربانیانی ئەنفال لە میدیاکانی کوردیدا بە (١٨٢٠٠٠) کەس ناودەبرێ، بەڵام لە ڕاستیدا ژمارەکە هەر بە مەزەندەیە و وردو تەواو نییە. ژمارەی گوندەکانیش هەندێ کەس بە (٤٥٠٠) گوندی دادەنێن، بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ ٤٢١، ١٩٩٣/٦/٢٥، ل٣.

[٧] Middle East Watch،Genocid in Iraq, The Anfal Campaign Against The Kurds, P. 8.

## ڕەهەندە کۆمەلآیەتی وسیاسییەکانی ئەنفال لەسەر کۆمەڵی کوردەواری

یەکێ لە ئامانجە سەرەکییەکانی شالآوی (ئەنفال) ئەوە بوو، کە بتوانێ لە ڕووی کۆمەلآیەتییەوە برینێکی قووڵ لە دڵی تاکی کورد دا بەجێ بێڵێ، کە تا چەند نەوەیەکی دیکەش سارێژ نەبێ بە تێکدانی پێوەندی خێزان و لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی پێوەندی کۆمەلآیەتی هۆزو تیرەو عەشایریی کورد، کەوەك بنیادێکی کۆمەلآیەتی و ئابووری کۆمەڵی کوردەواری لەسەر دامەزراوە، ڕاگواستن و قڕکردنی خەڵکی گوندەکان لەسەر زێدی هۆی باو باپیرانیان بووە شێواندنی کەلتوری کوردی و داب و نەریت و ڕەوشت و ئاکاری ئەو خەڵکە سادە پەروەردە بە خزمایەتی و دۆستی و هەستی کوردایەتی. ئەم شالآوە بووە هۆی ئەوەی چەندین نەخۆشی دەروونی لە پاش خۆی لە دەروونی کەسانی ڕزگار بوو و خزم و کەس و کاری ئەنفالکراوەکاندا دروست ببێت ، کە تا ئێستاش پێوەی دەناڵێنن، لە نەخۆشی خەمۆکی و دڵە ڕاوکێ و ترس و شێت بوون[٨].ئەمە بێجگە لەوەی ئەوانەی کە ڕزگاریشیان بووە بە ئازاد کردن یان بە ڕاکردن تووشی چەندین کارەساتی وەك جەستە شکان و کەم ئەندامیی بوون وەك بێ دەست و قاچ بوون، کە ئێستا بە هۆیەوە تووشی نەهامەتی هاتوون.

لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە، دووبارە یەکێ لە ئامانجەکانی (ئەنفال) جێ بەجێ کردنی تیۆری (مالتۆس) بوو، بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی دانیشتوان با بەکۆمەڵکوژی و ئیبادەش بێت، بەبەڵگەی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ئەنفالکراوەکان منداڵی ساوا و هەرزەکار و ژن و کیژی عازەب و پیر و پەککەوتەی تیا بووە، تەنیا بۆ لەناو بردن و کەم کردنەوەی ژمارەی خەڵکی کورد بووە.

لەڕووی ئابووریشەوە دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ، کە ئەو خەڵکانەی لە خەڵکانێکی بەرهەم هێنەوە کرد بەخەڵکێکی بەکاربەر و زەبرێکی کوشندە بوو بۆ داتەپینی ئابووری کۆمەڵی کوردەواری کە زۆربەیان بە کشتوکاڵ و مەڕدارییەوە خەریك بوون، کە تاوەك ئێستاش

---

[٨] بە پێی ئامارەکانی لێکۆڵینەوەی مەیدانیی لە نامەیەکی ئەکادیمیدا ڕێژەی شێت بوون و هەندێ نەخۆشی دەروونی وا دیاریی دەکات: دڵتەنگی لە ئەنجامی شالآوەکان ٢١,٢٪، شێتی ١٤,٨٪، لەبیر چوونەوەو دڵەڕاوکێو تووڕەبوون ٨,٥٪، ترس و خەمۆکی ٢١,٢٪.

بڕوانە: یوسف مەعروف محەمەد دزەیی، ڕەهەندە کۆمەلآیەتییەکانی تاوانی (ئەنفال) لە هەرێمی کوردستانی عێراق، ل١٦٤.

زۆریـان لەکۆمـەڵگـە زۆرەملێیەکانـدا بـێ کـار و کاسـبی ماونەتـەوەو لـەژیان و گـوزەرانێکی مەمرەو مەژیدا دەژین، بـە تایبـەتی ئـەو گوندانـەی سـەر بـە پارێزگـای کـەرکوکن، چـونکە هەروەك دەزانین زیانی زۆرو پلـە یــەکی (ئـەنفال) ناوچـەی گـەرمیانی گرتـەوە. وێرانکردنـی نزیکەی (٢٠٠٠) دووهەزار گوند و سووتاندنی ڕەز و باخ و دەغڵ و دانی خەڵکی ئەو گوندانـە زیانێکی دیار و بەرچاوە.

لە ڕووی سیاسییەوە، لـە سـەردەمی خۆیـدا، ژمارەیـەك خـەڵکی لـە خـەباتی سیاسـی و چەکداری سارد کردەوەو جۆرێك لە بێ بڕوایی و ورە دابەزینی لە ریزی کۆمەڵدا دروست کـرد و خەباتی چەکداری کزو لاواز کرد. ئەمە بێجگە لەوەی بۆ ڕاکردن لە خزمەتی سەربازی و ترس و تۆقاندنی ڕژێمی بەعس خەڵکانێك ڕوویـان لـە فەوجـە خەفیفـەکان دەکـرد بـۆ نـاو نووسـین بـۆ (جاش)یەتی، بەمەش ئامانجێکی سیاسی (ئەنفال) بەدی دەهات، کە کوشتن و قڕکردنی کـورد بە کورد و هەستی قێزەوەری لە دەروونی کەسیەتی تاکی کورد دا گەورە دەکرد، هـەروەها وەك هەندێ لێکۆڵینەوە ئاماژەی بۆ دەکەن، ژمارەیەکیش لەوانـەی لـە ترسـی پـەلاماری (ئـەنفال) ڕایان کرد و کوردستانیان بەجێهێشت لە ئێران و تورکیا و پاشان بەرەو ئەوروپا کۆچیان کرد.[٩]

ئەگەرچی لە سەردەمی تاوانەکەدا (١٩٨٨)، لە سیاسەتی دنیای ئـەوێ ڕۆژێـدا ئەوەنـدە بەپەرۆشەوە لە میدیاکانی جیهاندا نەبووە جێگەی باس، بەڵام ئەمڕۆ لـە دوای ڕاپـەڕین، بۆتـە مەسەلەیەکی زیندوو و بووە بەهۆی ئەوەی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لەسەر بنچینەی یاسایی و سیاسیی و سیستمی نوێی جیهانیدا بیکەنە پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچـەوانی ڕژێمـی عێـراق و داوای دادگایی ئەنجامدەرانی بکەن، کە لە ڕووی سیاسییەوە لە خزمـەتی دۆزی کورددایە.

## ڕۆڵی ڕۆژنامەوانیی لە ناساندنی کارەساتی ئەنفالدا:

ڕۆژنامـەوانیی وەك کەناڵێکی ڕاگەیاندن لە پاڵ کەناڵەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سـینەما و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت ...ڕۆڵێکی کاریگەر لە ژیانی ڕۆژانـەی کۆمەڵـدا دەگێـڕێ.ئـەمڕۆ زەمینەی زانستەکان ئەوەندە فراوان بۆتەوە، کە لە توانای مرۆڤـدا نییـە پـەی بـە نهێنـی ئـەو هەمـوو تیۆرو داهێنانە نوێیانە ببات، کە لە جیهاندا ڕوو دەدەن و دێنەکایەوە.

---

[٩] یوسف مەعروف محەمەد دزەیی، ڕەهەندە کۆمەلایەتییەکانی تاوانی(ئەنفال) لە هەرێمی کوردستانی عێراق، ل ١٧٩.

ئەو هەموو کێشەو گرفتە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی ڕۆژانە لە پارچەو کون و کەلەبەرەکانی دنیایێ ڕوو دەدەن بە ئاسانی بە هۆی (هۆیەکانی پێوەندی جەماوەری)بە ئێمە دەگات و جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکاتەوە، کە جیهان لە سایەی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیای هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە بۆتە (گوندێکی بچووك).

ڕۆژنامەوانیی دەتوانێت لە دروستکردنی (ڕای گشتی)دا دەورێکی چالاکانە ببینێ، بەو پێیەی ڕای گشتی حەز و ئارەزوو و یەکخستنی دەروونی و ویستی تاکەکانی کۆمەڵە بە شێوەیەکی دیموکراسی بۆ بڕیاردان لەسەر مەسەلە چارەنووسسازەکانی کۆمەڵ[10] ئەمەش خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی فیکرییە— بە واتایەکی دی ڕۆژنامەوانیی ئەرك و پەیامێکی سیاسی کۆمەڵایەتییەو دەتوانێ بە گەیاندنی هەواڵ و ڕاستییەکان بۆ جەماوەر پلەی زانیاریان بەرزبکاتەوە و ئاسوودەیان بکات و پرۆسەیەکە لە ڕووی دەروونییەوە وەك (وشیارکەرەوە) وایە کە چاوەڕوانی (وەلامدانەوە) دەکات، لە دروستکردنی کەسیەتی تاکدا بەشدار دەبێت.

لە ڕووی سیاسییەوە، ڕۆژنامە گەیاندنی بیروباوەڕی دەستەلاتە و ئاڕاستەکردنی خەلکە بۆ گوێگرتن و جێ بەجێ کردنی دەستەلاتە یاسادانەر و ڕاپەڕێنەر و دادوەرییەکان، بە پێچەوانەشەوە،ئەگەر باوەڕمان بە دیمۆکراسی بێت، لە کۆمەلگەیەکی مەدەنی،کە ڕێکخراوەکان بە دامەزراو (مۆسساتبکرێن ڕۆژنامەوانیی (دەستەلاتی چوارەم)[11] دەبێت، بۆ وشیارکردنەوەی دەستەلاتی سیاسی لە داواکارییەکانی گەل بە تایبەتی لە ڕێگەی ڕیفراندۆم بۆ ڕێکخستن و یەکخستنی ویستی ئەندامانی کۆمەڵ.

لە کۆمەڵی کوردەواریدا، تا ئێستا ڕۆژنامەوانیی نەیتوانیوە ئەو دەستەلاتەی هەبێت و ئازاد بێت، چونکە (ئازادیی ڕۆژنامەوانیی) و (ڕۆژنامەوانیی ئازاد) نەبووە، بەلکو بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەنووسیی ئێمە پابەندی حیزب و لایەنە سیاسییەکان بووە، کە خاوەنی ئیمکانیاتی ماددی بوونە، ئەمە بێجگە لەوەی پێکهاتەی کۆمەڵی کوردەواری جارێ لە ڕووی

---

[10] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی (ڕای گشتی) بڕوانە: د. عبد اللطيف حمزة، المدخل في فن التحرير الصحفي، ص١٦–٣٤؛ د. احمد بدر واخرون، الصحافة الكويتية، ص١١–٢٠؛ ا.د. عدنان ابو الفخر، الصحافة السورية بين النظرية والتطبيق، ص٤١–٥٩.

[11] لە بارەی ئەم زاراوەیە (دەستەلاتی چوارەم) بڕوانە: کەمال سەعدی، دەستەلاتی چوارەم، هەولێر، ١٩٩٨.

کۆمەڵایەتییەوە پەیڕەوی مەدەنیەتی نەکردوە و دەستەڵاتی دیمۆکراسی، کە بەرهەمی کۆمەڵێکی ئازاد و دیمۆکراسییە فەراهەم نەبووە، بەڵام نکۆڵی لەوەیش ناکرێت،کە ڕۆژنامەوانیی کوردیی چ بە نهێنی و چ بە شێوەیەکی ئاشکرا و فراوان بە تایبەتی لە دوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان لە ساڵی(١٩٩١)دا، ڕێگە بۆ ڕۆژنامەوانیی کوردیی ئاوەڵا بوو بۆ زیاتر پێوەندی کردن بە جەماوەرەوە، بوونی ژمارەیەك ڕۆژنامە و کەناڵی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ناوەخۆ و تەنانەت ئێستا بوونی کەناڵە ئاسمانییەکانی کوردیی ئەو ڕاستییە جێگیر دەکەن[١٢].

هەڵدانەوەی لاپەڕەی هەر کامێك لە ڕۆژنامەکانی دوای ڕاپەڕین بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەخەن، کەگرنگییەکی زۆریان بە بلاۆکردنەوەی ئەو ڕووداو و کارەسات و لیستانەوە داوە،کە لە بابەت چەکی بەکۆمەڵکوژ و کیمیایی و تاوانی جینۆساید لە پەلاماری ئەنفالەکاندا بەکارهاتووە، نەوەك هەر پیشاندانێکی ڕووتی کارەساتەکان بە تەنیا لە پاڵیدا داوای دادگایی کردنی ئەنجامدەران و هێنانەوەی بەڵگەی بەندەکانی جاڕنامەی گەردونیی مافی مرۆڤ و بڕیارەکانی ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك پاڵپشتێك بۆ مەبەستی وروژاندنی هەستی خەڵك لەڕووی سایکۆلۆژیاوە و خستنە ڕووی کارەساتەکان بۆبەر چاوی ڕایگشتیی جیهانی و دروست کردنی ڕای گشتیی لە کۆمەڵدا و ڕق ئەستوورکردنی خەڵك لە بەرامبەر تاوانەکانی ڕژێمدا. لە ڕووی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە دەتوانین بڵێین وەك (مانشێت)ی سەرەکی یان (سەروتار)یان (وتار) هەواڵەکان جێگەیان گرتووە. هەروا سوود لەچەندین (وێنەی ڕۆژنامەوانیی) وەرگیراوە بۆ گەورەکردنەوە و تەقاندنەوەی ناخی خوێنەر،تەنانەت ڕۆژنامەنووسیی حیزبی ئەوەندە ڕۆڵی گێڕاوە چەندین مانگرتن و ڕێپێوانی هێمنانەی بۆ بەردەم بارەگای نووسینگەی ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان و (UN) ڕێکخستووە و لە وروژاندن و یەکخستنی چین و توێژەکانی کۆمەڵدا سەرقافلە بووە[١٣].

---

[١٢] لە دوای ڕاپەڕینەوە ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو گۆڤار بلاوبۆتەوە بە پێی ئەو بیبلۆگرافیایەی عەبدوڵلا زەنگەنە ڕێکیخستووە دەگاتە (٥٢٩) تا ساڵی ١٩٩٧، بڕوانە: عەبدوڵلا زەنگەنە، ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی دوای ڕاپەڕین، ل ٣٤١-٣٦٠، ژمارەی تەلەفزیۆنەکان بە پێی حیزبەکان هەردەم لە (٧-٨) کەناڵی ناوخۆیی کەمتر نەبووە، ئێستاش چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانی لە سەتەلایت هەن، کە هەر حیزب و لایەنەکان لە کوردستاندا بەڕێوەی دەبەن.

[١٣] بۆ ئەو ڕێپێوان هاندانی خەڵك و وروژاندنیان بڕوانە: ئەم هەواڵەی ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان): (ڕۆژی ٤/١٤ ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی شاری هەولێر بە ئامادەبوونی نوێنەری حیزب و ڕێکخراوە

هەوڵ دەدەین ئاماژە بە نووسین و مانشێتی هەندێ لە ڕۆژنامەکانی کوردستان لە دوای (ڕاپەڕین)دا بدەین:

**ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ:**

ئەم ڕۆژنامەیە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە دوای ڕاپەڕینەوە ڕۆژانە دەریدەکات[١٤] بەرهەمی زۆری لەسەر ئەنفال بلاوکردۆتەوە، ڕەنگە هۆیەکەیشی بە پلەی یەکەم لەوەوە بێت، کە پەلامارەکانی ئەنفال بەشێوەیەکی بەرفراوان ناوچەکانی ژێردەستی (ی.ن.ك) ی گرتەوە، بەتایبەتی سەرکردایەتی (ی. ن. ك) لە سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، تەنانەت ڕژێم ئەوەندە بە پەرۆشەوە بوو، بەیاننامەی تایبەتی بەم بۆنەیەوە دەرکرد[١٥] وا هەندێ لە ناونیشانی بابەتە بلاوکراوەکانی نێو ڕۆژنامەکە دەخەمە ڕوو:

- ئەنفالەکان..کێشەی ژمارە ١، (ڕیپۆرتاژ)، ژ١٢٦٤، ١٦/٤/١٩٩٦.
- شێخ محمد شاکەلی لەبارەی ئەنفالەکانەوە دەدوێ، (چاوپێکەوتن)، ژ١٢٦٤.
- ئەنفال ئامانج، پەندو هەڵوێست...! (لێکۆڵینەوە)، ژ١٢٦٧، ٥/٥/١٩٩٦

---

جەماوەریو پیشەیی و پارێزگاری هەولێر و ڕێکخەری UN و ژمارەیەك لە زانایانی ئایینی، کۆبوونەوەیەکی جەماوەرییان لەبەردەم پارێزگای هەولێر ساز کرد:) بڕوانە: ژ ٢٠٢، ٢٣/٤/١٩٩٦.

[١٤] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (سفر)ی بە هەشت لاپەرە لە ١٢/١/١٩٩٢دا دەرچووەوە تا ئیستاش وەك ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەردەوامە.

[١٥] پەلامارەکانی ئەنفال لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕژێمی بەغدا بە شانازییەوە باسی لێوەکراوە، بۆ نموونە بڕوانە مانشێت و هەواڵەکانی ڕۆژنامەی (الثورة)ی زمانحاڵی حیزبی بەعس لە ڕۆژی ٢٠/٣/١٩٨٨و لە ژمارە ٦٥٠٨ دا نووسراوە:

- احتلال مقر الخيانة بقتال باسل وثأري.
- عملية (أنفال) تتوج جبالنا الحبيبة بنصر عراقي مؤزر.
- تظاهرات واسعة ابتهاجا بالنصر فرحة غامرة بالقضاء على وكر الخيانة والعمالة.

هەروەها لە گۆڤاری (الف باء) ی ڕژێم لە ژمارە (١٠٤٣) ىڕۆژى٢١/٩/١٩٨٨دا (عدنان خيرالله)ی وەزیری بەرگری ئەوکاتەی عێراق نکولی لە بەکارهێنانی گازی کیمیایی دەکات و دەربارەی گرتن و کوشتنی خەڵکی کوردستان لە پەلامارەکانی ئەنفالدا دان بەوە دادەنێت کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکە بەرەو سنوورەکانی ئێران وتورکیا ڕایانکردووە لە بەر ئەوەی ئێمە نایانناسین و هەموویان جلی کوردییان لەبەردایە.هەروەها دەڵێ بەبۆنەی کۆتایی هاتنی پەلامارەکان لە٥/٩/١٩٨٨دا حکومەت بڕیاری لێبووردنی گشتی بۆ کوردان دەرکردووە.

ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانەیە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان دەری دەکا

NO: 1600, Sunday, 26/4/1998

شەقڵاوە:

# نۆیەمین کۆبوونەوەی باڵای نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك بەسترا

شەقڵاوە_ لە ئەحمەد سەپانەوە:

لە چوارچێوەی پرۆسەی ئاشتی و لەدرێژەی کۆبوونەوەکانی نێوان هەردوو وەفدی باڵای ی.ن.ك و پ.د.ك دا، پێش نیوەڕۆی ڕۆژی (٤/٢٣)، وەفدەکانی هەردوولا لە شەقڵاوە بە ئامادەبوونی مامۆستا عەزیز محەمەد سەرپەرشتیاری پرۆسەی ئاشتی، نۆیەمین کۆبوونەوەیان بەست.

وەفدی ی.ن.ك لە بەڕێزان د.کەمال فوئاد کارگێڕی مەکتەبی سیاسی و ئەرسەلان بایز و عومەری سەید عەلی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پێکهاتبوو، وەفدی پ.د.ك‌یش پێکهاتبوو لە بەڕێزان سامی عەبدولڕەحمان و جەوهەر نامیق سالم ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و بروسك نووری شاوەیس ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی.

دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە هەریەك لە بەڕێزان مامۆستا عەزیز محەمەد و د.کەمال فوئاد و سامی عەبدولڕەحمان لە بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکان، بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دوان.

دەربارەی ئەو مەسەلانەی باسکران، د.کەمال فوئاد وتی: ...

دووبارە توانیمان ئەو مەسەلەیە ڕابگرین و دووبارە بڕیاری ئەوە بدەین کە لە ڕۆژی یەکشەممەی داهاتوو (٤/٢٦) ڕاگەیاندن وەکو جاران لێیبێتەوە. ئەوەش مەترسییەکی ئەوەیە کەئێمە بەبێ لاش کۆنابینەوە، کە کۆدەبینەوە ئێمان هەیە بە دەستی بێنین، دیارە ئەوە ڕوونەدات بەڵام کە ڕوویدا توانیمان سنووری بۆ دابنێین. هەروەها ڕایگەیاند بڕیار لەسەر کۆمەڵە هەنگاوێك درا لەوانە مەسەلەی هاتوچۆ، دیلەکان، مەسەلەی ئاوارەکان، مەسەلەیەکی تریش قسەی لێ کرا، ئەویش ئەوەیە جارەهای جارە ناوی دەبەین بە ((سەرکەوتن بۆ هەوراز‌ەکە))، ئەوەی ڕاستی بێ تا ئێستا بۆچوونی جیا جیا هەیە هەرچەندە مەسەلەی هاوبەشیش هەیە لە نێوانیاندا، ئێمە پێویستمان بە گوروتینێکی تر هەیە بۆ ئەوەی گرێکوێرەکە ئازادانە بکرێتەوە، هەرچەندە گرێکوێرە نییە لەسەر مێزی گفتوگۆ نەکرێتەوە، وەکو هەموو جارێك دەڵێین بەرژەوەندی میللەتەکەمان لەسەرووی هەموو بەرژەوەندییەکەوەیە.

ئینجا بەڕێز د.کەمال فوئاد ...

... بەشێوەیەکی گشتی تەرخان بکرێ بۆ خزمەتی پرۆسەی ئاشتی.

بەڕێزی ئەوەشی ڕاگەیاند پاش ئەوەی هەندێ لە مەسەلەکانمان باس کرد و لەبارەیەوە گەیشتینە کۆمەڵێك ئەنجامی باش، هاتینە سەر باسی مەسەلە سەرەکییەکان وەك دیاری کردنی حکومەتێکی ئینتلافی کاتی و سەرژمێری و خۆئامادەکردن بۆ هەڵبژاردن و چۆنیەتی میکانیزمی ئەو کارانە وەکو مامۆستا عەزیز فەرمووی ئێمە لەو بارەیەوە کۆمەڵێك بیروڕای لەیەکچوو جیاوازمان هەبوو، لەسەر ئەوە ڕێککەوتووین کە حکومەتێکی ئینتلافی دروستبێت کە سەرژمێری و هەڵبژاردن بکرێ، بەڵام لەسەر چۆنیەتی دامەزراندنی ئەو حکومەتەو ئەو هەنگاوانە جیاوازی لە بۆچوونەکانماندا هەیە، لەبەر ئەوە بڕیارماندا لەسەر کۆبوونەوەکان بەردەوام بین و کۆبوونەوەی داهاتووش لە کاتو شوێنی دیاریکراو بکرێت، ...

... خراپی هەبوو، بەڵکو باسی خۆم دەڵێم ئەبارتی و نەیەکێتی و ئەمیللەتی کورد لەو ڕاگەیاندنە قازانجی نەکرد، وەکو چەند جار گوتوومانە میللەتەکەمان چاوەڕێی ئاشتییەکی سەرانسەری تەواو دەکات، دۆستانی میللەتەکەشمان چاوەڕێی ئەوەن، تاکو ئەوا خەڵك گرتن بووە و ڕەنگە دەرکردن ڕوویدابێ، ئەمڕۆ شتانە ناڕێ بکرێ، داوا لە خەڵکانی بەرپرس لە پارتی و یەکێتی دەکەم پابەندی ئەو خاڵانەی کۆبوونەوەی (٢/١٢)ی شەقڵاوە بن کە پەیوەندییان هەیە بە مەسەلەی ئازادی هاتوچۆ و نابێ کەس بگیرێ و کەس لە جێگەی خۆی دەربکرێ.

مەسەلەی ڕاگەیاندنیش لە یەکشەممە بەدواوە دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی، ئێمە هەرسێکمان (ئەو دوو وەفدە لەگەڵ مامۆستا عەزیز محەمەد) لە خەڵکی باشتر دەزانین چی هەیە و چی نییە و چی پێویستە بکرێ؟ پێویست ناکا خەڵك قسەکانی ئێمە شی بکاتەوە، دیارە ئێمە هەرسێکمان لە کەس ناترسین، لەبەر ئەوە دەڵێین دەبێ ئەو شتە بەسەرچێ، ئەو دەمەی ئێکتیفا ...

بۆ لا٧

## سەرۆکی پەرلەمانی ئێران گەیشتە عومان

ڕادیۆی BBC - ٤/٢٥:

...

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ

- ڕواندوز وکفری یادی هەشتەمین ساڵڕۆژی کارەساتی ئەنفال دەکەنەوە،(هەواڵ)، ژ ١٢٦٤.

- ئەنفالی سێ لە گەرمیان، (وتار)، ژ ١٢٧٥، ١٩٩٦/٥/٣.
- ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەنفالكراوەكان، (ڕاپۆرت)، ژ١٢٦٤، ١٩٩٦./٤/١٦
- ئەنفال !(لێكۆلینەوە)، ژ١٢٦٤، ١٩٩٦/٤/١٦.
- كیمیا باران.. ئەنفال ونوگرە سەلمان، (وتار)، ژ٢١٨١، ٢٠٠٠/٦/٢٥.

## ڕۆژنامەی برایەتی:

ڕۆژنامەی (برایەتی) پارتی دیموكراتی كوردستان دەریدەكات[16]، لە دوای ڕاپەڕینەوە بە شێوەیەكی ڕۆژانە دەردەچێت، هەڵوێستی پارتی دیموكراتی كوردستان بەرامبەر بە ڕووداوو پێشهاتە سیاسییەكانی ڕۆژ دەردەبڕێ، بەو پێیەی كە ڕۆژنامەیەكی حیزبییە، ڕوانینی حیزبەكە دەردەبڕێ، لە سالآنی سەرەتای هەوەڵی ڕاپەڕین چەندین وتارو سەروتارو ڕیپۆرتاژو چاوپێكەوتن و هەواڵی تایبەت بەكارەساتی ئەنفالی بلاّوكردۆتەوە، بەمەش ڕۆژنامەكە ئەركی كۆمەلاّیەتی و سیاسی و ڕۆژنامەوانیخۆی بە جێگەیاندووە، لە وشیاركردنەوەی خەڵكی كوردستان و، ئەمە هەندێك لە مانشێت و سەرووتارو بابەتە ڕۆژنامەوانییەكانی ڕۆژنامەی (برایەتی) یە لە بابەت پەلامارەكانی (ئەنفال)ەوە:

- برایەتی لەگیروگرفتی ئەنفالەكان دەكۆڵێتەوە، (ڕیپۆرتاژ)، [١٦١٨، ١٩٩٣/٣/٢٣.
- ڕژێم بێ شەرمانە شانازی بە ئەنفالەوەدەكات، (مانشێت)، ژ١٦٠٤، ١٩٩٣/٣/٢٧.
- ئەنفال ڕۆژە هەرە تاڵەكەی سەحراوی، (وتار)، ژ١٦٤٩، ٩٩٣/٥/٢.
- ژنەكا ئەنفالكری چیروكا خو ڤە دگێڕیتەڤە، (چاوپێكەوتن). ژ١٥٩٧، ١٩٩٣/٣/١٦
- هەڵەبجە وئەنفال وكۆڕەوله پانۆرامایەكدا، (وتار)، ژ٢٨٠٣،١٩٩٩/٤/١٤
- ئەنفال جینۆسایدێكی بێ وێنەیە، (وتار)، ژ ٢٨١٣، ١٤/ ٤ /١٩٩٩.

---

[16] ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (سفر) ی لە ١٩٧٤/١/١ دا دەرچووە، لەدوای ڕاپەڕین دووبارە تێهەڵچۆتەوەو لە١٩٩٣/٣/٢ داو بە ژمارە ١٥٨٥ دەستی پێكردۆتەوە و ڕۆژانە دەردەچێت و بەردەوامە.

## ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان:

ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)،[17] کە ڕۆژنامەی حیزبی شیوعی کوردستانە، بەشێکی مانشێت و سەروتارو ڕیپۆرتاژو چاو پێکەوتن و جارجار گۆشەی تایبەتی بۆ دەرخستنی مەینەتی خەڵکی ئەنفالکراو و کەس وکاری ئەنفالیان ومەینەتی ئەو ناوچانەی بەر چەکی بە کۆمەڵکوژو گازی کیمیاویی کەوتوون تەرخانکراوە. بێگومان ئەو مانشێتانە و سەروتاری ڕۆژنامەکە گوزارشت لە بۆچوونی ڕۆژنامەکە دەکەن، کە ڕۆژنامەیەکی حیزبیە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ زۆر بە دەگمەن و جارجار وەك (مانشێت)ی ڕۆژنامەکە ئیبرازی کارەساتی ئەنفالکراوە، ئەگینا لە دووتوێی هەواڵ و چالاکی حکومی و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسییدا جێگەی کراوەتەوە.(سەروتار) مەگەر تاك و لۆق تایبەت کرابێت بۆ یادی ئەو کارەساتە دژ بەمرۆڤایەتیە و شیکردنەوەی پێویستیشی بۆ کرابێ، دیارە ئەم سەرنجانە ڕۆژنامەکانی دیکەش دەگرێتەوە وەنەبێ هەر تەنیا بۆ ئەم ڕۆژنامەیە بن. (چاوپێکەوتن) و (ڕیپۆرتاژ)ەکانیش زیاتر یادەوەری ئەو کەسانەن، کە ڕزگارییان بووە لە هەڵمەتەکە، کەمتر باروودۆخی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان و ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو خەڵکانە باسیان لێوە کراوە. (هەواڵ) زیاتر لایەنی سیاسی وپێویستی و یارمەتی کوردستان لە لایەن ڕێکخراوە خێرخوازەکان و دادگایی کردنی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانەیان گرتۆتەوە. هەندێ جاریش هەواڵەکان تایبەتن بە یادکردنەوەی ئەو کارەساتە لە لایەن حیزب و لایەنە سیاسییەکان و تیپە هونەرییەکانی کوردستان لە شارەکاندا، لە پێشکەشکردنی چالاکی شانۆیی و گۆرانی و سروودو کاری هونەریدا.

سەرنجی ئەم مانشێت و ناونیشانە ڕۆژنامەوانییانە بدەن:

- ئاوارەو ئەنفال لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە ئیدارییەکاندا، ڕیپۆرتاژ، ژ١٨٤، ١٩٩٥/١٢/٥.
- یادی ئەنفالیش ئەم ساڵ بوو بەدوو، (گۆشەی تایبەت (ژ١٩٩)، ١٩٩٦/٤/٢
- ئەو ڕۆژانەی (ئەنفال) گەیشتە ناوچەی قەرەداغ، (وتار)، ژ ٢٠٠، ١٩٩٦/٤/٩.

---

[17] ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)، ژمارە یەکی لە ١٩٩١/٦/١دا بە چوار لاپەڕەی قەوارە بچووك دەرچووەو تائێستاش بەردەوامە.

- ڤیستیڤاڵی یادکردنەوەی ئەنفالە بەدناوەکان، (هەواڵ)، ژ۲۰۲، ۱۹۹٦/٤/۲۳.
- یـەك ڕیـزی گـەل و هێـزە سیاسـییەکانی، وەفادارییـە بـۆ قوربانییـەکانی ئـەنفال، (مانشێنت)، ۲۱۷، ۱۹۹٦/۸/۱۳.
- تراژیدیای لەبیرکراو سەرە قەڵەمێك بۆخوێندنەوەی ئاکامەخراپەکانی ئـەنفال، (وتـار)، ژ۳۱٥ ۲٦ /۸ / ۱۹۹۸.
- قوربانیانی ئەنفال دوو ڕەهەندی مرۆیی و سیاسین نابێ بێ چارەسەر بمێننەوە (سەروتار)، ژ ۳٤۷، ۱٤ /٤ /۱۹۹۹.

## ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان:

ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)،[17] کە ڕۆژنامەی حیزبی شیوعی کوردستانە، بەشێکی مانشێت و سەروتارو ڕیپۆرتاژو چاو پێکەوتن و جارجار گۆشەی تایبەتی بۆ دەرخستنی مەینەتی خەڵکی ئەنفالکراو و کەس وکاری ئەنفالیان ومەینەتی ئەو ناوچانەی بەر چەکی بە کۆمەڵکوژو گازی کیمیاویی کەوتوون تەرخانکراوە. بێگومان ئەو مانشێتانە و سەروتاری ڕۆژنامەکە گوزارشت لە بۆچوونی ڕۆژنامەکە دەکەن، کە ڕۆژنامەیەکی حیزبیە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ زۆر بە دەگمەن و جارجار وەك (مانشێت)ی ڕۆژنامەکە ئیبرازی کارەساتی ئەنفالکراوە، ئەگینا لە دووتوێی هەواڵ و چالاکی حکومی و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسییدا جێگەی کراوەتەوە.(سەروتار) مەگەر تاك و لۆق تایبەت کرابێت بۆ یادی ئەو کارەساتە دژ بەمرۆڤایەتیە و شیکردنەوەی پێویستیشی بۆ کرابێ، دیارە ئەم سەرنجانە ڕۆژنامەکانی دیکەش دەگرێتەوە وەنەبێ هەر تەنیا بۆ ئەم ڕۆژنامەیە بن. (چاوپێکەوتن) و (ڕیپۆرتاژ)ەکانیش زیاتر یادەوەری ئەو کەسانەن، کە ڕزگارییان بووە لە هەڵمەتەکە، کەمتر بارودۆخی کەس و کاری ئەنفالکراوەکان و ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو خەڵکانە باسیان لێوە کراوە. (هەواڵ) زیاتر لایەنی سیاسی وپێویستی و یارمەتی کوردستان لە لایەن ڕێکخراوە خێرخوازەکان و دادگایی کردنی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانەیان گرتۆتەوە. هەندێ جاریش هەواڵەکان تایبەتن بە یادکردنەوەی ئەو کارەساتە لە لایەن حیزب و لایەنە سیاسییەکان و تیپە هونەرییەکانی کوردستان لە شارەکاندا، لە پێشکەشکردنی چالاکی شانۆیی و گۆرانی و سروودو کاری هونەریدا.

سەرنجی ئەم مانشێت و ناونیشانە ڕۆژنامەوانییانە بدەن:

- ئاوارەو ئەنفال لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە ئیدارییەکاندا، ڕیپۆرتاژ، ژ١٨٤، ١٩٩٥/١٢/٥.
- یادی ئەنفالیش ئەم ساڵ بوو بەدوو، (گۆشەی تایبەت (ژ١٩٩)، ١٩٩٦/٤/٢
- ئەو ڕۆژانەی (ئەنفال) گەیشتە ناوچەی قەرەداغ، (وتار)، ژ ٢٠٠، ١٩٩٦/٤/٩.

---

[17] ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)، ژمارە یەکی لە ١٩٩١/٦/١دا بە چوار لاپەڕەی قەوارە بچووك دەرچووەو تائێستاش بەردەوامە.

- ڤیستیڤاڵی یادکردنەوەی ئەنفالە بەدناوەکان، (هەواڵ)، ژ۲۰۲، ۱۹۹٦/٤/۲۳.
- یـەك ڕیـزی گـەل و هێـزە سیاسـییەکانی، وەفادارییـە بـۆ قوربانییـەکانی ئـەنفال، (مانشێنت)، ۲۱۷، ۱۹۹٦/۸/۱۳.
- تراژیدیای لەبیرکراو سەرە قەڵەمێك بۆخوێندنەوەی ئاکامەخراپەکانی ئـەنفال، (وتـار)، ژ۳۱٥ ۲٦ /۸ / ۱۹۹۸.
- قوربانیانی ئەنفال دوو ڕەهەندی مرۆیی و سیاسین نابێ بێ چارەسەر بمێننەوە (سەروتار)، ژ ۳٤۷، ۱٤ /٤ /۱۹۹۹.

کرێکارانی جیهان یەکگرن!

نیشتمانێکی ئازاد و
گەلێکی بەختیار
دیموکراسی بۆ عێراق
مافی بڕیاردانی چارەنووس
بۆ گەلی کوردستان

# ڕێگای کوردستان

# REGAY KURDISTAN

یەکەمین ژمارەی بە ناوی (ئازادی)یەوە لە نیسانی 1944 دا دەرچووە

ژمارە (441)ی ساڵی (56)
دووشەممە (19)ی فیبرایەر
(22)ی ڕێبەندانی 2700 ی کوردی

## لە پێناو خوێندنەوەیەکی بابەتییانەی هەل و مەر
## پتەوکردنەوەی ڕێکخراوەکانی حزبمان و بە جە
## با خەباتمان جۆش بدەین بۆ هێنانەدی ئاشتی و ئ
## گشتی و ئاسایی کردنەوەی بارودۆخ

### حزبی شیوعی کوردستانیمان کۆتایی بە کۆنفرانسە گشتییەکەی دەهێنێ و بەلاغێکی کۆتاییش دەردەکات

ئەوەی خوارەوە دەقی ئەو بەلاغی کۆتاییەیە

رۆژنامەی ڕێگای کوردستان

## ئەدەبیاتی ئەنفال لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا:

مەبەست لە (ئەدەبیاتی ئەنفال) ئەو ئەدەبەیە کە لە ناوەڕۆکەکەیدا گوزارشت لە کارەسات و تاوانی ئەو زنجیرە پەلامارەیە کە ڕژێمی عێراق لە ۲۳ی شوبات – ٦ی ئەیلولی ۱۹۸۸ کردیە سەر خەڵکی زۆربەی‌ناوچەکانی کوردستان، کە تیایدا بە چەکی قورس و گازی کیمیایی قەدەغەکراو خەڵکێکی زۆری کوشت و زیاتر لە (۱۰۰) هەزار خەڵکی بێ تاوانیش تێدا بێ سەرو شوێن کرد. ئەو تاوانە هەستی ئەدیبی کوردی لە ناخەوە هەژاندو کۆمەڵێ بەرهەمی ئەدەبی لە شیعرو چیرۆك و وتار لە دایك بوون. هەوڵدەدەین چەند نموونەیەك وەربگرین، چونکە بیبلۆگرافیایەکی تەواو بۆ هەموو بەرهەمەکان قوورسەو لە ئەستۆی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا نییە.

## ئەنفال و شیعری کوردی:

شیعر، پانتاییەکی گەورەی لە تۆپۆگرافیای ئەدەبی کوریدا داگیرکردووە، هەمیشە لەگەڵ ڕۆحی کورد ئاشنا بووە و لە هەموو سەردەمەکاندا بەشی زۆرینەی خیتابی ڕۆشنبیری کوردی بووەو لەگەڵ هەست و سۆزو ئەندێشە مامەڵەی کردووە. شاعیری کورد لە کێشە و گرفتەکانی سەردەمی خۆیدا دەستە پاچە نەبووەو هەوڵیداوە یادەوەری ڕابردوو لە ئێستادا زیندوو بکاتەوە و زۆر جاریش لە (ئێستا) دا بۆ ئایندە بڕوانێ. (ئەنفال) شاعیری بۆ زەمەنی ڕابردوو بردووەو لە مێشکی خۆیدا ئەو سروودو گۆرانییانەی ساڵەها مێشکی ئازارداوە هەڵبوەشێنێتەوە و ئاراستەیەکی پێچەوانەی بداتێ، ئەگەر جاران قافڵە بۆ عەجەم بەڕێ دەکەوت و (پاوانەی یار) بە زرنگ و هۆڕی خەڵکی سەرسام دەکردو حەپەساوی دەکردن، ئێستا پاوانەکان نەك هەر قافڵە ناگەڕیننەوە، بەڵکو نائومیدی و دڵەڕاوکێش دەخەنە دەروونەوە:

پاوانەکانی موحیبەت، گەر ئەمجارە، زرنگەیان لێوە بێ،  
قافڵە لەڕێی عەجەمەوە، ناگەڕێتەوە،...  
کوڵوانەو گۆزەی شکاو و قۆریە چای بەجێماوی  
هێشتا گەرمی ئێوەیان پێ یە...  
هۆرەی کوژراوو، ڕەشماڵی بێ نازو،  
فەقیانەی تەڕو خوێناوی ئێوەیان، هەڵگرتووە...  
قافڵەکان لە عەرعەرەوە دێنەوە!

پووزەوانەی بێ قاچ و، چاوەزاری شکاوی

سەردەرگای فیردەوسە ڕووخاوەکانیان بارکردووە[18].

ئەو قافڵەیەی، کە هەرگیز ناگەڕێتەوە، هەموو شتە جوانەکانی ماددی و مەعنەوی خەڵکی ئەنفالکراویان هەڵگرتووە، کوڵوانەو گۆزەو پووزەوانەو چاوەزارو هەموو ئەو شتانەی بوونەتە بەشێك لە ژیانیان. ئەم مەرگە ساتە مەسیح ڕادەچڵەکێنێ و هێمایەکە، ئەگەر سوورەتی (ئەنفال) دەروەست نەهات، با مەسیحی ئاشتی بتەزێنێ و لە خاچی خۆی دایگرێ:

بە ناوی ئێوەوە،

لە پێشەکیی چاپی دەیەمی ئینجیلدا، مەسیح، نووسیبووی

کێ (ئەنفال) م بۆ دەخاتە ڕستەوە

لە خاچەکەم دێمە خوارێ و

سەری خۆمی پێ دەبەخشم![19]

(شێرکۆ بێکەس) دەستی نزا بۆ مەلەك تاوس بەرز دەکاتەوە لەگەڵ سروودەکانی ڕۆحی پاکدا لە لووتکەی کێوی لالشدا هەروەك دەروێش و فەقیرو قەواڵەکانی خۆی لە (جیلوە)یەکدا ئاهو حەسرەتی کیمیایی (هەڵەبجە) و گوندە وێرانکراوەکانی گەرمیان و خۆشەویستی نیشتمان و یارو پیرۆزی خۆی هەمووی پێکەوە تێکەڵ بە یەك بکات:

ئەی فریشتەی ڕۆحی سپی!

ئەی (مەلەك تاوس)ی ڕەنگین

بە ڕەنگەکانی وڵات و بە ڕەنگەکانی قوربانییم

باڵ لێکدەو سەرکەوە سەر کەلی

ژاڵەیی جەستەی من

بە دەنووك لە تۆوی ڕووناکیی شیعرم و

ریشاڵی ئەنگۆرەی "هەڵەبجە"م هەڵگرەو

بیبەوە "لاش"

بارانی ئەم ڕەنگەیش موتوربەی ئاسمانی

---

[18] جەمال غەمبار، وەرزە ئاڵەکانی عەدەم، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ۲۰۲، ۲۰/۱/۶/۱۹۹٦.

[19] جەمال غەمبار، وەرزە ئاڵەکانی عەدەم، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ۲۰۲، ۲۰/۱/۶/۱۹۹٦.

"مەسحەفا" و ناو خۆڵی "جیلوە" کە

با گوڵی هەتاوێ لەم شەوی لەشەدا بڕسکێ

نەبینراو، با قوڕی "بەراتە" و ئەموستی وەریوی "گەرمێن" و

چەند پەڕێ لەتێلی تاوست و چەند تاڵێ لە قژی

یارەکەم، هەر هەموو، پێکەوە بشێلین،

بۆ ئەوەی لەم جەستە نوییەدا، لە جەستەی

" قەوال و فەقیر"دا لە کەنار شەوێکی زیوییندا،

ڕۆحێکی تازەتر لەبەردا بڕوێنین، بۆ ئەوەی

بەردەوام پێکەوە لەگیانی شەوێکی سپیدا

هەڵفڕین[20]

(ئیسماعیل بەرزنجی) لە (دژە دیمەنەکان) دا، هەموو وردو درشتی کارەسات و پاڵەوانیەتی و شکستەکانی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد لە بۆتەی دوو وشەدا کۆ دەکاتەوە کە مەدلوولی ئەو دوو وشەیە پێوەندییەکی دیالێکتیکیانەیان پێکەوە هەیە و سەر جەمسەری دوو یادەوەرین، کە ئامادەیی بەردەوامیان لە زەمینی تاکی کورددا داگیر کردووە و ئەوانیش ئەنفال و کیمیابارانن، کە دوو تاوانی سەدەی بیستەمن:

**مێژوو**

نە نووسراوەکانی توینبییە

نەچەند بەرگەکەی عەبدولرەزاق حوسەینی یە

نەکیفاحی هیتلەرە

نەچەند کتێبەکانی کەمال مەزهەرە

مێژوو دوو وشەیە

١-ئەنفال

٢- کیمیا باران[21]

---

[20] شێرکۆ بێەس، سوودەکانی مەلەك تاووس، گ. ئایندە، ژ١٦، ١٩٨٨، ل١٦٢.

[21] ئیسماعیل بەرزنجی، دژە دیمەن، گ. ئێستا، ژ١٥، ١٩٩٨، ل٢١٥.

لای (کەژاڵ ئەحمەد) (ئەنفال) هاوشێوەی(هۆلۆکۆست)ی جوولەکەکانی ئەو ڕوپایەو ئەو قڕکردنەی لە سەردەمی دووەمین جەنگی گێتیدا لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیکێشان و بوون بە سووتووی ڕق و قینی درێژبووەوەی پێش خۆیان و تیرۆانینی نازیزم بوو بۆ پارێزگاری لە (بوون)ی سەردەمی خۆی.

ئەنفال لە دیدی کەژاڵ وشك بوونەوەو لەبن هەڵکێشانی گوڵە جوانەکانی ڕۆحە وئیدی بەهاکان چی دەبەخشن ! میللەتێ دەسڕێتەوە.

جەستەی خۆڵە گەرمەکەی خۆی بخولقێنێ
ئەنفال ویستی:
بڵێ ئا ئەم گەردەلوولە ئیماندارانە دەتوانن
تەواوی نەوەیەك بە ناخی زەمیندا ببەن و
بڵێن ماڵئاوا.. میللەتە بێ ماڵەکان !
بیابان تۆ دەلیلم بە
ئەم شەو و ڕێگا غوربەتە پێم و دەمێکە
چرای شیعرم کۆکردە
- کە بردیانن هەموو شتێ بەرەو کاڵ بوونەوە دەچوو.
شۆڕش، ڕەوشت، جوانی
قەسیدە وەك ملی ئەوان
بەلادا کەوت
ئەو مێژووە
توانەوەی شەکری ڕووناکی بوو لەناو
ژەهراوی تاریکستاندا
تەسلیم بوونی گوڵەباغ بوو بەدڕکەزێ
حیکایەتی سەربڕاوی میللەتێ بوو
زوو شتی لە یاد دەچێ [٢٢]

---

[٢٢] کەژاڵ ئەحمەد، هۆلۆکۆست، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ١٢٧٤، ٢٨/٤/١٩٩٦.

یادەوەرییەکان لە ئاهەنگسازیی ئێستادا دەردەکەونەوە، مێژوو بە ڕوانینی بەعسیان یەك ئاراستەی هەیە ئەویش ڕابردوو بۆ ئێستایەکی ئەوتۆ، کە سەرکەوتن و گەورەیی خۆیان پیشان بدا لە زاڵبوون بەسەر میللەتانی دی لە ژێرپەردەی ئاییندا.

(بەختیار عەلی) دەڵێ: ((ئەنفال درێژکراوەی سەرەتای جیهادی ئیسلامییە، سەددام حوسێن خۆی درێژکراوەی پەیامبەرە. گەمژەییە واتێبگەین کە ئەجۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ مێژوودا تەنها سیستمێکی ڕەمزیانەیە و هیچی تر: ئەم شوبهاندنە ڕۆحی مامەڵەکردنی بەعسیانەو جەوهەری سەیرکردنێتی بۆ زەمەن.))[23]

## ب: ئەنفال و چیرۆکی کوردی:

لە ئەنجامی خوێندنەوەی ژمارەیەك چیرۆکی کوردی بلاّوکراوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا هەردوو چیرۆکی (ئاهەنگی ئەنفال)[24] و (سەعاتە وەستاوەکان)[25]م بە نموونە هەڵبژارد، کە ناوەرۆك و تەکنیکەکانیان شایانی لێکۆڵینەوەن، ڕاستەوخۆش دەربڕی دیمەنێکی ئەو کارەساتەن. بەکورتی باس لە گفتوگۆی نێوان ئاوو قوڕ دەکات، چیرۆکەکە لە جیهانی فانتیازیا بەو مانایەی دەرچوون لە شتە باوەکان و مامەڵە کردن لەگەڵ شتە بێ گیانەکان و بە قسە هێنانیان بۆ مەسەلەیەکی هونەری جوانناسیی.

---

بێجگە لەو شیعرانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا زۆر نموونەی دیکە هەبەن، وەك: فاتیح سەلام، پانۆرامای ڕاگوێزان و سووتماکی خاك، گ. ئێستا، ژ ١٦، ١٩٩٨؛ کەریم کاکە، دەقی ئەنفال حوجرەی کچان، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ ٢٨٩، ١٩٩٨/٢/١٨.

[23] بەختیار عەلی، یادەوەری وزەمەن، گ. ڕەهەند، ژ٦، ل٣٠.

[24] حەکیم کاکە وەیس، ئاهەنگی ئەنفال، گ. ڕامان، ژ٤٧، ل١٩٩-٢٠١.

[25] جەلیل کاکە وەیس، سەعاتە وەستاوەکان، گ ڕامان، ژ٤٧، ٢٠٠٠.

بێجگە لەم چیرۆکانە، چیرۆکی دیکەش بە شێوەی کتێب بلاّوکراونەتەوە، بۆیە نەکەوتوونەتە ناو ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەك: حەکیم عەبدوللا کاکە وەیس، چیرۆکی سەببیە شێت، گ. ڕامان، ژ٤٣، ٢٠٠٠، ل١٨٢-١٨٥؛ حەسەن مەحمود حەمە کەریم، چیرۆکی دایە مەنیج، گ ڕامان، ژ ٥٠، ٢٠٠٠، ل٢١٥-٢١٨؛ محەمەد ڕەشید فەتاح، ڕۆمانی ئەنفال، سلێمانی، ١٩٩٧؛ حسین عارف، ڕۆمانی هێلانە، سلێمانی، ١٩٩٩.

هەروەها لە کاری هونەرییشدا بەتایبەتی فیلمی (ئەنفال) لە سیناریۆو دەرهێنانی هونەرمەند کامەران ڕەفیق لە سالی ١٩٩٩ لە شاری: سلیمانی پێشکەشکرا، بڕوانە: محمد حمه صالح توفيق، فیلمی ئەنفال چۆن مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی ئەنفالدا دەکات، گ ئایندە، ژ ٣، ١٩٩٩، ل٤٢-٥٤.

پاڵەوانێکی سەرەکی دیار نییە، بەشێوەی کۆ پاڵەوان نووسراوە، ڕاستە، لە هەموویان زیاتر گفتوگۆی (دیالۆگی) ئەفسەرەکە زاڵەو هەروەك خۆی دەڵێ: ((ئەو کاتەی بەڕێوەبەری ئاسایشی شاری X بووم، هاوڕێ حیزبییەکوردەکانم ژن و خوشك و کیژی خۆیانیان دەهێنان و بۆمان هەڵدەپەڕین.. سەمایان دەکرد، ستریپیان دەکرد.. بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی هەر(٣٠١) کچەکە لە جووڵەو (ثیمە)کە دا بەشدارن، لە گۆرانی مەرگ و سەمای خۆکوشتن و نووزەی جاویدانیدا، ئەمەش لەگەڵ ڕەوتی ڕوودانی کارەساتەکەدا هاوئاهەنگن، کە کارەساتێکی بە کۆمەڵکوژو بەکۆمەڵ هەتك کردن و بە کۆمەڵ زیندە بە چاڵ و ڕاگواستن بووە. ئەو ئاهەنگسازییە زیندووکردنەوەی وێنەی سەرکەوتنەکانی ڕابردووی میللەتێکی داگیر کەرە، کە لە ژێر پەردەی مەزهەبدا کلتووری ئێمەی شێواندووە و فەوتاندووە.

ئەفسەرەکە خۆی بە (هارونە ڕەشید)ەکەی جارانی بەغدا دەزانێ، ئەمڕۆ ئەویش حەزو ئالۆشە خەفەکراوەکانی بە پاکیزەی کورد دادەمرکێنێتەوە، ئەویش دەرهەق بە نەتەوەی ئێمە هاروونە ڕەشیدێکەو بکەر و بەکرێگیراوی هەمان سیاسەت و سیستمی میللەتی پیرۆزە.

خاڵێکی تر،کە سەرکەوتوویی و وردیی چیرۆکنووس پیشان دەدات، سازکردنی ئیقاعێکی ناڕێکە، ناڕێکی لە ڕوودانی ڕووداوەکان، دەنا ئەو نەشازیی ئیقاعە لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکە، کە پەشێوی و تێکچڕژانی (ئەنفال) و شێواوی جووڵەو کارو دەروونی گشتییە ئەوەندە گونجاوە، خوێنەریش دەخاتە هەمان حەپەساوی و تراژیدیاکەو بەمەش ڕێك لەگەڵ ئەرکی تراژیدیا لە ڕوانگەی (ئەرستۆ) وە دەردەخات، کە پاك کردنەوەی دەروونە لەترس و بەزەیی و خوێنەریش دەبێتە یەکەیەکی ئەو فانتازیایە. ئەم ڕستانە نائاسایین و ڕۆڵیان لەو ئیقاعە نەشازەدا هەیە،کە بۆ جوانکاری چیرۆکەکە بەکارهاتوون:

- پەڵە هەورەکان بەبێ بەرنامەو ڕێرەوی دیار پێکدا دەهاتن، تێکەڵ دەبوون و دادەبڕان و جارێکی دی تێکەڵ دەبوونەوە.

- بایەکی توند لە هەموو لاوە هەڵیکرد بوو.

- دارەکان بەهەموو لایەکدا دەشکانەوە.

- ئەفسەرەکە خۆی دەستی بە چەپڵەکوتان کرد، بەلاّم لەگەڵ ئاوەزەکەدا یەك نەدەهاتەوە.

- دڵۆپە بارانەکانیش نائاسایی بوون.

بوونی پەیکەرێکی لە قوڕ دروستکراو لە چیرۆکەکەدا وەك شاهیدێك پاشتر لە دووتێی سیمبۆلێکدا مانای شاراوەییمان بۆ دەردەکەوێت، کە گەڕانەوەیەکە بۆ هەمان یادەوەریی ئەفسەرەکە، ئەویش سیمبولی سیستمێکی سیاسیی دروستکراوی ئایینیە تەنانەت ئاماژە بۆ ئایەتی (کما خلقنی ربی...) هیچ شك و گومان ناهێڵێتەوە.

کۆتایی چیرۆکەکە، دەربڕی ناونیشانی ئەو ئاهەنگە ترازیدییە، کە (۳۰۱) کیژ دەبنە نیقاعی پچڕ پچڕو نەشاز تیایدا و دوای هەتك کردنیان دەبنە خۆراکی مەرگ. ئەو ئاهەنگسازیە بە هۆیهای قوڕو ئاوو سەرجەم مرۆڤایەتی کۆتایی دێت.

جەلیل کاکە وەیس لە چیرۆکی (سەعاتە وەستاوەکان)دا دنیای دابڕان و تەنیایی پاڵەوانی چیرۆکەکە وەها بەرجەستە دەکات: ((عەیامێکە ترسی تەنیایی دەمهاڕێت، هەر ئەوەندە تاك یکەومەوە قەراییەك بە لێڵی خۆیم پیشان دەدات، لێم دەبێتە کەسێکی زرپ و زیندوو..))، پاڵەوانی چیرۆکەکە لە ترس و سامسێکی سەیردا دەژی، لەگەڵ خۆیدا دەدوێ و کەسیچکە هێندە ترساو و مارانگەستەیە، گومانی لە هەموشتەکانی دەوروبەریەتی، زۆربەی کات مۆتەکەیەکی قسەکەر لەگەڵیا و لە ڕووی دەروونییەوە تووشی شیبزۆفرێنیا بووە ئەو مۆتەکەیی پیاسەی لەگەلدا دەکات و لەگەڵیدا پاکەت دەکڕیش و دەخەوێ و لە نیو دیری خۆیندنەوەی کتیبدا سەرەتاتکی دەکات، زۆرجاریش بە چپە شتی پێدەڵێ، پاڵەوان دەڵێ: ((لێم نزیك دەبێتەوەو بە چپە شتهایەکم پێ دەڵێت))

کەش‌وهەوای چیرۆکەکە جیهانێکی سامناك و لە هەمان کاتدا فانتازی بۆ خوێنەر دەخواقێنێ وەك لە بەرامبەر بینینی فلیمێکی ترسناك دا نیشتبیت وایە ئەو مۆتەکەیە، کە پاشتر دەردەکەوێ مرۆڤیکی ئەنفالکراوی ئەو گەرمیانەیە (سەرحەد) دەچێتە ناو شووشەی پەرداخ، کە ئەوەش بۆ خۆی هێمایەکە بۆ شوێنی ئەوان کە لەو بیابانی سەماوەیە کارگەی شووشەی لێیە، دەچێتە ناو شەکردان و هەمووشتەکانی ترەوە، پالەوان تایەیەکی گەرمیەتی و ئارەقەی کردووە و زیندە خەونان دەبینێ و لە تاو دەردی خۆی وڕینە دەکات، ڕۆڵی مۆتەکە (سەرحەد) دەردەکەوێتەوە و وەها خۆی دەناسێنێ: ((.. بەو ئاسانییە نامناسیتەوە، من ئافەریدەیەکی دەستی خۆتم و هەرکە کەوتمە سەرپێ خۆت بە خودانم نەکرد..))، لێرەوە هاوکێشەیەك دەخاتە ڕوو کە لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتیەوە تاوەك ئەمرۆ ینچینەی (بوون) و بیر و فەلسەفەکانی دنیای لەسەر دامەزراوە:

بارودۆخی فیکریی و سیاسیی ئەو ڕۆژەی هەولێر، برێتی بوو لە ململانێی فیکریی نێوان ڕۆشنبیرەکانی شیوعی و پارتی. زۆرینەی ڕووناکبیرەکان بە هۆی سەرکەوتنی یەکیەتی سۆڤیەتەوە بەسەر ئەڵمانیای نازی لە دووەمین جەنگی گێتیدا و بلاوبوونەوەی دروشمەکانی بیری سۆسیالیستی، کەش و هەوایەکی وای دروست کردبوو، کە لایەنگرانی باوەری زۆر پتەویان بەو حیزبە بێت، هەر لەو بارودۆخەدا و لەسەرەتای پەنجاکاندا عەونی یوسف و عومەر مستەفا (دەبابە) و جەلال تاڵەبانی و عەبدوڵلا ئیسماعیل و وریا کانی‌مارانی و لەتیف بەرزنجی و نەژاد عەبدوڵلا عەزیز... هتد بەدزی و نهێنییەوە خەریکی کاری حیزبایەتی بوون بۆ شانەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەولایشەوە چەندین ڕۆشبیری وەك عەزیز محەمەد و مەلا شەریف و جەمال حەیدەری و عاصم حەیدەری و عەلی فەتاح دزەیی و زیوەر خەتاب و شێخەشەل (خاوەنی کتێبخانەی هەولێر)و چەندانی دی سەر بە بەرەی چەپ و شیوعی بوون.[٣] لەو نێوانەشدا هەندێ ڕۆشنبیری کورد بێ لایەن و دوور لە حزبایەتی بە تەنیا خەریکی کاری ئەدەبی بوون، لەوانە: مارف خەزنەدار و جاهید وکانی و پیربال مەحموود.

لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە لە سەرەتای پەنجاکاندا هەولێر یەکێك بوو لە سەنتەرەکانی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی لە کوردستاندا و بلاوبوونەوەی ڕۆژنامەی (هەولێر-اربیل) لە سالانی (١٩٥٠- ١٩٥٣) دا لە لایەن کۆمەلەی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێرەوە، گۆڕان و وەچەرخانێکی تازە بوو لە مێژووی ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی کوردیدا. ڕۆلێ دیارو بەرچاوی نووسەرانی وەك: (عیزەدین فەیزی و زەکی ئەحمەد هەناری و مارف خەزنەدار و علی چوکل بەریە و گیوی موکریانی ومحەمەد عەلی کوردی و حوسێن ڕەشوانی، لە ناساندنی مێژوو و ئەدەب و زمان و کەلەپووری کورد بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبییەوە، دیار و بەرچاوە).

لە یەکەمین ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیەدا عیزەدین فەیزی نووسیویەتی:

ئەم هەولێرە قەدیمە، کە میللەتێکی دلپاك و چاکی تێدایە، لە مێژە لە خوێندنەوەی ناوخۆی و زوبانی خۆی مەحرومە. جا ئەی هاوولاتیەکانی خۆم، مەعلومە لاتان کە زۆرترین شارە گەورەو بچووکەکانی عیراق، ڕۆژنامەی خۆیان لەناو خۆیاندا بلاوئەکرێتەوە و

---

[٣] چاوپێکەوتنی نەژاد عەبدوللا عەزیز لە هەولێر ڕۆژی ٢٠٠٠/٨/٧.

ئەخوێنرێتەوە... ئەمە یەکەمین رۆژە لە هەولێر رۆناکی رۆژنامە بلاو ئەبێتەوە و دلێ مامۆستایان و تێگەیشتووان گەش دەکاتەوە)[٤].

لە ناوەراستی مانگی مایسی (١٩٥٤)دا گۆڤاری (هەتاو) بلاّبووەوە، لەو کاتەدا کابینەی دووەمی (ارشد العمری) لە عێراق لەسەر کار بوو، ئەو گۆڤارە بە هەولێ (گیوی موکریانی) چاوی هەلێنا، لەوکاتەدا کە تەنیا چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی (ژین) لە سلێمانیەوە دەگەیشتە هەولێر، دەنا رۆژنامەکانی دی هەمووی عەرەبی وهی عەرەبە چەپەکان و نەتەوەییەکانی عەرەب و عێراقییەکان بوون، وەك: الشعب والاحرار وام درمان. هتد.

مۆلەتی گۆڤاری (هەتاو) فەزلەکەی هی (سعید قزاز)، وەزیری ناوەخۆ بوو، کە ناوبراو کورد بووە و پاشان لە مۆلەتی گۆڤاری (هیوا)یش لە سالێ (١٩٥٧)دا بۆ یانەی سەرکەوتنی کوردان دەوری هەبوو.[٥]

لە گۆڤاری (هەتاو) دا بەبۆنەی گواستنەوەی موتەسەرپیفی هەولێر (ئیسماعیل حەقی شاویس) ەوە نووسراوە: ((هەتاویش کە یادگاری دەوری مەعالی ئوستاد سەعید بەگ قەزازی وەزیری داخلیەی خۆمان و مامۆستا ئیسماعیل حەقی بەگی وێژەپەروەر...))[٦]

گیوی موکریانی

---

[٤] مەحموود زامدار، رۆژنامەی هەولێر حیکایەتی سەر هەلّدان و کۆتایی، ل١٢.

[٥] بۆ زانیاری لە بارەی گۆڤاری (هیوا)وە بروانە: هیمدادی حوسێن، رۆلّی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ١٩٩٨.

[٦] گ. هەتاو، ژ٧٢، س٢٠، ١٩٥٦، ل٣.

گۆڤارێکی وێژەیی [ ادبي ] هەفتەیی کوردییە جاری هەر لە دە
ڕۆژاندا جارێکی لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستاندا بەخش دەکرێت

Jimare 116 ♦ 4 20 Berfibez 2569 Kurdî « Madî »

ژمارە : ١١٦ سالی ٤ سێ شەممە ٢٠ بەفرەبار [ ١٠ کانوونی ١ ] ١٩٥٧


**Nawerok**



واگەلی شتی تریشی تیدا دەخوێنیتەوە

هەر لە ساڵی (١٩٥٤)دا، حکومەت بۆ ئەوەی بتوانێ بەرامبەر بە شالاوی ڕاگەیاندنی حیزبە نەیارەکان و ئۆپۆزسیۆنەکان بوەستێتەوە، لەپاڵ چەندین بڕیاریدیکەدا، فەرمانی داخستنی ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤاری ناوەوەی وڵاتی دەرکرد، لەوانە ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) و گۆڤارەکانی (الوادي، الحساب، العمل) پاشان ڕۆژنامەکانی (اخبار المساء، النهضة، النضال) بۆ ماوەی ساڵێك.[7]

هەر لەو ساڵەدا، لە هەولێر و شارۆچکەکانی دەوروبەریشیدا، خۆپیشاندان لە دژی حکومەتی دوازدەهەمی (نوری سەعید) سازدراوە، بۆ نموونە، لە شارۆچکەی شەقڵاوە لە پێناو کردنەوەی قوتابخانەی ناوەندی و چاك کردنی باری گوزەرانی خەڵکدا و دواتریش لە (١٩٥٥)دا دیسان بەبۆنەی سەردانی (نوری سەعید)ەوە بۆ ئەو شارۆچکەیە و لە دژی پەیمانی بەغدا خۆپیشاندان سازکراوە[8].

بەشداریی عێراق لە (پەیماننامەی بەغدا)دا، جارێکی دی عێراقی دەروەست بە سیاسەتی ئینگلیز کردەوە، ساڵێك دواتر لە (١٩٥٦)دا بە هۆی هێرشی سێ لایەنە بۆ سەر هێزە نیشتیمانیەکان بە ڕێگەی نارەزایی و خۆپیشاندان لە عێراق بە گشتی، لە هەولێریش ڕق و تووڕەیی خۆیان و هەڵوێستی دژ بە حکومەتیان دەربڕی، حکومەت ناچار بوو لە کۆتاییدا هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ و یارمەتی سەربازیی بۆ میسر بنێرێ و لە پاڵ ئەوەشدا کۆمەڵێ بڕیاری گرنگ دەربکا لە داخستن و ڕەت کردنەوەی مۆڵەتی هەموو ڕۆژنامەکان و داواکرا، کە نابێ لە حەوت ڕۆژنامە زیاتر لە بەغدا دەربچێ.[9]

ساڵی(١٩٥٨)، ساڵێکی گرنگە لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا، بە ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و سەرکەوتنی هێزو ئیرادەی گەل لە بەرامبەر ئیمپیریالیزمدا گۆڕانکارییەکی گەورە ڕوویدا. لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە چەندین دەستکەوتی گەورە لە بواری چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانیدا وەدەست هات، کە بەرهەمی ئازادیی بیرو بۆچوون و سیاسەتی ئەو سەردەمە بوون. گۆڤارەکانی (شەفەق) و ڕۆژنامەکانی (برایەتی) و (خەبات)، پاشتر ناوەندی ڕووناکبیریی کوردستانیان بووژاندەوە، بەڵام ئەو سەربەستی و ئازادییە لە دوای ساڵی (١٩٦٠)ەوە، بە هۆی

---

[7] بڕوانە، عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط ١، ج٩، ص١٢١.

[8] بڕوانە، ب. سیروان، چەند چالاکییەکی جەماوەری...، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ٧٦-٧٧.

[9] بڕوانە، عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط ٦، ج ٩، ص١٥١.

ناکۆکی کورد و حکومەتەوە، بەوەی، کە حکومەت لە هەڵوێستی خۆی پەشیمان بووەوە و بارودۆخ بەهۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە کەوتەوە گرژی و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش لە کار کەوتن، گۆڤاری (هەتاو)یش دوای حەوت ساڵ تەمەن و (١٨٨) ژمارە داخراو (گیوی موکریانی)ش بە تاوانی کوردایەتی بۆ خوارووی عیراق دوورخرایەوە.

## ناساندنی گۆڤاری (هەتاو):

دوابەدوای ئەو بارودۆخە سیاسیی و ڕۆشنبیرییەی لە ساڵانی پەنجاکان، کە لە فەسڵی یەکەمدا باسمان کرد، لە ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردیدا بە تەنیا ڕۆژنامەی (ژین)[١٠]، لە شاری سلێمانی بڵاودەبووەوە و ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرو ڕووناکبیرەکانی هەموو شارەکانی کوردستانی باشوور بەشداریان تێدا دەکرد.

لە شاری هەولێر بە هەوڵ و هیممەتی جوامێرانەی (گیوی موکریانی) خاوەنی (چاپخانەی کوردستان) توانرا جارێکی تر گۆڤار و ڕۆژنامەوانیی کوردیی لەو شارە دێرینەدا بە هەرمێن بکرێتەوە. بە تایبەتی تازە (ڕۆژنامەی اربیل- هەولێر)[١١] داخرابوو.

لە پێشدا بە پێویستی دەزانین لە ئاست خزمەتی ئەدەبی و ڕۆژنامەوانیی گیوی موکریانیدا هەڵوێستەیەك بکەین. ئەم ڕووناکبیرە بە بنەچە کوردێکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە و لەگەڵ (حوزنی موکریانی) کاکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چاپخانەیان هێنایە کوردستان و سەرەتا لە حەلەب پاشان ڕەواندز و دواجار لە هەولێر گیرسانەوە. بوونی ئەم یەکەم

---

[١٠] ڕۆژنامەی (ژین) پیرەمێردی شاعیر دایمەزراندو تا وەفاتی لە (١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠)دا هەر خۆی سەرپەرشتی دەکرد. دوای ئەو چەند جارێك سەرپەرشتی کەرانی گۆڕران.(جەمیل سائیب و گۆران و نوری ئەمین بەگ و ئەحمەد زرنگ هەر یەکەیان ماوەیەك سەرپەرشتییان کردووە). بارستی (ژین) زۆر جار گۆڕرا، بەڵام بەشێکی زۆری ژمارەکانی (٣٤ X٣٠سم)ن، بڕوانە: د.کمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی...، ل٢٢٢.

[١١] ڕۆژنامەیێکی زانستی وێژەیی هەفتەیی بوو لە شاری هەولێر لە لایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی هەولێر دەردەچوو، ژمارە (یەکی) لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠دا دەرچووە، هەتا ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بووە، مودیری مسؤول جمیل ڕشید بووە، دەستەی نووسەران لە حسین الرشوانی و عزالدین فیضي و ئەستێر سعید پێك هاتبوو و مدیری ادارە جمال جمیل بووە، بڕوانە:جمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٥٩.

چاپخانەیە لە مێژووی چاپ و چاپەمەنی کوردیی لەم شارەدا، هەرچەندە سادەو ساکاریش بوو بێت بۆ چاپی کتێب و بڵاوبوونەوەی بزاڤی ڕۆژنامەوانیی کاریگەرییەکی زۆری بووە. لە ڕێگای ئەو چاپخانەیەوە چەندین دیوانی شیعری شاعیرانی کلاسیك و فەرهەنگ و بابەتی مێژوویی و ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا چاپکراون دوابەدوای کۆچی دوایی (حوزنی) کاکی لە ساڵی (١٩٤٧)دا، ئیتر بە تەواوی کاروباری چاپخانەکە کەوتە دەست گیوی موکریانی، ئەویش هەر لەسەر ڕێبازی پێشووی کاکی لە خزمەتی وشەی کوردیدا بوو، لە پێگەیاندن و ڕێگە نیشاندان و هاندانی چەندین شاعیر و نووسەری کورد لە هەموو لایەکی کوردستانەوە دریغی نەکردووە. تەنانەت لە گەنجیشدا لە سەنعەت و دەست ڕەنگینی و زمانزانییەکەی چەندین کەس بەهرەی وەرگرتووە. محەمەدی قازی وەرگێڕی بە توانای کورد، کە بەرهەمێکی زۆری تەرجەمەی سەر زمانی فارسی کردووە، بە شانازییەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لەسەر دەستی گیوی موکریانی لە مەهاباد فێری زمانی فەرەنسی بووە.[12]

بڵاوکردنەوەی (گۆڤاری هەتاو) یەکێکە لە هەوڵە ڕۆژنامەوانییەکانی گیوی موکریانی یەکەم ژمارەی لە (١٩٥٤/٥/١٥)دا لە هەولێر بڵاکراوەتەوە. لەو سەردەمەدا تاقە گۆڤاری کوردی بووە لە کوردستاندا دەرچووە. بە پێی شارەزایی منن، لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی ئەکادیمی لە بارەی ئەو گۆڤارەوە نەنووسراوە، جگە لە چەند ئاماژەیەکی پەرت و بڵاو و ئەوە نەبێ، کە چەند ژمارەی لێ دەرچووە و کەی و لە لایەن کێوە، زیاتر نیە:

((گۆڤارێکی وێژەیی هەفتەیی کوردی بووە، بۆ ماوەیەك، دوو هەفتە جارێك دەرچووە، وە ماوەیەکی تر هەر دە ڕۆژ جارێك دەرچووە، خاوەنی ئیمتیازو بەڕێوەبەری گیوی موکریانی بووە، بەرپرسیاری پارێزەر ئیبراهیم عەزیز دزەیی بووە، ژمارە یەکی لە ڕۆژی یەکی مایس ١٩٥٤دا دەرچووە نزیکەی ١٨٨ ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.))[13]

---

[12] بڕوانە محمدی مەلا کریم، گیوی موکریانی ڕێی بۆ موحەممەدی قازی خۆش کرد ببێ بەو وەرگێڕە بەناووبانگەی کە بوو، گ. ڕەنگین، ژ١٩٩٦،٨٨، ل٢٢-٢٥.

[13] جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ل٦٢.هەروەها بڕوانە: مەغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، گ کاروان، ژ٣٢، ١٩٨٥، ل١٥.

سەرنووسەری گۆڤارەکە محامی ئیبراهیم عەزیز ئاغای دزەیی بووە و خاوەن ئیمتیازو هەڵسووڕێنەر گیوی موکریانی بووە. لە ژمارە (٤٠)ەوە سەرنووسەری بووە بە (محمد شهاب الدین دباغ) و لە ژمارە (١٣٨)ەوە بووە بە (جلال قادر). لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نووسراوە: ((گۆڤارێکی وێژەیی (ئەدەبی) هەفتەیی کوردییە جارێ هەر لە ١٠ ڕۆژاندا چەلێکی پەخش دەکرێت)).

ئەم گۆڤارە بەهۆی گیروگرفتی چاپ و توانای ماددییەوە نەیتوانیوە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا دەربچێت، هەندێ جار بە دە ڕۆژان و هەندێ جاریش زیاتر لە پازدە ڕۆژان ژمارەیەکی لێ دەرچووە. مەسەلەیەکی دی، کە سەرنج ڕا دەکێشێ ئەوەیە، نووسەرانی کورد، لە شارەکانی سلێمانی و بەغدا و لە دەرەوەی کوردستانیشدا بەرهەمی خۆیان بۆ ڕەوانە کردووە و بەشداری نووسینیان کردووە.

جەبار جەباری لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، وەها گۆڤاری (هەتاو) هەڵدەسەنگێنێ: ((ئەم گۆڤارە دەستێکی باڵای هەیە لە پێگەیاندن و هاندانی ڕۆشنبیرە تازە هەڵکەوتووەکانی گەلی کوردمان، وە هەمیشە بە ئسلوبێکی دڵ بزوێنەر پاڵێ بە لاوەکانەوە ئەنا بۆ هۆنینەوەی هەڵبەست و بە زۆری بەرهەمەکانیشیان بڵاوئەکرایەوە.))[14] هەروەها لە میانەی گفتوگۆیەکەدا لە بارەی باری ڕۆشنبیریی و ئەدەبی پەنجاکانی شاری هەولێرو کۆیەوە، (دڵزار) لە بابەت گۆڤاری (هەتاو)ەوە گوتویە: ((ئەم گۆڤارە ئەگەر چی لە ڕووی هونەری و داڕشتنەوە بەهێز نەبوو، بەڵام خزمەتێکی باشی زمان و ئەدەبی کوردی کرد، گەلێ شاعیرو نووسەری کوردی پێ گەیاند.))[15]

بە شێوەیەکی گشتی لە بارەی ئاستی ئەدەبی و هونەری گۆڤارەکەوە دەتوانین بەسەر دوو قۆناغدا دابەشی بکەین:

یەکەم: بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمموز.

دووەمیان: قۆناغی دوای شۆڕش.

لە قۆناغی یەکەمدا، ئاستی گۆڤارەکە لاوازیی لە ڕووی بابەت و ڕوخسارەوە پێوە دیارە،هەروەها بەشداریی ڕۆشنبیرو نووسەرانی هەولێری کەمتر تێدا بەدی دەکرێ، بە

---

[14] عبدالجبار محمد جباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ل١٠٤.

[15] گ. ڕامان، ژ٤٠،س٥، ل١٥٣.

پێچەوانەی قۆناغی دوای شۆڕشەوە، نووسەرانی کورد لە هەموو لایەکەوە بەرهەمیان بۆ ڕەوانە کردووە، بەلاّم دیسانەوە دەبێ ئەوە بلێین، چونکە لەلایەن (گیوی موکریانی) و بەپارەو پوولی خۆی و بە ئیمکانیاتی کەمەوە دەردەچوو لە ئاستی پێویستدا نەبووە، لە وەلاّمی ڕەخنەیەکدا،کە بۆچی نووسەران زیاتر بۆ گۆڤاری (پەیام) دەنووسن، (گیوی موکریانی) دەلێ: ((هۆی ئەوەی کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ ناکرێت و کەمتر وتاریشم بۆ دەنێررێ، تەنها لە وەی دەزانم کە لەم خاکەدا هەستی نیشتیمانی سست و بێ برەوە، پەیام چەورە ومن و هەتاویش یەك لەیەك تر ڕووت و هەژارترین.))[16]

## بابەتە ڕۆشنبیریی و ئەدەبیەکان:

بابەتە ڕۆشنبیریی و ئەدەبییەکانی گۆڤارەکە هەمە چەشنە و فرە لایەنن. ئێمە هەوڵ دەدەین لە ئاست چەند بابەتێکدا هەڵوەستەیەك بکەین:

### شیعری کوردی:

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و بە تەواوی لە دوای بڕانەوەی یەکەمین جەنگی جیهانی، شیعری کوردی تازەبوونەوەیەکی بە خۆوە بینی و ئەو تازەبوونەوەیە هەردوو لایەنی ڕووخسارو ناوەڕۆکی گرتەوە. لە ڕووی ڕووخسارەوە، گۆڕان بەسەر کێشی شیعری کوردیدا هات و زیاتر کێشی بڕگەیی یان کێشی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی سەرنجی شاعیرانی ڕاکێشا، لە ڕووی زمانیشەوە، وشە و زاراوەی کوردیی پەتی جێگەی وشەوزاراوەی شیعری ڕۆژهەلاّتی ئیسلامی گەلانی دراوسێ لە عەرەب و فارس و تورکی گرتەوە، لە ڕووی قافیەوە، زیاتر جووت قافیە و قافیەی ڕەنگاو ڕەنگ بلاّوبووەوە، قالّبە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی وەك غەزەل و قەسیدە و چوارین..کەم بوونەوە و شیعری ستوونی و پاشان شیعری ئازاد پەرەی سەند.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، قۆناغێکی ڕووناکبیری ولاکردنەوە بەلای کێشە سیاسی و نەتەوەییەکاندا هاتە گۆڕێ و چوارچیوەکۆنەکەی پێشوو لە غەزەل و دلّداری و وەسف جێگەیان لەق بوو، کێشە کۆمەلاّیەتییەکان زەمینەیەکی بەرفراوانیان لە جەستەی شیعر داپۆشی. ڕۆلی شاعیرانی وەك (زێوەر و پیرەمێرد عەبدولرەحمان بەگی بابان و شێخ نووری شێخ سالّح و

[16] گ. هەتاو، ژ٣٧، ل١٨.

گۆران)، لەو تازەکردنەوەیەدا شایانی ئاماژە پێکردنن. ئەو ڕەوتە نوێیەی شیعر درێژەی کێشا، تا لەگەڵ کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی گێتیدا بە تەواوی ئاسەواری شیعری کلاسیکی ون بوو و ڕۆژگارە پڕ لە ڕووداو و هەڵبەز و دابەزەکەی ئەو سەردەمە ڕێگەی بۆ شیعر خۆشکرد، کە ببێتە بەشداریکەر لە گرفتەکانی سەردەم و پەیامێکی سیاسی وکۆمەڵایەتی وشیارکەرەوە بهێنێت و دەروەست بوون لە شیعردا بووە دروشمی سەرەکی شیعر، لەم ڕووەوە (د. مارف خەزنەدار) دەڵێ: ((هەرچی شیعریش بوو مەیلێکی ئەوتۆی بۆ شیعری کلاسیکی لە ناوەوە نەبوو. لە مەیدانی چێژی ئەدەبیدا (ژدانۆڤیزم) و قوتابخانەی (ریالیزمی سۆسیالیستی)بە هەرمین بوون.)) [17].

لە ڕووی ڕووخساریشەوە کێشی هەمەڕەنگ و شیعری ئازاد بووە باو و لەگەڵ واقیعدا ڕێکەوت. شاعیرانی ئەو سەردەمە بە خوێندنەوە و کاریگەریی شاعیرە نوێخوازەکانی ئەو سەردەمەی عەرەب هەوڵیان دەدا ڕوو لە دنیای تازەبوونەوەی شیعریی بکەن. (جەوهەر غەمگین)ی شاعیر لەسەر ئەو کاریگەرییە وەها دەردەخا: ((... ئێمە مانان لە ڕێی گۆڤار و خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی عەرەب وەك (نازك الملائکە، عاتکە الخزرجی، بدر شاکر السیاب، محمد خلیل شلش، علی الحلی، فاروق شوشە... هتد) کە زۆربەیان لە گۆڤاری (الآداب)ی بەیرووتی نووسینیان بلاّو دەکردەوە... تامو چێژی خۆیان هەبوو... ئێمەش جا چ لە ڕێی لاسایی کردنەوە چ لە ڕێی سروشتی خۆڕسکی کورد خۆی بێ... ڕێچکەی نوێخوازی بە دیارکەوت وجێی خۆی گرت.. من خۆم یەکێك بووم، کە (الآداب)م بەردەوام دەخوێندەوە و چێژم لێ وەردەگرت.. هەروا لە پەنجاکان (ئەدەبی مەهجەر) کە میخائیل نعیمە و جبران خلیل جبران) و هی تر نووسین و شیعرەکانیان کە ئەوروپیانە بوو.. دەکەوتە دەستمان و دەمانخوێندنەوە.)) [18]

بوونی گۆڤارێکی کوردی، لەو ڕۆژگارەدا،شوێن و پایەی خۆی لە دلی ڕۆشنبیرو شاعیرانی ئەو سەردەمەدا بووە، چونکە گۆڤاری (هەتاو) لە شاری هەولێر تاقە گۆڤاری ئەو سەردەمەی کوردستانی باشوور بوو، کە بتوانن وەك سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیریی کوردی سوودی لێ وەرگرن.

---

[17] گ. ڕامان، ژ٤٠، س ٥، ل١٥٠.

[18] هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

(مسعود کەتانی) لە ئامێدییەوە دەلیٚ:

شەڤ چ گاری بوو مە لیٚ دەرکەت هەتاڤ

روون کری ل من هزر و دل فکر و هەناف[19].

(جاهید)، کە ئەو سەردەمە گیوی موکریانی تەخەلوسی (شێواو)ی بۆ هەڵبژاردبوو وا هەستی خۆی دەردەبڕێ:

| | |
|---|---|
| هـــەتاو هەر تۆ هەتاوی | ئاسمانی خاکی کوردانی |
| ترووسکەی نووری عرفانی | دەلیلی ڕاهی خۆمانی[20] |

هەروەها (**قانع**)ی شاعیر وادادەڕژێ:

| | |
|---|---|
| هەتاو ئەمـــڕۆ وا تەواو هەتـــاوە | ترسی تاریـــــکی لەنـــــاو ەماوە |
| تۆ ڕابەرم بە بلێـــــــی بە کوردان | شاریاوەی هەژاروێلی بنبەردان[21] |

شیعری سیاسی و نیشتمانی لەو ڕۆژەدا بایەخی زۆری هە بوو، مەسەلە سەرەکییەکان،کە بوونەتە هەوێنی شیعری شاعیران برێتی بـوون لـە جۆشـدانی جـەماوەر بـۆ خـەباتی نەپساوەی کوردایـەتی و خۆشەویـستی خـاك و نەتـەوە و یـەکگرتن و ڕوو بـە ڕوو بوونـەوەی دوژمنـان، عەبدولکەریم **هێرانی** نووسیویەتی:

گەلی کورد نابەزێ هەرگیز لە کۆشین و هەوڵدانی

لە مەیدانی خەباتا چەندە ڕۆڵەی کردە قوربانی

لە سەرباز و کرێکار و قوتابی ورەنجبەر و جوتیار

گەلێکی تر لە ڕۆلانی شەهیدی خاکی بارزانی[22]

بە بۆنەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەری شەهیدی کوردستان، کە دوای ئەوەی لە کۆماری دیمۆکراتی کوردستاندا بەشدارییان کـرد، حکومـەتی عێـراق بڕیـاری خنکانـدنی دەرکـردن، لـە هەموو لایەکی کوردستانەوە ڕق وتووڕەیی جەماوەر وروژا، شاری هەولێریش لە کاتی ناشتنی تەرمی شەهید خەیروڵلاً دا وروژا، (لەتیف بەرزنجی) ئەو غەم وپەژارەیە دەردەبڕێ:

---

[19] گ. هەتاو، ژ١٢٩، س٤، نیسانی ١٩٥٨، ل١٠.

[20] گ. هەتاو، ژ٧٨، س٣،تشرینی دووەم ١٩٥٦، ل ٩.

[21] گ. هەتاو، ژ١٣٧، س ٥، تەممووزی١٩٥٨، ل١٣.

[22] گ. هەتاو، ژ١٦٦، س٦، تشرین دووەمی ١٩٥٩، ل١٣.

وا چوار قارەمانـــی دلێر چوار ڕۆڵەی کوردی نەڕەشێر
وا چوار شۆڕە سواریبەناو پاڵـــەوانی زنجیر کـراو
لەناو بەندیخانەو زینـــدان دوای هەزار جۆرە ئازار دان
واکار بەدەستانی ئێـــران فەرمـانی داون بەخنکـان
هەڵۆاسرێن بە قەنارەوپەت تاکو چاوی بشکێ میللەت
کـوردایەتی لـە بن بێنـن لـــە تێکۆشان بیوەستێنن
بێ گوناهن بــەلاّم کـوردن ڕۆڵــەی گەلێـکی نەبەردن
سەریان شۆڕناکەن بۆ دوژمن شانازی ئەکەن بە کوژتن [٢٣]

لە ڕووی ناوەرۆکەوە، چەندین بابەتی وەك سروشتی کوردستان و دوورکەوتنەوە لە هەندێ دیاردەی دزێوی کۆمەلاّیەتی وەك پۆکەر و قومار بەرچاو دەکەون.

(حەبیب عەلی میرانی) لە وەسفی بەهاری کوردستاندا کە لەو ساڵەدا لافاو بـووە، وەك شێوەن دەلێ:

لەرزین و تەرزەی لافاوی بەهار میرانـــی داینـا لە بۆ یادگار
برایـــان فەسڵی بەهارە ئیمڕۆ سەرزەمین گشتی گوڵزارە ئیمڕۆ
هەرچەندە فەسڵی بەهارە ئیمڕۆ هـەناسەم بەفری کۆسارە ئیمڕۆ
عادەتە لە ڕۆژ سەیران و شادی هەرکەس دلّداری خۆی دێتە یادی
لە ئاوی چاوم لافاو هاتە جۆش ڕاپمالێ هێزی فکرو فام و هۆش
ناوی ئــەم ساڵەم بەم تەرزە ساڵی دوو لافاو چەند بوومەلەرزە [٢٤]

(جاهید)،کە زیاتر بە ڕاگوزاری بە شێوەیەکی سـەرپێیی چـەندین شـیعری نووسـیووە لـە وەسفی هاوینە هەواری (پیرمام) دا هەستی خۆی دەردەبڕێ:

مەسیف سێیەمین ئەمە باسـتە دڵی شاعیران هەر ســوپاستە
چریکەی بولبول لەباخ و گوڵزار دیسان وا منی هێناوە گوفتار
مەنزەری بەرگی شینی سەرزەویت گرد و ئاقــاری بڵند و نەویت

---

[٢٣] گ. هەتاو، ژ١٨٠، س٧، حوزەیرانی ١٩٦٠، ل١٤.

[٢٤] گ. هەتاو، ژ١٢٦، س٤، مارتی ١٩٥٨، ل٧.

مەوج و شەپۆلی بوخار و تەمـت          هەزاران خەفەت لادەبا غـەمت[٢٥]

ئەگەر بە وردی لە ڕووی ڕووخسارەوە لە شیعرەکانی ئەو سەردەمە و ئەو قۆناغە بڕوانین، دەتوانین بڵێین، کاریگەریی قۆناغی شیعری نوێی کوردی پاش جەنگی جیهانی ئاشکرا دیـارە، جووت قافیە و بەکارهێنانی وشەی کوردی پەتی و بابەتەکانی چەوسانەوە و خـەباتی سیاسـی، لە شێوەی ڕێبازی ڕیالیزمدا خۆی دەنوێنێ.

**ب- وتاری هەمەچەشنە:**

دیـارە هـەموو گۆڤارێك،کـە بلاوّدەبێتـەوە، کۆمـەڵێ وتـاری هەمـە چەشـنەی لـە ڕووی ناوەرۆکەوە تێدایە، لە وتـاری مێـژوویی، زمانـەوانی، ئـەدەبی و زانـستی و.. هتـد. گۆڤـاری (هەتاو) یش لەم چەشنە وتارانەی بلاوّکردۆتەوە و دەتـوانرێ بـە ئاسـانی دەسـت نیـشانی هـەر یەکێك لەو چەشنانە بکرێت.

لە ناو وتارەکاندا ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشام گرنگی دان بـە وتـاری هونـەری بـوو، بـە تایبەتی (عومـەر دزەیـی) لـە بابـەتی مۆسـیقاوە بـە زنجیرە وتارێـك، کـە کـۆی کردونەتـەوەو وەریگێڕاون چێژی هونەری و زانیاریی ئەو نووسەرو وەرگێڕەمان پێشان دەدا، لە سـەرەتای ئـەم وتارەدا هاتووە: ((هونەری جوان ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەوە ئادەمیزادی پـێ گەیـشتوو دەتـوانێ تام لە جوانی بکات و زاناکانی پێشینان ئەو هونەرەیان کردووە بە دوو بەشی گەورە:

١- هۆنەرانی جوانی پایەدار

٢- هۆنەرانی جوانی جوولاوەیی

هونەری جوانی پایەدار وەك وێنەگەرێتی، بەردتاشی و دروسـت کردنـەو هـی جـوولاوەیی وەك مۆزیقە، هەڵپەڕکێ، هۆنراو.))[٢٦]

وتارنووسە دیارەکانی گۆڤارەکە برێتین لە: گیوی موکریانی، تاهیر بەهجەت مەریوانی و عومەر دزەیی و مارف خەزنەدار و ع. قرگەیی و تاهیر ئەحمەد حەوێزی... هتد.

بە شێوەیەکی گـشتی شـێوەزاری نووسـینی هـەموویان لـە ڕووی زمانـەوە لـەوەدا یـەك دەگرێتەوە، کە هەوڵیانداوە وشەی کوردیی ڕەسەن بـەکار بێـنن و لـە ڕووی ڕێنووسـەوە کـەمتر

---

[٢٥] گ. هەتاو، ژ١٨٠، س٧، حوزەیرانی ١٩٦٠، ل١٤.

[٢٦] گ. هەتاو، ژ١٢٦، س٤، مارتی ١٩٥٨، ل٧.

پێڕەوی ڕێنووسی عەرەبی بکەن، بە تایبەتی لە بەکارهێنانی پیتە بزوێن و بەکوردیکردنی پیتە عەرەبیەکاندا.

## پ- ڕێنووس و زمانی کوردی:

بە هۆی ئەوەی، کە **(گیوی موکریانی)** خاوەنی گۆڤارەکە هەر لە سەرەتاوە خەریکی کاری فەرهەنگنووسیی وگەڕان بەدوای وشەی کوردی پەتیی و زانینی زمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسی دابووە[27]، ئەمە وایکردووە لە گۆڤارەکەشدا گرنگییەکیتایبەت بە ڕێنووس و زمانی کوردی بدات، چ بە نووسینی خۆی و وەڵامی هەندێ کەس[28] و بلاْوکردنەوەی بیروڕای نووسەرانی دی لەو بوارەدا گۆڤارەکە دەولەمەند بکات. بۆ یەکخستنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لە پێناو زمانێکی (ستاندارد)ی نووسین هەولێداوە و نووسیویەتی: ((پێویستە نووسینمان بە چەشنێك بێ کە کوردێکی دیاربەکر بتوانێ نووسراوی برایەکی لوڕی خۆی بخوێنێتەوە و کوردێکی هەورامی لە نووسراوی کوردێکی شوان و زێلی و سورچی بگات.ئەوەش بە تێکەلاْو کردنی وشەی هەمووشار خێلاْت و هۆز و تیرەکانی کوردستان نەبێ پێك نایە نەك هەر وشەکانیان تێکەلاْو کرێن و بەس بەلْکو دەستووری سەرف و نەحوشیان کۆ بکرێتەوە بەو هۆیەوە زمانەکانپان و پۆڕو فراوان و دەولْەمەند دەبێ و ساردی و ناهومێدێتی و بێگانەیەتیش لە نێوانێ دانامێنێ.))[29]

لە بارەی ڕێنووسەوە، گۆڤاری (هەتاو) پێڕەوی ئەلف و بێی عەرەبی کردووە، بەلاْم هەولێداوە هەر هیچ نەبێ وەك هەنگاوی یەکەم ئەلف و بێی لاتینی بۆ کوردی بە ڕاست بزانێ و خوێنەرەکانی پێ ئاشنا بکات. لە ڕێنووسی عەرەبیشدا، وەك دەردەکەوێت پلانێکی دیاریکراوی نەبووە، بە گوێرەی نووسینی نووسەرەکان خۆیان چۆنیان نووسیبێ، گۆڤارەکەیش هەر بەو شێوەیەی بلاْوکردۆتەوە. بۆ نموونە، لە چەندین وتاردا کە نووسەرانی سلێمانی

---

[27] وەرگێڕی بەناوبانگی ئێران(محەمەدی قازی)، کە کوردێکی مەهابادییە، لە یادداشتەکانی خۆیدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، کە زمانی فەڕەنسی لە خزمەت (گیوی موکریانی)دا خوێندووە، بڕوانە: گ. ڕەنگین، ژ١٩٩، ٨٨، ل٢٢-٢٥.

[28] لە ژمارەی (١٢٩)ی گۆڤاری (هەتاو) دا گیوی موکریانی وەلاْمی تۆفیق وەهبی داوەتەوە، ل١٨-١٩.

[29] گ. هەتاو، ژ٧٧، س ٣١، تشرینی یەکەمی ١٩٥٦، ل١.

ڕەوانەیان کردووە، پیتە قاڵبی (ئە) لە پێش فرماندا بەکار هاتووە و ئەوانەی هەولێریش (دە) یان بەکار هێناوە. یان لە کاتی چاپکردنی پریپۆزیشنی (لە...دا)، (دا)یەکی دواوە هەندێ جار بە وشەکە لکاوەو نووساوە، بە پێچەوانەوە لە هەندێ وتاردا بە جیا لە وشەکەوە نووسراوە، یان نووسینی پیتی (و) لە هەندێ وشەدا بەیەك واو و لە هەندێ بە دوو واو نووسراوە. هەولێکی دیکەی گۆڤارەکە ئەوە بووە، زمانی کوردی لە وشە و زاراوەی بێگانە پاك بکاتەوە و لە جیاتی ئەوان وشە و زاراوەی کوردی بڵاوبکاتەوە، لە هەندێ ژمارەیدا لیستێکی کردووە بۆ دانان و پێشنیازکردنی وشەی کوردی، هەروەك:

| باکوور | سۆران | عەرەبی |
| --- | --- | --- |
| ڕەوش | خشڵ | زینت (زینە) |
| ڤیان | خۆشەویستی | محبت (محبە) |
| لالاش | کعبە | کعبە |
| هەدام | ڕوو | وجە |

## گۆڤاری (هەتاو) وچمکێ لە هونەرەکانی ڕۆژنامەوانیی:

بەر لە هەموو شتێك دەبێ بە چاوی ڕۆژگاری پەنجاکان لە گۆڤارەکە بڕوانین، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین، لەبەر نەبوونی ڕۆژنامە لە شاری هەولێر، لە ڕووی بابەت و هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە، گۆڤاری (هەتاو) تێکەڵاوە لە هەر دووکیان، چەندین هەواڵێ ڕۆژ و ئاگاداریی و ڕیپۆرتاژ و گۆشەی تایبەت بە کێشە سیاسی و زانستی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دەمە نووسراون.

### ئـ- هونەری هەواڵ:

هونەری هەواڵ لە گۆڤاری (هەتاو)دا، جێگەیەکی تایبەتی هەیە، لەبەر نەبوونی ڕۆژنامە لەو کاتەدا گۆڤارەکە کەلێنێکی گەورەی پڕ کردۆتەوە. ئەم هونەرە بە بڕبڕەی پشتی ڕۆژنامەوانیی دادەنرێت، بە تایبەتی بۆ ڕۆژنامەوانیی ڕۆژانەی هەواڵ، ڕەنگە لە گۆڤاردا کەمتر بایەخی هەبێ، چونکە لە ڕووی کاتەوە گەرماوگەرم نییە.

وێڕای جیاوازی ئایدیۆلۆژیاو بیرو بۆچوونی جیاواز و جۆری لێکۆڵینەوەیان بۆ پێناسە و ئەرکی هەواڵ، بەڵام هەندێ فاکت هەن، کە ناتوانرێ چاوپۆشییان لێ بکرێت، هەروەك وەڵامی

پرسەکانی (بۆ، کەی، لەکوێ، چۆن، کێ)، هەروەها تازەیی و ڕاستگۆیی و وروژان و سەرنج ڕاکێشان و پشتگیری و بەسوودی ... هتد.[30]

لە سیستمی نوێی ڕاگەیاندن و جیهانگەریدا، (هەواڵ) چەکێکی کاریگەرە لە خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی و ناساندنی ناسنامەی فەرهەنگی ئەو میللەتەدا، کە دەتوانرێ بەپێی بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ مەبەستی دیاریکراو دابڕێژرێ. هەواڵ لە ڕووی ناوەرۆکەوە، هەموو بوارەکانی ژیان و چالاکی مرۆڤی گرتۆتەوە، لە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژوویدا... هتد.

لە هەواڵێکدا، گۆڤاری (هەتاو) سووتانی قەیسەری هەولێر وا ڕادەگەیێنێ: ((شەوی پێنج شەممەی ١٣ی مانگ ئاگرێکی سەخت قەیسەریەکی لە هەولێرێ داگرت (١٤) دوکانی سوتاند و زیانێکی ئیجگار زۆری بە خاوەندەکانی گەیاند. ئەگەر گیانبازییتی پۆلیس و عەسکەران فریا نەکەوتبایە لەوانە بوو تەواوی بازاڕ و قەیسەری بسووتێنێ. هەموو شارەکانی عراقێ لکی ئاگر کوژاندنەوە (أگفائیە)یان هەیە تەنها هەولێر لەو بابەتەوە بەشبڕاوە. ئومێد و تکا وایە کە دەوڵەت ئەو کەم و کورتیەمان بە دامەزراندنی دائیرەی أگفائیە بۆپڕبکاتەوە.))[31]

لە ناوەڕۆکی ئەم هەواڵە کۆمەڵایەتیەدا دەردەکەوێ، کە مەسەلەی سووتانەکە،کە ترسی زۆری هەبووە و لە ڕووی ماددیەوە زیانێکی زۆری بە خەڵك گەیاندووە، بەڵام بە پێوانەی چمکەکانی هونەری ڕۆژنامە نووسیی هەواڵ کەم و کورتی زۆری تێدایە، بەوەی،کە وەڵامی پرسەکانی (بۆ،چۆن،کێ؟)ی نەداوەتەوە، بۆ سووتاوە و چۆن سووتاوەو کێ سووتاندویەتی، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لە کۆتایی هەواڵەکەدا هۆکاری زوو پێ ڕاگەیشتن و کەم و کورتی سیاسەتی سەردەم دەربڕێ لە خزمەتی هاوولاتیان و دابین کردنی ئامرازی پێویست بۆ پاراستنی گیانی هاولاتیان و سەروەت و سامانیان.

هەروەها چەندین هەواڵی هونەری وەك نواندنی هەردوو شانۆگەری (سەری گلۆلەکە) و (ژیانی قوتابی) لەسەر شانۆی قوتابخانەی دواناوەندی کوڕان لە هەولێر[32] و هەڵبژاردنی

---

[30] بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی هونەری هەواڵ بڕوانە د. فاروق ابو زید، فن الخبر الصحفي، ط٢، ص ٨٧-١٥٠. د. كاظم معتمد نژاد، ڕوزنامەنگاری، ص١٦-٤٦.

[31] گ. هەتاو، ژ٣٧،س٢، تەمموزی ١٩٥٥، ل٣.

[32] گ. هەتاو، ژ١٤٩، س١٥، شوباتی ١٩٥٩، ل٢٦.

(کۆمەڵەی ئاوازی کوردی لە بەغدا)[٣٣] و چەندین هەواڵێ سیاسی وەك (یادی ڕاپەڕینەکەی٢٧ی کانوون)[٣٤] و (بێزاری)[٣٥] بڵاوکراوەتەوە.

### ب- هونەری ئاگاداری:

ئاگاداری و بانگەواز، لە هۆیەکانی بانگەشە و پڕۆپاگەندەن، کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێ تایبەتی و گشتی بن. دیارە (تایبەتی) ئەوانەن، کە ڕوو بەڕووی کەسێکی دیاریکراو دەکرێنەوەو (گشتی) یش بۆ هەموو جەماوەرە، بۆ ئاگادارکرنەوە یان بەجێ گەیاندن و پێڕەوی کردن. لە ئاگاداربیدا (سەرەتا) هەوڵ دەدرێت بابەتەکە ڕوون بکرێتەوە پاشان (داواکاری) دەخرێتە ڕوو. بۆ نموونە بڕوانە ئەم ئاگادارییە:

**بۆ زانین**

**لەبابەت موناقەسەی نهێنی**

بلاّو ئەکەینەوە بە هەبوونی موناقەسەی نهێنی بۆ تەعەهودی ٧٥٧٠ متر موکەعەب ئیشی خۆڵ و ١٩٠٠ متر قالّبی تەنیشت و ناوەندو ٨١٥٥ متر مورەبەع تەبلیتی شەقام و ١٨٤٥ متر مورەبەع تەبلیتی مەفرەقەکانی شەقام و گۆڕەپان و ٣٥ متر دروست کردنی پردی لولەیی لە کۆنکرێت بۆ تەبلیتی مەدخەلی ڕێگای شەقلاوە - ئەربیل لە ساحەی بەرامبەر نەخۆشخانەی نەخۆشیی سینگ تا بیدایەتی شەقامی هیلالی بە پانایی ٦٠ متر ئیستمارەی شرووتی موناقەسە لە شوعبەی هەندەسەی بەلەدیە پاش دانی ٣ دینار نەقدەن بۆ فەتحی هەر مەجموعەیەك دەست ئەکەوێ، عەتائات پێشکەش ئەکرێ لە لایەن موشتەریکەکانی لەناو زەرفێکی پێچراوە بۆ مەجلیسی بەلەدیە تا سەعات ١١ زوالی ڕۆژی دوشەم بەرامبەر ١٤/٤/٩٥٨...[٣٦]

---

[٣٣] گ. هەتاو، ژ١٤٩، ل٢٧.

[٣٤] گ. هەتاو، ژ١٤٩، ل٢٧.

[٣٥] گ. هەتاو، ژ١٨٧، س١٥ ، تشرینی یەکەمی ١٩٦٠، ل٣٥.

[٣٦] گ. هەتاو، ژ١٢٧،س ٤، مارتی ١٩٥٨،ل٢٠. لە هەمان کاتدا زۆر ئاگاداریی (تایبەت) بڵاوکراوەتەوە، بۆ وێنە بڕوانە: گ. هەتاو، ژمارەکانی (١٢٧، ل٢٨) و (ژ ١٥٠، ل٤٣).

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ، لەگەڵ ئەوەی، کە (گیوی موکریانی) خەریکی کاری فەرهەنگنووسیی و زمانی کوردی بووە، ئاگاداری و بانگەوازەکان بە شێوەیەکی گشتی بە زمانی عەرەبین و بەناونیشانی (اعلان) بلاو کراونەتەوەو هەر وەك چۆن لە فەرمانگەکانەوە هاتوون. وێدەچێ ئەو ڕۆژانە لە کاروباری ڕەسمیدا زمانی عەرەبی پێڕەوی کرابێت نەوەك لەبەر ئەوەی، کە بەزۆر سەپێندرا بێت بەڵکو ژمارەی فەرمانبەری کوردیزان، کە بتوانێ بە زمانی کوردیی بنووسێ کەم بووە، دەنا هەندێ فەرمانگە بە تایبەتی (مەحکەمەی سوڵحی هەولێر) هەمووی بە کوردی نووسیووە. لە ڕووی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە، (ئاگاداری) کاری دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە نیە[37]

## ئـ- گۆشەی تایبەت:

زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە هەموو جیهاندا، بە شێوەیەکی گشتی گۆشەی تایبەتییان جێ کردۆتەوە. ئەو گۆشانە هەندێکیان تایبەتن بە قەڵەمی نووسەرێکەوە و بەردەوام ئەو دەینووسێ و هەندێکیشیان هەر جارەی بە هەمان ناونیشانی جێگیر یەکێك دەینووسێ. نەبوونی پسپۆڕیی لە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیدا هەتا ئەم دواییە وایکردووە، کە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیی هەمەلایەنە و گشتگیری بێت. لە گۆڤاری (هەتاو) دا چەندین گۆشەی تایبەت بۆ زمان و زانست و کۆمەڵایەتی و (ئافرەتان) و (لاوان) بەرچاو دەکەون، بە تایبەتی هەردوو گۆشەی تایبەت بۆ ئافرەتان و لاوان هەنگاوێکی تازەیە و پێشتر لە ڕۆژنامەنەوانیی کوردیدا بەرچاو ناکەون، ئەمەش وایکردووە، کە بۆشاییەکی زۆری ئەو ڕۆژگارەی ناوەندی ڕۆشنبیریی کوردی پڕبکاتەوە و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵیش لە خۆی گرد بکاتەوە. بێ گومان، گۆشەی تایبەت لە ڕۆژنامەنووسیدا خاسیەت و بنەمای خۆی هەیە، لەوەی،کە بابەتی گەرمام گەرم و هەستیار بخاتە ڕوو، بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێشی ڕۆژنامەوانییانە، کە گفتوگۆ هەڵبگرێ و بە کورتی و بە وردی و بەشێوەیەکی ڕەخنە ئامێز ڕووناکی بخاتە سەر بابەتەکە. لە

---

[37] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی خەسڵەتەکانی ئاگاداری و جۆرەکانییەوە بڕوانە: د. عبدالعزیز الغنام، مدخل في علم الصحافة، ص١٨٩-١٥٠. بیار البیر، الصحافة، ترجمة محمد برجاوي، ص ٤٨-٥٦.

گۆڤاری (هەتاو) دا چەندین گۆشە بەم ناوانە دەبینرێن: (ئامۆژگاری) و (مەتەڵ) و (باخچەی بوێژان) و (بەشی پزیشکی)، کە هەندێکیان بۆ ماوەی درێژو هەندێکیشیان بۆ ماوەیەك بەردەوام بوون. لە کەم و کورتیەکانی ئەم گۆشە تایبەتییانەدا ئەوەیە، نووسەر هەروەك وتارێکی ئاسایی ڕۆژنامەنەوانیی و درێژ نووسیویەتی بێ ئەوەی ڕەچاوی بنەماکانی ئەو هونەرە بکات.

## ئەنجام:

بارودۆخی ڕۆشنبیریی لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە شاری هەولێر بە هۆی ئاراستەکردنی جەماوەر لە لایەن ڕووناکبیرانی سەر بە حیزبی شیوعی و پارتی و لایەنەکانی دی و ڕۆژنامەوانیی کوردی (ڕۆژنامەی هەولێر) و پاشان (گۆڤاری هەتاو) لە لایەن گیوی موکریانییەوە بووژانەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردیی بە خۆوە بینی، بابەتەکانی شیعرو زمانی شیعر و وتار و یەکخستنی زمانی کوردی و بابەتە ڕۆشنبیرییەکانی تر لە مەسەلە سەرەکییەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی و ئەدەبی بوون، ئەمەش بە ڕوون و ئاشکرایی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (هەتاو)دا ڕەنگی داوەتەوە.

گۆڤاری (هەتاو) لەگەڵ کەم دەرامەتی و هاوکاری نەکردنی ژمارەیەك لە نووسەرەکانی ئەو ڕۆژە توانیویەتی خزمەتێکی گەورە بە خەڵکی شارەکەو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی و فیکریی نووسەراندا بکات، کە بە شاهێدی هەندێ لە نووسەر و ڕووناکبیرەکان قوتابخانەیەك بوو بۆ پێگەیاندنی لاوەکان و تازە بنووسەکان. لە ڕووی نەخشەسازی و هونەرەکانی ڕۆژنامەوانییەوە لە ئاستێکی پێشکەوتوودا نەبووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت بێ بایەخ و کەم هەرمێنێش بووبێ، نەوەك هەر بۆ هەولێر، بەڵکو لەبەر ئەوەی تاقە گۆڤاری سەردەمی پاشایەتی بوو دوای گۆڤاری (گەلاوێژ)، کە بڵاو کراوەتەوە، لە هەموو لایەکی کوردستانەوە بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی بۆ ڕەوانەکراوە، ئەوە بێجگە لەوەی لە هەندەرانیش نووسەرانی کورد نووسین و وەرگێڕانیان بۆ ڕەوانە کردووە.

لێکۆڵینەوە لە باری ڕۆشنبیریی و ئەدەبی کوردی نەوەك هەر لە شاری هەولێر، بەڵکو لە مێژووی ئەدەبی کوردی بەگشتی بێ گۆڤاری (هەتاو) پڕ لە کەموکورتیی دەردەچێت.

## سەرچاوەکان:

### ١- بەزمانی کوردی:


- بەکر شاکر عەبدوللا، عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و نووسەر، (نامەی ماجستێر)، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٠.

- باوکی سیروان، چەند چالاکییەکی جەماوەریی شاری شەقلاوە لە سالانی ١٩٥٤و ١٩٥٥دا، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ(٧٦) و (٧٧) لە ڕۆژانی ١٩٩٣/٩/٢٨ و ١٩٩٣/١٠/٥.

- ب. هەوراز، ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ(٤٥) و (٤٧) لە ١٩٩٣/٢/٩ و ١٩٩٣/٢/٢٣.

- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.

- ڕامان، باری ئەدەبی و ڕووناکبیری پەنجاکان لە هەولێر و کۆیە، گ ڕامان، ژ٤٠،س٥، ١٩٩٩.

- عبدالجبار محمد جەباری، مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧٠.

- عبدالقادر بەرزنجی، یادی سەیرانێکی سالی ١٩٥٤، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ٦١، س٤٩، ١٩٩٣/٦/١٥.

- علاء الدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، بەغدا، ١٩٧١.

- قادر ڕەشید ناسك، دامەزراندنی نەقابەکانی کرێکاران و یەکێتی یە پیشەییەکان بە نهێنی لە سلێمانی، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ١٩، ١٩٩٣/١٠/٧.

- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٧.

- محمدی مەلا کەریم، گیوی موکریانی ڕێی بۆ محەمەدی قازی خۆش کرد ببێ بەو وەرگێرە بە ناووبانگەی کە بوو، گ ڕەنگین، ژ٨٨، ١٩٩٦.

- محمود زامدار، حیکایەتی سەرهەلدان و کۆتایی ڕۆژنامەی هەولێر، هەولێر، ١٩٨٨.

- مغدید حاجی، کاروانە سەخت و پیرۆزەکەی چاپخانەی کوردستان، گ. کاروان، ژ٣٢، ١٩٨٥.

- هیمداد حوسێن، ڕۆلێ گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ١٩٩٨.

- ژمارەکانی گۆڤاری (هەتاو).

**بە زمانی عەرەبی:**

- اسماعيل شكر رِسول، اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨، (رسالة دكتوراه)، كلية الآداب- جامعة صلاح الدين- اربيل، ١٩٩٩.
- بيار البير، الصحافة، ترجمة محمد برجاوي، منشورات عويدات - لبنان، ١٩٧٠.
- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٩، ط٦، بغداد، ١٩٨٢.
- د.عبدالعزيز الغنام، مدخل في علم الصحافة، ج١،دار النجاح، بيروت، ١٩٧٢.
- د. فاروق ابو زيد، فن الخبر الصحفي، ط٢، دار الشروق-جدة، ١٩٨٤.
- يعقوب القصاب، الصحافة الكردية منذ نشأتها الى ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، مجلة كاروان، ع ١٦، ١٩٨٤.

**بە زمانی فارسی:**

- د.كاظم معتمد نژاد، ڕوزنامەنگاری، چ٤، مرکز نشر سپهر، تهران، ١٣٧٢.

## پێشەكی

ڕۆژنامەوان هەوڵ دەدات بە زمانێكی سادەو ڕەوان دور لە زێدەڕەوّیی و بەووردی و ڕاستگۆییانەوە جیهان بورژێنێ و لە ئاست كەم و كورتیەكانمان وریامان بكاتەوە. هەڵبـژاردنی زمانی ڕۆژنامەوانبی كوردیی بە پلەی یەكەم لەوەوە دێت، كە ئەم مەسەلەیە كەمتر لای لێكراوەتەوە، ئەگەر چی زمانی ڕۆژنامەوانیی لە سایەی پێشكەوتنی تەكنەلۆژیا و دەزگاكانی ڕاگەیاندنی گشتی ئەمڕۆدا پێشكەوتووەو دیاردەیەكی زیندووەو هەمیشە لەگۆڕاندایە، لە ئەنجامەكانی ئەم باسەدا بۆمان دەردەكەوێ، كە زمانی ستانداردی كوردی كەڵكی لە ڕۆژنامەوانیی وەرگرتووە.

سنووری لێكۆڵینوەكەم، لە چوارچێوەی نووسینی كوردستانی باشووردایە، ب ەتایبەتی ئەوماەی دوای (ڕاپەڕین-١٩٩١)م وەرگرت، چونكە ڕاپەڕین گۆڕانێكی سەرتاسەری بەسەر ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری و كۆمەلاّیەتی و ئابوری خەڵكی كوردستاندا هێنا، بێگومان ڕۆژنامەوانییش گەشانەوەیەكی تازەی بەخۆوە بینی. میتۆدی لێكۆڵینەوەكە تیۆری-پراكتیكییە و هەوڵ دەدات لە زمان بكۆڵێتەوە وەك دیاردەیەكی زیندووی هەمیشە گەشەكردوو، بەشێوەیەكی وەسفی.

ستراكتۆری لێكۆڵینەوەكە:

بنیادی لێكۆلینەوەكە، لەسەر پێشەكیەك و دوو فەسڵ دامەزراوە و هەر فەسڵەشی لە چەند سەرەباس دەدوێ، لە فەسڵی یەكەمدا هەوڵمداوە، بەكورتی پێناسەی ڕۆژنامە و پەیوەندی بە كۆمەڵوە دیاربخەم، بەو پێیەی كە دیاردەیەكی كۆمەلاّیەتییە، پاشان خاسەتەكانی ڕۆژنامەوانیی دوای ڕاپەڕین بەگشتیی دیارخستووە و لە فەسڵی دووەمیشدا زمانی ڕۆژنامەوانیی كوردییم لەسەر هەردوو بنەمای هونەرەكانی ڕۆژنامەوانیی و ناوەرۆكیانەوە دەرخستووە و ئەنجام و سەرچاوەكانی لێكۆڵینەوەكەم دیاریی كردووە. ئومێدمە تیایدا سەركەوتوو بم.

## بەشی یەکەم

# ڕۆژنامە وکۆمەڵ

پێناسەی ڕۆژنامە لە مێژووی پڕ هەوراز و نشێودا بەپێ چەمکی ڕۆژگار گۆڕانی بەسەرداهاتووە و بەپێی دەسەلاتی سیاسیی سەردەم گۆڕاوە. ئەوانەی لەمێژووی دێرینی ڕۆژنامەوانیی دەکۆڵنەوە، سەرەتای هەواڵ و ڕاگەیاندن بۆ مێژووی چاخە بەردینەکان دەگەڕێنەوە و لەو کاتەی مرۆڤ هەولیداوە پێوەندی بە دەوروبەرەکەیەوە بکات، پێوستی بە هۆکارێك بووە بۆ هەرەوزی لەیەکتر تێگەشتن، یان ڕوونتر بلێین لە سەدەکانی دواتر دا لای چینییە کۆنەکان هەولی ڕۆژنامەوانیی دراوە پاشتر لای ڕۆمانیەکان و... هتد.

فرناند ترۆ، سەرەتای ڕاستەقینەی ڕۆژنامەوانیی بەشێوەیەکی ساکار لە ئەوروپا بۆ سەدەی سێزدەهەم دەباتەوە، کاتێ هەواڵەکان بە دەست دەنووسرانەوە و لە سنورێکی دیاریکراو دا بلاو دەکرانەوە، دەڵێ: ((ئەو دەنگ و باسانەش لاپەڕەی بەدەست نووسراو بوون، کە هەواڵیان تێدا دەنووسرا و بە شێوەیەکی تایبەتیش لە (ئەفیزی) لە ئیتالیا و (زیتونگن) لە ئەلمانیا دا بلاوبووەو، ئەم دەنگ و باسانەش بۆ بەرژەوەندی دەولەمەند و بازرگانە گەورەکان و کارداراني بانك (رجال المصارف) دەهۆنرانەوە.))[1]

ئەمە بۆ شارستانێتی ڕۆژئاوا و بۆ سەرەتاکانی ڕۆژنامەوانیی لای ئەوان، بەلام بۆ ڕۆژهەلاتی کۆن، لای ئێرانییەکان (قاجارەکان) و لە دەولەتی عوسمانییدا، دوای ئەوەی چاپخانە لە ئەوروپاوە گەیشتە ڕۆژهەلات هەلی ڕۆژنامەوانیی بە شێوەیەکی هاوچەرخ دەستی پێکرد.[2]

چەمکی ڕۆژنامە یەکەمجار بەواتای یاداشتی ڕۆژانە بەکاردەهات و پاشان ئەو هەوالانەی پێوەند بە باری ناوەخۆ و دەرەوەی مەملەتەکانەوە هەبۆو دەنووسرانەوە. لەسەردەمی نوێدا، یۆنسکۆ بۆچوونی بۆ چەمکی ڕۆژنامە ئەوەیە،کە دەبێ:

١. چاپکراو بێت.

٢. ئامادەکردن و ڕێکخستنی لە ناوەوەی ولاتدا بێت.

---

[1] فرناند ترۆ، لە مێژووی ڕۆژنامە گەری جیهانیەوە لە سەرەتا تا سالی ١٨١٥ سەرەتاکانی ڕۆژنامەگەری، وەرگێڕانی عەبدوالکریم شێخانی، گ ڕۆژنامەڤانی، ژ١، ل٩٨.

[2] د. کاظم معتمد نژاد، روزنامەنگاری، ص٤٤٧— ٤٥٥.

**٣.** بۆ سوودی گشتی بێت.[3]

ڕۆژنامه، لەسەدەمی نوێدا دەربڕی خواست و ئاوات کێشەکانی کۆمەڵـە. دوای ئـەوەی بەپێی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ، کـە هـەموو کەسێك لـە دەربڕینـی بـیرو بۆچـوونیدا ئـازادە، بلاوکرایـەوە، ئیـدی بـیروڕای جیـاواز دروسـت بـوون و مەسـەلەی دیموکراسـیی و ئاشکراکردنی نهێنی دەسەڵاتدراو کار بەدەستان بووە شتێکی ئاسایی و بۆ ڕۆنامەوانییش بـووە کارێکی ئاسایی، کە پێی بە هەموو نهێنیەکان ببات و بتوانێ بەو پەڕی سەربەستیەوە هـەموو نهێنیـەکانی حکومـەتـەکان بـدرکێنێ، لـەو ڕوانگەیـەوە کـە ئـەو نهێنییانـە و کاروبارەکـانی کارگێڕی پێوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی ئێستا و داهاتووی کۆمەڵەوە هەیە. بەم هۆیانـەوە لـە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا زوو بەزوویی سەربەسـتی چـاپەمەنی هاتـە کایـەوە، تەنانـەت لەهەندێ لە وڵاتانی ئەوروپایی سەربەستی و ئازادی ڕۆژنامەنووسیی کەوتۆتـە نـاو بەنـدەکانی دەستوری وڵاتەوە. لە وڵاتی نەرویجدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە (ئـەرکی چاپخانە و دەزگاکـانی بلاوکردنەوە گەیاندنی هەموو ئەو زانیاری و حاڵەتانەیە، کە لە کۆمەڵگادا هەن، پەردە لەسەر هەموو مەسەلەو کێشەکان هەڵدەدەنەوە کە بەنهێنی ڕەخنەیان لێبگیرێ.)[4]

زۆرجاران، مەسەلەی سەربەسـتی زانـین و زانیـاری لـە ڕۆژنامەوانییـدا کێشەی گـەورەی دوست کردووە و بۆتە هۆی سەرئێشەو ئاژاوەی زۆر چ لە ناوەوەی یەك وڵاتدا و چ لەسەر ئاستی نێوان وڵاتاندا، ئەمە سەرباری ئەوەی زۆرجار پاراستن و شاردنەوەی زۆر مەسـەلەی زینـدوو لـە کۆمەڵ لە لایەن کاربەدەستانەوە بە بەهانەی ئاسایشی نەتـەوەیی و زارەوەی سیاسـیی دیکـەوە بۆتە مۆدەیەکی دی، لـە کاتێکـدا هـەموو ئەنـدامانی کۆمـەڵ بـەپێی جیـاوازی وەك چـۆن لـە دەربڕینی بیروڕایان دا ئازادن و بە هەموویانـەوە پرۆسـەی دیموکراسـیی بـەرەو پێشەوە دەبـەن، ئاواش مافی ئەوەیان هەیە لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕگەیاندنی گشتی و جەماوەرییـەوە،ئاگاداری هەموو هەنگاوەکانی حکومەت بن. دەبـێ ئـەو ڕاسـتیەشمان لەبـەر چـاو بـێ، کـە دەزگاکـانی ڕاگەیاندنی گشتی، لە ناویاندا ڕۆژنامـەوانیی مەبەسـتی سـەرەکیان ئەوەیـە هەسـت و هۆشـی نیشتمانی و نەتەوەیی بەرەو پێش ببەن، هەر بۆیە چـەندین هـەنگاوی گـرنگ دەتـوانن زامنـی

---

[3] زهرا باقریان نژاد اصفهانی، ڕوزنامەو ڕوزنامەنگاری در ایران، ص٤.

[4] ژان پۆل مارپوز، هەقتە بزانی، وەرگێڕانی شیرزاد حەسەن، ل١.

کۆمەڵگایەکی ژیاری و شارستانی بکەن، لە سەرووی هەموویانەوە لەناوبردنی نەخوێندەواری، بە تایبەتی لە وڵاتانی تازە پێشکەوتوودا، لە پاڵ ئەوەشدا دەزگاکانی ڕگەیاندنی جەماوەری (ڕادیۆ، تەلەفۆن، سینەما....) لە زەمینەیەکی بەر فراواتنردا کاریان پێدەکرێت.

کۆمەڵی کوردەواری بەهۆی پێهاتەی خێڵەکی و نەخوێندەواری لە ماوەی ڕابردوودا نەیتوانیوە، ئەوەندە کاریگەری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی بەسەرەوەبێت، بەتایبەتی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردیی و خاوەن ئاڕاستیەکی نەتەوەیی بوونیان نەبووە، بەهۆی نەبوونی ئازادی و سیاسەتی چەواشەکاری و ژێر دەستەیی لەلایەن ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەرنامەی ستراتیژیی دووریان هەبووە بۆ شێواندنی کلتوری کوردی و سوککردنی بەهاکانی نەتەوەیی لەڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و میدیاکانەوە، ئەمڕۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردیی دەتوانن لە خزمەت کۆمەڵی کوردەواری دابن و سەکۆیەك بن بۆ ئازادی ڕا دەربڕین و خۆدواندنی ئەندامانی کۆمەڵ لەڕێگەی ڕاگەیاندنەوە، لە سەرووی هەموویانەوە ڕۆژنامەوانیی.

**زمان و کۆمەڵ و هۆیەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری**

زمان دیاردەیەکی زیندووە تایبەتە بە مرۆڤەوە[٥]. هەر لە زووەوە زمان سەرنجی فەیلەسوف و زانایانی ڕاکێشاوە و هەوڵیان داوە نهێنیەکانی زمانی ئادەمیزاد بدۆزنەوە، لەوەی کە ئەم دیاردەیە خواکردە و خوا بەخشیویەتی بە مرۆڤ یان بەهەوڵ وکۆششی مرۆڤ خۆی هاتۆتە کایەوە.

زمانەوانیی کۆن بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لە هەوڵی ئەوەدا بوو یاساو دەستورەکانی زمان دابڕێژێ، بە شێوەیەك، کە زمان کۆمەڵی یاساو دەستوری نەگۆڕو چەسپاو سەیر بکات و لە دەرەوە لە زمان بکۆڵێتەوە، کەچی باشە و چۆن خەڵك زمان پاراو بن لە بوارەکانی ڕەوشت و کۆمەڵناسیی چ ڕۆڵێك دەبینێ. بە پێچەوانە قوتابخانە زمانەوانییە نوێیەکان، کە هەوڵ دەدەن لە ناوەوەی زمان بکۆڵنەوە و ئەو سیستەمانەی، کە زمان پێك دێنن بدۆزنەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەمیشە هەوڵ دەدەن پێوەندی نێوان زمان و بیر لەسەر ئەو بنچینەیە لێك بدەنەوە، کە زمان بۆ هەرەوەزی و هاریکاری ئەندامانی کۆمەڵ بە کاردێت و بە هەموو

---

[٥] دکتۆر محەمەد مەعروف فەتاح، لە کتێبی (زمانەوانی)دا، چەندین پێناسەی زانایانی زمانی هێناوەتەوە، بڕوانە: زمانەوانی هەلێر، ١٩٩٠، ل٥.

پێوانەکان زمان بەجیا لە کۆمەڵ سەیرناکەن (چۆمسکی) لە هەوڵی ئەوە دابوو، کە زمان بە جیا لە کۆمەڵ سەیر بکات، بەڵام کەوتە بەر شاڵاوی ڕەخنەی توندەوە.[6]

هەروەها زمانەوانیی و کۆمەڵناسیی ئەوەندە تێکەڵی یەك بوون، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی فراوان (کۆزمانەوانی ـ sociolinguistics)، کە بە (سۆسیۆ زمانەوانیی) ناسراوە پەرەی سەند، ئەم زانستە هەوڵ دەدات ((پێوەندی نێوان بینای کۆمەلایەتی و ڕۆنانی زمان بدۆزێتەوە.))[7] دەبێ لێرەوە درەك بەو ڕاستیە بکەین، کە سەرچاوە و کانگەی زمان لە کۆمەڵەوەیە و بۆ کاریگەرییە لەسەر کۆمەڵ لە هەموو بوارەکاندا، کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێ کاریگەریی بەجێ بێڵێ و شارستانیەتیی خۆی لەسەر دابمەزرێنێ و بیرو بۆچوون و ڕامانەکانی خۆی پێ دەربڕێ.

ئەمە ئەوە ناگەینێ کە زمان وەك ئامرازێکی وشك برینگ تێی بڕوانێ، بە پێچەوانەوە لە هەردوو لایەنی ماددی و مەعنەوییەوە ئەگەر دەست نیشان بکرێت، ئەوا زیاتر زمان، لایەنە مەعنەوییەکان دەگرێتەوە و زیاتر وشە مەعنەوییەکان لەزماندا دەوری کاریگەرە، بەتایبەتی لە بواری کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتیی بە ڕۆژنامەوانیشەوە، دەور دەبینن لە قسەکردن لە زماندا، بۆ هەر دانەیەکی تایبەتی چەندین ڕەمز دەور دەبینن کە ئەو ڕەمزانە واتایەك دەگەینن، کە وشەکانی قسەکردن خۆیان نین. لە نێو ئەو پرۆسەیەدا زمان کەرەستەکانی بیر دەردەبڕێ، ئەوەی ئێمە لەم باسەدا گەرەکمانە لێی بکۆڵینەوە زمانی ڕۆژنامەوانییە. دیارە، کە زمان ئەو ڕۆڵە گرنگە بگێڕێ لەبنیاتنانی شارستانیی و بیری مرۆڤایەتیدا، ئەوا تا ڕادەیەکی زۆر زمانی کوردیی ئەمڕۆ قەرزار باری ڕۆژنامەوانییە، کە توانیویەتی نیمچە زمانێکی کوردیی ستاندراد لە کوردستانی باشووردا بێنێتە کایەوە، بۆ ئەوەی نووسینی کوردیی و گفتوگۆی یان دوانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیی جەماوەریی لە ڕادیۆ و

---

[6] چۆمسکی، کەزانایەکی نوێی زمانە، لە هەوڵی ئەوە دایە، کە زمان وەك یەکەیەکی سەر بەخۆ بە جیا لە کۆمەڵ سەیر بکات و مەودا و سنووری زمانەوانی تەسك کردۆتەوە، کەوتە بەر ڕەخنەوە، بۆ وێنە بڕوانە: تیرنس موور و کریستین کارلنغ، فهم اللغة نحو علم لغة لما بعد مرحلة ضومسکی: ترجمة الدکتور حامد حسین الحجاج، بغداد، ١٩٩٨، ص٢٠٦ــ ٢٩٧.

[7] محەمەد معرف فتاح، کۆزما نەوانی سنور و بنەما و ئەرکەکانی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ١١٢، ١٩٨٦، ل١٢٨.

تەلەفزیۆندا یەك بخات. ئەو گۆڕانکارییە خێرایانەی لە بوارەکانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابوریيدا ڕوودەدەن نابێ بەبێ گرنگی و کاریگەری زمان ڕووبدەن و زمانی ڕۆژنامەوانیی هەوێنی گۆڕانی سیستەمی دیموکراسی و هەنگاوەکانی چاکەکاری کۆمەڵایەتیە. زمان کۆڵەکەی پشتی (گەیاندنی جەماوەری)یە و هەریەکێك لە جۆرەکانی گەیاندنیش زمانی تایبەتی خۆی دەوێ، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا شارەزایان سێ بنەمایان دیارکردووە بۆ پرۆسەی گەیاندنی جەماوەریی، کە ئەمانەن: (نێرەر- وەرگر- پەیام)[8]، بە لاوازبوونی هەر یەکێکیان یان نەبوونی هەریەکێکیان پرۆسەکە کز و لاواز دەبێ و ناتوانێ ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ.

جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە، کە زمان هۆی گەیاندنە و پردێکە بۆ دواندن لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵ، بەمەش ئەرکێکی کۆمەڵایەتی گرنگ دەگێڕێ و ئەمەش خۆی لە خۆیدا کۆمەڵێکی مەدەنی هاوچەرخ بنیات دەنێت.

زمانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری پێوستی بەوە هەیە تا ڕاددەیەکی زۆر سانا وە ڕەوان بێت بۆ زۆرترین ئەندامانی کۆمەڵ بەهەموو چین وە ڕەگەز وە توێژێکەوە لێی تێبگەن. ئەگەر زمانی ڕۆژنامەوانیی خەڵکی خوێندەوار بدوێنێ وە لە دروست کردنی ڕای گشتیدا وەك دەستەڵاتی چوارەم لە کۆمەڵدا دەور ببینی ئەوە ڕادیۆ و تلیفزیۆن لە ساتێکی کەمدا دەتوانێ بەهۆی وێنەوە جیهان وەك گوندێکی بچووك بخاتە بەرچاو و گوێت، لە هەمان کاتدا دەبیتە هۆی فێربوونی زمانی بێگانە سنورە سیاسیەکان دەبڕی. لە ناوەوەی یەك زمانیشدا کاردەکات و دەبێتە هۆی لەیەکتر نزیك کردنەوەی شێوەزارەکان و زمانێکی ڕۆژنامەوانیی سەردەم دێتە کایەوە ئەمەش چاکیەکەی لەوەدایە، کە دەبیتە هۆی دەوڵەمەند کردنی ئەو زمانە، بە وەرگرتنی چەندین وشەو زاراوە لە زمانەکانی دەوروبەردا. تەنانەت لە میدیاکانی جیهانی وەزانکۆکانی ئەمریکا دا و زانستێك لە هەردوو بەشی زمانەوانی و ڕاگەیاندندا دروست بووە، کە بە (زانستی زمانی ڕاگەیاندن) ناسراوە، بە تایبەتی بۆ لێکۆلینەوەی زمانی ڕاگەیاندن تەرخان کراوە ئەم زانستە نوێیە لەلایەن زانای ئەمریکی (کالیهان calihan) دوای بلاوبوونەوەی کتێبە بەناوبانگەکەی (سینتاکس بۆ پیاوانی ڕاگەیاندن) زیاتر پەرەی سەند. ئەم زانستە نوێیە بریتیە لەو (زانستەی، کە لەبەر ڕۆشنایی بیرۆکەی گەیاندن لە زمان دەکۆلێتەوە،

---

[8] محمد جميل شلش، اللغة و وسائل الاعلام الجماهيرية، ص١٨.

هەروا بیرو ڕاکانی تریش پشتگوێ ناخات، سوود لە زمان وەردەگرێت بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردەی پێوەندی ڕاگەیاندن، بەوەی کە دەست نیشانی شوێن و پایەی زمان و خاسیەتە کاریگەرەکانی لە پیادەکردنی ڕاگەیاندنی جەماوەردا دەکات[٩].

## خاسیەتەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوای ڕاپەڕین

یەکێ لە دیاردە بەرچاوەکانی ژیانی ڕۆشنبیریی دوای ڕاپەڕین، زووری ژمارەی ڕۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنی کوردیی، ساڵەها بوو ڕۆژنامەوانیی کورد خەمەکانیان لە دنیادا پەنگی خواردبۆوە، ئێستا ئەو هەلە هاتە پێشەوە، کە گۆڕانێکی بنجی لە چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانییدا بێتە کایەوە. خاسیەتەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردیی ئەو قۆناغە بەچەند خاڵێك دیاری دەکەین:

١. لە ڕووی ئیمتیازەوە، زۆر بوون و بلاّویی ڕۆژنامەوانیی حیزبیی.

٢. لە ڕوویی پسپۆڕییەوە، زیاتر ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەرەو پسپۆڕیی چوون.

٣. زۆربوونی ژمارەی ڕۆژنامەوانان و کارمەندانی چاپەمەنی.

٤. بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێی چامەنی و ڕۆژنامەوانیی، کە زیاتر جوانکاریی بە ڕۆژنامەوانیی بەخشیوە لە ڕوویی هونەرییەوە، بەتایبەتی ڕەنگاوڕەنگی گەورەو بچوکی فۆنتەکانی چاپی کۆمبیوتەریی و نەخشەسازیی و سوود بینین لە ئامرازەکانی سکانەر و سەتەلایت و وێنەی ڕادیۆیی و فاکس...

٥. ڕێکوپێکی لە کاتی دەرچوون و گەیشتن بە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان و خوێندنەوەی لەلایەن ژمارەیەکی زۆری خەڵکەوە، لە هەمان کاتدا بەتین کردنی پێوەندی بە جەماوەرەوە بۆ ئەوەی ڕۆنامە بچیتە ناخی مەسەلەکانەوە بەشدار بێت لە گۆڕانکارییەکاندا.

٦. لە ڕوویی زمانەوە، هەروەك لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێ، زمانی کوردیی ئەمڕۆ بەکەڵکی ڕۆژنامەوانیی وەرگرتووە، جا چ بە وەرگێڕان و وەرگرتن لە زمانە زیندووەکانی جیهانی یان بە داتاشین و دۆزینەوەی وشەو زاراوەی بەجێی بۆ دیاریی دەکات.

---

[٩] بۆ ئەم پێناسە بەو زانیاری لەباری (زانستی زمانی ڕاگەیاندن)، بڕوانە: د. هادي نهر، اللسانیات والاعلام، مجلة التوثیق الاعلامي، ع٢، ١٩٨٨، ص١٥.

## بەشی دووەم

# زمانی ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوای ڕاپەڕین بەپێی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانیی

### ١. زمانی هەواڵ:

ڕۆژنامەوانیی بە شێوەیەکی گشتی واتە هونەری هەواڵ، هەر لە سەرەتاوە هەواڵەکان سەرەتا بەدەست و پاشان بە چاپ دەنووسرانەوە، هیچ شتێکیش وەك هەواڵ بێ بایەخ نابێت، کە درەنگ بکەوێت. زمانی هەواڵ لە ڕۆژنامەوانییدا، پێوەندی بەجۆری دارشتنی هەواڵەکەوە هەیە، ئەگەر هەواڵەکە لە شێوەی گێڕانەوەدا بێت جۆرێکە و ئەگەر بەشێوەی چیرۆکە هەواڵیش بێت جۆرێکی دی دەکەوێتەوە. ئەگەر چی جیاوازییەکان شتێکی لاوەکیدا، چونکە هەر خۆی زمانی ڕۆژنامەوانیی شێوەیەکی سادە و ساکار بەکاردەهێنێت. بەشێوەیەك خۆی لە ڕستەی کورت و وشەی سادەدا دەدۆزیتەوە، ئەو وشانەی زۆر باون لە کۆڕ و کۆبوونەوەی خەڵك و قسەی ڕۆژانەی خەڵکیدا.

هەواڵ دەکرێ بە دوو بەشی سەرەکی: سەرەتا (دەروازە) و ناوەند[10].

لە سەرەتادا ڕۆژنامەوان هەولدەدا دەروازەیەك یان بەرکولێك بۆ چوونە ناوەوەی هەواڵەکەوە بدۆزێتەوە بەشێوەیەك، کە سەرنج ڕاکێشبێت ڕەگەزی هاندانی تێدابێت، پاشان لە (ناوەند) یان ناوەڕۆکی هەوالەکەدا وەلامی ئامرازەکانی پرسی (بۆ، چۆن، کەی، لە کوێ) دەداتەوە. ئەوەی لێرەدا جێگەی هەڵوەستەیە، ناونیشانی هەواڵە، کە قورسایی هەواڵەکەی دەوێتە سەر. ناونیشانیان (مانشێت)، لە هەواڵدا بەکورتترین ڕستە یان فرێز دەردەبڕێ و کەمتر خۆی بە فرێزی کارییەوە دەبەستیتەوە، یان ڕەنگە خۆی لە دوو وشەی کورتدا بدۆزیتەوە.

بۆ نموونە سەیری ئەم ناونیشانانە بکە:

- کۆنگرەی خاك لە بەرازیل.[11]
- تاوانێکی دیکەی ڕژێم.[12]

---

[10] بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی بەشەکانی هەواڵ بڕوانە: د. محمد حسن عبدالعزیز، لغة الصحافة المعاصرة، ص٢٤.

[11] ڕۆژنامەی ئالای ئازادی، ژ٢٦، خولی دووەم، ١٩٩٢/٦/٧.

- هەوڵدان بۆ بەرقەراری ئاگر بەس.[13]

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە، کەم و کورتی مانشێتی ڕۆژنامەکان بە پلەی یەکەم لەوە دایە درێژن و تاڕاددەیەك ناوەرۆکی هەواڵەکە بەدەستەوە دەدات، بۆ وێنە بڕوانە:

- ڕێز لە خوێنی هەزاران شەهیدی گەلەکەمان و لە ئیرادەی خۆڕاگری جەماوەر و ئەم شەڕە کارەستبارە ڕاگرن.[14]

جارێ لەپێش هەموو شتیکدا ئەم فەرمانەی دوایی ڕستەکە دەبووایە (بگرن) بووایە، ڕێز... بگرن، ئینجا خوێنەر بیری بەدوادا چۆن و وروژان و سەرسوڕمان، بە پێچەوانەوە لە ئامۆژگاریو پەند دادان دەچێت.

- ئۆپۆزۆسیۆنی عیراقی ئەگەر بەڕاستی بۆ عیراقێکی دیموکراسی تێدەکۆشی دەبێ بێ سلکردنەوە دان بە فیدرالیەتی کوردستان دابنێ.[15]

لە مانشێتی یەکەمدا، جەخت لەسەر (ڕێزگرتن) کراوەتەوە و هەر بەو پێیە کەوتووتە سەرەتای ڕستەکەوە، لە مانشێتی دووەمدا جەخت لەسەر (ئۆپۆزسیۆنی عیراقی) کراوەتەوە، کە لە هەردووکیان دا (ڕێژەی داخوازی)ن. هەروەها ئەوەی لەو مانشێتانەو چەندین مانشێتی دیکەدا سەرنج ڕادەکێشێ ڕۆژنامەوانیی هاوچەرخی کوردیی چەندین وشەو زاراوەی سیاسیی هێناوەتە نێو زمانەکەوە، هەروەك: (ئۆپۆزسیۆن، فیدرالیزم، تیم، پەرلەمان، فراکسیۆن، دیموکراسی، سەندیکا، جینۆساید، تیرۆر، un،...)، بۆ هەندێك لەو زاراوانە:

- ئۆپۆزسیۆنی عیراقی ئەگەر بەڕاستی بۆ عیراقێکی دیموکراسی تێدەکۆشێ دەبێ بێ سلّ کردنەوە دان بە فیدرالیەتی کوردستاندا بنێ.[16]

- تیمێکی پسپۆڕانی UN دەگاتە بەغدا.[17]

- دەبێ پەرلەمانی هەلبژێردراو مافی چارەی خۆنووسین بکاتە دروشم.[18]

---

[12] ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ١١٧، س٥٠، ١٩٩٢/٦/٧.

[13] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ ٧٨، س ١، ١٩٩٢/٤/٢٨.

[14] ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ژ ١٠٩، س٥٠، ١٩٩٤/٥/٣١.

[15] ڕۆژنامەی ئالآی ئازادی، ژ٤٥، خ٢، ١٩٩٢/١٠/٢٥.

[16] سەرچاوەی پێشوو.

[17] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠١٧، ١٩٩٤/٨/١٣.

**ئـ- زمانی وتار:**

زمانی وتار، زمانێکی ئاساییە، سادە و ساکارە، وشە و دەستەواژەکانی ئەوەندە ڕوونـن، زۆرترین توێژ و چینەکانی کۆمەڵ بە ئاسانی لێی تێدەگەن و زیاتر خۆی لە زیادەڕۆیی دەپارێزێ و بە ئاسانی مەبەست بەدەستەوە دەدات. زمانی وتـار بـەپێی نـاوەڕۆکی وتارەکـانی دەگـۆڕێ. وتاری ئەدەبیی جۆرە وشەو دەستەواژەیەکی ڕازاوە و خەیاڵی بەکار دەهێنـێ، بـە پلـەی یەکـەم وروژانـدنی نـاخی مـرۆڤ و دڵ دەبزوێنـێ، بـە پێـچەوانەی ئـەوە وتـاری زانـستی هـەوڵ دەدات مەسەلەیەکی زانستیی بەشێوەیەکی سادە و لە میانەی ڕۆشنبیریی گشتییدا بە خەڵك بگـەینێ و لـەم جـۆرە وتـارەدا ڕوونکردنـەوەو ئاسـان کردنـی بابەتەکانـە نـەك وەك وتـاری ئـەدەبیی و هونەریی، کە نووسەر بیروڕای خۆیان تێدا دەخەنە ڕوو و زیاتر بۆچوونی کەسیی و خودیین.

لێـرەدا لـە زمـانی وتـاردا دەبـێ ئامـاژە بـە وتـاری ڕۆژانـە بکـەین بەتایبـەتی (سـتونی ڕۆژنامەوانیی)، لە زۆربـەی ڕۆژنامـەکانـدا سـتوونی بـەردەوام بەرچـاو دەکـەون، کـە بـەئیمزای ڕۆژنامـەوانانیی دیار دەنووسرێن و لەچەندین بابەتی جیـاوازدا هەنـدێکیان حەفتانـەو ڕۆژانـە و هەندێکیان ناوە ناوەن.

لەڕووی ناوەڕۆکەوە زۆربەی ئەو ستوونانە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و وەرزشیین.

ئەوەی لەو ستوونانەدا زیاتر سەرنج ڕادەکێشن ئەوەیە، کە بەشێوەیەکی سادەو گشتگیری بـۆ زۆرینـەی خـەڵك نووسـراون نـەوەك بـۆ کەسـانی پـسپۆڕ و تایبەتمەنـد. زمـانی سـتوونەکان بەتایبەتی لەبواری زانـستیی وەرزشـیی و سیاسییـشدا زۆر وشـەو زاراوەی بیـانی تێدەکـەوێ و کەمتر بەرامبـەریان بـەزمانی کـوردیی پێـشنیاز کـراون. هـەر بـۆ نموونـە سـەیری ئـەم ڕسـتەو دەستەواژانە بکە لەو بوارانـەدا.. لـەبواری وتـاری وەرزشـییدا (گـۆڵ، پـەناڵتی، ئـۆف سـاید، تاکتیك، بۆکسێن، مۆنـدیال، تـەکنیك)... لـەبواری وتـاری زانـستییدا (تەلـەفزیۆن، ڤیـدیۆ، ڤیتێرنەری، گازۆیل، ڤیارڕۆس).

- گرفتی ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرەکان لە نێوان شۆفێر و سەندیکادا.[19]
- جینۆساید گونەهەکە ل کوردستانێ هاتیی کردن.[20]

---

[18] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٧٧، ١٩٩٢/٤/٢٧.

[19] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٢٥، ١٩٩٤/٨/٢٣.

- ئەندامێکی بەرزی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران لە بەغدا تیرۆر دەکرێ[21].

لەپاڵ بەکارهێنانی ئەو وشەو زاراوانەدا هەروەك خۆی، کە چۆن لە زمانە بیانییەکانەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردی، نابێ (ڕۆڵی وەرگێڕان) لەلایەن ڕۆژنامەوانانیشەوە لەبەر چاو نەگیرێ، کە بەرامبەر زۆر زاراوەی سەربازی و سیاسیی ئیداری هەوڵیانداوە لە زمانی کوردیدا بۆی دابتاشن یان بەپێی واتای فەرهەنگی و پێوانەیی بۆیان بدۆزنەوە، بۆ وێنە بڕوانە:

- بۆسنە و هەرسك و پاکسازیی نەژادی.[22]
- دانوسانی ئاشتی بەردەوامە[23].

لەجیاتی (تفاوض) یان (مفاوضات).

- تێکشکاندنی چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق[24].

لە جیاتی (اسلحة الدمار الشامل)

- داوا دەکەین هێزی چەکوشی ئامادە لە تورکیا بمێنێتەوە[25].

لە جیاتی (قوة المطرقة...).

- هەوڵدان بۆ بەرقەراری ئاگربەس[26].

لە جیاتی (وقف اطلاق النار).

- هەردوو ناوچەی دژەفڕین لە عیراق دەمێنن[27].

لە جیاتی (منطقة حضر الطیران).

- پرۆسەی ئاشتی ئیرلەندای باکوور[28].

---

[20] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٣٠، ١٩٩٤/٨/٢٩.

[21] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠١١، ١٩٩٤/٨/٦.

[22] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٠٤، ١٩٩٤/٧/٢٩.

[23] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٢٧، ١٩٩٢/٢/٢٥.

[24] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٣٢، ١٩٩٢/٣/٢.

[25] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٢٨، ١٩٩٢/٢/٢٦.

[26] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٧٨، ١٩٩٢/٤/٢٨.

[27] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٤٩، ١٩٩٩/١٤.

[28] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٥٠، ١٩٩٩/١/٥.

لەجیاتی (عملية السلام).

- شاندێکی حکومەتی سوید گەیشتە کوردستان[29]. لە جیاتی (وفد).

لە وتاری سیاسیدا (فراکسیۆن، مانۆڕ، پەرلەمان، کۆنترۆل، دیسپلین، پلینیۆم) ئەوە بێجگە لەوەی هەندێ جار زمانی وتارەکان ئەوەندە ساکار دادەبەزن و بەشێوەی گفتوگۆی خەڵکی سادە و بازاڕی بەکاردێن. وەك:

بڕیارەکانی کۆبوونەوەی لێژنەی تگبیعی سلێمانی[30].

حکومەتی یەمەن لامەرکەزی قبوڵ دەکات[31].

زمانی وتارەکانی نێو ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوای ڕاپەڕین، چەندین وشەی تازەی لە خۆگرتووە، ئەگەر چی هەندێکیان ڕەنگە بکەونە خانەی هەڵەی باوەوە و لەژێر کاریگەریی ڕێزمانی زمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی دابن بە هۆی تێکەڵاوی ڕۆشنبیریی ئەو میللەتانە و زیاد بوونی ژمارەی پەنابەری کوردیی لە دەرەوە و گەڕانەوەیاندا، هەموویان بە سەرێکەوە هەندێ ڕستەو دەستەواژەی وایان هێناوەتە گۆڕێ، کە نامۆن، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەکاردێن و تاڕادەیەك ڕوون و ئاشکران و لە لایەن ڕۆژنامەوانانیشەوە بەکاردێن. هەروەك (قەیران، پیادەکردن، دیموکراتیزەکردن، ڕەوتی ئاشتی، ئەنجامدان، هەڵدەستێت بە...، دەگەڕێتەوە بۆ...، تیشك خستنە سەر..) کە ئەمانە بە سەرنجدان بە ئاسانی هەندێکیان دەتوانین دەست نیشان بکەین:

(ئەنجامدان یان بە ئەنجام دەگەینێ): انجام میدهد (لە زمانی فارسیەوە).

هەڵدەستێت بە..: یقوم بـ... (لە زمانی عەرەبیەوە).

دەگەڕێتەوە بۆ..: یعود الی... (لە زمانی عەرەبیەوە).

بڕوانە لە هەندی لە ڕستەو ناونیشانی وتارەکان: کۆنگرەی دیموکراتیزەکردنی کوردستان[32].

- کۆنگرەی ڕەوتی شۆڕشگێرانی زەحمەتکێشان و پیادەکردنی عەدالەتی کۆمەلاّیەتی[33].

---

[29] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٥٣، ١٩٩٩/١/٩.

[30] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٢٠، ١٩٩٤/٨/١٦.

[31] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠١١، /١٩٩٤/٨/٦.

[32] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٣، ١٩٩٢/١/٢٨.

[33] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٤، ١٩٩٢/١/٢٩.

- ئەگەرەکانی مانەوەی هێزە هاوپەیمانەکان[34].

**زمانی ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوای ڕاپەڕین بەپێی ناوەڕۆکی بابەتەکان:**

**ئـ- زمانی یاسایی:**

پاش ڕاپەڕین، زۆر کۆمەڵەو کۆڕ و ڕێکخراوی سەندیکایی دامەزران و زیاتر کەشێکی دیموکراسی ئەو تۆ خولّقا، کە ژیانی ژیانی سەندیکایی بەرەوی سەندو کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و پیشەیی هەمە چەشنە دامەزرا، بێ گومان ئەو کۆمەڵە و سەندیکایانەش بۆ گەیاندنی دەنگی خۆیان و خستنە ڕووە مەرام و ئامانجەکانیان، چەندین بلاّو کراوەی هەمە چەشنیان دەرکرد.

کەسانی یاسا پارێز و مافناس کەوتنە هەوڵی ئەوەی بلاّو کراوەی یاسایی دەربکەن و یاساو دەستوری دادگاکان و دادوەری بە کوردی بکرێن و زمانی کوردی پێ دەوڵەمەند بکرێت. وەك چۆن خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی زیاتر بە هەرەمێن بوو وبایەخی زیاتر پێدرا. بورای یاساشی گرتەوە و چەندین وشەو زاراوەی کوردیی پەتی و داتاشراو کەوتە نێو زمانی ڕۆژنامە نووسیی. بڕوانە ئەم زاراوانە:

- داواکەر (المدعي)
- داواگیر (المدعي عليه)
- دادوەری ڕوو بەڕوو (المحاكمة الحضورية)
- دادوەری بزری (المحاكمة الغيابية)[35]

ئەمە بێجگە لەوەی دەقی بڕیارەکانی یاسیی بەکوردیی کران، بۆ وێنە بڕوانە:

- بەپێی بڕگە (١) لەماددەی (٥٦) ی یاسای ژمارە (١) ی ساڵی ١٩٩٢ و لەسەر پێشنیاری وەزیری ڕۆشنبیری و بڕیار لەسەر دانی ئەنجومەنی وەزیران، ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عیراق لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٩٢/١١/١٢ دا بڕیاری دەرکردنی ئەم یاسایەیدا:

یاسای ژمارە (١١) ساڵی ١١٩٢

یاسی وەزارەتی ڕۆشنبیری

---

[34] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ٧٦، ١٩٩٢/٤/٢٦.

[35] گۆڤاری یاساپارێزی، ژ١، س١، ١٩٩٦ل٨٠.

### گۆڤارێکی یاسایی یە
### بە زمانی کوردی دەردەچێت

ژمارە 5 ساڵی پێنجەم 2000

- مافی دەستێوەردانی مرۆیانە لە یاسای نێودەوڵەتیدا
- دەمارگیری نەتەوایەتی لە تەرازووی ئایینی ئیسلامدا
- یاسای گومرگەکان و گومرگەکانی کوردستان
- ساڵی ١٩٢٢، لە پەرلەمانی تورکیا پرۆژەی خودموختاری (ئۆتۆنۆمی) کوردستان گفت وگۆی لە سەرکرا
- تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی یاساو ئایینەوە

ماددەی یەکەم ٣٦:

ئەمە بێجگە لەوەی زۆر زاراوەی یاسای نێودەوڵەتی کەوتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان هەروەك:

کۆنفدرالی نیقابەکانی کوردستان ٣٧.

هەڵکەوتنی شوێنی هەولێری پایتەخت لەڕووی جیۆپۆلەتیکەوە ٣٨.

**ب- زمانی وەرزشی:**

وەرزش دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و بە نێو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەبێ جیاوازی تەمەن و ڕەگەزدا بلاو بۆتەوە، ئەمڕۆش وەرزش ئەوەندە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاو، تەنانەت زۆرجاران سروشتی سیاسی و نەتەوەیش بەخۆوە دەگرێ. لەم بوارەش دا بەهۆی ئەوەی دارِشتنی یاساکانی وەرزشی لە بنکە جیهانیەکان دا بەتایبەتی لەلایەن (FIFA) ەوە، بە زمانە ڕۆژئاواییەکان و بەزۆریش لە ڕەگ و ڕیشەی زمانە لاتینی یەکانەوە وەرگیراوە، ئەمەش پێوەندی بە کۆنی و دێرینی وەرزش لە ئۆلۆمپیادەکانی یۆنانەوە هەیە.

خوێندنەوەی سەرچاوە کۆنەکان جەخت لەسەر لەش ساغی و تەندروستی مرۆڤی دێرین دەکەنەوە، کە توانیویەتی بەهێزی بازووی خۆی بەرەنگاری سروشت بێتەوە. لە ڕۆژگاری نوێشدا کۆمەڵی کوردەواری وەك زۆر بواری دی، بە تایبەتی دوای پێشکەوتنی کۆمەڵ و چاك بوونی بنیادی ئابووری و ڕێکخستنەوەی یاریگاکانی شارەکانی کوردستان و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەوانیی وەرزشی لە لایەن خەمخۆرانی ئەم بوارە، زمانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانیش لە دانانی زۆر وشەو زاراوەی ئەو بوارەیە زمانی کوردی و هێنانی زۆر زاراوەی بیانی سەرکەوتوو بوون. بۆ نموونە بڕوانە ئەم وشە کوردییانە و پاشان هەندێ زاراوەی بیانی:

- یانەی وەرزشی پێشکەوتن[٣٩].
- بەنیازین خولێکی تۆپی بالە ساز بدەین[٤٠].

---

[٣٦] ڕۆژنامەی هەرێم، ژ٨، ١٩٩٢/١/٢١.

[٣٧] گۆڤاری یاسا پارێزی، ژ١، س١، ١٩٩٦، ل٢٧.

[٣٨] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٤٩، ١٩٩٩/١/٤.

[٣٩] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٤٧، ١٩٩٨/١٢/٢.

- یەکەمین کارتی سوور لە ژیانی ئالان شیرەردا[41].
- ڕاهێنەری پێشووی ئەلمانیا[42].
- بیرۆکەی دوو ناوبژیوان لە ناو یاریگا[43].
- جامی جیهانی گۆڕەپان ومەیدان دەستپێدەکات[44].
- لەیلا محەمەد عەلی کلای و یاری بۆکسێن[45].
- لە لێدانی پەنالتی زۆر وریایە[46].
- تاکتیك بە واتای بەکارهێنانی تەکنیك لەناو یاریگادا[47].
- پلیتی یارییکانی مۆندیالی فەڕەنسا[48].

**جـ- زمانی سەربازی:**

دامەزراندنی کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، دوای ڕاپەڕین لە یەکێ لە دەستکەوتەکانی ئەو (ڕاپەڕین)ە دەژمێردرێت، بوونی وەزارەتی پێشمەرگە، پێوستی بەوە دەکرد، کە پلەو پایەکانی فەرماندەی لە شکری کوردستان ڕیکبخرێنەوە و ئەو پلەو پایانەش بە زمانی کوردی ناویان بۆ بدۆزێتەوە چەسپ بکرێن. ئەمە بێجگە لەوەی زمانی کارگێڕی نامەو نووسراوەکانی نهێنی و ئاشگرای نێوان فەرمانەکان دەبووایە بە زمانی کوردی بێت. ئەمە ڕێخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی چەندین وشەو زاراوەی تازە وەك هەموو بوارەکانی دی بێتە نێو زمانی کوردییەوە. بۆ وێنە:

---

[40] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٨٣، ١٩٩٩/٨/١١.
[41] هەمان سەرچاوە.
[42] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٤٧، ١٩٩٨/١٢/٢.
[43] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٦١، ١٩٩٩/٣/١٧.
[44] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٨٤، ١٩٩٩/٩/١٨.
[45] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٦١، ١٩٩٩/٣/١٧.
[46] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٤٦، ١٩٩٨/١١/٢٥.
[47] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٤٧، ١٩٩٨/١٢/٢.
[48] ڕۆژنامەی وەرزش، ژ٤٦، ١٩٩٨/١١/٢٥.

436
وەرزش
SPORT

Wednesdy 4/10/ 2006
ژمارە (٤٣٦) چوار شەممە ٤/١٠/٢٠٠٦ ٢٧٠٦ی کوردی ٤ لاپەرە نرخی (١٥٠) دینارە

### بەبۆنەی هاتنی مانگی رەمەزانی پیرۆز

# شەوانی هەولێر یارییەکانی خولی سنی سنیانێ لەخۆ دەگرێ

بەبۆنەی هاتنی مانگی رەمەزانی پیرۆزو بۆ پاراستن و زیندوو راگرتنی رەسەنایەتی، بەئامادەبوونی بەرێز پشتیوان سادق بەرپرسی لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان و جەماوەرێکی زۆر، لیژنەی ناوچەی قەڵا پێشبرکێیەکی خولی (سنی سنیانێ) بۆ (١٨) یاریزانی تیپە میللیەکانی شاری هەولێر کردەوە، لەسەرەتادا بەرپرسی لقی دوو وتەیەکی بۆ ئامادەبووان پێشکەش کردو تیایدا زیندووکردنەوەی رەسەنایەتی ئەم یارییە کوردەوارییانەی بۆ ئەوەی ئێستا بەگرنگ هەژمارد، هەروەها ستایشی لیژنەی ناوچەی قەڵاتیشی کرد بۆ ئەنجامدانی ئەم جموجۆڵە لەیەکەم یاریش لە نێوان تیپی شەوانی هەولێر توانی بە(١١٠) خاڵ بەرامبەر بە(٧٥) خاڵ یارییەکە لە تیپی بازاڕی سیروانی بردەوە، هەروەها تیپی خانەقا توانی بە ئەنجامی (١٠٤) خاڵ بەرامبەر بە (٧٠) خاڵ یارییەکەی لەتیپی مستەوفی بباتەوە شەوانەش یارییەکان بەردەوامە.

# لە هەولێر خولی رەمەزانی پیرۆز دەستی پێکرد

لەدرێژەی چالاکییەکانی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان، ناوەندی باڵای هەولێر هەڵسا بەسازدانی خولی رەمەزانی پیرۆز بۆ (٢٤٠) تیپی میللی لە تۆپی پێی گۆڕەپانی بچووککراوە بۆ سەرجەم ناوەندەکانی (١١-٢-٣-٤)ی چالاکی و پێگەیاندنی لاوانی لە هەولێری پایتەخت، یارییەکانیش رۆژانە لە یاریگاکانی (بارزانی نەمر، گرداو، ١٦ی ئاب، سەلاحەدین، دۆلارزە، خەنزاد) بەرێکوپێکی و ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر ئەنجام دەدرێت ئەمەش بەشێک لە ئەنجامی یارییەکانە:

میران × هەڵاڵە (٢ - سفر)گۆڵ، کرێکاران×کەیوان (٧-٦)گۆڵ شکۆدار× تەیراوە(٧ - ١) گۆڵ، کارۆخ × سیما(٣-٢)گۆڵ بەلێدانی سزا، سەروان × بێستون (٣ - ٢) گۆڵ بەلێدانی سزا، ساکار × ئاسەکەلی (٤-١) گۆڵ، هێلین × شێرخان (٢ - سفر) گۆڵ، ترمێنسک × چوارچرا (٣-١) گۆڵ بەلێدانی سزا.

**ناوبژیوانانی یارییەکانیش پێک هاتبوون لە بەرێزان:**

کامەران عەلی، کەمال قادر، یادگار عەزیز، نەجمەدین ئەحمەد، هێمن عەباس، شاخەوان خەسرۆ، کەهار مەحمود.

# خولێکی تۆپی سەرمێز کرایەوە

بەئامادەبوونی بەرێز ئاری ئەتەگەلی بەرپرسی لیژنەی ناوچەی ئالار جەماوەرێکی زۆر لە باخچەی ناوچە، سەنتەری راژن بۆ چالاکی و رۆشنبیری و فرەیی بەهاوکاری لیژنەی ناوچەی ئالا بەبۆنەی مانگی رەمەزانی پیرۆز خولێکی تۆپی سەرمێزی بۆ (١٦) یاریزان سازکرد، لەیەکەم یاریدا ئەحمەد مەحمود بە (٢-سفر) گێم لەهەردی شێرزادی بردەوە ئەم یارییەش لەلایەن ناوبژیوانان رەوین سەڵاح و سیروان عەبدوڵلا بەڕێوەچوو.

# ئاسۆس پاڵەوانیەتی تۆپی پێی ئەنفال دەباتەوە

سەڵاح ... رۆژی شەممەی ... یاریگای

# لەم هەفتەیەدا ژمارەیەک یاری دۆستانەی نێودەوڵەتی بەڕێوەدەچێت

چوارشەممە ژاپۆن سەرپەرشتیاری هەڵبژاردەی (گانا) دەکات، لەکاتژمێر (٨)ی ئێوارەی رۆژی شەممەی داهاتووش ئەڵمانەکان لە ئێستر یاریگای خۆیان ... ... لە رۆژی

| | | | |
|---|---|---|---|
| - پاژ (گرووپ) | بەرامبەر (رهط) | و | Squad |
| - دەستە | بەرامبەر (حضيرة) | و | Section |
| - پەل | بەرامبەر (فصيل) | و | Platoon |
| - لق | بەرامبەر (سرية) | و | Company |
| - بەتالیۆن | بەرامبەر (فوج) | و | Battalion [٤٩] |

### ت- زمانی زانستی:

لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا تا ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم، ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیی سەربەخۆ بۆ بابەتی زانستی نەبوو، لەماوەی چارەکەسەدەی دواییدا گۆڤارەکانی (تووتن، ئابوریزان، زانیاری،...) بلاّو بوونەوە. لە دوای (ڕاپەڕین) دا، ژمارەیەکی بەرچاو لە گۆڤاری زانستی بلاّو بوونەوە و لە زۆر بەی ڕۆژنامەکانی حیزبی و حکومیشدا لاپەڕەو گۆشەی تایبەتی لە بارەی زانستەوە تەرخان کراوە. لە زمانی زانستیدا، بە ئاشکرا کاریگەریی زمانە ڕۆژئاواییەکان بە تایبەتی زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی بەرچاو دەکەوێت، دیارە هۆیەکەشی بە پلەی یەکەم لەوەوە دێت، کە شۆڕشی پیشەسازی و داهێنانە زانستیەکان لە تاقیگەکانی ئەواندا بە دەست هاتووە و ناوی داهێنەر یان وشە و زاراوەکانی ئەو زمانەی وەرگرتووە.

مەسەلەی زانست بەشێوەیەکی گشتیی پێوەندی بە ئاستی ڕۆشنبیریی و هۆشیاری کۆمەڵەوە هەیە، کۆمەڵی کوردەواری وەك کۆمەڵە ڕۆژهەڵاتیەکانی دی درەنگ خوێندن و خوێندەواری بەشێوەیەکی فراوان تێیدا بلاّو بۆتەوە، بێ قەوارەیی سیاسی و شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکان بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستان، هەمووی بەسەر یەکەوە وایکردوە لە ڕووی زانستیەوە میللەتی ئێمە درەنگ بکەوێت. پاشان دامەزرانی کۆڕی زانیاری کورد و دەزگا ڕۆشنبیری و پەروەردەییەکان و بەرنامەکانی خوێندن ڕۆڵیان لە بەرز ڕاگرتنی زانست و پەرە پێدانی زمانی زانستی دا بینی. بۆ شالاّوی وشەو زاراوە بیانیەکان هەر بۆ نموونە لە دوو توێی لاپەڕەکانی ڕۆژنامە نووسیی کوردیی دوای ڕاپەڕین چەند نمونەیەك وەردەگرین:

---

[٤٩] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ ٢٠٠٥، ٣٠، ١٩٩٤/٧/٣٠.

- لەم دواییە دا بازاڕی جیهان کۆمەڵێکی نوێ لە (لێزەر دیسك) دەگرێتە خۆی لە جیاتی شریتی ڤیدیۆ هەروەها ئەم جۆرە دیسکانە زۆر بە ڕوونی فلیمی لەسەر تۆمار دەکرێ و زۆر بە ئاسانیش دەگوازرێتەوە بۆ سەر شاشەی تلیفزیۆن[٥٠].

- ڤایرۆسی ئیپۆلا بلاّو دەبێتەوە[٥١].

- زانکۆی سلێمانی کۆلێژی ڤیتێرنەری لە ئامێز دەگرێ[٥٢].

- بێگومان کالسیۆم یەکێکە لە کانزا هەرە گرنگەکانی جەستەی زیندەوەر وەك هەموو کانزاییێك و ترەیسێکی دی[٥٣].

- تەکنۆلۆژیای بۆشاییگەری[٥٤].

- بەرەو دۆزینەوەی زانست و ئەبستمۆلۆژیای ڕاستەقینە[٥٥].

- لەو وێنەی تریشدا تەلەفۆنی دەستی بەدی دەکەین. کە ئامێری فاکسیشی لە خۆ گرتووە، کە ئەمیش پەیوەستە بە کەناڵەکانی ئینتەرنێتەوە[٥٦].

ئەمە سەر باری ئەوەی زۆر وشەو زاراوەی کوردیی پێشنیازکراو لە جیاتی ئەوانەی بێگانە بەکار هاتوون، کە هەندێکیان جێگەی خۆیان گرتووە و هەندێکیشی تا ئێستا نامۆن، لەوانە:

- ماددەی سڕکەر بە گەورەترین کێشەی نێو کۆمەڵ دادەنێن[٥٧].

- ئاشکرا بوونی دەفرە فڕیوەیەك[٥٨].

- دۆزینەوەی هەسارە و ئەستێرەیەکی نوێ[٥٩].

---

[٥٠] **ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان، ژ١، ١٩٩٥/١١/٢٥.**

[٥١] **ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان، ژ٧، ١٩٩٦/٢/٢٠.**

[٥٢] **ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان، ژ٦، ١٩٩٦/٢/٦.**

[٥٣] **گ. دۆزینەوە، ژ (٠، ١)، ل٤٤.**

[٥٤] گ. دۆزینەوە، ژ (٠، ١)، ل٢٢.

[٥٥] گ. دۆزینەوە، ژ (٢، ٣)، ل ٥.

[٥٦] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٦٩، ١٩٩٩/٢/٣.

[٥٧] ڕۆژنامەی برایەتی، ژ٢٧٦٩، ١٩٩٩/٢/٣.

[٥٨] گ. دۆزینەوە، ژ (٠، ١)، ل ١٨.

[٥٩] گ. دۆزینەوە، ژ (٠، ١)، ل ١٩.

# اكتشاف

## دۆزینەوە

السنة الثالثة ، العدد (٥)، ايار ١٩٩٩ ، السعر (٤٠) دنانير

السعادة

ملف العدد:

ارتفاع ضغط الدم

الجن يختطف صبياً !

قطع الغيار البشرية

الجماجم و التصاوير الحقيقية

الليزر الزرقاء

- دەرکردنی دەمارە گوێزەرەوە[٦٠].
- بە هۆی زیادبوونی چەقەهێزی دەرکەنەرەوەی ناوەندییەوە[٦١].
- دوای ساردبوونەوە پلانێتەکانیان دروست کردووە[٦٢].
- ژمارەیەکی زۆر تەنۆکەی ڕەق ورد بووە [٦٣].

**ئەنجام:**

١. زمان دیاردەیەکی زیندووە و هەمیشە لە گۆڕاندایە، بۆ لەیەکتر گەیشتن و هاوکاری ئەندامانی کۆمەڵ بەکاردێ، بەو پێیە زمان ئەرکێکی کۆمەڵایەتی گرنگی لەسەر شانە.

٢. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە سەرووی هەموویانەوە ڕۆژنامەوانیی کوردیی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە دەوڵەمەندکردنی زمان و یەکخستنی دیالێکتەکانی زمان و هاتنە کایەی زمانی ستانداردی کوردیی.

٣. هونەرەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردیی، هەریەکەیان شێوازی تایبەتی خۆی و زمانی خۆی لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەرەستەکانی زماندا هەیە.

٤. ڕاپەڕین گۆڕانێکی گرنگی لە ڕێگەی ڕۆژنامەوانییەوە بەسەر زمانی کوردیدا هێنا لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەوانیی هەمە چەشنەی هەمە بابەتی وەك زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووری و وەرزشیی....، کە بە هەموویانەوە بە کاریگەری وەرگێڕان و مامەڵەکردن لەگەڵ فەرهەنگی ڕۆژئاوایی، زمانی کوردییان دەوڵەمەند کرد.

٥. بە بەراوردکردن لەنێوان زمانی کوردیی لە پێش ڕاپەڕین لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا لەگەڵ دوای ڕاپەڕین دەردەکەوێ، کە پێشتر، زمانی ئەدەبی و داڕشتنی ئەدەبی و هونەریی زیاتر زاڵە، بەپێچەوانەوە لە دوای ڕاپەڕین هۆشیاریی ڕۆژنامەوانیی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن زیادی کردووە و زمانی ڕۆژنامەوانییش سادە و کورت و ڕەوان و میللی بووە، هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ لێی تێ دەگەن.

---

[٦٠] گ. دۆزینەوە، ژ (٠، ١)، ل ٤٥.

[٦١] گ. دۆزینەوە، ژ (٢، ٣)، ل ١٠.

[٦٢] گ. دۆزینەوە، ژ (٢، ٣)، ل ١٠.

[٦٣] گ. دۆزینەوە، ژ (٢، ٣)، ل ١٠.

## سەرچاوەكان:

### ١- بە زمانی كوردی:

### أ- كتێب:


١. محمد معروف فتاح، زمانەوانی، هەولێر، ١٩٩٠.

٢. ژان پۆل مارپۆز، هەفتە بزانێ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە شێرزاد حەسەن، سلێمانی، ٢٠٠٠.


### ب- رۆژنامەو گۆڤارەكان:


٣. رۆژنامەی ئالاّی ئازادی، ژ٢٦، خ٢، ١٩٩٢/٦/٧؛ ژ٤٥، خ٢، ١٩٩٥/١٠/٢٥.

٤. رۆژنامەی برایەتی، ژ٢٠٠٤، ١٩٩٤/٧/٢٩؛ ژ٢٠٠٥، ١٩٩٤/٧/٣٠؛ ژ٢٠١١، ١٩٩٤/٨/٦؛ ژ٢٠١٧، ١٩٩٤/٨/١٣؛ ژ٢٠٢٠، ١٩٩٤/٨/١٦؛ ژ٢٠٢٥، ١٩٩٤/٨/٢٣؛ ژ٢٠٣٠، ١٩٩٤/٨/٢٩.

٥. رۆژنامەی رێگای كوردستان، ژ١٠٩، س٥٠، ١٩٩٤/٥/٣١؛ ژ١١٧، س٥٠، ١٩٩٤/٧/٢٦.

٦. رۆژنامەی كوردستانی نوێ، ژ٣، ١٩٩٢/١/٢٨؛ ژ٤، ١٩٩٢/١/٢٩؛ ژ٢٧، ١٩٩٢/١/٢٥؛ ژ٢٨، ١٩٩٢/١/٢٦؛ ژ٣٢، ١٩٩٢/٣/٢؛ ژ٧٦، ١٩٩٢/٤/٢٦؛ ژ٧٧، ١٩٩٢/٤/٢٧؛ ژ٧٨، ١٩٩٢/٤/٢٨.

٧. رۆژنامەی وەرزش، ژ٤٦، ١٩٩٨/١١/٢٥؛ ژ٤٧، ١٩٩٨/١٢/٢؛ ژ٦١، ١٩٩٩/٣/١٧؛ ژ٨٣، ١٩٩٩/٨/١١؛ ژ٨٤، ١٩٩٩/٩/١٨.

٨. رۆژنامەی هەرێم، ژ سفر، ١٩٩٥/١١/٢٦؛ ژ٨، ١٩٩٣/١/٢١.

٩. رۆژنامەی هەرێمی كوردستان، ژ١، ١٩٩٥/١١/٢٥؛ ژ٦، ١٩٩٦/٢/٩؛ ژ٧، ١٩٩٦/٢/٢٠؛ ژ٩، ١٩٩٦/٣/١٩.

١٠. گۆڤاری دۆزینەوە، ژ(٠، ١)، ١٩٩٧؛ ژ(٢، ٣)، ١٩٩٨.

١١. گۆڤاری رۆژنامەڤانی، ژ١، س١، ٢٠٠٠.

١٢. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ١١٢، ١٩٨٦.

١٣. گۆڤاری یاسا پارێزی، ژ١، س١، ١٩٩٦.

٢ – بە زمانی عەرەبی:

ت- کتێب:

١٤- محمد جميل شلش، اللغة و وسائل الاعلام الجماهيرية، الموسعة الصغيرة (٢٦٠)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٦.

١٥- د.محمد حسن عبدالعزيز، لغة الصحافة المعاصرة، السلسلة الثقافية، المركز العربي للثقافة والعلوم، بيروت، ؟

ب- گۆڤار:

١٦. نهر، د.هادي، اللسانيات والاعلام التأثر والتأثير، مجلة التوثيق الاعلامي، المجلد السابع، ع٢، س٧، بغداد، ١٩٨٨.

٣. بە زمانی فارسی:

أ- کتێب:

١٧. زهرا باقرایان نژاد اصفهانی، ڕوزنامه و ڕوزنامەنگاری در ایران، انتشارات مولانا اصفهان، ١٣٧١.

١٨. د. کاظم معتمد نژاد، ڕوزنامەنگاری، چاپ چهارم، تهران، ١٣٧٢.

## لە پەراوێزی وتارێکی ڕۆژنامەنووسیداو
## پێشنیارێك بۆ نووسینەوەی مێژووی ڕۆژنامەوانیمان

لەم ماوەیەدا بە ڕێکەوت لە ڕۆژنامەی (اطلاعات) ی چاپی فارسی ئێران، ژمارە (١٩٩٥٤)ی ڕێکەوتی ١٩٩٣/٧/١٣، وتارێکم بە ناونیشانی "لێکۆڵینەوەی پایەی ڕۆژنامەوانیی لە کۆمەڵی ئەڵمانیدا" خوێندەوە، کە پەیامنێری کۆماری ئیسلامی ئێران لە شاری (بۆن) ی ئەڵمانیاوە ڕەوانەی کردبوو.

لەم وتاردا پەیامنێرەکە زۆر زانیاری بە کەڵك و بەسوودی بۆ خوێنەرانی ڕۆژنامەی ناوبراو نووسیوە، کە لەو وڵاتەدا چەند ڕۆژنامە و هەفتەنامەی و چاپکراو دەردەچێت و هاوکات دەگەڵ ئەوەشدا بەراوردێکی کردووە لە نێو خوێنەری ڕۆژنامەکان لە چەند وڵاتێکی ئەوروپادا.

مـن هەوڵ دەدەم، بە کورتی پوختەی ئەو سەر ژمێری و ئامارانەو هەندێ لەو زانیارییانەتان بۆ دەربخەم و بۆ ئەوانەی سەرگەرمی کاری ڕۆژنامەنووسی و لێکۆڵینەوەن لەم بوارەدا سوودمەند بێت.

دەرکەوتنی ڕۆژنامەو چاپەمەنی لە مێژووی کەلتوری هەموو میللەتێکدا خاڵی وەچەرخانێکی گەورەیە لە بەرەو پێشەوەچوونی هۆشیاری نەتەوەیی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی ئەو میللەتەدا. ئەمەش لە خاڵێکدا دێتە دی، کە ڕادەی خوێندن و خوێندەواری و تامەزرۆیی زانست و زانیاری لە لایەن ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لە ئاستێکی بەرزدا بێت.

ئێمەی کورد بە هۆی بارودۆخی ڕامیارییەوە، کۆمەڵەکەمان لە خوێندن و قوتابخانە بێ بەری بوونە، وەك د. شاکر خصباك نووسیویەتی لە ساڵی ١٩٥٤ لە شارێکی وەك هەولێردا تەنیا (٧٢) قوتابخانە هەبووە. ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانەکەیدا بەراورد بکرێت ئێجگار کەمە، کە (٢٣٩٧٧٦) کەس بووە.

مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانیی کوردیش بە شێوەیەکی فراوان لە کوردستانی عێراقدا لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەست پێ دەکا و بارودۆخی سیاسی و لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەست پێ دەکا و بارودۆخی سیاسی و مافی نەتەوەکان هاتە گۆڕێ و میللەتانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی پێشوو کەوتنە خۆ بۆ سەربەستی و ئازادی بیروڕا، بێ گومان لەم ڕووەوەش ڕۆژنامەوانیی کوردی بووە مەیدانی ئەو بیروباوەڕانە ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو هەفتەنامەو گۆڤاری کوردی دەرچووە، کە بە داخەوە تا ئێستا نەزانراوە ئەو مێژووە

پڕ له سەروەرییەی ڕۆژنامەوانانی کورد بنووسرێتەوە. له وتارەکەی (اطلاعات)دا هاتووە بێ گومان دەتوانرێ خەڵکی ئەڵمانیا لە هەموو میللەتان زیاتر بە هەواداری ڕۆژنامە... هەفتەنامە بژمێردرێ..

له دوای دەسەلاتی بەرچاوی تەلەفزیۆن ڕۆژنامە جێگەیەکی بەرزی بۆ خۆی داگیرکردووە. له ماوەی چڵ ساڵی ڕابردوودا بەرزبوونەوەی تیراژی ڕۆژنامەکان سێ بەقەد پیشوو. واتە لە ١١ ملیۆن دانەوە بۆ ٥، ٣٣ ملیۆن دانە لە ڕۆژێکدا نیشانەی تامەزرۆیی خەڵك پێشان دەدات "

ئەمە بێجگە لە گۆڤارەکان. جا ئەو گۆڤارانە وەك نووسەرەکەی ژماردوونی هەندێکیان پسپۆرین و هەندێکیان هەمەلایی و گشتین و دەڵێ: ((ژمارەیەکی زۆر گۆڤار لە ئەڵمانیا بلاّودەبێتەوە، کە ژمارەیان زیاتر لە ٨١٠٠ گۆڤار دەبێت)) پاشان دەربارەی ڕادەی خوێندنەوەی ڕۆژانە نزیکەی ٢٥ دەقیقە ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە. (ئەڵبەتە ئەو ماوەیە ڕۆژنامەی هەمەلایەنی و گشتییەکان دەگرێتەوە.) ئینجا لە ڕووی تەمەنی خوێنەرانەوە دەڵێ: ((ئەوانەی تەمەنیان لە ١٩ ساڵ کەمترە ڕۆژانە تەنیا ١٣ دەقیقە ڕۆژنامە دەخورێننەوە لە ١٠٪ کەمتریان تەنیا وتاری سیاسی ڕۆژنامەکان دەخوێنێتەوە. بەپێی دوا لێکۆڵینەوە کە لە ١٣٦ گۆڤاری ئەڵمانی ئەنجام دراوە ٦٣٪ ی ئەوانەی گۆڤاری تایبەتمەند بە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و گۆڤارەکانی تری ڕابواردن و زانیاری دەخوێنینەوە، تەمەنیان لە ١٤ ساڵ بەرەو ژوورە.))

پەیامنێرەکە دەربارەی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا دەڵێ: ((تیراژی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا لە ماوەی چل ساڵی دواییدا، زیاتر لە سێ بەرابەری پێشووەو گەیشتۆتە ٣٣,٥ ملیۆن دانە لە ڕۆژێکدا. لەناو ئەو ژمارەیەدا ٢٦,٦ ملیۆن دانە پەیوەندی بە ڕۆژنامە ڕۆژانە، ٤/٧ ملیۆن بە بلاّوکراوەکانی ڕۆژانی یەك شەممە و ٢/٢ ملیۆن دانە ئەو ڕۆژنامەی هەفتەی جارێك دەردەچن)).

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانی لەگەڵ ولاّتانی تر بەراوردبکەین بۆمان دەردەکەوێت ڕۆژنامەکانی ئەڵمانی مەرکەزیەتیان نییە و زۆربەیان لەناو خۆیین یان ناوچەیین. له ئەڵمانیا ٣٩١ ڕۆژنامە هەیە، کە ٣٧٥ ڕۆژنامەیان ناوچەیین و بە تیراژی ١٨,٩ ملیۆن دانەیان لێ دەردەچێت و (٧) ڕۆژنامە سەرتاسەری بە تیراژی ١,٦ ملیۆن دانەو (٩) ڕۆژنامە بە تیراژی ١,٦ ملیۆن دانە بلاّودەبێتەوە". پاشان ناوی ڕۆژنامە ناوچەیی و گشتیەکان دەبات و هەریەکە لە ڕووی نرخ و تیراژ و ڕادەی خوێندەواری و ئەو شارانەی لێی دەردەچن و ناوەڕۆکیان زانیاری بلاّودەکاتەوە. لەناو هەموویاندا وا یەکێکیان وەردەگرین؛

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانی لەگەڵ وڵاتانی تر بەراوردبکەین بۆمان دەردەکەوێت ڕۆژنامەکانی ئەڵمانی مەرکەزیەتیان نییە و زۆربەیان لەناو خۆیین یان ناوچەیین. لە ئەڵمانیا ٣٩١ ڕۆژنامە هەیە، کە ٣٧٥ ڕۆژنامەیان ناوچەیین و بە تیراژی ١٨,٩ ملیۆن دانەیان لێ دەردەچێت و (٧) ڕۆژنامە سەرتاسەری بە تیراژی ١,٦ ملیۆن دانەو (٩) ڕۆژنامە بە تیراژی ١,٦ ملیۆن دانە بڵاودەبێتەوە". پاشان ناوی ڕۆژنامە ناوچەیی و گشتیەکان دەبات و هەریەکە لە ڕووی نرخ و تیراژ و ڕادەی خوێندەواری و ئەو شارانەی لێی دەردەچن و ناوەڕۆکیان زانیاری بڵاودەکاتەوە. لەناو هەموویاندا وا یەکێکیان وەردەگرین:

**هەفتەنامەی ـ شپیگل:**

هەفتەنامەی شپیگل بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٧ دا بڵاوبووەوە. جێگەیەکی تایبەتی لە ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیدا هەیە. خاسیەتی ئەم هەفتەنامەیە لەوەدایە کە بەشێوەیەکی زیرەکانە لەگەڵ هەواڵ گەیاندندا شی کردنەوەی خۆی هەیە و زمانێکی تایبەت بە خۆی هەیە. باری ئابووری ئەم هەفتەنامەیە بە هۆی دۆزینەوەو بڵاوکردنەوەی ئاگاداری و پرۆپاگەندە هەمیشە بەرز بووە. ئەم هەفتەنامەیە بەهۆی بڵاوکردنەوەی هەواڵی سەر پێیی و خستە ڕووی ڕاستی ڕیسواکردنی لێپرسراوانی بەدخووی دەوڵەتی سیاسی و بەهۆی بەکارهێنانی زمانێکی توندو تیژ لە لایەن لاگیرانییەوە دوژمنی زۆرە.

بە شێوەیەکی گشتی ٨٤٩ کەس لەو هەفتەنامەیەدا کاردەکەن، کە ٣٦٦ کەس لە دەستەی نووسوران و ١٢١کەس لە بەشی ئەرشیف و ٣٦٢ کەس لە بەشی بڵاوکردنەوەن. تیراژی ئەم هەفتەنامە ناسراوە زیاتر لە ١,٣٨ ملیۆن دانەیە و ژمارەی ئەوانەی ئابوورنەیان داوە لەناو ئەڵمانیا دا (٣٦٥) هەزارکەس و لە دەرەوەی ئەڵمانیاش (١٦,٥) هەزار کەسە.

هەفتەیەك (١,١٤) ملیۆن دانەی لێ دەفرۆشێت، کە تەنیا (٥٣,٦) هەزار دانەی لە ولایەتەکانی ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا سەرف دەبێت. ژمارەی لاپەرەکانی بە شێوەیەکی مام ناوەندی (٢٧٣) لاپەرەیە و لە ساڵێکدا دەکاتە (١٤١٧٨) لاپەڕە. لە حاڵی حازر دا زیاتر لە (٦) شەش ملیۆن نەفەر، واتا ٧,٥٪ خەڵکی ئەڵمانیا شپیگل دەخوێننەوە. کە ٦٣٪ یان پیاو و ٣٦٪ یان ژنن، ٣٠٪ خوێنەرانیان تەمەنیان ١٤- ٢٩ ساڵن، ٤١٪ یان تەمەنیان ٣٠ـ ٤٩ ساڵن و ٢٩٪ لە سەرووی ٥٠ ساڵییەوەن تیراژی ئەو گۆڤارە (١,٣٨) ملیۆن دانەیەو نرخی هەردانەیەکی (٥,٤) مارکە.

((... لە ساڵی ١٩٩١ دا دوو ملیۆن و (١٥٦) هەزارو (٢٤٠) تەن لە چاپی ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا سەرف کراوە))؛ ((... بەپێی ئاماری ١٩٩٢ ٨٣,٨٪ پیاوان و ٧٩,٩٪ ژنان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ڕۆژنامەیان خوێندۆتەوە))؛

((... خەڵکی ئەڵمانیا لە هەموو شتێ زیاتر لە ڕۆژنامەکاندا ڕووداوو بەسەرهاتی ناوچەیی خۆیان بەلاوە پەسندە، پاشان کاروباری سیاسی ناوەخۆ و خوێندنەوەی ئاگاداری و شتی ڕۆژانەو وەرزش و هەواڵی دەرەوە بەسەردەکەنەوە...))

لە ساڵی ١٩٧٩ـ١٩٩٠ ژمارەی گۆڤارەکان لە ٦٠٤٢ گۆڤاری جۆربەجۆر بوو بە ٨١٠٦ گۆڤارو ٣٢٠٠ گۆڤاریان پسپۆرین و ٥٢٤ گۆڤاریان بۆ سەرگەرمی و ڕابواردنەو ٣١٨ جۆریان گۆڤاری مەزهەبی جۆربەجۆرن و ئەوانی تر لە زەمینەی ترن. لە کۆتاییدا، پەیامنێری ڕۆژنامەی (اطلاعات)، بەراوردێکی لەنێو چەند وڵاتێکدا کردووە سەبارەت بە ژمارەو تیراژی ڕۆژنامەکان و ڕێژەی سەدی خوێنەران ڕۆژنامە لەو وڵاتانەدا، کە ئەمە نەخشەکەیە:

| وڵات | ژمارەی ڕۆژنامە | تیراژبە ملیۆن | ڕێژەی سەدی خوێنەر |
|---|---|---|---|
| ئەڵمانیا | ٣٩١ | ٢٦,١ | ٪٨٢ |
| فەرەنسا | ١٠٥ | ٨,٧ | ٪٥١ |
| ئینگلتەرە | ١٠٣ | ٢٠,٩ | ٪٨٥ |
| ئیتالیا | ٨٤ | ٦,٨ | ٪٤٥ |
| نەمسا | ١٥ | ٢,٦ | ؟ |
| سویسرا | ١٢٧ | ٢,٨ | ٪٧٩ |
| ژاپۆن | ١٢٦ | ٧٢,٥ | ؟ |
| ئەمەریکا | ١٥٨٥ | ٦١,٧ | ؟ |

### * پێشنیازێك:

هەروەك لە زانیارییە بەکەڵکەکانی پەیامنێرەکەدا دەرکەوت، زۆر لایەنی باری ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیای بە پێی ئامار بلاوکردۆتەوە. ئەم ئامارانەیش لە خودی ڕۆژنامەکانەوە بەدەستی هێناوە. لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێك و لایەنێکی ڕۆژنامەوانیی کوردی بە بێ ئەو چەشنە ئامارانە کارێکی پڕ لەکەم و کورتی دەردەچێت، بەتایبەتی لە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیدا زۆر پێویستە و لێکۆڵەر هەندێ ڕاستی گرنگی بۆ ئاشکرا دەبێت و

یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی ڕادەی خوێنەرو فرۆشتن و زەرو قازانجی و سەرچاوەی ئابووری و ژمارەی کارمەندان و دەستەی نووسەران و تەمەنی خوێنەرو ڕەگەزی خوێنەرانی بۆ ئاشکرا دەبێت، لە پاڵ ئەوەی، کەحەزو مگێزی خوێنەران و ڕەواج و هەرمێنی هونەرەکانی ئەدەب.... هتد بۆیە بە ئومێدم و پێشنیازی ئەوە دەکەم ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ساڵانە بەکاری خۆیاندا بچنەوە و فۆرمی تایبەت چاپ بکەن بۆ وەدەست هێنانی ئەو زانیارییانەی کە پێویستن، بەمەش خزمەتێکی باش بە ڕەوتی ڕۆژنامەوانیی کوردی و خۆشیان دەکەن ئەگەر ئەمە لە کۆندا نەکراوە، نەوەك هەرئەوە، بەڵکو زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانمان تەنها ناویان دەزانین و زانیاریمان دەربارە کەمەو دانەیان دەستناکەوێ. با لەمەودووا ڕوو لە نووسینەوەی مێژووی ڕۆژنامەوانیمان بکەین بە شێوەیەکی زانستی.

## کارتێکەری ڕۆژنامەوانی بەسەر هونەرەکانی ئەدەبدا

سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی چاپەمەنی و ڕۆژنامەو گۆڤار لە مێژووی کلتووری میللەتاندا بــە دیاردەیــەکی شارســتانی دەژمێردرێــت و ڕادەی هۆشــیاری ئــەو میللەتــەی پــێ هەڵدەســەنگێندرێ. بڵاوبونــەوەی یەکــەم ڕۆژنامــەی کــوردی (کوردســتان ١٨٩٨ – ١٩٠٢) وەچەرخاندنێکی نوێ یە لە مێژووی ڕووناکبیریی کوردیی، ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بەهۆی زاڵ بوونی باری نەخوێندەواری و نەبوونی هۆشیاری نەتەوەیی و کەم دەرامــەت و چاپخانە تووشی چەندین کێشەو چەرمەسەری بووە.

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە کوردستانی عێراقدا ئاسۆیەکی نوێ دەرکــەوت، ئینگلیزەکان بەهەر مەبەست و نیازێك بووبێ، ڕۆحی نەتەوەیی و ژیــانی خوێنــدەوارییان بــەرەو پێشەوە بردو ڕۆژنامەو گۆڤاری (پێشکەوتن) لــە بیــستەکاندا گرنگییــەکی تایبــەتی هەیــە بــۆ هونەرەکانی ئەدەب. لەوێوە سەرەتایەکی نوێیچیرۆکی هونــەریی کــوردی ســەری هەڵــداو نابــێ دەوری (مێجەرسۆن)[1] فەرامۆش بکرێت، هەرلەوێوە بیری ڕێچکەشکێنی **شێخ نوری شێخ ساڵح** بۆ شیعری نوێی کوردی سەری هەڵداوە بەلاسایی کردنەوەی شیعری شاعیرانی تــورك و ســروودو گۆرانی تورکی کێشی شیعری کوردی لەعەرووزەوە گۆڕی بە کێشی هیجایی. بەمە بووە ڕابەری ئــەو بزووتنــەوە نوێخوازییــە لــە شــیعری کوردیــدا وەك مامۆســتا ڕەفیــق حلمــی وتــەنی (ئینقلابێکــی)[2] لــە شــیعردا کــردو پاشــان (گــۆران)ی لووتکــەیش درێــژەی بــەو ڕێــچکەیەداو فەرهەنگێکی نــوێی بــۆ زمــانی کــوردی پــەتی دانــاو کــەش و هیــوای ڕۆمانــسییزمی ئــەدەبی ئینگلیزیی گواســتەوە نــاو شــیعری کــوردی و شــاگردەکانی (گــۆران)یــش[3] کامــەران مــوکری و هەردی و دیلان و کاکەی فەللاح و ع. ح. ب شیعری نوێی کوردییان زیاتر چەسپاند.

---

[1] بۆ ڕۆڵی مێجەرسۆن لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن بڕوانە: مێجەرسۆن و ڕۆژنامەی پێشکەوتن و گرەوێکی ئەدەبی، گ. ڕامان، ژ ٥٥، ٢٠٠١، ل،

[2] ڕەفیق حلمی، ئینقلاب لە شیعری کوردیدا، گۆڤاری پێشکەوتن، ژ١، بەغدا، ١٩٥٨.

[3] مارف بەرزنجی لە هەڵسەنگاندنی دیوانی (دیاری)ەکەی کامەران موکری دا ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە

هەر لە دووتوێی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا چەندین ژانری ئەدەبی تر لە دایک بوون و ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەند کرد، ڕۆژنامەی (کوردستان) لە یەکەم ژمارەیدا، چەندین (وتار) ی بلاوکردەوە،کە وتارەکان بەپێ ی ناوەڕۆکیان سیاسی و ئەدەبی و مێژوویی زمانەوانی و زانستی و وەسفین. لە باوەشی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا (نامەی ئەدەبی و چیرۆکە شیعرو پەخشانە شیعرو شانۆگەری... لە دایك بوون و لاپەڕەکانی ئەدەبی کوردییان ڕازاندەوە، لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەو گۆڤارەکان شاهیدی سەردەمی خۆیان لەو گۆڕانکارییانەی کە سەردەمەکە بە خۆوەی گرتوە. ئەگەر ڕۆژنامەو گۆڤار لە ئەدەبی میللەتانی تر لە ڕووی سەرچاوەی ئەکادیمیەوە بە پلەی دووەم بێت ئەوا بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی بە پلەی یەکەم دێت، لەبەر کەمیی کتێب و کەناڵەکانی دی ڕۆشنبیری ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی کات ڕۆژنامەوانیی کوردی، پسپۆڕی تیانەبووەو ئیمتیازەکەی گشتی بووە، بۆیە سەیر نییە لە ڕۆژنامەو گۆڤارە پسپۆڕییەکانیشدا ئەدەبی کوردی بە پلەی یەکەم بێت، لە ڕووی چیرۆکی کوردی بلاوکردۆتەوە بۆیە سەیرنییە گەر بڵێین لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی بە بێ ڕۆژنامەوانیی مەحاڵە و تەواوکەری یەکترن.

بە چاوخشانێکی خێرا بە ڕابەری ڕۆژنامەوانیی کوردی و قۆناغەکانی ڕۆژنامەوانیماندا ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامە ئەدەبییەکان لە هەموویان زۆرترن. بەدەگمەن ئیمتیازی گۆڤارو ڕۆژنامەی سیاسیی دراوە، بۆیە هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا، کۆڕو کۆمەڵ و ڕێکخراوە کلتووریەکانی کوردیی لە ڕێگەی ئەدەبەوە ئامانجی سیاسیی و کۆمەلایەتییشیان، بە تایبەتی لە ڕێگەی شیعرەوە بلاوکردۆتەوە. نموونەی شیعرەکانی ئەحمەد موختار جاف و بێ کەس و پیرەمێرد و گۆران و شێخ نووری شێخ سالح ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن و پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆی (یانەی سەرکەوتن) و (کۆمەڵی زانستیی لە سلێمانی)یش نموونەی زیندوون.

## دەروازەیەك
## بۆ ڕۆژنامەوانیی کوردی- فارسیو چەند سەرەقەڵەمێك

شوێنی جوگرافی کوردستان و مێژووی هەزاران ساڵی پێکەوە ژیانی میللەتانی ڕۆژهەڵات لەپێش زایین داو دواتر کۆبونەوەی ئەو میللەتانە لەژێر ئالای مەزهەبداو بەرژەوەندی ئابووری و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی دوورو درێژی سنووری و ژیانی ئاوارەیی و پەناهەندیی بەهۆی بڕیارو شەڕو سیاسەتی سەردەمەوە، هەموو ئەمانەو گەلێ هۆکاری دی وایکردووە لەگەڵ بیری بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی و ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامەوان و ڕۆناکبیری کورد پێویستی بەناسینی کلتوورو زانینی زمانی خۆیان دۆزی نەتەوەیی و پرسی داواکانی بخاتە بەردەم ئەوان ئەمە هۆکاری زۆرە گرێی خۆ بەکەم زانین لە بنیادی سایکۆلۆژی ئینسانی کوردو نزمی ئاستی هۆشیاری و کزی خوێندەورای و توانای بینینی ئایندەو بەرژەوەندی تاکەکەسی و چەندانی دی.

ڕۆژنامەوانیی کورد هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی ڕۆژنامەوانیی کوریدا، لەگەڵ ڕۆشنایی ڕۆژنامەی (کوردستان)، کە بە خاڵی وەرچەرخانێکی گەورە و بەهێزی کلتووری کورد بوو لە ١٨٩٨ دا بەهەردوو زمانی کوردی و زمانی تورکی، کە زمانی دەسەڵاتی سیاسی بوو بڵاوکراوەتەوە هەندێ جار بەزمانێکی سکالا ئامێز و پارانەوە بۆ پێدانی مافی خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکی خۆت بخوێنێ و بنووسی و بیربکەیتەوە وتارو بابەتەکانی نووسیووە، بە تایبەتی وتارەکانی سەردەمی میقداد بەدرخان کڕووزانەوە لەبەردەم دوژمندا بێجگە لە گوێپێنەدان و بە سووك سەیرکردن هیچی دیی لێ دەست نەکەوتووە.

ئەم تێکەڵاوی و بەکارهێنانی زمانی دووەم لە نووسیندا، جاران لە سەردەمی زوودا، نەوەك هەرلای کورد لای میللەتانی دراوسێش دیاردەیەکی بەرچاوەو کەمتر هەستی شۆڤێنی نەتەوەیی لە لایان بەتایبەتی لای تورکی گەلالەببوو زۆر لەشاعیران و تەنانەت لە دەربارو تەلاری پاشاکان یان سوڵتانەکانی عوسمانلی زمانی فارسی بەکاردەهات لەشیعری کوردیشیدا زانینی زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی مەرجی سەرکەوتوویی شاعیریان پیشان دەداو نالی (١٨٠٠-١٨٧٢) گوتەنی:

فـارس و کورد و عەرەب هەرسێم بەدەفتەر گرتووە
نالی ئەمـــــڕۆ حاکمی سێ مولکی دیوانی هەیە

خۆدەست ڕەنگینی و دەست بەسەرداشکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە هۆنینەوەی شیعر بەزمانەکانی تورکی و فارسی و چەندین شاعیرانی دی تۆژەرەوەکانی ئەو نەتەوانەیان سەرسام کردووەوە زۆر جاریش بە مۆڵکی خۆیانیان دەزانن.

زۆر نووسەری بە ڕەگەز کورد لە ئێران و ئەفغانستان و پاکستاندا بە زمانی فارسی مێژووی ئەدەبیاتی ئەو میللەتانەیان دەوڵەمەند کردووە. لەسەردەمی نوێدا لە ئێران لەسەدەی بیستەمدا زمانی کوردی قەدەغەکرابوو بۆ نووسین و خوێندن و بەهۆی سیاسەتی پاراستنی خاکی ئێران و دەستەلاتی شاو یەکگرتوویی گەلانی ئێران نووسەر و ڕۆژنامەوانی کوردیش پەنای بۆ زمانی دووەم، زمانی فارسی بردووە، لە کوردستانی عێراقیشدا ئەگەر چی مێژووی دەستپێکردن وخوێندن و نووسینی کوردی لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق بە پشتیوانی ئینگلیزو بەپێی بەندەکانی پەیماننامەی سیڤەر و دەستووری عێراق ڕێگە بە زمانی کوردی درا بۆ بەکارهێنان لە داموودەزگاکاندا، دیسانەوە بەهۆی ئەوەی شاعیر ونووسەری کورد زۆربەیان زمانی فارسییان لە حوجرە خوێندبوو ئامادەییان تێدابوو بە زمانی فارسی بنووسن، لە ڕۆژنامەوانیی سەردەمی شێخ مەحموودی نەمردا چەندین وتاری نووسەرانی کورد بەزمانی فارسی لەرۆژنامەوانیی ئەو سەردەمەدا بڵاوکراونەتەوە. بێگومان ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی ناویان دەبەین لە پێڕستی ڕۆژنامەوانیی کوردییدا ناویان دێت، بەهۆی ئەوەی کە دەستەی نووسەران و ناوەرۆکی بابەتەکانی تایبەت بەکوردو کوردستانن، لەبەرهۆکارگەلێك وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد با بە زمانی فارسیش نووسرابن.

لە باشووری کوردستاندا گۆڤاری بانگی کوردستان (١٩٢٢)[٤] لە سەرەتای حوکمدارییەتی شێخ مەحموددا شیعرو بابەتی نووسەرانی کوردی بەزمانی فارسی بڵاوکردۆتەوە. ئەم گۆڤارە وەك تیایدا نووسراوە هەفتەی جارێك دەردەچێ، لە شاری سلێمانی و لە لایەن جەمعیەتی

---

[٤] گۆڤاری بانگی کوردستان گۆڤارێکی زانستی کۆمەڵایەتی ئەدەبی بووەو لەسەر ڕووبەری یەکەمیدا لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە غەزەتەیەکی حورو سەربەستی میللییە، هەفتەی جارێك دەردەچێ، ژمارەی یەکەمی لە ٢ ی ئابی ١٩٢٢ دا ژمارە ١٤ی لە شاری سلێمانیدا دەرچووە. ئەم گۆڤارە لە شاری بەغدا ٣ ژمارەی دیکەی لە ساڵی ١٩٢٦ دا دەرچووەو زمانحاڵی (جەمعیەتی کوردستان) بووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بانگی کوردستان ١٩٢٢–١٩٢٦ کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار، بەغدا ١٩٧٤.

کوردستان و بە سەرپەرشتی مستەفا پاشای یا مۆلکی و موحەریری کوردی و فارسی عەلی کەمال و شێخ نوری شێخ صالح (م. نوری) و موحەریری تورکی ڕەفیق حیلمی بلاۆ کراوەتەوە.

١٤ ژمارە لەم گۆڤارە بلاوکراوەتەوە و گۆڤارێکی ئەهلی بووە، لە ژمارەکانیدا چەندین پارچە شیعری شاعیرانی کورد کە بە زمانی فارسی نووسیویانە و هەروەها ئاگاداری و وتاری لە بابەت ڕووداوەکانی خوی و سەلماس و ڕەزائیە ورمێ و سمکۆی شکاك بلاوکردۆتەوە. لە یەکێ لە ئاگادارییەکانیدا کە لە ژمارە (١) ی گۆڤارەکەدا بە زمانی فارسی بلاوکراوەتەوە هاتووە: ((بخدمت کوردهای محترم ایران بانگ کوردستان کە ناشر افکار ملت کرد وخادم علم و معارف است دوام و ترقیش محتاج همت و معاونت همە وطن پروران کردستان است چەدر خصوص نوشتن مقالات ملی و وطنی چە در خصوص ابونەشدن این غزتە از غیرت منوران و متخیرات کرد امید معانت داریم در این خصوص کمترین سعی و جهد حمیتمندان وطن موجب شکران عظیم خواهد گردید.

بانگی کوردستان))

بۆ خزمەت کوردە بەڕێزەکانی ئێران (بانگی کوردستان) کە بلاوکەرەوەی بیروباوەڕی میللەتی کورد و خزمەتگوزاری زانست و زانیارییە بەردەوامبوون و گەشەکردنی پێویستی بە هاوکاری هەموو ولاتپارێزانی کوردستانە چ لە بابەت نووسینی وتاری نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری و چ لەبابەت ئابوونەداریی ئەم غەزەتەیەوە ئومێدمان بەهاوکاری غیرەتی ڕووناکبیران و هزرمەندانی کوردەو هەرهەوڵ و تێکۆشانێك لەم ڕووەوە لە لایەن ولاتپارێزانی کوردستانە چ لە بابەت نووسینی وتاری نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری و چ لە بابەت ئابونەداریی ئەم غەزەتەیەوە ئومێدمان بە هاوکاری غیرەتی ڕووناکبیران و هزرمەندانی کوردەو هەرهەوڵ و تێکۆشانێك لەم ڕووەوە لە لایەن ولاتپارێزان مایەی سوپاسی گەورەی ئێمەیە.

بانگی کوردستان[٥]

دواتر لەگەڵ دامەزرانی دەوڵەتی عێراقی نوێدا بپێی بڕیارێکی تایبەت،کە پێشتر ئاکامی (پەیمانی سیڤەر) بوو وبۆ چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتی موسڵ زمانی کوردی لە ناوچە کوردەوارییەکەدا بوو بە زمانی فەرمی خوێندن و کاروباری کارگێڕی و وردە وردە خوێندنی

---

[٥] سەرچاوەی پێشوو.

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات بدریت
٣ آنه ده سیبریت

هو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

# بانگ کردستان

(زمان کوردی و فارسی)
بۆ کەل ...

[illegible] عدل آونه
[illegible] جوار
[illegible]

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه دەکری

(زمان کورزو رم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمه)

تاریخ انتشار
٢ آغستوس ١٩٢٢

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، فرتەیکی حر و سربست ملیه

نسخەیکی به ٢ آنه دەفروشری
هفتهٔ جاریك دردچی
سالانی

سال ١ ژماره ٨ [ جمعه ] ٧ صفر ١٣٤١ ٢٩ ایلول ١٩٢٢

« دولت همه ز اتفاق خیزد »
« بیدولتی از نفاق خیزد »

امرو له ناو ملت ایمەدا نفاق به درجەیك حکمفرمایه له کل برا ، باوك له کل اولاد ، حاصلی کس له کل [illegible]دا له قصه ، له فکردا یك ناکەون .

به بعضی امه شخصیك شخصیکی خوش ناوی ایتر [illegible]رق او یا هزار قصهٔ باش بکا ، یا بو منفعت ملت و[illegible] خوی فدا بکا هیچ فایدهٔ نیه له نظر یا زدیی و فکره باشهٔ له نظری جهلا و عوامدا به نوعیکی خراب [illegible]ا دەکات و نشانی به خلق ادا .

مثلا : امرو همو کس ازانی و حتی جهلایش فرق [illegible] دەکەن که حاکمی له حکومتی چاکتره له کل ایمیش د[illegible]نی کس شك ایم به بعضی امه رق له کسیکه و او کسه [illegible] به شکوری ناکات و دیەویت آزاد و حرله ژیر ادار[illegible] [illegible] خویا ژی لەرق او کسه ام حظ اکات ملتەکی [illegible] [illegible]حکوم و مظلوم بی .

ای قوم کرد . بو چی خرابه امرو لە ژیر بیداغ خوما[illegible]

به سربستی بژین و ایلی حقوق ملیهٔ خومان بین .

ایمه نالین بین به دشمن حکومت اسلام ایمه الاین جاری با بو خومان موجودیتیك . ناویك پیدا بکین و لەژیر بیدغی کردا کرد بینه وه اوسا که بو بین به شتیك و دمعان کیشته حکومت اسلام متفقاً و ترقی اسلامیت دست بدینه دست او حکومتی اسلامیه یه که امیدت به دراوسیمان .

[illegible] وقتەدا ام فرصته که بو قوم کرد هاکوتوه ملتەکانتر به فداکردن صد هزاران نفوس بویان هل نکوتوه و هل ناکوی — لەکل امەیشدا ایمه لەبر نفاق و شقاق خومان اغفال اکین هر داین ( فلان هات ، فیسار رویشت ) بوین به کردەکی له هردو جزنان بو .

عجبا اکر همو وکو برا دست بدینه دس یك واز له نفاق و حسد بهینین ، بو ترقی و تعالی خومان نی بکوشین و محافظهٔ خومان بکین له باشتر نیه که به درو و داسه ام وقته عزیزەی خومان ضایع بکین و له نفا[illegible]

ڕەسمی قوتابخانە دەستی پێ کرد، کە ئەویش بە زمانی کوردی و عەرەبی بوو و زمانی فارسی، کە پێشتر لە خوێندنی ئایینییەوە فەقێ و مەلا و شاعیرەکان فێری دەبوون ئەمجارەیان

ڕۆژنامەنووسیی کوردی– فارسی لەوێدا بە شێوەیەکی فراوان دەرکەوت و بە تایبەتی نووسینی فارسیی نووسەرانی کورد.

لە ماوەی سالانی جەنگی دووەمی جیهانیدا بە تایبەتی لە سالی ١٩٤٣دا دکتۆر ئیسماعیل ئەردەلان ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی لە دەولەتی ئێران بەناوی (کوهستان)ەوە وەرگرت، کە بەشی زۆری بەزمانی فارسی و هەندێ بەرهەمیش بە زمانی کوردی، بەتایبەتی شیعری شاعیران و پەندی پێشینان و وتاری ڕەخنەیی تێدا بلاوکراوەتەوە. ئەم ڕۆژنامەیە تا سالی ١٩٤٨ بەردەوام بووەو هەموو ڕۆژانی دووشەممە هەفتەی جارێك بەهەشت لاپەڕە بلاو دەبووەوە[6].

لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا لە مەهاباد لە ٢٢/١/ ١٩٤٦– ١٩٤٦/١٢/١٧دا چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بلاو کراونەتەوە بە تایبەتی ڕۆژنامەی کوردستان، کە زمانحالی کۆمار بوو، لە پال بابەتە کوردییەکاندا هەندێ جار بابەتی بەزمانی فارسی بلاوکردۆتەوە، ئەم ڕۆژنامەیە ١١٤ ژمارەی لێ بلاوبۆتەوە و ڕۆژی نا ڕۆژێ لەمەهاباد لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە و بە سەرپەرشتی پێشەوا قازی محەمەد بلاوکراوەتەوە.[7]

لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا دوابەدوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی لەسالی ١٩٧٩داو هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی ئێران بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کوردیی و بەتایبەتی لە سالانی سەرەتای شۆڕشدا زیاتر گەشەی کردو هەندێ سەنتەرو ئەنجوومەنی فەرهەنگیی کوردی بۆ بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەو کتێبی کوردی دامەزراون، کە هەندێکیان سەر بە دەولەتن و لەلایەن دەولەتەوە باربووی ماددی دەکرێن. مامۆستا (هێمن)ی شاعیر ڕۆلی لە دامەزراندنی سەنتەری سەلاحەددینی ئەیوبی بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی لەشاری ورمێدا هەبوو، ئەم سەنتەرە گۆڤاری (سروە)ی لێ چاپ دەبوو، کە ئێستایش ئەم گۆڤارە بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی بابەت بلاودەکاتەوەو بەردەوامە، هەروەها گۆڤاری (ئاوێنە)لە تاران و ڕۆژنامەی (ابیدر- ئاویەر) لە شاری سنەداو (زرێبار) و (سیروان) وەك دوو ڕۆژنامە بەهەردوو زمانی

---

[6] لە بارەی ڕۆژنامەی (کوهستان) ەوە بڕوانە: د. هـ یمداد حوسێن، ڕۆژنامەنووسیی کوردیی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٢–١٩٤٧، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٦٧–١٩٦.

[7] سەرچاوەی پێشوو.ل.١٤٠–١٦٥.

کوردی و فارسی هەواڵ و چالاکی و کلتوری ناوچە کوردەواریبەکە بلاودەکەنەوە. لەم ساڵانەی دواییدا گۆڤارەکانی (کوردستان) و (مەهاباد) و هەندێ پەخشنامەی خوێندکاریی لە زانکۆکانی ئێراندا لەلایەن خوێندکارانی کورد بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی بڵاودەبنەوە، کە کێشە و گرفتی فیکری و مەعریفی و کلتوری بڵاودەکەنەوە.



بقلم آقای محمد مردوخ (آیت‌الله کردستانی) -۱۸۰-

# کرد و کردستان

**

(عطف نظر برشته کیقباد ) اولاد توس قبادی یعنی توس‌مادی. نسلاً بعد نسل در (ماد وپارس) یعنی ایران کنونی و مضافات تا زمان استیلای کورش کبیر بر «آزدیاک» سلطنت کرده اند.

اما اولاد لهراسب کیقبادی در خاورستان سلطنت داشته اند سپس در «مادوپارس» هم تااستیلای اسکندر کبیر سلطنت کرده‌اند. وهنگام استیلای کورش کبیر بر کشور ماد وپارس اولاد لهراسب صمیمانه طرفدار کورش بوده اند کورش هم باآنها نهایت محبت و نوازش‌راداشته است.

ازلهراسب آثاری درتواریخ مشهود نیست جزاینکه بعضی مینویسند که (هند) را تصرف نموده. اما تصرف هند بدون مساعدت پادشاه ماد وپارس برای لهراسب چندان سهل وآسان نبوده است شاید در لشکر کشی لریبرز بهندوستان لهراسب هم دخالت داشته یا رئیس سپاه بوده‌است که مورخین اشتباهاً فتح هند را باو نسبت داده اند.

اما آثار گشتاسب پسر لهراسب خیلی زیاد است. قلعه‌سرلند ودیوارخاور درست مشرق وشهریضاه فارس‌ازآثار اواست مدفنش‌درشیراز است.

گشتاسب درحال حیات پسر برتخت سلطنت جلوس نموده ۶۶۸ ق. م لهراسب درسال ۶۵۰ ق.م درگذشته است

پایتخت گشتاسب اول‌بلخ بوده بعد به استخرپارس انتقال داده است . باعث شهرت گشتاسب بیشتر ترویج مذهب زرتشت کرد بوده است یعنی زردشت اخیر که توس ثیار ازجلوگیری شده است گشتاسب در درسال ۶۰۲ ق. م درگذشته است.

حکمدار خاورستان در زمان کورش کبیر بهمن پسر اسفند یار پسر گشتاسب، پسر لهراسب بوده است«۶۰۲ـ ۵۳۳ »ق.م بهمن در کتب عهد عتیق بنام «اخشویروش» مذکور است و یونانیان اورا«آرتاگزرسیس»میگویند. اردشیر درازدست هم عبارت ازاوست وامتدیار پدرش‌را یونانیان «گزرسس» یاگزرسز میگویند که گشتاسب اورابجنگ خاندان رستم فرستاد ودرآنجا کشته شد.

بهمن قلمروخود را ازهند تا حبش توسعه داد ومرکز خود را شوش مقرر ساخت (۴۶۴-۴۲۴) ق. م این پادشاه ...

داشته است بعدل وحکمت موصوف وقوانین موضوعهٔ او درتنظیم‌امور کشوری‌معروف است نوشته اند که بهمن بکین قتل پدر بجنگ خاندان رستم رفت وفرامرز پسر رستم‌رابکشت«در زینة‌التواریخ مذکور است که رستم دراین واقعه حیات‌نداشته است»

درعهد بهمن بنی‌اسرائیل خوشحال ودرنهایت رفاه بوده انـد بلشتر پسر بختنصر راکه ازطرف او حکمران بابل بوده محض‌آسایش خاطر یهود معزول کرده وبجای او کورش نام که از اولاد جاماسب پسرلهراسب بوده و مادرش از بنی‌اسرائیل‌خواهر دانیال پیغمبر بوده والی آنجا نموده است «مروج‌الذهب جلددوم صفحه ۸۲و۸۳ تاریخ سرجان ملکم جلد اول صفحه ۱۳ روضة الصفا صفحه ۲۲۸ وغیره

ابن‌خلدون درصفحه ۱۶۲ ومسعودی درمروج الذهب صفحه ۶٤ راجع‌بکورش مذکور مینویسد که از ملوک بابل بوده است بهرحال این کورش‌مادی‌است وغیر ازکورش هخامنشی که درکتب عهدعتیق بکورش پارسی باکورش پارس مذکور است.

«کتاب دوم تواریخ ایام فصل ۳۶ آیه ۲۲و۲۳ کتاب عزرافصل‌اول وفصل سوم آیه هفتم وفصل چهارم آیه پنجم کتاب دانیال فصل ششم‌آیه ۲۸ و فصل دهم‌آیه اول» پس اختلاف مورخین‌راجع بکورش بیمورد است واین کورش‌غیراز کورش هخامنشی‌است.

این مورد ازجمله مواردی است که مستشرقین تحقیق اینجانب را تصدیق کرده اند.

پس‌از بهمن دخترش همای که یونانیان‌پریزاد میگویند مدت چهل سال سلطنت کرده است «۵۳۳-٤۹٤» ق.م پایتخت او درعراق درنواحی «تیسفون» بوده است‌گویا ازانتقال قتل پدرش‌آنجا رفته است یونانیها اشتباهاً‌هارا پریزاد نوشته اند پریزاد لقب داریوش پسرهما است‌که برای نبرله بهمن او را پری نسبت داده اند«مستشرقین این تطبیق را هم تقدیر کرده اند»درزمان سلطنت‌همای پس‌از درگذشتن کاروس هخامنشی پسر کورش کبیرکه یونانیها‌کامبوز میگویند ...

## وصف و تشبیه لەدە ئەبەستەدا

بقیه‌ازصفحه ۶

لابکە ئەوە ترجی ترجی ئەبژی:

چاریکم ئەوی بی کلە وەش بیو ەکوەە سارەروناکە وکەش‌بی!

ئەوی ئەتانەوی بزانن لە کوردیدا ئاریفی کولیکی‌رووناک وشاون‌برشەووریشە‌چون کراوەبابەچاویکیش‌بخشینەئەمەلیەتەی «ئاریە» داکو وتوبەتی:

گەر لە برجی لەم بە بیولەی دلەە وێ دووربی لە رووت
وائە سوزیدا، لە سیە، شاجرای‌گوتانە وەبە.

بویژی کورد لە ئیکراهەدا بە روەخراو ئەبینە وە ولەبان گوبە ناسکەکەی تەوشە ویتەکە بە وە،گولالەبکی خوێنی بی‌جا وەکەوبت کوناوی «دەم» ەجا، لەخوشیدا، خاوتە بینە وە ولەبیر دلە وەوەکو بولبولیکی دە ئە باش ئە چریکینی وەئەلی:

توربانی دووت بم‌کە شکستی بقەمە ردا!
حەیرانی لیبت بم‌کە رە واجی بەسە کەردا!

لەم‌کاتەدا کو «نالی» حەیرانی لیبی‌ئاڵە، گیانی «ئاری» لەبان چناکەی توت ویتەکە یەوە، لەدەستی باوەشینی تۆی بارە وە، ئالوزئەبیت وهاداوردەکا:

لیرشەکەز ئەرسو بەبرجت بارەشینی لیرەکا،
مینی کیانم ئە رنشتە وبەئەندی جاتەزە.

(پەشوبی ئەمەدادیسان ئەنوسین)

سنه، ناصرءآزا. (آزادپور)

این داریوش پسر ویشتاسب پسر آرسام پسرآریاوام پسر سیاوش پسر کورش اول پسرکاوس اول پسرسیاوش اول‌پسرهخامنش حکمدار پارس وعیلام است‌که درکتیبه های خودش نیز خود را هخامنشی معرفی کرده است ودرکتب عهدعتیق به«سیاوش پارسی» یا «داریوش پادشاه ماد»معروف است.

« کتاب نحمیا فصل دوازدهم آیه ۲۲ وکتاب عزرا فصل چهارم آیه پنجم وبیست وچهارم وفصل پنجم آیه ششم و هفتم » بیت‌المقدس را این داریوش تعمیر کرده است.

سپس درسال ٤۲٤ ق.م داریوش مادی یعنی داریوش پسر بهمن که از همای متولد شده بود برتخت سلطنت جلوس کرده ودر تحت تعلیمات خصوصی مادر سلطنت نموده است اورا «دارا» نیز گفته اند.

این داریوش برتمام کشور ماد وپارس‌استیلاء یافته‌تاتاظلمطین درتحت زمامداری او بوده است و مدت بیست سال سلطنت کرده است این داریوش درکتب عهد عتیق به« داریوش مادی » مذکور است.

کتاب دانیال فصل پنجم آیه ۳۱ وفصل یازدهم آیه بحکم ودرفصل نهم آیه اول تصریح شده‌که داریوش پسر«اخشویروش» ازنسل مادایان است بنابراین تفصیل ازسلسله کیان‌یازده نفرسلطنت کرده اند از اینقرار:

۱-کیقباد ۲-کیکاووس ۳-توس ٤- فریبرز ٥-کواکسار ٦-آزدیاک ۷-لهراسب ۸-گشتاسب ۹- بهمن ۱۰- همای ۱۱- دارا یعنی داریوش پریزاد.

درسال ۳۳۰ ق.م اسکندر مقدونی برایران « یعنی ماد و پارس» تاخته پس‌ازجنگ سختی درنواحی هولیر «اربیل» داریوش بدست دو نفر جنایتکار همدانی «جانو سیار، ماهیار » کشته شد و دولت ماد خاتمه یافت و تمام کشور تحت تصرف و استیلای ...

زمارە ٩٣
سـالی یەکەم
دانـەی قرانیك

# کوردسـتان

ارگانی حزبی دیموکراتی کوردستان

پێنج شەممو
١١ رەزبەر
١٣٢٥

هەیئەتی نوسەران وەدەری دەخەن

لەچاپ ودەستی دانیووتاردا آزاد بن


بەقەلەمی هەژار

# میتینگی گەورەی

## دەهەزارنەفەری لەشاری مـهاباد

گرتینگ لـە سـەرانی دا هێشتاشاری مهاباد وداوێنی کیوەکانی دەورەی نسی‌دایرشیون کـیوەکانسم وەك پەحاپ‌ پیرانەدەهاتە پێش‌چاو کـە بەکشیدەی زمردەوە وبستاون‌وچاوە نوری‌پەمری رەئیسی‌ناحیەی‌خویان:

هەرچەند لەورروژەوە کە حزبی دیموکراتی کوردستان تـەشکیلی بوەهەموسەاتێکمان‌هەرجەشەو تاریخێن بەلام روژو وەخت‌وسەعاتـی واتی دین‌کەتەرقیکی تایەتی هەبـەولـە روژانی دی‌تـارێـخی تـرن‌روژی ٥ ر ٧ ر ١٣٢٥ پێش لـەوانـە دەژمیردری.

لەورروژەدا لەپێنج‌لای‌شارەوە لەهەرلایەی خەلکی ناحیەیەك‌بەمازی وبەمسلحی کوبونەوە وەلەپاش‌حاضرو غایبی کەیمحیحات بـەمەشق زور بەریك‌وپیکی رویان کردە مەیدانی عمومی چوارچرا.

ئەماشاچیان لەپاوونڤ جوان وپیر کچ وکورەهەزارەها وەك کو لەمەورە یان کوبونەوە هێشتی‌تفنجنی کوردستانیش بەرامبەر جابی‌حاجی باباشێخ وپێشیکی زورلە گـەورە گەورانی هەشایر لەمەسەری حزب لەخزمەت پیشەوادابەسەفراوستابون.

وی‌جەلک خەلکی‌شارولاوە جـاویان بریوەتە لای‌کانگای حزبـونریونێك کەتزیک بەوی‌دامـەزراوە بـلیند پێزیک کەبوناشقان دانـدراوە. کوی‌یان آمادە کردوەبویستی ئەمریا ونارویەندیك کەلەوسەرتریونەرا پیان دەلین‌وبلیندبیز تحویلیان‌دەدا. دلیان حاضر کردوە بوقبولکردنی.

دەستەی‌موزیکان وسرودی منالانی‌مەکتەب بانگ آوازێك‌بوون لـە تـمدنی کـوردیان خبردەدا

ماوەلەلاپەرەی ٢

# قەدری‌بەگ جەمیل‌پاشا

## پیاویکی نـیشتمان‌پەروەری کـورد

قـەدری‌بەگ جەمیل‌پاشا لەبنەمالیکی زور گەورەی کوردی (دیاربەکر) ئەوبنەماله تیکرا دەستیکی بالایان‌بوە لەکاروباری کوردایەتی‌دا

قەدری‌بەگ لەسالی١٨٩٢ی میلادی لە شاری (دیاربەکر) کـە یەکیکە لەشارانی کوردستانی‌نور کیا لەدایك‌بوە‌لەتەمەنی ١٦ سالی‌دابوخویندن چوتە ئەستەمبول کەئەودەمی‌پایتەختی حکومەتی عوسمانی‌بو چەندیك‌ئەلبسە (مدرسەی‌متوسطە) ی‌ئەستەمبول ودو سالیش لەمدرسەی فەلاحەت‌داخویندویە

لەسالی١٩١١ یەعنی‌ئەمەنی ١٩ سالیدا قەدری‌بەگ دەبینی کـەئەونەتەوانەی لەژیر آلای‌امپراطوریی عوسمانی دادەژین وەکو عەرەب، ئەرمەنی، آرناوود (آلبانی) خەریکن‌بوزگاری خـویان تیدەکـوشن وبوئەوآمانجە کومەل واحزاب تـەشکیل دەدەن ئەویش بەراهنمایی دەرونی‌یاك‌وهەستی میللەت پەروەری دەگەل چـەنـد محصلیکی کوردی دیکە‌بەرهبەری وارشادی‌ماموستا(خەلیل‌خەیالی‌موتکی) کومەلی (هیفی) یان‌سازکرد آمانجی‌ئەو کومەلەوە کولەهەموکەس آشکرابە سـەرخستن وپیشخستنی کاروساری نـەتەوەی کوردبوو

ماوەلەلاپەرەی ٢

بەقەلەمی رحیم‌سیف قاضی

# بوچ مـلتی

## کورد وابەدبە ختوسەرلـی‌شیواو بوو؟

هاونیشتمانانی خوشەویستم، برایانی عەزیزم، وەکوهـەموتان دەزانـن سالانیکی دریژە کە ملتی کوردلەریی سەربەستی وآزادی کـوردستان‌دا مەیەتی کیشاوموامەریگایەداقوربانیان لەئەندازە بەدەری داوەبەم‌حالەش بە مرامی‌خویان نەدەگەیشتن وئەم‌بـی بەشیەش هەرامبەر دووبەرەکی‌وکینە کیشی نیوەخویان‌بوو.

لەمەوبەت چەرخ لـەمەوبەر ئاڵەورو چەرخێك نەبوە کەیەك‌پلەچند پیاوی‌نیشتمان پەرست وآزایەیدانەیی کەبوآزادی وەەربازی کوردستان لەاسارت‌ملەوبەرەبەرەکانی نەکامەیەتانیان کیشاوە وەکیانبازیان بەخرج‌داوە لەژیانی خویان‌ومالو منالیان‌دەستیان هەلگرتوە وبوون‌ونەبوونیان لەپیناو آزادی کورداندابەخت کردوە.

کاتی کەلە آمانجی بـاکیان تریك‌بونەتەوە وگەلی‌جاریش‌دوستی خوشەویستیان لەباوەش گرتوە پاش پێنیك کوتوبررلەنیوچون‌وسازمانیان بلاوبوە بوچی؟ چونکو هاوری وهاودەست وبیارەدە وەکاتیـبان

ماوەلەلاپەرەی ٣

بەقەلەمی: دلشاد رسولی

# خدماتی حزبی دیموکراتی

## کوردستان بە جامعەی کوردەواری

ئەوی روژی کە نیوی کورد هینان نەدەهاتەخونی هیچ کوردیك. ئەوی روژی کە خویندن بەکوردی بەبیری هیچ بشریك دا نەدەهات و ئەگەر بیری لی‌کردبا گوتنی مایەی اعدام و محوکر بو ئەوی روژی کەکلیمەی ـ بژی کورد و کوردـ ستان لە قاموسی لغات و لەسەرزوبان هەلگیرابو وکەس جرأتی گوتنی نە بو. ئەوی روژی کە هەمو کوردیك وای دەزانی ژیان هەرئەوەیە کەکار بکەی ئمرەی بیگانە بیبەن هەر دیلو بەندە بی‌وخەلك آزادیی ئەوی روژی

کە تەواوی کوردان وایان چو بوە میشکی کەشتهای خوشبەختی لە ژیان چوەبەکەئەوەی خوی لەسەرت کردوە بە گەورە لیت رازیی‌بی ئەوی روژی

زەمانیك بو بیبیان دەگوت زمانی دیکتاتوری کەئەو دیکتاتورانە وەکو دیوی حەوت سەر شالاویان بو خاکی ایمە هینابو پەنەمابوون لەریشەوە نابود مان بکەن. ـ وەهیچ کوردیك تەوانای ئەوەی نەبو بلی من کوردم اصلا نەی دەزانی زیانیك و آزادیەك هەیە تاداوای بکا زوردارو خوین مژەکان کوردیان وا لە ریشەوە هینا بوە دەر ئەگەر خودای متعال روحی بەو ملتە نەکردباوچەند لاویك بوزگار کردنی ئەو کەلە ـ هەزارە گیا نیان لە سەر دەست دانە نەبا ونەهاتبانە مەیدانی ملە

و مبارزە ئەوانەی نیوی خو یان نابو عدالت پەروەر ایمەیان نابود کرد بو ونەیان‌هیشتبو بین ـ.

جەوانانی مبارز لاوانی نیشتمان پەروەر بە مەرداتە بە نیوی حزبی دیموکراتی کوردستان لە دەورەی یەك کومەل‌بوون‌و هەریەکە بەایمان و عقیدەییکی‌قایم و بە دلیکی پاك‌سویندی خوارد ـ هەتا گیانم لەبەردایە بوسەربەخویی و سەر بەرزی و لاتومیللەتەکەم لەتیکوشین‌و تەقەللا دەست هەلناگرم بەحقی‌نەو قورآنە ـ ئە و کـومەلە لە وجەوانانی بەهیزی کوردستانە

ماوەلەلاپەرەی ٣

# تلـگراف

## اورمیەدن

آذربایجان دموکرات فرقه سینن حرمتلی‌رهبری جناب آقای پیشەوری حضور لرینه کوردستان دموکرات فرقه سینن عزیز رهبری جناب پیشوا آقای قاضی محمد حضور لرینەاوزی آذر بایجان روز نامه سی اوزی کوردستان روز نامه‌سی بوموقعده آذربایجان و کورد ملتین خاین‌لر

طرفندن کورد ملتینن آدینه ویرلن یالان انتشارات بیز لەفداکی‌امضه ایدنلر ارومیه اطرافندا اولان کورد قبیله رئیس لرینی واد لر ایدر بو تلـگرافلی حضور یزه عرض و وز عزیز رهبر لر یمزی ایمن ایدرك هیچ بیر ارتجاعی قوەلر ایده بیلمز ایکی قردلشی ارا سینی ویرسون کورد ایلی‌یاخشی‌بیر ملت لرار اسیندا اساز امدیقی احترام الـدە ایتگمز ازادلیق شبه سینده اولمو شیدی بو نیه اولندان انجـدیگمز ایندی

تجدید ایدب بو وسیله ایله ازادلیق یولوندا تو کولن آزادخواه لارین مقدس قانینا آند ایچریك آخرین تقریمز قالانا کیمن آذر بایجـان ملتینن ارلسیندا توده دن بیرلیك و قردلشلقی و الدیقمز ازادلیقی کمگی حفظ ایده جیك

بهادری ـ پیروی ـ شکاکی ـ آقا فتك ـ سید جهانگیری ـ حسن آقا هناری طاهر خان سمیقوی ـ حسن‌تلو ـ نوری بیك ـ عباس تمر خان هناره

### لەکـنفرانسی آشتی‌پاریس

دەکـوبونەوەی‌سیاسی سنوری‌ایتالیادا نوینەرەکانی یوکوسلاوی دەلین کـە ئەگەرسنوری ایتالیاو کوسلاوی‌هەر بەوچەشنە ببینیەوەو ئەنیردرنە پیش چاوی وزیرەکانی دەرموەبوکوسلا وی‌ئەو قەراردادەی امضاناکا.

### لەانلونیزی

لەباتاویا اورد کیلرن‌نارداوی‌تایبەتـی انکلیس‌هەندیك لەنوینەرەکانی‌هلندی‌و اندونیزی‌بانگ هیشن کـرد کـە دەگـلوی نهاریبخون ودوکـتور شهریاریش حاضربو.

خومان آمادەین و آگاداریش دەکەین مـاون کـومیتەی مەرکەزی‌حزبی دیموکرات کوردستان ـ مناف کریمی

واحساسات لەوولاتی خویاررلرە کیش یاردەکا وەهاباد دەبی‌ئەوەش بزانین کەسایری مناطقی دیکەی کوردستان نیش‌هەر وەکوئەوچەی مەهابادبو آزاد بون احتیاجی بەفعالیتی کەنجان‌ولاوانی فیداکارە. گەورەترین خدمتیش بەنظری حزبی دیموکرات ئەوەیەهەر کەسە لەمنطقەی خـوی‌دا فعالیت‌و کوشش بکانەك هەلوەدای جیگای‌دیکەبـی چونکو ئەوەتایە هەرچلونیك‌بی‌هەر فردیك‌لە منطقەی‌خوی‌دا چاتردەتوانی خدمت بەنیشتمان وملەتەکەی‌بکا. چونکو لەحیث‌وضعیت مالی‌ایمە دە مضیقەداین ورفـع ئـەومضیقە بەش اقداماتی لازم‌دەست پی کراوە هەر وەختیك مرفع‌بو بوقبولی‌دانـەنـی

# درسی یەکەم

## جغرافیەی کوردستان

جغرافی علمیکە لەدنیای ئـەورودا اهمیەتیکی زوری‌هەیە. میللەتیش کەونوەکان هەموسالیکی بەملیارد تومەن بوخدمەت کردنی جغرافیە خەرج دەکەن.

جغرافیە گەلی‌جووری هەیە وەکو(جغرافیەی‌آبووری، جغرافیەی فلکی، جغرافیەی‌سیاسی ...).

بوچـی جغرافیەی کوردستان دەخوینین؟:

(١) بوئەوەی درحـق‌آوو هەواوکانگەو چومو شارو دیـهات وعشایرو هەموجورە شتیك کە لە کوردستان‌هەیەمعلوماتیکی‌باشمان‌بیـی وبەجاکی لەشاك وآوی‌شارەکانـی کوردستانی گەورە آگادار بیـن

(٢) ئەومیللەتانە کەنیوانیان دەگەل کورد هەیە وتریك بـە کوردستانن یان‌نـاسین وشـارەزای وەلاتەکەیان بین.

(٣) لەپیش کـەوتن‌وپاش کـەوتنی میللەتـەکانی دنـیـا

ماوەلەلاپەرەی ٣

# اگاداری

بەهـوی دەستوری زمارە ٢٨٠ ١٠ر٧ر٢٥ انجمەنی بەرزی کوردستان لەمەوەلی‌مانگی‌رەزبەری‌١٣٢٥ حـەقی روناکایی برق‌قرار کیلواتی ٨٠ریال وەشمی ٩٠ ریال (کیلواتی‌قرانیك وەشمی نمنیك بـو شـارداری اضـافە لەحقی مدتیـبشو) تعین دەکری سال میکائیلی

# بوزانین

لەورروژەبەوە کەحکومەتی میللی کوردستان تەشکیل‌دراوە ئاشـەورو برایانی کوردی‌هەمو منطقەیك‌ایرانی احساساتیکی بی‌ئەندازەیان کـردوە ولەهەمو لایەکەوە بوئەنجامی‌وەظیفەی کوردایەتی ونیشتمان‌پەروەری‌بەرامبەر بەکوردو کوردستان رویان کردو ئەمەرکەزی حکومەتی میللی کورد ستان کە مهابادە مەعلومە ئەوبرایانەی تشرفیان دیتەلای ایمەهەمووشەخصی فعال وحەدی‌وکارزان وتیکـەیشتون

## مێجەر سۆن و
## ڕۆژنامەی "پێشکەوتن" و گرەوێکی ئەدەبی

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفید لە سلێمانی، ئینگلیز کاروباری شاری سلێمانیان بە دەستەوە گرت، یەکێ لە کارە چاکەکانی ئینگلیز ئەوەبوو، یەکەم چاپخانەیان بۆ شارەکە هێناو لە پێناو بلاوکردنەوەی بیروڕای کۆلۆنیالیستانەی خۆیان و هاندانی خەلکی بۆ خوێندن و خوێندەواری بۆ لاینگری خۆیان و دژایەتی دەولەتی عوسمانی و لاینگرانی تورك کەوتنە بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەوانی و چاپەمەنی. ئەم هەنگاوەی ئەوان بە هەر مەبەستێك و بۆ هەر مەسەلەیەك بووبێ، تۆمارێکی زیندوویان بۆ ئێمە بە جێ هێشت، کە لە لێکۆلینەوەی زانستی لایەنەکانی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕووناکبیری کورددا پڕ بایەخە.

ڕۆژنامەی **پێشکەوتن**، کە یەکەم ڕۆژنامەی شاری سلێمانی و یەکەم ڕۆژنامەی کوردییە لە باشووری کوردستاندا بلاوکراوەتەوە.[1] ئەم ڕۆژنامەیە لە لایەن ئینگلیزەکان و بە سەرپەرشتی مێجەرسۆن هەفتانە بلاوکراوەتەوە[2] یەکەم ژمارەی لە (٢٩ی نیسانی ١٩٢٠)دا بلاوکراوەتەوە. تا ژمارەی (٩٧) لە سالی دووەمیدا بە چوار لاپەڕە و پاشان بە شەش لاپەڕە بلاوکراوەتەوە.

ڕێڕەوی گۆڤارەکە ڕۆشنبیریی گشتی بووە، هەروەك لەسەرەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە (**هەموو بۆ پێشکەوتن دەنوسرێ**). ڕۆژنامەکە لە ڕووی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانیی و چاپەوە، لە چاو ڕۆژگاری خۆی تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتووە، کە ئەمەش نیشانەی لێزانی و شارەزایی سەرپەرشتیکەری ڕاستەوخۆی (سۆن) بووە.

---

[1] لە سالی ١٩١٨دا ئینگلیزەکان لە بەغدا ڕۆژنامەی تێگەیشتنی (ڕاستی)یان بە زمانی کوردی بلاوکردەوە، بەلام لە سنووری باشووری کوردستاندا ڕۆژنامەی پێشکەوتن یەکەم ڕۆژنامەی کوردی شاری سلێمانی و باشووری کوردستانە.دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لە بارەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یەوە لێکۆلینەوەیەکی بە نرخی بلاو کردۆتەوە، بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.

[2] سەرجەم ژمارەکانی ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە لایەن عەلی ناجی کاکە حەمەئەمین عەتار و سیروان بەکر سامی و بە پێشەکی د.مارف خەزنەدار لە سالی ١٩٨٨دا بلاو بۆتەوە.

(**پێشکەوتن**)، کە هەندێ بە (**پێشکەوتنی سلێمانی**) دادەنێن بەهۆی ئەوەی لەسەر ئارمی ڕۆژنامەکە،کە (پێشکەوتن)ە بە بچووکتر (سلێمانی) نووسراوە، بەڵام من وای بۆ دەچم، کە نووسینی (سلێمانی) بە تەنیا بۆ ئەوەبوو، کە دیاری بخات، لە شاری سلێمانی دەردەچێت و هیچی تر. ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکە بریتیە لە هەندێ بابەتی ئەدەبی وەك شیعرو چیرۆکی وەرگێڕاو و بابەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەمە بیجگە لەوەی هۆیەك بووە بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵك و بانگەوازو کاروباری ڕەسمیی فەرمانگەکانی تاپۆو شارەوانی و... تاد.

لە ڕووی قەوارەوە ڕۆژنامەکە (٢١×٣٣) سم لە هەر لاپەڕەیەکدا دوو ستوونی تێدایە و درێژی هەر ستوونێکی (٢٩)سم و درێژی هەر دێرێکی (٨) سم. ڕێنووسی ڕۆژنامەکە ڕێنووسی عەرەبیە و نیشانەکانی (٧)ی تێدا بەکارنەهاتووە و تیپە بزوێنەکانی (ە، و، ی) نەبووەو هەروەك نووسینی عەرەبی نووسراوە، بۆ نموونە (ئارمی) ڕۆژنامەکە (پێشکەوتن) وا نووسراوە، ئەمە وای کردووە لە هەڵەی ڕێنووس و هەڵەی چاپی بەدەر نەبێ، کە بەشی زۆری بۆ سادەیی چاپخانەکە و شێوەی کارکردنی دەگێڕێتەوە.

## مێجەرسۆن ڕۆژنامەوان و حاکمی سیاسی

لە ساڵی (١٩٠٨)دا لە ئینگلتەرەوە (مێجەر سۆن) بەکاری ڕەسی بەریتانیاوە ڕەوانەی کوردستان کراوە، بۆ ئەوەی زانیاری لە بارەی کورد و دابونەریت و ڕەوشت و ئاکارو مێژوویەوە زانیاری کۆبکاتەوە. سەرتا گەیشتۆتە ئەستەمبوڵ دوای گەڕان و سووڕان بە دوای کوردێکدا تاوەك تووشی (شیخ الاسلام) ی بیارە دەبێت، بەڵام هیچ سوودێکی نابێت و شێخ شك و گومانی لێدەبێت، بە پاپۆڕێك بۆ (بەیروت) بەڕێ دەکەوێ، شایەنی باسە، پێشتر لە کرماشان شتی کوردی فێربیوو، لە بەیروتەوە بە شەمەندەفەر دێتە حەلەب و ناوی خۆی دەگۆڕێ بە (میرزا غولام حوسێنی شیرازی) گەشتێکی سەیروسەمەرە لە (ئورفە) وە بۆ (دیاربەکر) و لەوێ بووە بە هاوڕێی کابرایەکی هەولێری بەناوی (حاجی والی)، کە حەڤدە جار چووە بۆ حەج و لە دیاربەکر دەیباتە دەرەوە و ناوی دەنێ (موسی) بەناوی کوڕەکەیەوە. دەگاتە موصل و لەوێ لەگەڵ قەتارچییەکدا دێتە هەولێرو کەرکوك و پاشان سلێمانی. لەو شارەدا لە خانی (غەفورئاغا) ژوورێك بەکرێ دەگرێ و پاشان دەبێتە هاوەڵ و دۆستی خەڵك. دواترێ دەچێتە هەڵەبجە و لەگەڵ وەسمان پاشای جاف و عادیلە خانمدا دەبێتە دۆست، دوای ماوەیەك لە کەرکوکدا دەمێنێتەوەو بە (کەلەك) لە (پردێ) وە دەگاتە بەغدا و لەوێوە دەگەڕێتەوە.

(مێجەر سۆن Ely Bennister Soane) لە ڕۆژی (١٦)ی ئاغستۆسی (١٨٨١)دا لە ساری (کینسنگتۆن) لە ئینگلستان لە دایك بووه. لە (١٨٩٨) لە زانکۆی (کامبرێدج) بە پلەی شەرەف دەرچووه. ئارەزووی زمانە ڕۆژهەلاتیەکانی هەبووه، لە سالی(١٩٠٢) دا دەینێرن بۆ ئێران بۆ ئەوەی لە بانقێکدا ئیش بکات، لە تاران بە سالێك زمانی فارسی دەبێت و هەر لەوێ دیوانی شیعرەکانی (عومەر خەیام) تەرجەمەی سەر زمانی ئینگلیزی دەکات.

لە سالی (١٩٠٩)دا بووه سەرۆکی (کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی ئێرانی)، لە سالی (١٩١٥)دا دەچێتە بەسرەو ڕۆژنامەی بەسرە تایز(Basrah Times) دەردەکات، پاشان لە خانەقین دەبێ بە دادوەر (حاکم). لە سالی (١٩١٩)دا بووه بە حاکمی سلێمانی و خزمەتێکی زۆری شارەکەی کردووه لە ڕۆژنامەوانیی و کردنەوەی قوتابخانەو بەرگرتن لە کاری دزی و جەردەیی و خوێندنی کردووه بە کوردی و هەلبژاردنی فەمانبەرە کوردەکان لە ناوچە کوردەواریەکەدا، ئەم گرەوەی کە لێرە لێی دەدوێین، نموونەیەکی کارەکانیەتی بۆ بە کوردیکردنی خوێندن و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشەنبیری کوردی لە ڕێگەی ڕۆژنامەی پێشکەوتن (١٩٢٠– ١٩٢٢)ەوە، کە بە هەولی ئەو دامەزراوه و بلاوکراوەتەوە[٣].

مێجەرسۆن لە سالی (١٩٢١)دا گەڕایەوه ئینگلتەرەو خەریکی فەرهەنگی کوردی بووەو چەند بەرهەمێکی لە بابەت زمان و مێژوو و فەرهەنگنووسیی کوردی بەجێ هێششتووە، لەوانە:

- Kurdish grammar (Grammar of the Kurmaji of Kurdish language)، London، 1913.
- Elementary Kurmanji grammar (Sulaimania district). Baghdad, 1919.
- A southern Kurdish foksong in Kermanshani dialect "Journal of the Royal Asiatic Society". 1909، January, Pt.I.pp 45–51.
- Notes on the phonology of southern Kurmanji.

---

[٣] لە بارەی ژیان و گەشتی مێجەرسۆن بۆ کوردستان سوود لە وتارێکی قادر خەفاف وەرگیراوە،کە لە گۆڤاری گەلاوێژ بە چوار ئەلقە بلاوکراوەتەوە.لەم وتارەدا نووسەر کتێبەکەی مێجەرسۆن بە ناونیشانی To Miesopotamia and Kurdistan in Disguise خستۆتە بەرباس و لێکۆلینەوە و لە کۆتایی وتارەکەیدا چەردەیەك زانیاری لەبارەی ژیانی مێجەرسۆن بلاوکردۆتەوە، بڕوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، ژ (٤، ٥، ٦، ٧)، ١٩٤٥.

- Notes on the Kurdish dialect, Sulaimania (Southern Turkish Kurdistan)[٤].

لە ساڵی (١٩٢١)دا لە لایەن پاشای بەریتانیاوە خەڵات کراوەو لە ڕۆژی (٢٤)ی ساڵی (١٩٢٣)دا کۆچی دوایی کردووە.

**ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)و گرەوێکی ئەدەبی**

ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە ژمارە (٢٧)دا لە ژێر ناوی (**بۆ زانین**) ئاگادارییەکی بڵاوکردۆتەوە بۆئەوانەی،کە دەیانەوێ بە کوردییەکی سادەو ڕەوان بنووسن و ئەو نوسینانەشی، کە قبوڵ دەکرێت پاداشتی شیاو وەردەگرن، لە ئاگاداریەکدا کە پێدەچێ لە نووسینی مێجەر سۆن خۆی بێت نووسراوە:

**بۆ زانین**

پێشکەوتن خۆی و کۆمەڵێ لەوساوە کە حەز بە ژوورکەوتن و پێشکەوتنی زمانی کوردی خۆمان دەکات داوا هەیە کە نووسینی کوردی بکرێت و بانگی ئەوانە دەکات کە حەز لە نووسین دەکەن.

١. بە (٣) ڕەنگ پارەی داناوە بۆ کرینی ئەم نووسینە کوردییە بۆ (١) پەنجا ڕووپیە، بۆ (٢) سی و پێنج ڕوپیە بۆ (٣) بیست و پێنج ڕوپیە.

٢. هەتا ڕۆژی (١٠)ی نۆڤەمبەر (١٩٢٠) ئەم نووسینە وەردەگیرێت.

٣. ڕۆژی یانزە تەماشادەکرێت.

٤. ڕۆژی هەژدە لە پێشکەوتندا بڵاودەکرێتەوە و پارەکە دەدرێت.

٥. ئەو کەسە گرەو دەباتەوە کە نووسینەکەی ڕوون و دیاربێ. فارسی و تورکی عەرەبی کەمتر تیابێ و تامدار بێ، نووسینەکەیشی وەك، سیاسی، فەلسەفە، ئامۆژگاری نەبێ، باسی زەرعات یا سەفەرنامە و حیکایەت و سەرگوزەشتی شەڕ و شتی وابێ باشە، ئەگەر شیعر بوو کەلیمەی فارسی نەبێ وەك ئەمەی ڕووی "حەزلێکراو– مەعشووقە" دەکەن بە "ماهی تابان" ئەگریجە و زولف و "مشك ئالود" لێو بە "لەعل و یاقووت" چاو بە چاوی "غەزال– ئاهو" ئەگەر کینایە بێ با ئەویش کوردی بێ[٥].

---

[٤] د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕابەری سەرچاوە لەبارەی زمانی کوردییەوە، بەغدا، ١٩٨٩، ل ٢٣٨.

[٥] ڕۆژنامەی پێشکەوتن، ژ٣٠، س١، پێنجشەممە ١٩٢٠/١١/١٨.

له ژمارەی (٣٠)دا، ئەنجامی گرەوەکە بلاوکراوەتەوە بە شێوەیەك شێخ نووری شێخ صالح بە پلەی یەکەم دەرچووە، هۆیەکەشی هەروەك نووسراوە لەبەر ئەوەی نووسینەکەی ئەو بە شیعر بووە، ئێمە لێرەدا هەرسێ نووسینەکەی بە یەکەم و دووەم و سێیەم دەرچوون وەك خۆی و بە رێنووسی ئەمرۆی کوردی دەنووسینەوە.

## جووت گا شتێکی چاك[٦]

له باسی هـــــەر شتیَ پیاراگەیشتین ئێمە نووسیمان

ئیتر با بێینەوە ســــەر باسی جووتیاری و زەوی کێلاَن

له پایزدا خەریکی جـــووت تـــۆو چاندن ئەبی تا سەر

له مالّی خۆتَ ئەنویت و بیَ عـــەزیەت ئاوی ئەدا باران

له جەردەو دز بە دوورەوە قەت مـــەترسە هیچی لیَ نایە

له هاوینا له پاش دروێنە بێتە ســــەر خەلەو خەرمـان

وەرە تۆ پێگەیشتووی وەختی هاوینیش تەمـاشـــاکە

وەك بامیە تەمـــاتە و کالّەك و لـــۆبیا و باینجان

جگە لـــەو پارەی خـــاوەن زەوی ئەیخاتە گیرفانی

بە راستی زەحـــمەتێکی زۆر ئەکا بۆ هـــاولاّتیەکان

کلەمەو نیّلَ و هەوجارێك و جـــووتیَ گای لەرِو بیَ فەرِ

ئیتر دەســـمایەی ناویَ وەك دوکـــانی بازرگـــان

بەقالی و ئەم شـــتانە هیچ نیە وەختی نابووت بـــوو

له ئاخریا ئەلّیَ ئەسپیَ گۆرانی سەوزەلیَ تۆم گیـــان

زەوی و زار دەولّتێکە نامـرێت و قـــەت لەناونـــاچیَ

فەقیرو دەست نەرِۆیو نابیَ قەت خاوەن دەغـــلّ و دان

بناغەی دەولّەمەندی هەر بەجووت و گا ئەبیَ قـــایـم

بە جووت و گا ئەلّێن عەرزو هەلّدرِین و پارە دەرهێنانە ؟

---

[٦] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢.

تکاتن لێ ئەکەم لەم ئیشـــەدا تا پێشکەوتن چاکە
بەڵام دووبارە پێویستە حـــکوومەت بێتە یـــاریدان
لە باســـی تووتن و کـــڕیار لادێیش بنووســـم با
کە پارەی بوێ دێت و هـــەزار ڕپیە ئەیا زســـتان
بەهارێ سەد دێراو تووتن ورد و پیس وبێ گەڵاوکێشان
وە چ و دارێك زیاتری ناوێ تووتن بێ پشـــووی نادا
هەموو هەردارو بەردو زبڵ و پووش و قسپڵ و ئێســـقان
بچێت و پێی بڵێ ئەو تووتنە باتمانی چـــەند ئێژێ
بەسێ لیرەی عەجەمی کەمتری نادەم بەسەد قورحان
لە عەزری وشك و ڕەق تووتن پەیا بێ و ئەشـــیفرۆشن
کەوا بێ با هەموو دەسکەینە جووتیاری و زەوی کـێڵان
سلێمانی. م. نووری

* * *

## بۆچرووك[7]

هەچ وەختێ ئەم قامیشە دوو لەتە، ئەم ئاسنە دووکەرتە ئـەگرم بەدەسـتەوە زمـانم تـوێ توێ ئەبێ،.خوێنی دڵ ئەو دڵۆپە دڵۆپە سوورانە لە هـەموو شـارەکی لەشمـەوە کـۆ ئەبێتـەوە و ئەتکێ حەوزێکی سوور دەخاتە بەرچاوم، تنۆك تنۆك لە چاومەوە فرمێسك ئەڕژێ و لەبەر پێما بیرێك پەبا ئەبێ. سەرم وەك مزراحێکی دگ دگە بە گوڕ دایکـوتێ گێـژوو سـووڕ ئـەخوا و لـە بەینا ئەمێنێتەوە. ئـەو هەنسکانەی لـە بنکـی دڵـەوە هەڵئەکـشێ لـە گـەرووما کۆدەبێتـەوە هەناسەم لێ دەبڕێ. دەمەوێ نەختێ لەم کاسە لاێوەرێژەی دڵم برێژم و سەرم سـوك کـەم، سـەد حەیف گرەی دڵ، کرپـەی جـەرگ، بـۆ چـررووکی نـاو زگ کـە بلیـسکە ئەبیستێ وەك زمـانی هەژدیها لە قوڕگمەوە سەر ئەکێشێ، هەرچی سەرچاوەی فرمێسکم هەیە ئەیکا بـە هـەڵمێکی سوور و لە کونە لووتمەوە دەری ئەکا. هەروەك دوا هەناسەی مردوو لێوم، چاوم وەك نـانی سـەر ساج وشك و ڕەش ئەکاتەوە، لەو وەختەدا دەمەوێ بە هەموو هێزی زمانم هاوەرکـەم و کەسـێ

---

[7] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢.

بە دادمەوە بهێنم، بەڵام زمانم نەستراوە. دەمەوێ بە هەموو هێزی ئەژنۆم ڕاکەم، بەڵام ڕێگام گیراوە بە هەردوو دەست ئەکێشم بەسەرو پۆتاڵەکی خۆماو ئەزیڕێنم. بەڵام هەموو کەس چاوی نووقاوە. هەموو لا گوێ ی کەڕ بووە. کەس دەرد لەمن لە من ناشنەوێ، کەس چاوم بۆ ناگێڕێ، هاوار سەد هاوار، من چیم کردووە خوا وام لێ بکا. ئەگەر نەبووایە بە ناشکوری ئەو دەست و چاوە، ئەوگیانەی خوا دایومێ وەك بوخچەی بووك ئەمپێچایەوە و ئەمکوتا بەسەر چاوی عیزرائیل — دا... نەمئەویست، بەڵام ئەوەیشم پێ ناکرێ عزرائیلیشم دەست ناکەوێ، لە دووری ئەگێڕم و نایگەمێ، لێم بووە بە سێبەری خۆم، کە بۆی ئەچم ئەڕوا، ڕاوە دووری دەنێم ڕائەکا، تا ڕۆژی خۆی نامگرێ منیش ئەبێ تا ئەو ڕۆژە بتلێمەوە، وە گەوزی خۆم بدەم.

* * *

## زەکی صائب

## ڕۆژەوە بوونێك [8]

لە دوای ئەم بەهارەدا لە بەغدا ئەهاتمەوە شەوێك لە کەرەبچنەوە دوو کەس بووین سواری دوو بارکە بوو بووین لەگەڵ قاترچیەکدا سێ بە سێ لە سەگرمەوە هاتین، دنیا چونکە هیچ جەردەو دزو حیزی نەبوو بێ ترس و لەرز بێ دڵەداخوورپێ بەڕێکەوتین، شەو مانگە شەو بوو تریفەی ئەودیوی سەگرمە دێتە ژوور بەردەلانی و خوارو خێچە هەر لە نیوەی ڕێگا من دابەزیم بە هەزار نق وم جەڕ سەرکەوتم، کە هاتمە سەرێ زۆر ماندوو بووم، لە سوچێکی سەرکەژەکەوە قنکەل فسێکم دایەوە توزێ دانیشتم وەختێ بەرە بەری بەیان بوو، مانگیش لە ئاوا بوونا بوو جریوە جریوی ئەستێرەکان و بریقە بریقی مانگە شەو، کە ئینسان تێری لێ ئەخوراد هەروا تاس ئەی بردمەوە جێگەکەم وا هەلکەوتبوو هەموو قۆپیەی قەرەداخم لێ دیار بوو هەتا چاو بڕی ئەکرد ئەو دارستانی قۆپیەیە وەك ئاوێکی زۆر مەنگ و کش و مات سەوز ڕاگیرابوو، شنەشنی ئەو با فێنکە کە ئەهات خشپەو هوڕی بەو گەڵایە ئەخست، لەولایشەوە تازە شەبەقی بەیانی دابوو قەراغ و بێجاغی عاسمان سپی داگەڕابوو هەرچەنێکم ئەکرد تێرم لە ڕوانینی نە ئەخوارد لە خوارەوە لەبەردەممدا لەناو قۆپیەدا جار جارە لورە لوری دەعبا و مەعبا، زریوە زریو و فرکو هوڕی چۆڵەکە و مۆڵەکە کەوا تازە لە خەو هەڵئەسان و ئەگەڕان دڵی دائەخورپان

---

[8] سەرچاوەی پێشوو، ل٣-٤.

لە ناو قۆپیەدا ناو بە ناو شوان و موان ئاگرۆچکەیان کرد بووەوە بریسك و هوڕی ئەو ئاگرانەش لە دوورەوە ئەتووت گەلە ئەستێرەیە ئەنوێنێ ئەو ڕوناکیە بێ تۆزە ئەو با خۆشە بۆنـدارە، ئـەو کەژوو کێوە سەوزە، ئەو دانیشتن و پاڵدانەوەیە، ئەو بیرکردنەوەیە هـەروا تۆزلقانەیـەکی مـابوو لە خۆشیانا ببورێمەوە، ئەمویست هەتا ماوم لە دنیـادا لـەو جێگـاو سـەعاتەدا بوومایـە، لـە پڕێکا کابرای قەتارچی کرمانگی وتی فلانەکەس، فلانەکەس، وتم هێ بلەباقە ئەوەچییە کوڕە وتی درەنگە هەڵسە بەڕێکەوە بڕۆین منیش هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشاو هەڵسام و ڕاپـەڕیم بۆ خوارەوە،لەو سەرەوە لێژەیە بەدوو سێ قەڵەمباز خۆم گەیاندە خوارەوە پـێش هـەتاو کـەوتن گەیشتینە دەربەنگەکە، باوەڕ ئەکەن ئەوێشم بەقەد سەرێ لا خـۆش بـوو لـەم لاو لـەولاوە ئـەو بـەردو تاوێرانـە چـوون بـۆ عـاسمانـا سـەریان گەیـشتۆتە کەشکەشـان، سـەر هەڵئـەبڕی کـلاو ئەکەوێتە خوارەوە، تافە تاف و هاژە هاژی ئەو ئاوە سپییە ساردە، کە ئەهاتە خوارەوە ئەو بـا فێنکە خێرا خێرا ئەیدا بەسەرو چاوما، لە خۆشیانا قاچم نـەبوو بـڕۆم بـەڕێوە لەبـەر دەربـەنگا جۆگەڵەیەکی نەشمیلە و خنجیلە ڕێك و پێك هەڵگیرسا بوو هەر چوار لای دارستان و سەوزە گیا و گوڵی زەرد و سوور لە وەختی هەتاو کەوتنا لە قەراغی ئەو جۆگەڵەیە بارمان کوتا بە زەویـا هەتاو تازە ئەکەوت بریسقەی هەتاوەکە لە مەعبێن لقی گەلاکانەوە ئەیدا بـەناو جۆگەڵەکـەدا لە پرشنگەکانی چاوم ڕێشکەو پێشکەی ئەکرد. کتوپڕ ئاگرێکی نێڵە نێلمان کردەوە چـایێکمان لێنا، قاوەییێکمان پێگەیاند، چونکە بە ڕێـی ئاسـن هـاتبووین هێـشتا سـەموون و بکـسەمد و پەنیر و ماستی بەغدا و خەیا ڕو پورتوقاڵی باقووبە و قەیسی و سـێوی شـارەبانمان تـەڕوبڕ پـێ هەبوو بە چای و قاوەوە تێرو پڕ مان خوارد، دوایی سەر خەوێکمان شکان و هەڵسـاین و هـاتین بەڕێوە. ئێستاکەیش و هەتا ئەو ڕۆژەی دامیانە لێوی قەبر ئەو خۆشیەم لەبن دانایە.

محمد جمیل

*     *     *

**شێوازی نووسینەکان:**

(جووت گا شتێکی چاکە)، سەرەتای هەوڵی نووسین و شیعری (شیخ نوری شێخ صالح)ەوە سادەو ساکاریی لە شـیعرەکەدا لـە ڕووی نـاوەڕۆك و دووبـارە بوونـەوەو کـەمتر دەسـت بەسـەر ڕاگەیشتنی قافیەو ڕەوانبێژی پێوە دیارەو شیعرەکەیش، کە لـە پارچـی پەخشانێکی قافیـەدار

دەچێت لەسەر كێشی عەرووزی عەرەبی (هەزەج) ی هەشت هەنگاویە، كە بە (مفاعیلن مفاعلین مفاعیلن مفاعلین) خۆی دەنوێنێ.

(بۆ چرووك)، كە پارچە پەخشانێكی هونەری خودییە، بە شێوازێكی ئەدەبیی جوان نووسراوە هەست بە ئەندێشەو سۆزو خەیاڵ ئامێزی قەڵەمی نووسەرەكەی (زەكی صائب) دەكەین، كە لە تەمەنێكی زوودا كوژراوە، دەنا ئەو قەڵەم بە تواناو بە بڕشتە جێگەیەكی دیاریی لە دنیای پەخشانی كوردیدا دەگرت، هەر لەو نووسینەوە كاریگەری ئەدەبیاتی ڕۆمانسیی توركی لە دوای یەكەمین جەنگی جیهانی لە ئەدەبی كوردیدا ڕەنگی داوەتەوە، خەیاڵی فراوان و گەڕانەوە بۆ سروشت و گریان و هەست و سۆزی بە كوڵ و خۆشەویستیەكی قووڵی شاراوەو نیگەرانی و ڕاڕایی و یاخی بوون لە دووبارە بوونەوەیەكی بێهوودە و یاساكانی كۆمەڵ و وجوود و خەوبینین بە جیهانێكی جوانتر لەوەی، كە هەیە، لە سیما سەرەكییەكانی ئەو پارچە پەخشانە هونەرییەن.

(ڕۆژەو بوونێك)ی جەمیل صائب، كە بە یەكێ لە ڕابەرەكانی چیرۆكی هونەریی كوردی دادەنرێت، بە شێوازێكی درامی و چیرۆك ئامێز نووسراوە هەست بە ڕوانینی جوانیی ئەو دەكەین لە گفتووگۆ و مەنەلۆكی ناوەوەو دۆش دامانی بە جوانی سروشت و بەستنەوەی ڕامانی بە خاكەكەیەوە و ڕەخنە توندەكانی بەرامبەر بە دەستەڵاتی ئەو سەردەمە و دواكەوتوویی باری كۆمەڵایەتی كۆمەڵی كوردەواری، كە پاشتر هەموو ئەمانە لە چیرۆكی (لە خەوما)كەی لە ڕۆژنامەی (ژیان-١٩٢٥) گەیشتە چڵۆپۆپەی چیرۆكی هونەری كوردی لە قۆناغی یەكەمدا.

**سەرچاوەكان:**


١- د. كەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.

٢- عەلی ناجی كاكەحەمە ئەمین عەتار و سیروان بەكر سامی، پێشكەوتن یەكەمین ڕۆژنامەی سلێمانی(١٩٢٠-١٩٢٢)، هەولێر، ١٩٩٨.

٣- قادر خەفاف، كتێبەكەی مێجەرسۆن بە كورتی، گۆڤاری گەلاوێژ، ژ (٤، ٥، ٦، ٧)، س٦، نیسان و مایس و حوزەیران و تەموزی ١٩٤٥.

٤- د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕابەری سەرچاوە لە بارەی زمانی كوردییەوە، بەغداد ١٩٨٩.

## زانكۆ و
## پێداویستی ڕاگەیاندن

لە سیستمی نوێی جیهاندا کە بەرەو گلۆبالیزم (بە جیهانی بوون) دەڕوات و هەوڵدانێکە بۆ بەزاندنی سنووره سیاسییەکان و تێکەڵاوی و کارلێکەریی شارستانیەتە جیهاوازەکان، بە مەبەستی گفتوگۆی ژیاری و بە ئینسانی بوونی یەك کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، کە بنچینەکانی لەسەر بەرژەوەندی ئابووری و پەیوەندییە کۆمەلآیەتییە چوون یەکەکان دامەزرابێ.

(ڕاگەیاندن) لەمیانەی ئامانجەکانی (جیهانگیری) دا شوێن و پایەیەکی دیارو بەرچاوی هەیە، ڕۆژانە چەندین کارەساتی سروشتی و کوشتن و بڕینی ولآتە دواکەوتووەکان خۆ بە خۆیی و لەنێوان مێلشیا چەکدارەکاندا، ڕووداوی تامپۆنی ئۆتۆمبێلە تیژڕەوەکان، تەقینەوە لە لایەن گروپە تیرۆریستیەکانی ئێرەو ئەوێ، سەردانی فلآنە سەرۆك و وەزیرو کاربەدەست بۆ شوێنان، کێشەی کۆچ و بێ کاریی گەنجان و ئازادیی زەوت کردنی کچان و ئافرەتان و چەندان ڕووداوی هەنووکەیی و چاوەڕوان نەکراودا، (ڕاگەیاندن) دەیەوێ پێشبرکێ لەگەڵ زەمەندا بکات بۆ ئەوەی گەرماو گەرم و زوو بە زوویی لە تاریکستانی نەزانین و بێ ئاگایی بەرەو ڕاستە شەقام و ئاقاری (زانین) مان بەرێت، لە مێژووی پڕ سەروەری ڕۆژنامەوانە و ڕاگەیاندنی کوردیدا، کەتەمەنی (١٠٤) ساڵ دەبێ و بە هاواری بنەماڵەی بەدرخانییەکان دوای شکستە سەربازییەکان و شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکاندا، ئەمجارەیان پەنایان بۆ قەڵەم برد، هاواریان بە گوێی دنیادا بگەیەنێ، کە هاواری ئەوان هاواری میللەتێك بوو، کە زەبرو زەنگی عوسمانییەکان ناخی هەژاند بوون و ڕۆژنامەی (کوردستان) لە قاهیره ساڵی ١٨٩٨ لە ولآتی غەریبیان دەنگی دایەوە، سەرەتای ڕۆژنامەوانیی کوردیی دوور لە سانسۆر بە ئازادیی لە دایك بوو ڕۆژنامەنووسیی وەك بەشێك لە ڕاگەیاندن بوو بە کتێب و بوو بە تۆمارێکی زیندووی هەموو ژیانی کۆمەڵی چاپخانەو کتێبەوە ئاشنا نەبووین، لەسەردەمی نوێدا دوا بەدوای وشیاربوونەوەی کوردو بەرەو ژوور چوونی هەست و هۆشی نەتەوەیی و دروست بوونی چینی ڕووناکبیریی کوردیی ورده ورده پسپۆڕی و پێویستی و قووڵبوونەوه لە ژیانی ڕۆشنبیریی و زانستی بووه سیما و خەسڵەتی ڕاگەیاندنی تایبەت بە خۆیان.

مێــژووی دروســت بــوونی دەزگایــەکی زانــستی و ئــەکادیمی وەك (زانکــۆ) لــە کوردســتان و کۆمــەڵی کوردەواریــدا بــۆ نیــوەی دووەمــی ســەدەی بیــستەم دەگەڕێتــەوە هێنــدە دوورنیــە، بــەلاَم لــە ژیــانی زانــستی و ڕوونــاکبیریی میللەتەکەمانــدا خــاڵی وەچــەرخانێکی گــەورە بــوو و دەکــرێ وەك پێوەرێــك بــۆ بەمــەدەنی و شارســتانی بــوونی کــورد دابنــدرێ و لــەوێوە نەخــشە و ڕێــی ئایینــدەی نەتــەوەیی لــە هــەموو بوارەکانــدا بنوێنــدرێ و ببێتــە ســەنتەرێك بــۆ کۆبوونــەوەو بڕیــار گــەلێکی زانــستی و خۆنزیــك کردنــەوەمان لــە ڕەوتــی کــاروانی زانــستی جیهــانی میللــەتانی پێــشکەوتووەوە، لــە پــاڵ داهێنانــە زانــستییەکاندا زانکــۆ ئــەرکێکی فیکریــی و هونــەری گــەورەی لەسەرشــانە و کــە چــۆن ڕامــان و گومــان و پرســیار لــە ئــاوەزی کۆمەڵــدا دروســت بکــات و بەشــداریی گۆرانکارییــە فیکــری و سیاســی و کۆمەلایەتیــەکان بکــات و لەنەخــشە دارشــتنی ئاسایــشی نەتــەوەیی و ناســاندنی چــاندو کلتــووری نەتــەوەیی بــە (ئــەوان) ڕۆڵێکــی مــەزن بینینــێ، دیــارە بــێ گومــان بــۆ ئەمــە پێویــستمان بــە (ڕاگەیانــدن) ێــك دەبێــت، کــە لــە ئاســت ئــەو ڕۆڵ و پایــەی زانکــۆ دابێــت، ئەمــەش بــە بلاَوکردنــەوەی ڕۆژنامــەو گۆڤــاری تایبــەت بــە زانکــۆ بــە ســازدانی ســیمیناری بــەردەوام لــە دەزگاکــانی ڕاگەیانــدن دا بــۆ مامۆســتایانی پــسپۆڕو شــارەزا بــۆ دۆزینــەوەو دەســت نیــشان کردنــی و چارەســەرکردنی کێــشەکانی قوتابیــان و چــۆنیەتی بــاری گــوزەران و دابــین کردنــی پێداوســتیە زانــستییەکان و بەســتنی پرۆتۆکــۆلی هەمــە چەشــن لەگــەڵ زانکۆکــانی دەرەوەی کوردســتاندا، کردنــەوەی بەشــی (ڕاگەیانــدن) لــە یــەکێ لــە کۆلێــژە مرۆڤایەتیەکانــدا خــەون و خواســتی توێــژێکی بــەرفراوانی ڕۆژنامــەنووس و هــەوادارانی ئــەو بــوارە پــڕ لــە جموجــۆڵ و گرنگەیــە، ئەگــەر لــە ڕۆژێکــی وەك ئــەمڕۆدا لەســایەی حکومــەتی هــەرێم و ورەی بــەرزو بــالاَی جــەماوەردا نــەتوانین کــادیری (ڕاگەیانــدن) پــێ بگەیــەنین و لــە پــاڵ زانــستەکانی دیکــەدا خزمــەتی ئێــستاو ئایینــدەی ئــەو ئەزموونــە نەکــەن، ئــەدی کــەی دەیکــەین و چــاوەڕێی چــی دەکــەین و پلانــی داهاتوومــان چــی دەبێــت ؟ دیــارە بــێ گومــان هــەموو ئەمانــەش ڕەنگدانــەوەی بــارودۆخی کوردســتان و پــشتگیریی دەســەلاَتی سیاســییە، کــە دەتــوانی لــە دەســتەبەرکردن و زامن کردنی پێویستیەکاندا پێشدەستی بکات.

## ڕۆژنامەوانی
## لە کۆمەڵگای مەدەنیدا

هۆکارە تازەکانی پێوەندی وەك ڕۆژنامە، ڕادیۆو تەلەفزیۆن بە ڕاگەیاندنی هەڵسوکەوت و ڕووداوەکانی دەوروبەر و لێکۆڵینەوە و ئاشکراکردنی ئەندێشە و بیروباوەڕە مرۆڤایەتیەکان لە مەڕ گەشەکردن و بەهێزکردنی بەها کۆمەڵایەتیەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری و ڕۆشنبیری خەڵکیدا ئەرکێی زۆر گرنگیان لە ئەستۆدایە.

لەو ژینگە فراوانەی ژیانی ئادەمیزادا، لە وڵاتانی جۆربەجۆر، لە شوێنی دوور و نزیك- هەرساتە و چەندین ڕووداوی جۆراوجۆر ڕوودەدەن. هەموو ڕۆژێ بە هەزاران بنیادەم دێنە دنیاوە، سەدان سەنەدی شووکردن ئیمزا دەکرێن، هەزاران پاداشت دابەش دەکرێن، دەیان کەس دەبنە قوربانی تامپۆن یان تاوان و گوناه، ڕووەك و ئاژەڵ بەهۆی برووسکەوە دەسوتێن و دەبنە خۆڵەمێش، چەندین خانوو و ساختمان بە ڕەشەباو لافاو وبوومەلەرزە وێران دەبن.

هەموو ڕۆژێ دەیان پەرلەمان وحکومەت و هەزاران شوراو ئەنجومەنی ئیداری و شارەوانی دادەنیشن، باس لە خۆیان دەکەن ودستوور وبنەمای کۆمەڵایەتی بارودۆخ دادەڕێژن، چەندان کارگە ودامەزراوەی جۆربەجۆر دەکەنەوە یان دادەخەن ...

قات وقڕی نەهامەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی، خۆپیشاندان و مانگرتن و شۆرش وچەندین شەڕی لێ دەبێتەوە. توێژینەوە و زانستی یەکان دەبنە هۆی دۆزینەوەی چەندان دەرمانی تازەو داهێنانی شێوازی تازەی هونەری ...

لەنێو ئەم هەموو ڕووداوانەدا تەنها کەمێکی بۆ بڕە خەلکێکی کەم وەك خانەوادە و دۆستان و دراوسێکان کەڕاستەوخۆ لە ڕووداوەکان ئاگادارن شایانی سەرنجە ئەم جۆرە ڕووداوانە ڕای گشتی ناجولێنن و بلاوکردنەوەشی گەلەك پێویست نییە. هەر بۆیە لە مەودایەکی فراوانی جوگرافی، لە زەین و هۆشی خەڵکێکی زۆردا نامێنێتەوە.

هەندێ ڕووداوی تر بە پێچەوانە، دەبنە هۆی گۆڕینی ژیانی ناوچەیەك، وڵاتێك و هەتا هەموو جیهانیش، چونکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵك هەیە یان بەهۆی ئەوەی پەیوەندی بە کەسێکی نائاسایی یەوە هەیە، ڕاستەوخۆ زانینی لەسەر داوای گشتی و هەموانە.

هەندێك لەو ڕوداوانە وەك، جەنگ و تەقینەوە و گڕگرتن، لافاو و بوومەلەرزەكان بزاڤێكی ماددیان هەیە و هەندێكی دیكەیان وەك ڕاگەیێنراوە سیاسییەكان، گفتوگۆی پەرلەمان، ڕاگەیاندنی بیروڕای فەلسەفی شێوەیەكی مەعنەوییان هەیە، ئەم ڕووداوانە گەورە یان بچووك شادی بەخشن یان خەمەنگێز، خرۆشان یان ئاسایی بن بەهەر حاڵ پێویستە بە خەلكێكی زۆر ڕابگەیەندرێ و بیزانن.

ئەو خەڵكانەی كە هەموو ڕۆژی بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی خوێندنەوە و ڕۆژنامە و بیستنی ڕادیۆ و بینینی تەلەفزیۆنن تا هەواڵی تازەیان دەست بكەوێ و ژیانی خۆیان بە گوێرەی ئەوە ڕێك بخەن و بەسەر تەنگوچەڵە كۆمەڵایەتیەكانی خۆیاندا زاڵ بن.

بۆ بەدەست هێنانی هەواڵی تازە بۆ ملیۆنەها لە خوێنەر وگوێگر و بینەران كە بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی ڕووداو وپێشهاتی تازەی دەوروبەرن، بەهەموو دەمێ شەو و ڕۆژ دەیان و سەدان و هەزاران كەس لە هەواڵنێرانی ڕۆژنامەكان و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەكان لە گۆشە وكەنارەكانی جیهان زۆر بە وردی خۆیان لە بۆسەناوە تا بێ پچڕان جەرەیانی ڕووداوەكان بنووسن یان وێنەی بگرن یان بە فلیم تۆماری بكەن و دەسبەجێ لە ڕێگەی كەناڵەكانی ڕاگەیاندنەوە بڵاوی بكەنەوە، كەوا بێ بەدواداگەڕانی ڕووداوەكان و ئامادەكردنی هەواڵەكان بۆ زۆرینەی خەڵك ئەركی سەرەكی هەواڵنێرانی ڕۆژنامەكانە..

پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ كە بەدواداگەڕانی هەواڵ قۆناغی یەكەمی كارەكە پێكدێنێ پاشان دەبێ ڕاپۆرتی ڕووداوەكان بەگوێرەی دوور و نزیكی بە تەكنیكی هونەری پەیوەندی كردن وەك تەلەفۆن و تەلەگراف و ڕادیۆ دەگەیەنرێتە سەنتەرەكانی كۆكردنەوە و بڵاوكردنەوەی هەواڵ (ئاژانسەكان). كۆكردنەوە و پەخشی هەواڵەكان دەتوانرێ ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ڕۆژنامەكان یان پەیامنێرانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەكان یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی هەواڵنێرە میللی و نێونەتەوەیی یەكانەوە وەربگیرێ.

ئەو ڕیپۆرتاژانەی، كە لایەن پەیامنێرە تایبەتییەكانی ڕۆژنامەكان، ڕاستەوخۆ لە ناوەوە یان دەرەوەی وڵات دەگاتە ڕاگەیاندن لە دەستەی نووسەران و بنكەكانی هەواڵنووسیی و بڵاوكردنەوەی هەواڵی خوێنراو و بیستراو و بینراو لێی دەكۆڵرێتەوە پاشان تیایاندا هەڵدەبژێردرێن و بەشێوەی چاپ یان بە پەیامی ڕادیۆیی و فلیمی تەلەفزیۆنی و سینەمایی دەكەوێتە بەردەستی خوێنەران و بیسەران و بینەران.

ئەو هەواڵانەی لە لایەن پەیامنێرانی ڕیپۆتاژەکانەوە ئامادە دەکرێن، دوای ئەوەی دەگەنە بنکەی ئاژانس لێیان دەکۆڵرێتەوە ورێك دەخرێن و پاشان بەپێی گرنگیان و بە پێی ناوچەی جوگرافیایی و پێداویستی هەواڵ، بۆ زۆربەی بەشداربووان، کە ڕۆژنامە ورادیۆ و تەلەفزیۆنەکانن تەلەفۆن دەکرێت تا ئەوەی کە پێویستیانە هەڵیبژێرن و بڵاوی بکەنەوە.

بێگومان کەناڵە تازەکانی ڕاگەیاندن لە کۆمەڵە گەورە هاوچەرخەکاندا بە پێودانگە جیهانی، ناوچەیی وڵات و شارییەکان - بەهۆی نەبوونی پەیوەندی ڕاستەوخۆ نێوان ئەندامانی کۆمەڵانی خەڵك، تاکە هۆکاری گەیاندنی مرۆڤایەتین و دەنگ و زمانی کۆمەڵ دەردەبڕن و بۆیە لە کاتێکدا کە دابخرێن یان کاری خۆیان بە چاکی ئەنجام نەدەن و ئەرك و لێپرسراویەتی خۆیان نەزانن و چاوەدێری نەکەن، دژواریەکی زۆر دێتە ڕێی پێشکەوتن و کامڵبوونی مرۆڤ.

هەر بۆیە خزمەتکردنی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئەنجامدانی ئەرکی هەواڵ لە ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان و چ لە دەزگاکانی تری ڕاگەیاندنی وەك نووسینگەو دەزگا چاپەمەنی و پەیوەندی گشتییەکاندا پایەو پەیامێکی گەورەی کۆمەڵایەتییە.

لە ئەنجامی ئەو ئەرکە مەزنەدا، خۆ ئامادەکردنی پێشوو، پەروەردەکردنی پێشەیی و لێپرسراویەتی کۆمەڵایەتی زۆر پێویستن و لەم ڕووەوە زەوق و ئامادەباشی، فێربوونی زانستەکانی ڕاگەیاندن و هەست کردن بە لێ پرسراویەتی گرنگییەکی تایبەتیان هەیە:

**ئـ- زەوق و ئامادەباشیی کەس:**

پسپۆڕانی زانستەکانی ڕاگەیاندن و کارئاسانی فێربوونی بەشە جیاوازەکانی چاپەمەنی زۆربەیان لەو باوەڕەدان، کە هەبوونی زەوق و ئامادەیی نووسین و بێژەری هەروەك زەوق وئامادەیی مۆسیقی لە بۆ سەرکەوتن لە کارەکانی ڕاگەیاندندا پێویستە وئەو کەسانەی بەهرەیەکی خۆرسکیان تێدا نەبێت لەم ڕووەو ناتوانن گەشە بە توانا و بەهرەی خۆیان بدەن. بۆیە کۆلێژ و دامەزراوە بەرزەکانی زانستەکانی ڕاگەیاندن لە کاتی هەڵبژاردنی داواکاری ئەم کارو پیشانەدا ئامادەیی توانایان لەبەر چاو دەگرن، لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ڕۆژنامەوانان و کارمەندانی ڕاگەیاندن سەرکەوتنی زیاتر بەدەست دێنن، چونکە ئەو کەسانە بۆ نووسین ئامادەباشی پێشوەختەیان هەبێت، سادە و ڕەوان دەنوسن و لە هەڵبژاردنی وشە و ڕستەسازیدا گیرو گرفتیان نابێت.

• بە چاکی دەتوانن هەواڵ ئامادە و ڕێك خەن و لە چۆنیەتی ڕێگاکانی دەربڕینی هەواڵ بە باشی سەر دەردەکەن. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو کەسانەی شارەزا و پسپۆڕن وردبین و چوست و چالاکن. لە وەدەست هێنان و بەدواداگەڕانی ڕیپۆرتاژ و گوتار یان وێنە و فیلمدا بەدەست و برد و سەرکەوتوون.

زۆر لەوانەی کە بەچاکی لە کار و پیشەی ڕۆژنامەوانی تێ گەیشتوون وا دەزانن ئەگەر هەر کاتێ لە کار و پیشەیەکدا سەرنەکەوتن دەتوانن ببنە ڕۆژنامەوان و لێپرسراویەتی یەکێ لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەدەستەوە بگرن. ئەو جۆرە کەسانە ئاگایان لەوە نییە،کە چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانی لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و هونەری نوێدا ئیدی جێگەی بێکار و سەرگەردان و ئەدیبە سەرنەکەوتوو و شاعیرە بێ بەهرەکان نییە و بە هیچ شێوەیەك ناتوانن هەر کەسەو بە ئارەزووی خۆی چ کارێکی پێ بەڕێوە دەچێت و سەر لە هیچ دەرناکەن جێگەی خۆیان لەو بوارەدا بکەنەوە بۆ ئەنجامدانی خزمەتی ڕۆژنامەوانی دەبێ ئامادەیی و پێوەندی بە بابەتەکەوە تیابێ، پەروەردەی پیشەکە بێ و خاوەن ئەزموون بێت.

دوابەدوای گۆڕانی مەزنی زانست و هونەرەکانی ڕاگەیاندن و لە ئەنجامی فراوان بوونی ڕۆژانەی ڕۆژنامەوانی خوێندنەوە و بیستن و بینین، ئێستا پیشەی ڕۆژنامەوانیی و ڕاگەیاندن گرنگی یەکی بێ سنووری پەیداکردووە. بە شێوەیەك کە سەدان هەزار کەس لە سەرانسەری جیهاندا خەریکی ئەم پیشەیەن. جا لەبەر ئەوە کارکردن لەم بوارەدا پێویستی بە بڕوانامەی پسپۆری لە خوێندنگا و دەزگا بەرزەکاندا هەیە. ڕۆژنامەوانیی سەدەی بیستەم بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوو بەتەواوی گۆڕاوە. ڕۆژنامەوانیی لە دوو سەدەی ڕابردوو دا سەرەتا بە هۆی نووسەر و خاوەن سەلیقە ئەدەبیەکانەوە هاتە کایەوە ئێستاش لە هەندێ وڵاتی دواکەوتوو دا ڕۆژنامەوانان هەمان نووسەرانی ئەدەبین.

بێگومان کارکردن لە پیشەی ڕۆژنامەوانیی بەو شێوەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد توانا و بەهرەی نووسین پێویستە، بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بچێت، کە زەوق و بەهرە بە تەنیا بەس نییە وئەو کەسانەی بیانەوێ لە بواری ڕۆژنامەنووسیندا کار بکەن هەروەك هەموو پیشە کۆمەڵایەتیەکانی دی و تەنانەت زیاتریش پێویستیان بە فێربوون پەروەردەی کەسیی هەیە.

گۆڕانکاری هونەری خێرای ڕۆژنامەوانیی گرنگی کۆمەڵایەتی پیشەکانی ڕاگەیاندن، زیاد بوونی بۆچوونی خوێنەرانی و بیسەران و بینەران هەموو ئەمانە پشتگیری لە پێویستی

فێربوونی پیشەی ڕۆژنامەوانیی و کاروباری چاپەمەنی دەکەن بە تایبەتی ئەم بابەتە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو و گرنگی یەکی زۆرتری هەیە. لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، لەگەڵ فراوان بوونی بەرنامەکانی لەناوبردنی نەخوێنەدەواری، ژمارەی خوێنەرانی ڕۆژنامە ڕۆژ بەرۆژ لە زیادبووندایە و بۆ وەڵامدانەوەی بۆچوون و پێداویستیەکانی خوێنەواران لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا دەخوازێ پەیوەندی مەعنەوی و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری گشتی کۆششی زیاتری بۆ بکرێت و ڕۆژنامە دەورێکی کاریگەر تر بگێڕێ.

دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە ڕۆژنامەوانان و کارمەندانی گشت کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن جا چ ئەوانەی لە ڕۆژنامەکاندا کاردەکەن و چ ئەوانەی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەمای هەواڵدا کاردەکەن، لە کۆمەڵە هاوچەرخەکاندا چەندین ئەرکی قورسیان لە ئەستۆدایە ڕۆژنامەنووس بۆ وەدەست هێنانی هەواڵ و زانیاری گشتی دەبێ هەوڵ بدات خەڵکی لە پێشکەوتن و گۆڕانی نەتەوەیی و نێوان وڵاتاندا ئاگادار بکاتەوە و بۆ بەرەو پێشەوە بردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی گیانی هاوکارییان تێدا بوروژێنێ، بەم شێوەیە دەتوانێ ئەرکی ڕێنوێنی و ڕابەرایەتی کۆمەڵایەتیش بە چاکی بنوێنێ.

کەوابێ ڕۆژنامەوانان و گشت کارمەندەکانی تری کاروباری ڕاگەیاندن بەر لەوەی پیشە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەستۆ بگرن دەبێ ڕاهێنان و مەشق بینن تاوەك بتوانن خۆیان بۆ ئیش و کاری پڕ لە لێ پرسراویەتی ئامادەبکەن. دامەزراندانی خوێندنگە و دامەزراوی بەرزی چاپەمەنی و ڕاگەیاندن و گەشەکردنیان لە هەموو وڵاتانی جیهاندا نیشانەی لا لێ کردنەوەیەکی تایبەتییە لەم ئەرك و لەم پیشەیە.

لێپرسراوێتی ڕۆژنامەوانان و پسپۆڕانی ڕۆژنامەوانی بە هۆی زیادبوونی تیراژی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و فراوان بوونی بواری ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما زۆر قورس بووە.ئێستا کێ بە هەموو دەم شەو و ڕۆژ سەدان هەزار و ملیۆنەها خوێنەر و بیسەر و بینەرانی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و هەواڵدا لە تەماسدان بۆ سوود بینین لەو هەواڵانەی، کە بەدەستیان گەیشتووە.

کەواتە ئەگەر پەیامنێران، نووسەران و ئامادەکارانی بەرنامەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن نەتوانن ئەرکی پیشەیی خۆیان ئەنجام بدەن و هەواڵی ڕاست و دروست نەخەنەبەر دەست خەڵکی و دڵنیایی و بڕوایی خەڵکی لە دەست دەدەن.

دەبێ ئەوە بزانرێ کە خزمەتگوزاری ڕاگەیاندنی پەیوەندی بە ئیمتیازاتی گرنگی مەعنەوی و جۆرەها دژوارییەوە هەیە و هاوتەریبە و لێپرسراویەتییەکی کۆمەڵایەتی ترسناکی لێدەکەوێتەوە هەر بۆیە ئەو کەسانەی لە ڕۆژنامەوانی و گشت پیشەکانی دی ڕاگەیاندن هەنگاو دەنێن دەبێ پێش ئەوە سەرنجی ئیمتیازات و دەرماڵە بدەن بیر لە چالاکی کۆمەڵایەتی و خزمەت کردن بکەنەوە. کارمەندانی دەزگاکانی چاپەمەنی و ڕاگەیاندن لە هەموو خاوەن پیشەکان خزمەتکارترن و ئامانجی ئەو کەسەی ئەو پیشەیە هەڵدەبژێرێ و ئەو لێ پرسراویەتە قبوڵ دەکات لە پێشکەوتنی ژیان و زامن کردنی داد و یەکسانی لە نێو کۆمەڵدا کۆمەکی دەکات. گرنگی مەزنی ڕۆژنامەوانی تازە دەست پێکەر لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە هەواڵنێر و نووسەرێك لە سەرتاپای ژیانی و لە هەموو قۆناغەکانی کارکردن دا پشت بە زانیاری دروست و ئەو شتانەی بیستێ کە بە چاوی خۆی ببینێ و بەرژەوەندی گشتی و بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی ببەستێ، هەر بۆیە هیچ پیشەیەك لە ئاشکراکردنی ڕاستی دا ناتوانێ ڕووبەڕووی بێتەوە.

ئەرکی کۆمەڵایەتی هونەرەکانی ڕاگەیاندن وا دەخوازێ،کە هەواڵ و وتارەکانی بەشێوەیەکی گشتی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەروەك کە هەن دەربڕن بۆ ئەوەی ڕاستی بۆ هەموو لایەك بەیان بکات و جێگەی گومان نییە کە تەنیا بە گوتنی حەقیقەت دەتوانرێ دادی کۆمەڵایەتی زامن بکرێت.

ئاساییە، کە حەقیقەت گوتن پێداویستی ئازادییە هەروەك چۆن دادپەروەری بێ هوشیاری لە حەقیقەتی عەمەلی نابێ، گەیشتن بە حەقیقەتیش بەبێ ئازادی بەدی نایەت لەبەر ئەو گرنگیدانە بە دادپەروەری و حەقیقەت و ئازادییە ڕۆژنامەوان وکارمەندانی ڕاگەیاندنی گشتی قەدریان لێدەگیرێ و پیشکەیشیان بەسەر هەموو پیشەکانی دیکەدا فەزڵ دەکرێت، بۆ وەدەست هێنانی ئەو شایستەیی و قەدرزانینە سەرەتا دەبێ ئەرکەکانی پیشەکە تێبگەیی و پاشان بۆ قبوڵ کردنی بەرپرسیارییە کۆمەڵایەتییەکان هەنگاو هەڵێنیتەوە.

سەرچاوە: دکتور کاظم معتمد نژاد با همکاری دکتر ابو القاسم منصفی، ڕوزنامەنگاری با فصلی جدید دربازگری ڕوزنامەنگاری معاصر، چاپ چهارم، ١٣٧٢، ص ٩-١٥.(مقدمه).

## جیهانی سێیەم و گەڕان
## بەدوای ڕۆژنامەوانیی ئازاددا

گەڕان بۆ بەدەست هێنانی ڕۆژنامەوانی لە جیهانی سێیەمدا، کە لە بەرامبەر پێداویستی و ویستی وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقیایی و ئەمریکای لاتین و خەسلەتە تایبەتییەکانی خەباتی ئەوان بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی نەتەوەیی و گەشەکردن و پێشەکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەواندا هاوسەنگ بێ، هەروەك هەموو زەمینەکانی هەوڵی سەربەخۆیی و پێشکەوتنیان، ڕووبەری کۆسپ و تەگەرەی جیاواز بوونەتەوە. لەم ڕەوتەدا، پرەنسیپە تەقلیدییە گەشبینەکانی خۆی بە پیرەوی نموونە و مۆد و مەرجەکانی ڕۆژنامەوانییەکی کلاسیکی ڕۆژئاوایی، لەگەڵ پرەنسیپە ڕادیکاڵ و ئۆپۆزۆسیۆنەکاندا، بۆ وەدەست هێنانی ڕۆژنامەوانیەکی ئازاد و پێشکەوتوو ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە بۆ ئاشنابوون و ناسینی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لە زەمینەی ڕۆژنامەوانیی نوێی جیهانی سێیەمدا سەرەتا چۆنیەتی فۆرمی (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان) و پاشان تایبەتمەندییەکانی پێوەند بە ڕۆژنامەوانی ئازاد یان (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان) لێی دەکۆڵدرێتەوە و داوتر بە سەرنجدان لە ڕوانێنە گشتییەکانی ڕۆژنامەوانیی ئازادی جیهانی سێیەم، خەسڵەت و بنەماکانی هەواڵ لەم تەرزە ڕۆژنامەوانیە و تایبەتمەندییەکانی هەواڵی گەشەپێدان و هەروا خاسیەتەکانی هەڵبژاردن وخستنە ڕووی هەواڵ لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو و دژواری و کێشەکانی ئەم زەمینە و ڕوانینی ئایندەییان دەخرێتە بەرباس.

**ئەلف: شێوە تازەکانی ڕۆژنامەوانی لە جیهانی سێیەمدا:**

لە قۆناغی دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا، دوا بەدوای گرنگی پەیداکردنی مەسەلەی پەیوەست بە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی لە باری ناوخۆی (وڵاتانی تازە پێگەیشتوو) دا و لە باری ڕۆژنامەوانیی لە باری جیهانی (پێوەندی نێودەوڵەتی)، فێربوون و پەروەردەی ڕۆژنامەوانان و هەروەها سەرجەم شێوەکانی پیشەی ڕۆژنامەوانیی، سەرنجی ڕاکێشان و سەرجەم شێوەکانی پیشەی ڕۆژنامەوانی، سەرنجی ڕاکێشان و وردە وردە وڵاتانی جیهانی سێیەم، زیاتر وریا بوونەوە و پێویستی سەربەخۆیی فەرهەنگی خۆیان لە پێناو وەدەست هێنانی شێوە تازەکانی ڕۆژنامەوانیی تایبەت بەخۆیان، کەوتنە هەوڵ وکۆششەوە.

هەوەڵێن هەوڵی ڕۆژنامەوانی و بواری ڕاگەیاندن لە (وڵاتانی تازە پێگەیشتوو) دا لەم ڕووەوە، لە تیۆری ونمونە هەڵخەڵەتێنەرەکانی ڕۆژئاواوە سەرچاوەی گرت، کۆششی تازتر و بنچینەییتری پەیوەند بەم زەمینەوە، لە سەرەتای دە ساڵی ڕابردوو دا، لە پاڵ ڕەخنە ودژایەتی جیهانی سێیەم لە ڕووی ڕاگەیاندنی جیهانی ویەکسان نەبوونی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتیەوە درێژی هەبوو.

## ١- ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان

زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم پاش سەرکەوتنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی و لە بەرگرتنی سیاسەتی دژ بە ئیستعمار لە قۆناغی دوای جەنگی دووەمی جیهانی دا، لە مەیدانی ژیانی نێودەوڵەتیدا و دەرکەوتن و لە زەمینەوەی ڕاگەیاندنی گشتیشدا هەروەك دیارە و دەزگا تازەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگ، بە پەیڕەو کردنی تیۆری و نموونەکانی ڕۆژئاوایی گەشەکردنی نەتەوەیی، کەوتنە وەرگرتن و لاسایی کردنەوە.

بەشێوەیەك، کە وڵاتانی ناوبراو، هاتنەکایەی ئەو دەزگا نوێیانەی ڕاگەیاندن و بە تایبەتی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و هەواڵنامە نەتەوەییەکانیش وەك سروودی نەتەوەیی، لە ڕوخسارەکانی سەربەخۆیی سیاسی ناساند و (بەرهەمی خستنە ڕوو)ی ئەو شتانەشیان خستەبەر باری سەرنجەوە. لە جەرەیانی ئەو وەرگرتنەدا، وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، کە زیاتر لە ژێر کاریگەری سیاسەتی ئیستعماری پێشوی ڕۆژئاوایی و درۆ دەلەسەکانی ئیستعماری نوێدا، ڕێگەی گەشەی سەرمایەداری پەیوەندیدارەوە هەنگاویان هەڵێناوە، لە بەرکارهێنانی ڕاگەیاندنی گشتی و شێوازی بەرێوەبردنیشدا دیسانەوە بەبێ گوێدانە هەل و مەرجی مێژوویی و ناسنامەی فەرهەنگی خۆیان،ئەزموونی وڵاتانی ڕۆژئاواییان درێژەپێداو لە قوتابخانە و کۆلێژەکانی ڕۆژنامەوانیی و ڕاگەیاندنی تازە دامەزراوی خۆیاندا، کە بە زۆری بە یارمەتی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی وڵاتانی ئەوروپایی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هاتبووەکایەوە، هەروا لاسایی بەرنامەکانی پەروەردە و فێرکردن و خاسیتەکانی ڕۆژنامەوانیی باوی ڕۆژئاواییان کردەوە. لە شەستەکاندا، لە کاتێکدا کە پسپۆڕان و لێکۆڵەرانی ڕاگەیاندنی گشتی ئەمریکایی، بە پاڵپشتی تیۆر و بەرنامەکانی ڕۆژئاوایی کامڵ بوون و گەشەکردن دا، بەرنامەی گەشەکردن و بەرەو پێشەوە بردنی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیان بەرهەمهێن دەکردو لە لایەنی چاکی ڕۆژنامەوانیی و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما لە پێشکەوتنی جیهانی سێیەم

بـەرگریان دەرکـرد، هەنـدێ لـە ڕۆژنامـەوان و کارناسـەکانی ڕاگەیانـدن لـە (وڵاتـانی تـازە پێگەیشتوو)ی ئاساییش، بە لاسایی کردنەوەی خەیاڵە گەشبینانەکانی ئەوان، جەختیان لەسەر پێداویستی گرنگیدان بە (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان)[1] دەکردەوە.

(بنکـەی ڕۆژنامـەوانی ئاسـیا)[2]، کـە لـە ئـابی ۱۹٦۷ دا، بـە هاوکـاری ژمارەیـەك لـە بەڕێوەبـەرانی ڕۆژنامـەکان و ڕۆژنامـەوانی وڵاتـانی باشـوور و باشـووری ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا و کۆمەکی دارایی (بنکەی فۆرد)[3] ی ئـەمریکا بـە ئامـانجی پـەروەردەکردنی (ڕۆژنامـەوانان لـە خزمەتکردنی گەشـەکردندا)، لـە (مـانێلا)ی پایتـەختی فلیـپین دامـەزرا، ئـەم هـەنگاوە، بـە دەسپێکی ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دەژمێردرێت[4].

ئەم دەزگایە، هەر لە سەرەتای چالاکییەکانی خـۆی دا، بـۆ ڕێکخسـتنی خـولی تایبـەتی فێرکردنی (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان) کەوتە هەوڵ و تەقەلا و بە یارمەتی هەندێ لە قوتابخانە و دەزگـا باڵاکـانی ڕۆژنامـەوانی وڵاتـانی ئاسـیایی، وەك (ئینسـتیتۆی ڕۆژنامـەوانی هینـد)[5]، (بنکەی ڕۆژنامەوانی ئیندۆنیزیا)[6]، ئینستیتۆی ڕۆژنامـەوانی مالیزیـا)[7]، چـەندین بەرنامـەی تایبەتی بۆ ناسینی مەسەلەکانی تایبەت بەگەشەسەندنی ئابووری و پێشخستنی کۆمەڵایەتی و شێوە تازەکانی پـەیامنێری و ڕاپـۆرت و نووسـی چـالاکی و هـەنگاوەکانی پەرەئەسـتاندن، بـە ئەنجام گەیاند. سەرباری بەرنامە تایبەتیەکانی فێرکردن (بنکەی ڕۆژنامەوانی ئاسیا) لە ماوەی نێـوان سـاڵانی ۱۹٤۷-۱۹۷۷ نزیکـەی (٥٠) سـیمینار و بەرنامـەکاری پڕاکتیکـی و کـاری فێرکاری لە وڵاتانی جۆربەجۆری ئاسیایی بۆ ڕۆژنامەوانی ئەم ناچەیە بەجێ گەیاندووە.

بڵاوکردنـەوەی پەخـشنامەی هەفتـەیی (داتاکـانی ئاسـیاAsia-Data)[8]، لـە بـواری لێکۆڵینەوەکانی پەیوەند بە پەرەستاندنی کۆمەڵایەتی و ئـابووری سیاسـی وڵاتـانی ئاسـیایی و

---

[1] Development Journalism (F). Journalisme au service du Development (F).

[2] Press Foundation of Asia (P.F.A).

[3] Ford Foundation.

[4] Rosemary Righer.Whose News? politics‹the press and the Third World, London: Burnett, P.P.188-189.

[5] Press Institute of India.

[6] Press Foundation of Indonesia.

[7] Malaysian Press Institute.

[8] Data-Asia:

هەروەها بڵاوکراوەکانی بواری ڕاگەیاندن و ئامار و ژمارەی جۆراوجۆر لە بارەی ئـەم وڵاتانـەوە دیسان لە میانەی چالاکییەکانی دیکەی ئەم بنکەیەوە بـووە، یـەکێ لـە هـەنگاوە گرنگـەکانی بنکەی ڕۆژنامەوانیی ئاسیا، لە بواری ڕاگەیاندن و (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان) دا، دامەزراندنی ئاژانسێکی تایبەتی ڕاپۆرتە هەواڵە بە ناونیشانی (دیبت نیوز)[9]، ئەم ئاژانسـە، کـە لـە سـاڵی (١٩٦٩)ەوە کەوتۆتە کاروچالاکی ڕاپۆرتـە هـەواڵی تایبـەتی، لـە بـارەی مەسـەلە ئـابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فێرکردن ولەش ساغی ودانیشتوانی وڵاتانی تازە پێگەیشتووی باشوور و باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ڕۆژهـەلاتی دوور ئامـادە دەکـات ودەخاتـە بەردەسـتی کەناڵـە گشتیەکانی ئەم وڵاتانە. لە ساڵی ١٩٧٧ دا، ڕاپۆرتەکانی ئەم ئاژانسە بـە (دە) چـاپی جیـاواز وبەچەندین زمانی جیاواز، بەتیراژی نزیـك لـە چـوار ملیـۆن دانـە، لـە دوازدە وڵاتـی ئاسـیایی دابەش کرابوو[10].

داهێنانی(بنکەی ڕۆژنامەوانیی ئاسـیا) لـە ڕواج پێـدانی(ڕۆژنامـەوانی گەشـەپێدان، لـە کـردەوەدا، هـەروەك وەرگرتنـی سـەرجەم تیـۆری و بابەتـەکانی دیکـەی ڕۆژئـاوایی لـە مـەڕ گەشەکردن وپەرەسەندنی وڵاتانی جیهانی سێیەم، سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا، چونکە بـەهۆی وەرگرتن لـە گۆڕانکاریـە بنجی و بنیادیـەکان لـە وڵاتـانی ئاسـیایی و خۆپـاریزی ڕژێمـە بـاڵا دەستەکانی سەر بە ڕۆژئاوا لە زۆربەی ئەو وڵاتانە، ڕۆژنامەوانی ناوبراویش هەروەك بەرنامـە و سیاسەتە تەقلیدییەکانی پەرە ئەستاندن، جۆڵانەوەیەکی پرۆپاگەندە و نمایشی پەیـدا کـرد و بـە شێوەی (ڕۆژنامـەوانانیی ڕێنوێنی)[11]، لە خزمـەتی سـەرکردەکانی دەوڵـەت، گۆڕا. گـرنگترین ئەرکی ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییە، سەرنجدانی پێویستییەکانی پەرەسـەندن وپـشتیوانی کـردن لـە سیاسەتەکانی حکومەت و خۆ بە دوور گرتن لە ڕەخنەی سیاسی بەشێوەیەکی گـشتی و پـشت بەستن بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی چالاکییە چاکەکانی دەوڵەت وسەرنج ڕاکێشانی بەرگری گـشتی لە لایەنی پێشکەوتنی بەرنامەکانی (پەرەسەندنی نەتەوەیی)یە[12].

---

[9] Development‹Economics and Populattuion themes News(DEPTH News).
[10] S.M.Ali. DEPTH News:Amodel for a Third World Feature Agency, in philip C.Horton(ed.) the third World and Press Freedom.Newyork: Praeger,1978, P.P.187-196.
[11] Guided Journalism
[12] John A. Lent. (Press Freedom in Asia‹the Quiet, but completed, Revolution). Gazette, Vol.24‹No.1,1987, P.P.41-60.

چەند ساڵ دوای دامەزراندنی (بنکەی ڕۆژنامەوانی ئاسیا) بەهۆی سوود لێ وەرنەگرتنی ڕژێمە دیکتاتۆریەکان لە کاریگەری بەرچاوی (ڕۆژنامەوانی بۆ پەرەسەندن)، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەش بووە مایەی ڕەخنە لێ گرتن. بەجۆرێك کە لە وڵاتی (فلیپین) کە بە لانکەی ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییە دەژمێردرێت، لە جیاتی ئەم زاراوەیە، زاراوەیەکی دیکەیان بۆ بەکارهێنا. شایەنی وەبیرهێنانەوەیە، کە لە ساڵی ۱۹۷۳دا، لە زانکۆی فلیپین لە بەشی (ڕاگەیاندن بۆ پەرەسەندن[13]، دامەزراوە ئەم بەشە ڕوانینێکی تازە بوو بۆ (ڕۆژنامەوانی بۆ پەرەسەندن) و لە جیاتی ئەو چەمکە (ڕاگەیاندن بۆ پشتیوانی پەرەسەندن)[14]، بەکار هات، کە تیایدا کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتی، بە تەنیا وەك ئامرازەکانی پەرەسەندن دەناسرێت.

خاتوو (نوراکف ئیبرال) بە یەکەمین بەڕێوەبەری ئەو بەشە دامەزرا، ئەو دەمە لە بابەت ڕێنوێنی ئامانجی بەرنامەکانی فێرکردنی ئەو بەشە، وەك بەرەو پێشەوە بردنی سیاسەتە ئابووریەکان ڕزگارکردنی خەڵکی لە هەژاری، مسۆگەر کردنی یەکسانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی فراوانتر و بەکار هێنانی هەموو توانا لە بن نەهاتووەکانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە. قسەی دەکرد[15]، بەڵام لە کردەوەدا خۆی لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا گونجاند بوو، ڕۆژنامەوانانی فلیپینی، لە هەموو ڕەخنەگرتنێك لە حکومەتی (فردیناند مارکۆس) سەرۆك کۆماری باڵا دەستی ئەو کاتە بێ بەری بوون و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتی پەرەئەستاندن خوازی ئەم وڵاتەیش هەر وەك زۆربەی وڵاتانی سەر بە جیهانی سێیەم، لە خزمەتی سیاسەتەکانی ڕژێمی دەستەڵاتداردا مانەوە.

بە هەر حاڵ، بەکار هێنانی زاراوەی (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان) لەنێو نەچوو ولە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، ئەم زاراوەیە، بەبێ گوێدانە ڕەگ و ڕیشەی ڕۆژئاوایی دەسەڵات ئامێزی ئەو، بۆ ناساندنی هەوڵی تازەی لێکۆڵەرو پسپۆڕانی ڕاگەیاندن لە پێناو بەدەست هێنانی ڕۆژنامەوانیێکی ئازاد بەکار هات.

---

[13] University of Phillipines at los Banos Department of Development, Cmmunication.
[14] Development Support Cmmunication.
[15] Nora.C.Q.uebral.(Development Cmmunication.)

۲- ڕۆژنامەوانی پێشکەوتن:

لە سەرەتای ۱۹۷۰دا، هاوکات لەگەڵ قووڵبوونەوەی خەباتی وڵاتانی پێشکەوتووی جیهانی سێیەم بۆ بەرەنگاری دەستەڵاتی فەرهەنگی و ڕاگەیاندن، هەر وەك چوون تیۆری و نموونەکانی دەستەڵاتداری ڕۆژئاوایی لە بارەی ڕۆڵی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی، کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، شێوەی ئاسیایی (ڕۆژنامەوانی گەشەپێدان)، کە لە بابەت بەرەڤانی پێوەندی دەستەڵات و پەیوەست بوون پێوە، لە خزمەتی ڕژێمە دیکتاتۆریەکاندا بوو، هەروا پشتگوێ خراو چەندین هەوڵی تازە بۆ هێنانە کایەی شێوەی نوێی (ڕۆژنامەوانیی ئازاد)دا[16]، یان (ڕۆژنامەوانی پێشکەوتن)دا[17]، دەستی پێ کرد، پێش ئەوەی کە هەوڵە سەرەتاییەکان بۆ هاتنە کایەی ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییە ئازادە لە لایەن پسپۆڕان و لێکۆڵەرانی ڕاگەیاندنی گشتی جیهانی سێیەم لە چوارچێوەی هەنگاو و چالاکییەکانی تازەی (یۆنسکۆ) و (جووڵانەوەی وڵاتە بێ لایەنەکان) جێگەی خۆی بگرێ،وەك خەونێك بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، لە قسەی هەندێ لە ڕابەرە ڕزگاریخوازە بەناوبانگەکانی ئاسیایی و ئەفریقیایی دا بە ئاشکرا وای خۆی دەنواند.

جەواهیر لال نەهرۆ، سەرۆك وەزیرانی پێشووی هیندستان، کە هەر خۆی لە بەرگریکەرە دەنگ دلێرەکانی ڕزگاریخوازەکان دەژمێردێت، لە زەمینەی ڕۆڵی ڕۆژنامەوانیی لە وڵاتانی تازە سەربەخۆدا، چەندین بۆچوونی دیاری لە مەڕ تیۆرە کلاسیکییەکانی ئازادیخوازی ڕۆژئاوایی دەربڕیوە. بە گوتەی نەهرۆ، جۆری ئازادی و نەزەر لەم ڕووەوە، جیاوازە لەگەڵ ئەو ئازادییە بێ سنوورەی، کە لە وڵاتانی ئەوروپایی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە. نەهرۆ لەو باوەڕەدا بوو، کە ئازادی بێ سنووری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لەوانە بارودۆخی نێودەوڵەتی پڕ مەترسی بێنێتە گۆڕێ و هەر بۆیە دەبێ دەوڵەتان (بە توانایەکی ئەوتۆ خۆیان چەکدار کەن، کە بتوانن ڕووبەرووی زمانی پڕ مەترسی ڕۆژنامەوانیی ببنەوەو ئەو جەختی لەسەر ئەوە دەکرد، کە (ئێمە ناتوانین بە ناوی جۆرە ئازادییەکی خەیاڵ ئامێزەوە، کە کۆتایی بە هەموو ئازادییەکان دێنێ، سەلامەتی هەموو میللەتان بخەینە مەترسییەوە)[18].

---

[16] Emancipatory Journalism.

[17] Advancing Journalism.

[18] Donald E. Smith Nebru and Democracy: The Political Thougt of an Asian Democrat, Bombay:Orintal Longman,1958.

(قوام نكرۆمه)، ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی غینیاش لە میانەی ئەو قسانەی، کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا، لەبەرامبەر کۆمەڵێ لە ڕۆژنامەوانانیی ئەفریقیاییدا کردبووی، گوتبووی: ((ڕۆژنامەوانیی ئەفریقیایی شۆڕشی ئێمە، دەبێ لە خزمەتی ئامانجەکانی شۆڕشی ئێمەدا بێت، ڕۆژنامەوانیی تەنیا بۆ دەوڵەمەندکردنی زەنگینەکان و خەریک کردنی خوێنەرەکانی نەهاتۆتە کایە. ئەمانە بەشێکی دانەبڕاوی کۆمەڵن ودەبێ لەگەڵ ئامانجەکانی کۆمەڵدا هاوشان بن. ڕۆژنامەوانیی دەبێ لە سەقامگیر کردنی ڕژێمێکی سیاسی و ئابووری پێشکەوتووی ئەفریقیاییدا، کە مرۆڤ لە پێویستی وهەژاری و ناعەدالەتی کۆمەلایەتی ڕزگار دەکات، هاوکاری بکات. ئەو شتانەی دەبێ بگاتە دەست هەموو خەلك، فێریان بکەن و ڕێنۆێنیان بکەن و لە ڕێگەی یەکسانی و چەسپاندنی جیهانی مافی مرۆڤ لە هەموو جێگایەکدا تێ بکۆشن.

لەم ڕووەوە، ڕۆژنامە ڕاستەقینەی ئەفریقیایی، پەروەردەکارێکی گشتیە و گەورەترین چەکە کە دەبێ لە پێناو سەرکەوتن بەسەر ئیستعمار و ئیمپریالیزم و یارمەتی بۆ سەربەخۆیی و یەکێتی ئەفریقا بەکاربهێنرێت...))[19].

ڕۆژنامەوانانی ئەفریقیایی بەشدار لە کۆبوونەوەی ناوبراودا، لە بەیاننامەی کۆتایی کارەکانی خۆیاندا، بۆچوونی ڕۆژئاوایی پەیوەند بە ناسیاسی بوونی ڕۆژنامە وەك میراتێکی ئیستعماری ڕەت کردەوە و خۆیان وەك فەرمانبەر لە قەڵەم دا تا وەك بیرۆکەی ئەوەی، کە دەبێ ڕۆژنامەوانیی سیاسی نەبێ، بە ناوی ئەوەی، کە ئەمە یەکێکە لە سیاسەتەکانی ئمپریالیستی، فەشەل پێ هێنا.

دووپاتکردنەوەکانی (جۆلیۆس نیرێر)[20]، ڕابەری ڕزگاریخوازی تانزانیا لە سەر پێداویستی سوود وەرگرتن لە توانای ناوخۆ بۆ تازەکردنەوەی ئەم وڵاتە و کەلك وەرگرتن لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی و بە تایبەتی ڕادیۆ، لە پێناو یەکێتی نەتەوەیی، هاوبەشی هەمە لایەنە، بۆ پیادەکردنی بەرنامەکانی پەرەپێدانی کۆمەلایەتی بە نموونەیەکی دیکەی بەکارهێنانی ڕاگەیاندن بۆ پێشکەوتن دەژمێردرێت.

---

[19] Kwame Nkruma, The African Journalism.Dar-es-Salam: Tanzanian Publishers, 1965.
[20]Julius Nyerere.Ujama, The Basis of African Socialism. Dar-es-Salam: Tanganyika Standard, 1962.

ئەو بە هەموو شێوەیەك هاتنە ناوەوەی تیمەکانی تەلەفزیۆن بۆ نێو خاکی ئەم وڵاتە (بێجگە لە دوورگەی زەنگبار) بۆ بەرگرتن لە بەرنامە سریالییەکانی ئەمریکایی و ڕووبەڕووبوونەوەی بەها فەرهەنگییەکانی کۆمەڵە مەسرەف کەرەکان، لە هەموو وڵاتانی جیهانی سێیەم، تایبەت بە تاکە. ڕابەران و ڕۆژنامەوانانی ئەمریکای لاتینیش بۆچوونی ئامانجدارییەتی خۆیان لەمەڕ دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە دەستەبەرکردنی ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتانی جیهانی سێیەم، دەربڕیوە. لە نێوانیاندا دەتوانرێ تێڕوانینی(کلمنت مارکۆکین ڕۆجاس)[21] ڕۆژنامەوانی گواتیمالایی، کە ماوەیەك جێگری سەرکۆماری ئەم وڵاتەش بووە، بێنینەوە یاد. ئەو لەو باوەڕەدایە، کە (هەموو ڕۆژنامەیەك هۆیەکە بۆ خەباتی سیاسی و هەموو ڕوژنامەوانێکیش پێشمەرگەیەکە).

هەروەها کۆسپ و تەگەرەکانی تایبەت بە جیاوازی نێوان ئازدای ڕوژنامەوانیی لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی و جیهانی سێیەمیش دەست نیشان کردووە، بە بڕوای وی، ڕۆژئاواییەکان لەو زەمینەیەدا جەخت لەسەر (ئازدای زانیاری)[22] دەکەنەوە، کەچی لە کاتێکدا ئەوانەی سەر بە جیهانی سێیەمن، زیاتر بیر لە (ئازادیی ویژدان)[23] دەکەنەوە، هەر بۆیە بۆ گەیشتن بەم ئازادییە داوکراوە، دەبێ بەر لە هەموو شتێك هەل و مەرجی پێوستی گەشەکردن و بۆچوون و باوەر بەم مەسەلەیە لە بەرچاوان بگیرێ[24]. بۆ دەست هێنانی خەسڵەتەکانی ڕزگاریخوازانە و ئازادیخوازانەی ڕابەران و هزرمەندانی جیهانی سێیەم لە بابەت شێوە تازەکانی ڕۆژنامەوانی، لە سالآنی هەوەلی حەفتاکاندا، چەندین هەوڵی جۆر بەجۆر لە لایەن وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئەمریکای لاتینەوە درا. لەم بارەیەوە هەوڵ و کۆششی پسپۆڕان و تۆژەرانی ڕاگەیاندنی ئۆپۆزسیۆنی ڕۆژئاوایی و جیهانی سێیەم و بەتایبەتی هەنگاو و چالاکییەکانی (یۆنسکۆ) و (جۆلانەوەی وڵاتانی بێ لایەن) بۆ ڕێگرتن لە نایەکسانی و ناتەبایی لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانیدا، هەروا بۆ لەبەرگرتنی ڕێگەی تازەی ڕۆژنامەوانی لە خزمەتی پێشکەوتندا، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو.

---

[21] Clement Marroquin Rojas.
[22] Freedom of Information
[23] Freedom of Conscience.
[24] J. Herbert Altschull. Agents of Power: The Role of the News Media in Human Affairs. New York: Longman, 1984, P.P.143-164.

لە هەوەلین کۆنفرانسی پسپۆڕانی جیهانی لە بواری ڕاگەیاندندا، کە لە ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧١ دا، بە یارمەتی (یۆنسکۆ) و (مۆنتریاڵ)ی کەندا و پاریس بەڕێوەچوو، بۆ یەکەمین جار شێوازەکانی پەروەردەیی و لێکۆڵینەوەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی کەواتە بەر دژایەتی و تەنگ و چەڵەمە و زەمینەیەکی لەبار بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ڕەخنەگرانەی ڕاگەیاندن ڕەخساند.

هەوەڵین ڕەخنەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە سەر (نایەکسانی ڕاگەیاندنی جیهانی). کە لە پاییزی ١٩٧٠ لە دانیشتنەکانی شازدەمینی کۆبوونەوەکانی کۆنفرانسی گشتی یۆنسکۆدا، بە قسەکانی سەرۆکی دەستەی نوێنەرانی هیندستان لە بارەی بوونی درزێکی گەورە لە نێوانی هەواڵ و ڕاگەیاندنی ئاژانسە گەورەکانی ڕۆژئاوایی و هەندێ لە سەرچاوە هەواڵی و ڕاگەیاندنەکانی لێکدراو لە لایەن هەندێ ئاژانس و سەرچاوە هەواڵییەکانی جیهانی سێیەم بۆ ڕۆژئاوا، دەستی پێکرد دوو ساڵی دواتر، لە حەڤدەمین دانیشتنەکانی ئەم کۆنفرانسەدا، وڵاتانی ئەندام لە یۆنسکۆ بە شێوەیەکی یەکجارەکی و ڕەخنەیەکی توندو تیژ دژی دامەزاوە دەستەڵاتدارەکانی ڕۆژئاوایی لە مەیدانی گەشەپێدانی بەشی ڕاگەیاندن و نەخشەسازی نوێی ئەم دەزگا جیهانییە، لە بەرەوپێشەوەبردنی (سیاسەتی نەتەوەیی ڕاگەیاندن)ی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، دەنگیان هەڵبڕی و ئەم هەنگاوە لە جوڵاندنی سۆزی جیهانی سێیەمدا بۆ پێداچوونەوە بە تیۆری و دەزگاکانی ڕاگەیاندن دەسەلاتداری ڕۆژئاوایی، کاریگەریەکی گەورەی هەبوو. سەرەتا کۆششکەکانی (جووڵانەوەی وڵاتانی بێ لایەن) بۆ ڕووبەڕبوونەوەی کەلەپووری فەرهەنگی ئیستعماری ڕۆژئاوایی و لەوانە ڕاگەیاندنی ئیستعماری، لە بەیاننامەی کۆتایی چوارەمین کۆنفرانسی سەرانی ئەم وڵاتانە لە سێپتەمبەری ١٩٧٣دا، ڕەنگی دایەوە، هەروەها بۆ گۆڕینی ڕوانین و چالاکیەکانی ڕاگەیاندنی جیهانی سێیەم، بووە بناغەیەکی پتەو. لە درێژەی سازدانی سیمینار و کۆنفرانسە جۆراوجۆرەکانی ڕۆشنبیران و لێکۆڵەران و دژ بە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی و جیهانی سێیەم، لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا وەك سیمنیاری ڕۆژنامەوانی (بنکەی داگ هامر شولد) لە سیپتەمبەری ١٩٧٥ لە نیویۆرك، سمپۆزیۆمی ڕاگەیاندنی جۆلانەوەی بێ لایەنەکانی لە مارسی ١٩٧٦، لە شاری (مەکسیکۆسیتی) پایتەختی مەکسیك و هەنگاوەکانی یۆنسکۆ بۆ سازدانی کۆنفرانسەکانی ناوچەی (سیاسەتی ڕاگەیاندنی نەتەوەیی)، کە هەوەڵ و بەناوبانگترینیان لە هاوینی ١٩٧٦دا لە شاری (سان خوزێ)ی پایتەختی کۆستاریکادا بەڕێوە چوو و پاشان چەندین کۆنفرانسی ناوچەکانی دیکە بۆ ئاسیا و ئۆقیانووس

و كيشوەری ئەفريقيا و هەروا ولاّتانی باكووری ئەفريقيا و ولاّتانی عەرەبی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لە سالاّنی ١٩٧٩، ١٩٨٧، ١٩٨٠دا بەردەوامبوو. هەروەها چەندین هەولّی گرنگی (جوولاّنەوەی ولاّتانی بێلایەن) لە سالاّنی ١٩٧٥، ١٩٧٦ دا بۆ دامەزراندنی (تۆڕی ولاّتانی بێلایەن)[25].

پەرەپێدانی هاوكاری ڕاگەیاندن و هەوالّ لە نێوان ولاّتانی ئەندام لەم جوولاّنەوەیەدا، هەول و مەرجی شیاوی بۆ پێداچوونەوە بە شێوە كلاسیكییەكانی ڕۆژنامەوانیی ڕۆژئاوایی خولّقاند. لە ناوەڕاستی حەفتاكاندا، ولاّتە پێشكەتووەكانی جیهانی سێیەم، ئەوانەی كەلە گفتوگۆ و بڕیارەكانی ڕاگەیاندنی جیهانی (یۆنسكۆ) هەنگاو وچالاكیەكانی (جوولاّنەوەی ولاّتانی بێ لایەن) بۆ ڕێگرتن لەو نابەرابییەی ڕاگەیاندن و نایەكسانی ڕۆژنامەوانیی، ڕۆلّی بەرچاویان هەبوو، لە ڕێگەی گەیشتن و وەدەست هێنانی سەربەخۆیی ڕاگەیاندن و و هەوالّ و بەرقەراری سیستمی نوێی ڕاگەیاندن جیهانی، كەوتنە خەباتێكی بەهێز دژی فەرهەنگ و ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا.

بۆ ئەم مەبەستە ولاّتانی ناوبراو،سیاسەت و هەنگاوی پێویستیان نا بۆ لەنێوبردنی بزاڤی نایەكسان و تاكڕەوی ڕاگەیاندن و هەوالّی جیهانی و بەرنامەكانی تەلەفزیۆنی و گشت بەرهەمەكانی تەلەفزیۆنی وگشت بەرهەمەكانی فەرهەنگی ڕۆژئاوایی، هەروەها بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، لە پالّ (تۆڕی ئاژانسی دەنگ وباسی بێ لایەن)دا كەوتنە دامەزرانی ئاژانسی نوێ لە ناوچەكەدا، هەروەك (ئاژانسی هەوالّی پان ئەفریقا)[26]، (ئاژانسی هەوالّی ولاّتانی ناوچەی كاریبی)[27] و هاوكاری لەگەلّ ئاژانسی هەوالّی سەربەخۆ (ئینتەرپرێس سێرڤیس)[28] كە بە هەوەلین ئاژانسی هەوالّی جیهانی سێیەم دەژمێردێت. هاوكات لەگەلّ ئەوەشدا ڕوویان لە چەندین مەسەلەی تایبەت بە پەروەردەكردنی ڕۆژنامەوانی ولاّتانی تازە پێگەیشتوو بە تایبەتی و شێوە تازەكانی ڕۆژنامەوانی و خەسلّەت و تایبەتیەكانی هەوالّی سەربەخۆی جیهانی سێیەم كرد.

**ب- خەسلّەت و تایبەتمەندییەكانی هەوالّ لە جیهانی سێیەمدا:**

پسپۆران و توێژەرانی ڕاگەیاندنی ولاّتانی تازە پێگەیشتووی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئەمریكای لاتینی، لە هەولّ و كۆششی خۆیاندا بۆ دەستەبەركردنی ڕۆژنامەوانییەكی ئازاددا، لە لایەكەوە جولاندنەوەیەكی تەقلیدی وەرگێڕاو لە خەسلّەت و تایبەتمەندییەكی هەوالّی

---

[25] Non-Aligned News(Agencies)Pool.
[26] Pan African News Agency(P.A.N.A.).
[27] Careabban News Agency (C.A.N.A.).
[28] Inter Press Servics(I.P.S.)

ڕۆژئاوایی کە بەهۆی وەرگێڕان لە ڕۆژنامەوانیی و گشت کەناڵەکانی دیکەی ڕاگەیاندنەوە دەرکەوتووە، بخەنە بەر دیدێکی تازەوە لە لایەکی دیکەشەوە لەسەر بنچینەی تایبەتمەندییە مێژووییەکان و ناسنامەی فەرهەنگی وپێداویستی سەربەخۆیی و پێشکەوتنی خۆیاندا گرنگی بە خەسڵەت وتایبەتمەندییەکانی هەواڵی خۆماڵی بدەن.

**١-چاوخشاندنێك بە خاسیەتەکانی هەواڵی ڕۆژئاوایی:**

خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی هەواڵی ئێستای ڕۆژئاوایی – هەروەك لە باسی پێشوودا باسی لێوە کرا- دوابەدوا گۆڕانکاری ڕۆژنامەوانی و لە قۆناغی بازرگانی پێکردنیدا، بەرجەستە بوون، بەشێوەیەك تیۆردانەرەکانی سیستمی دەستەڵاتداری ڕۆژئاوایی، چالاکییەکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتی لەسەر بنچینەی (بابەتخوازی) و (ئوپۆزۆسیۆن) کە بەرامبەر هەنگاوە نادروستەکانی دەوڵەت و (چاوەدێری) کردنی بەرژەوەندی گشتییەکان لە بەرامبەر سیاسەتە چەوتەکانی دەوڵەت بەپێویست دەزانن، بەبڕوای ئەوان، هەواڵ بریتییە لە ڕاپۆرتێکی (ڕاستگۆ)[29]، (ورد وبێ لایەنانە)[30]، (هاوسەنگ)[31] و (بابەتی)[32]یانە، کە ئەمانە هەندێ لە (خەسڵەتەکانی هەواڵ)ن[33].

ئەم خەسڵەتانەش بە پێی پێوانەکانی (کاریگەری)[34]، (گرنگی)[35]، (نزیکی)[36]، (گەرماوگەرم و تازەیی)[37]، (پەیوەندی مرۆڤایەتی)[38]، (گەیشتنەیەك و جیاوازی)[39] و (تایبەتمەندی نائاسایی)[40] دەست نیشان دەکرێت.

لە (شێوە هەواڵی ڕۆژئاوایی)[41]، سەرنج دان بۆ هەنووکەیی ڕووداوەکان و گواستنەوەی بە پەلە و سات بەساتی ڕووداوەکانیش، گرنگە، چەمکی (ئازادی ڕۆژنامەوانی)یش لە پەخشی

---

[29] Accurate
[30] Fair
[31] Balanced.
[32] Objective
[33] News Values.
[34] Impact.
[35] Prominence.
[36] Proximity.
[37] Timeliness.
[38] Human Interest.
[39] Conflict.
[40] Oddity.
[41] Western News Model.

هەواڵ ڕۆژنامەوانی، مەرجێکی بنەڕەتییە چەمکی دوایی، لەسەر بناغەیەك دامەزراوە کە پێی وایە، ئەو قسەکەرانەی بە ئازادی زانیاری وەدەست دێنن، لە کۆمەڵێکی کراوە و دیموکراتیك و بەکردەوەدا کاریگەرییەکان ڕۆڵێکی بنەڕتیان هەیە. لە کۆمەڵێکی وادا چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت، کە ڕۆژنامەوانیی و گشت کەناڵەکانی ڕاگەیاندن گشتی، هەموو ڕووداو بیروباوەڕەکانی تایبەت بە ژیانی ڕۆژانەی گشتی، لە (بازاڕی بیروڕای ئازاد)[42]، ڕابگەیەنن تا (حەقیقەت) بۆ خەڵکی ڕوون بێتەوە. کەوابێ، خەڵکی (مافی ئاگا لێ بوون)[43] لە سیاسەت و هەنگاوەکانی دەوڵەتی هەیە وهەر لەبەر ئەوە، هەواڵ و ڕاپۆرتە هەواڵییەکان دەبێ بە ئاراستەی ئامادەکردن و خستنە ڕووی چۆنیەتی ڕووداوە بنەرەتیەکان بێ ئەوەی بخرێتە بەردەستی ئەو خەڵکە، تاوەك ئەوانیش بتوانن لە بارەی کاروباری گشتییەوە، باوەڕی ڕاست و دروستیان هەبێ.

هەروەها چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتی، لە ڕوانین ژیانی کۆمەڵایەتی، ڕێنوێنی سیاسەت و بڕیارەکانی دەوڵەت لە ئەستۆبگرێت و بەمجۆرە، ڕۆڵی تایبەتی خۆی، بەناوی چاوەدێری لە بەرامبەر دەوڵەت و بەرگری لە مافی خەڵك، وە دەربخات[44]. بەلاَم ڕاستییەکەی ئەوەیە،کەڕوانینی گەشبینانە لە بارەی ڕۆڵی هەواڵ وکەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی، لە کردەوە دا سەرکەوتن وەدەست ناهێنێ، چونکە ئەم کەناڵانە لە بازاڕێکی بەسانسۆردا چالاکییەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن، ئەو بازارەش زۆر لە ژێر کاریگەری بەرژەوەندی بازرگانی گوشاری دەزگاکانی پڕوپاگەندەدان، بۆ زیادکردنی زۆرترین ئامارەی خەڵك بۆ لای خۆیان، ئەمەش بە زۆری لە ڕێگەی سەرنج ڕاکێشان ئاگاداری ڕاستەقینەی ئەوان و خۆگونجاندن لەگەڵ سەلیقەی ئەوان.

لە توێژینەوەیەکدا کە لەساڵی ١٩٧٣دا، لە لایەن (ئەنجومەنی بلاَوکەرەوەی ڕۆژنامەکانی ئەمریکا)[45]، لە بارەی ڕۆژنامەکانی ڕۆژانەی ئەو وڵاتەی ئەنجامدابوو، زیاتر لە چل مانشێی

---

[42] Free Market Place of Ideas.
[43] Right to Know.
[44] Munir K. Nasser. ((News Values Versus Ideology: A Third World Perspective)), in L. John Martin and Anju Grover Chauhary (eds). Cmparative Mass Media Systems. New York: Longman, 1983, P.P.44-66.
[45] America Newspaper Publishers Associalition(A.N.P.A.)-News and Editorial Content and Readership of Daily Newspaper.Reston: America Newspaper Publishers Associalition Research Center،1973.

هەواڵ بە جیا وەرگیرابوو، بەپێی ئەم لێکۆڵینەوە دەرکەوت، کە ڕۆژنامەوانی ئەمریکا، لە هەواڵی نێودەوڵەتی زیاتر گرنگی بە هەواڵی وەرزشی دەدەن و هەواڵەکانی تاوانکاری زیاتر لە هەواڵەکانی ڕۆشنبیریی دەخەنە ڕوو. ئەنجامی کۆتایی لێکۆڵینەوەی ناوبراو وا نیشان دەدات، کە بەرفراوانترین زەمینەی بابەتەکانی هەواڵی ڕۆژنامەکانی ئەمریکا، بریتین لە ڕووداوی جۆربەجۆر، کارەساتی سروشتی، کاروباری نێودەوڵەتی، مەسەلە دارایی و تاوانکاری.

هەندێ لە ڕابەرو هزرمەندانی ئۆپۆزسیۆنی جیهانی سێیەم، لەو ساڵانەی دواییدا، بە تێگەیشتنی زۆرترەوە لە بارەی واقیعیەتی کاری کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی گشتیی وڵاتانی سەرمایەداری و بەر ئەنجامی دژوارییەکانی دەستەڵاتی کلتووریی و ڕاگەیاندنی جیهانی ئەوان ڕەخنەیان لە شێوازی هەواڵی ڕۆژئاوایی گرتووە و جەختیان لەسەر پێویستی هەڵبژاردنی خەسڵەتەکانی هەواڵی ئازاد کردۆتەوە.

لە بابەت کارەسات و دژوارییەکانی دەستەلاتی ڕاگەیاندنی جیهانی ڕۆژئاوایی و بەتایبەت شێوەکانی ڕاپۆرت، وتەکانی (کارلۆس ئەندرێس پیرێز)[46]، سەرکۆماری پێشووی ڤەنزەویلا، لە حوزەیرانی ١٩٧٦ دا پەند وعیبرەتە، لە میانەی وتەکانی خۆیدا لە کۆنفراسیی ناوچەیی سیاسەتی نەتەوەیی ڕاگەیاندن بۆ وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا، لەو (هێرشی هەواڵی بێ کۆنترۆڵ)ی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە گشتی و ئاژانسەکانی جیهانی ڕۆژئاوایی، سەبارەت بە ڕۆڵی خراپی ئەوان لە سەپاندنی بەهاکانی بێگانەو هەرەشەکردن لە ناسنامەی فەرهەنگی) وڵاتانی جیهانی سێیەم، ڕەخنەی گرت، ئەو بوو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییە و بە مەبەستی زامنکردنی مافی ئاگادار کردنێکی ڕاست و دروست بۆ خەڵکی جیهان، دانانی بریارنامەی نێو دەوڵەوتی لە بەکارهێنانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و خەبەری بۆ بەیانکردنی ڕاستی و مافی دانانی سنوورێك بۆ خستنەڕووی بیرورا ، بە پێویستزانی، هەروەها ئەوەی ڕوونکردەوە، کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ناتوانن بە پێش بەرژەوەندی و مەسلەحەتی گشتی و داب و نەریتەکانی کۆمەڵ بکەون. سەرکۆماری ڤەنزۆێلا هەروەها درێژەی پێدا، کە (دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی جیهانی تەنیا ئەو هەواڵانەی، کە وێنەی میللەتانی ئێمە عەیبدار دەکەن، بڵاودەکەنەوە و خەبات و کۆشش و خواستەکانی ئێمە بۆ سەقامگیربوونی سیستمێکی دادپەروەرانەی نێودەڵەتی پشتگوێ دەخەن.)[47].

---

[46] Carlos Andres Perez.

[47] Roger Tatarian.((News Flow in Third World)). in Philip C. Horton(ed). The Third World and Press Freedom. P.27.

(کێن کاوندا)، سەرکۆماری ناسراوی (زامبیاش) لە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەوانیی ئەم وڵاتە، جەختی لە سەر پێویستی پاراستن و پارێزگاری لە سەربەخۆیی نەتەوەیی و پەرەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و یادئاوەری ڕۆڵی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی لە پاراستنی یەکیتی گشتی کردەوەو ڕەخنەی لە هەندێ شێوە ڕاپۆرتە ناوخۆییەکان گرت.

هەروەها ناوبراو لەم ڕووەوە ئەوەی نیشاندا، کە (...دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتی ئێمە دەبێ ڕەنگدانەوەی سروشتی کۆمەڵ بن و فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و بەها و پەیوەندیەکانی ئێمە بە ناوی وڵاتێکی خاوەن دەستەڵاتێکی نەتەوەیی بەرگری بکەن. ئەگەر ئێوە ڕۆژنامەوانان، بەو ئاراستەیە کارنەکەن، لە لای ئێمە وەك میللەتێك جێگەتان نابێتەوە...)[48].

(نازیندەر ئاگاروالا) ڕۆژنامەوانی هاوچەرخی هیندی، کە یەکێ لە بەناوبانگترین بەرکاریگەرانی ڕۆژنامەوانیی ئازادی جیهانی سێیەمەوە کە لە ساڵانی پێشوو خاوەن پایەی ڕاگەیاندن بوو لە بەرنامەی پەرەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆ ناوچەی ئۆقیانووس و ئاسیا) دا خزمەتی دەکرد، چەندین ڕەخنەی یەك لەدوایەکی لە ڕۆژنامەوانی ڕۆژئاوایی دەگرت، بەهۆی ئەوەی کە هیچ گوێیان بەو واقیعەت و بەرژەوەندی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو نەدەدا. ئەو سکاڵای لەوە بوو، کە زۆربەی پەیامنێرەکانی ئەوروپایی و ئەمریکایی خەریکی ئامادەکردن و خستنەڕووی (هەواڵی ورووژێنەر یان هەواڵی گەرماوگەرم)[49]ی ڕووداوی جەرگبڕ و جەنجاڵ ئامێز و سەیر و سەمەرە و نزیکی جیهانی سێیەمن، وەك کارەساتی گەورەی سروشتی، قات و قڕی فەسادی سیاسی، پەشێوی و پێکدادانی سەربازی، بۆ ئەوەی گوێی بە (هەواڵی بێ سەروسەدا یان هەواڵی گەشەپێدان)[50]، ناسراون بەرچاو نییە بە بڕوای وی دەربارەی گۆڕانکاریە چاکەکانی ئەم وڵاتانە بدەن. ئەم ڕۆژنامەوانە، هاوکات لەگەڵ ئەوە یەکێکە لە هەوەڵینی پسپۆرانی ڕاگەیاندن، کە (هەواڵی گەشەپێدان)یان بە گرنگ وەرگرتووە و خستوویانەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە[51].

---

[48] Munir K.Nasser. ((News Values Versus Ideology: A Third World Perspective)). P.P.48،49.

[49] Sesation or Spot News.

[50] Soft or development News.

[51] Narinder Aggarwala. ((News with World Perspctives: A Practical Suggestion)), in Philip Horton(ed). The Third World and Press Freedom. New York: Prager, 1978, P.P.197-208 and ((Whates development News?)), News of Communications, Vol.29, No.1,1979, P.P.180-181.

### ٢- خاسیەتەکانی (هەواڵی گەشەپێدان):

(ناریندەر ئاگا والا) لە وتارە جۆرەبەجۆرەکانی خۆی لە بابەت ڕۆژنامەوانی لە جیهانی سێیەمدا، خاسیەتەکانی (هەواڵی گەشەپێدان)یش دەست نیشان کردووە، هەروا لە هەمان کاتدا یەك پێناسەی تەواو و دروست لە بارەی ئەم جۆرە هەواڵە بەکارێکی دژوار دەزانێ.بۆ وە بیر هێنانەوە لەم ڕووەوە، ئەو هەواڵانەی کە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گشتییەوە ئامادەکرێت و بە (هەواڵی پۆزەتیڤ)[52]، ڕۆژنامەوانێك کە لە بواری کاروباری پەرەپێداندا خزمەت دەکات، دەبێ بۆچوونەکانی تایبەت بە گەشەپێدان و لە ڕووی دابین کردنی پێویستییە نەتەوەیی ناوچەییەکاندا بێ، جیاوازییەکانی نێوان ئەوەی، کە بەرنامەی بۆ دارێژراوە و ئەوەی جێ بەجێ کراوە، هەروا جیاوازی دیدگای هەوەڵێنی دەوڵەت لە بارەی کاریگەری ئەو بەرنامەیە لە ژیانی خەڵکی و دەرئەنجامە بەدەست هاتووەکانی کۆتاییان بخاتە بەر لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنە گرانە و بە ووردی بینرخێنێ.

ئەو لەو باوەڕدایە، کە لە ڕۆژنامەوانیی بۆ پەرەپێداندا، هەموو ڕوانینەکان بەرەو ڕووداوی تازە و ئەو شتانەی کە لە کاتێکی دیاری کراو و ڕۆژێکی تایبەتیدا ڕوو دەدەن لەبەرچاو ناگرێت، بەڵکو ئەو شتانەی لە ماوەیەکی تا ڕادەیەك درێژدا دەرنەکەوتووە، بەنەزەر وەردەگرێ. هەر لەم ڕووە ئەوە دێنێتەوە یاد، کە ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییە، گرنگی بە (ڕیپۆرتاژانەی کە لەم بارەیەوە زیندوون، لەپاڵ ڕووداوەکاندا، پێشهات و ڕۆڵ و ئاکامەکانی داهاتوشیان لێ دەکۆڵدرێتەوە و بەم هۆیەوە، قسە بۆ کەرانی بۆ ماوەیەکی درێژ بە چۆنیەتی پەرەپێدانی ئابووری و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکانی ئاشنا دەکات لەم دیدگایەوە (هەواڵی گەشەپێدان)، لەگەڵ (هەواڵی وروژێنەر)[53]، و ڕاپۆرتی خێرا، بەتەواوی جیاوازە.

(ئاگار والا) لە میانەی ڕەخنەکانی لە بێهوودەیی پەیامنێرەکانی دەزگا گشتییەکانی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی و هەتا وەك پەیامنێرانی ناوخۆی وڵاتانی جیهانی سێیەم بەرامبەر گۆڕانکاریەکانی پەرەپێدان خواز لەم وڵاتانە، بە تایبەت لە مەسەلەکانی سەرکەوتنی کەم بایەخەکانی وڵاتانی ناوبراو لە بوارەکانی کشتوکاڵ و تەندروستی بە نموونە دێنێتەوە.

---

[52] Positive News.

[53] Action News.

ئەو هەر بە نموونە درێژەی پێدەدا، کە ئاژانسەکانی جیهانی ڕوودانی تامپۆنی پاسێك لە وڵاتانی (کینیا) کە بۆەتە هۆی مردنی دە کەس وەك هەواڵێکی گرنگ بە هەموو دونیا دا بڵاودەکەنەوە، بەڵام لە وڵاتێکی جیهانی سێیەم وەك (مالاوی) دەزگایەکی ئاوی پاك دادەمەزرێنن، کە دەیان هەزار لە خەڵکی گوندەکان سوودی لێ دەبینن، خۆیان لێ گێل دەکەن، لە کاتێکدا دەستکەوتنی ئاوی خواردنەوە یەکێ لە پێویستەکانی ژیانی خەڵکی جیهانی سێیەمە و دابین کردنی ئەم جۆرە سەرچاوانەی ئاو، دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ڕێژەی مردنی منداڵانی ئەو وڵاتانە.

بە نەزەری ئەم ڕۆژنامەوانە، (هەواڵی گەشەپێدان) لە ڕووی ئامادەکردن و ڕێکخستندا، لەگەڵ هەواڵی ئاسایی دا جیاوازی نیە، بەڵام چاکتر وایە، کە هەواڵ و چالاکییەکانی پەرەپێدان، بە هۆی سروشتی تایبەتی خۆی زەروورەتی تاکمەندی، بە شێوەی ڕیپۆرتاژی (لێکۆڵینەوە)[54]، بخرێتەڕوو و ئەم جۆرە ڕاپورتانە دەتوانن لە بارەی مەسەلەکانی پەیوەند بە پەرەپێدان لە ڕووی ناوچەییەوە وردبێ و لە ڕووی میللی و نێو دەوڵەتیشدا شێوەی جۆراجۆری هەبێت. ئەوەی پەرەپێدانی دەبێت: دەبێ هەرچی توانا و شارەزایی و ئەزموونەکانی خۆی بۆ ڕیپۆرتاژی ئایندەیی و پەرەپێدان بەکار بێنێت تا وەك بتوانێ بە چاکترین شێوە بیخاتە بەرچاوی خوێنەرانی.

خستنەڕوویەکی سەرنج ڕاکێشانی گۆڕانکارییەکانی گەشەپێدان و بەخشینی سروشتێکی ئینسانی بە ڕیپۆرتاژەکانی ناوەخۆ و جیهانی و شتە پەیوەندداره‌کان، لە گرنگترین ئەرکەکانی ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانییەیە[55].

### ٣- بنەماکانی هەڵبژاردن و خستنەڕووی هەواڵ لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا:

لەم بیست ساڵەی دواییدا، هاوکات لەگەڵ ئەو کوششانەی لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بۆ گۆڕینی خاسیەتە باوەکانی هەواڵ دراوە، هەر لەلایەن ئەوانەوە بۆ ڕێکخستن و دانانی بنەمای تایبەت بۆ هەڵبژاردن و بڵاوبوونەوەی هەواڵ دراوە.

---

[54] Investingative Reporting.
[55] Narinder Aggarwala.((A New Journalism,)), InterMedia, Vol.8, No.1, 1980, P.P.26-27.

(ئالسینۆلوئی دا کۆستا)[56]، بەڕێوەبەری گۆڤاری (ئەفریقای نوێ) لە شاری (دکار)ی پایەتەختی سەنیگال، لە میانەی وتارێکدا کە لە بارەی خاسیەتەکانی هەڵبژاردنی هەواڵ لە ئاژانس و کەناڵەکانی پەیوەندی جەماوەریی ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٨٠، لەگەڵ چەندین لێکۆڵینەوەیەکی دی بەناونیشانی ((پایە و دەستووری هەواڵ لە پێوەندیی فەرهەنگی وڵاتاندا)) بڵاوکراوەتەوە، سەرچاوە جۆربەجۆرەکانی هەواڵ و لەوانە، هەڵبژاردنی هەواڵی نەتەوەیی و هەواڵی نێو دەوڵەتی بڵاوکردنەوەی لە ناوەوەی وڵاتانی ئەفریقیا خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

بەگوێرەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەڵبژاردنی نیشتمانی، پەیوەندی ڕابەری سیاسییە بەهاتنە کایەی هەنگاوی چاك و سیاسەتەکانی دەوڵەتەوە ئەمەش دەبێ وەك هەواڵی دڵنیاکەرەوە بخرێتە پێش هەواڵەکانی دیکەوە و مایەی سەرنج ڕاکێشان بێت، لە بارەی هەڵبژاردنی هەواڵی نێو دەوڵەتیش دەبێ جەخت لە سەر ڕاست و دروستی لایەنی دەروونی- سیاسی گوێگران بکرێتەوە، هەروەها سەرنج لە بەرژەوەندیی هاوبەشی وڵاتانی ئەفریقایی و هەواڵی وڵاتانی دۆست فەزڵ بکرێت، پێداویستیەکانی سیاسەتی نیشتمانی و پرۆژەی بەرەو پێشەوە بردنیان- هەر وەك بەرگریکردنی دەوڵەتی جەزائیر لە کۆماری دیموکراتی بیابان، لە بەرامبەر مەراکش- هاوکات لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەکانی- هەر وەك خەباتی هاوبەشی میللەتانی ئەفریقا لە بەرامبەر ڕەگەز پەرستی و ئیستعمار- لەبەرچاو بگرێت، ئەو ڕۆژنامەنووسە مەرجەکانی هەڵبژاردنی هەواڵی نیشتمانی لە لایەن ئاژانسەکانی ئەفریقیایی بۆ بڵاو کردنەوە لە کەناڵەکانی پێوەندی تۆڕی هەواڵی وڵاتانی بێ لایەن خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە و هەنگاو هەڵێنانی ڕۆژنامەوان.

(شەپۆلی نوێ)ی ئەفریقیایی لە میانەی ڕیپۆرتاژی توێژینەوە و چەسپاندنی ئەو ڕەوتەی بە بەرز نرخاندووە. هەروەها هەواڵی ئاژانسە گەورەکانی نێودەوڵەتی بۆ کەناڵەکانی پێوەندی جەماوەری ئەفریقایشی نرخاندووە و پاشان ئاماژە بە هەندێ لە بزاڤە چاکەکانی ئەوان کردووە و ڕەخنەی لە پێودانگ و نرخ وپلە و پایەی تایبەتیان و تێڕوانینی نابێ لایەنانەیان و

[56] Alcino Louis da Costa, ((News Criteria for the Selection of News in Africa)), in News Values and Principlles of Cross Cultural Communication.Paris: Unesco, Report and Pages on Mass Communication, No.85, 1980, P.P.7-15.

ولایەنگریی سیاسییان بۆ سوودی دەوڵەتە گەورەکانی ڕۆژئاوا وئیبرازکردنی هەواڵی نائاسایی قەیران و ڕووداوە هەست و ڕووژینەرەکان و سووك کردنی میللەتانی ئەفریقایی و بێ دەنگ بوون لە ئاست ڕووداوە گرنگ و بەرچاوەکانی ئەفریقا و شێواندن وبڵاوکردنەوەی وێنەی نابەجێی ئاژانسەکان، گرتووە. هەروەها ناوبراو، لە کاریگەریی دەستەڵاتی ناوخۆ و دەرەوەی دەزگاکان و کەناڵەکانی پێوەندی جەماوەریی ئەفریقایی شێوازی ئیبرازی هەواڵ لەلایەن دەستەی نووسەرانەوەی کۆڵیوەتەوە و لەم ڕووەوە کاری دەستەڵاتی سیاسی لە زەمینەی بڵاوبوونەوەی هەواڵ و تایبەتی مانشێتەکانی هەواڵی ڕۆژنامەکان و کاریگەریی بارودۆخ و ڕێ و شوێنی تایبەتی قەیرانەکانی ناوخۆی وڵات و دەستەڵاتی بەڕێوبەرانی کەناڵەکانی پێوەندی لە شێوەی کاری ڕۆژنامەوانان و کاریگەریی گوشاری پارە وپوول لەسەریان و نا ئارامیی ئابووری سەربەخۆیی پیشەی ڕۆژنامەوانانی دەست نیشان کردووە لە دەستەڵاتی بەر فراوانی خاوەن ئاگادارییەکان بۆ لابردن و دانانی هەواڵی نابەجێ وکاریگەریی خوێنەران لە چۆنیەتی ناوەرۆکی ڕۆژنامەکان وسەرجەم پەیامەکانی ڕاگەیاندن، دواوە.

(داکۆستان) لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا، جەختی لەسەر کاردانەوەی خوێنەران لە بابەت چۆنیەتی هەڵبژاردنی هەواڵەکان کردۆتەوە و کۆسپ و تەگەرە ناپەسەندەکانی ڕێگەی وەرگێرانیان لەسەرچاوەکانی هەواڵی ناوخۆیی و ڕووکردنە سەرچاوەی دەرەکی و بەتایبەتی ڕادیۆکانی جیهانیی یادداشت کردووە. نووسەر لە دەرئەنجامەکانی کۆتایی خۆیدا، شێوازە پێویستەکانی هەڵبژاردنی هەواڵیشی ژماردووەو لەوانە، خۆپاراستن لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی نادروست، بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەی نائومێدی و دژایەتی و ڕق و کینەی نەتەوایەتی و ئایینی و نژادی، چاوەدێرکردنی واقیعی و لەبەرچاوگرتنی بارودۆخ و هۆیەکانی هاتنەکایەی ڕووداوەکان، هەوڵ و کۆشش زیاتر بۆ گەشەسەندن وپێشکەوتنی ئەفریقا تەرخان بکرێت، ڕێزگرتن لە هاوکاریی وڵاتانی ئەفریقایی و کۆشش کردن و بۆ یەکگرتنیان، بەهێزکردنی خولی فێرکردنی پسپۆری ڕۆژنامەوانانی ئەفریقایی و گرنگیدانی زیاتریان بەڕاستییەکان، ئامانج و مەبەستی هاوبەشی ئەفریقایی.

لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا، کە لە لایەن ((یەحیا ئەبوبەکر)) یەکێ لە پسپۆڕانی ڕاگەیاندنی وڵاتانی عەرەبی، کە لە بارەی گۆڕینەوەی هەواڵ لە نێوان ئەو وڵاتانەدا کردوویەتی

و لـه كۆمەڵـەى (يۆنـسكۆ) دابلاّوكراوەتـەوە، لەمـەڕ زەمينـەى خەسـلەتەكانى هەڵبـژاردن و بلاّوكردنەوەى هەواڵى ئەو ولاّتانەدا، لەسەر بنچينەى خاسيەتە باوەكان، بيروبـاوەڕى ئـايينى و ئايديۆلۆژى سياسـى و هـەروا كاريگـەريى نـووتنى دژوارى عـەرەب و ئيـسرائيل و مەسـەلەى فەلەستين بەگرنگ دەزانىّ و جەختى لەسەر دەكات[57].

لە پـاڵ دوو ليّكۆلينـەوەى ئاماژەمـان بـۆ كـرد، ليّكۆليّنەوەكـەش لـە لايـەن (پـران چۆپرا)[58]، ئەندامى (سەنتەرى ڕۆژنامەوانيى ئاسيا) لە بارەى پيّوانەى كاتى هەڵبژاردنى هەواڵ لـە ئاسـياوە بلاّوكراوەتـەوە، نـاوبراو لـەم ليّكۆليّنـەوە دا، وێـراى ئامـاژەكردن بـۆ پـەروەردەى پيشەيى ڕۆژنامەوانى ئاسيا لەسـەر بنـچينەيى شـيّوازەكانى فيّركـردن و كلتـوورى ڕۆژئـاوايى، ئامـاژەى بـۆ پـەيڕەوكردنى پيّودانگـەكانى ڕۆژئـاوايى و دەسـتەلاّتى بـەهيّزى كۆلۆنيـاليزمى كلتـوورى دەرەكـى لـە كەناڵـەكانى پيّوەنـدى جـەماوەڕيى ئاسـايش كـردووە و ڕەخنـەى لـەوە گرتووە، كە ڕۆژنامەوانانى باشوور و باشوورى ڕۆژهەلاّتى ئاسيا بە شيّوەيەكى فراوان ڕوويان لە هەواڵى سياسى كردووە و گوىّ بە هەواڵەكانى گۆڕانكارى ئابوورى و بە تايبەتى كشتوكاڵ. كە سەرچاوەى بژيّوى زۆربەى گوندشينەكانى ولاّتانى ئەو ناوچەيان نادەن.

دوا ليّكۆلّينەوەى ئەم كۆمەلّيە، كە لە هەموويان زياتر ڕەخنەدەگرىّ، هى (فرناندۆ ڕيـس تاما)[59]يە، كە ڕۆژنامەوانيّكى ئـەمريكاى لاتينييـە. لـەم ليّكۆلّينەوەيـەدا، لايـەنى نموونـە و كاريگەرييە خراپەكانى بازرگانيى كەناڵەكانى پيّوەندى جەماوەرى ولاّتـانى ئـەمريكاى لاتينـى كە بە لاسايى كردنەوەى ولاّتە يەكگرتووەكان هاتۆنەتە كۆڕىّ، شى دەكاتەوە.

بە پيّى ئەم ليّكۆلّينەوەيەى دوايى، ڕۆژنامەوانى ئەمريكاى لاتين، بە شيّوەيەكى گـشتى، بزاڤيّكى ڕووكەشانە و كات بەسەربردن وكەمتر ڕووى لە گۆڕانكاييـە ئابووريـيـەكان كردۆتـەوە. لەبـەر هەنـدىّ ورووژيّنـەر و خيّرايـى ولاّتـە يـەكگرتووەكانى ئـەمريكا دا قـەرارى گرتـووە و ئيبرازكردنى هەواڵى ڕووداوە خراپەكانى بەسەر ڕووداوە چاكەكاندا فەزڵ كراوە.

---

[57] Yehia Aboubbakr. ((Towards an Intra-Cultural News Exchange in the Arab States)), in News Values and Principles of Cross Cultural Communication, P.P.17-28.

[58] Pran Chopra. ((Asian News Values: A Barierr or Bridge?)), in News Values and Principles of Cross Cultural Communication, P.P.29-42.

[59] Fernando Reyes Maltta. ((The Concept of News in Latin America)). in News Values and Practicales of Cross Cultural Communication, P.P.43-56

توژەرێکی دیکەش لەلێکۆڵینەوەیەك دا لەمەڕ وڵات و کەناڵەکانی پێوەندی جەماوەری لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین دا، یەکێ لە خاسیەتە گرنگەکانی هەواڵی ئەم وڵاتانە بەیاننامەکانی دەوڵەت بە گرنگترین هەواڵەکانی ئەم وڵاتانە دەناسێنێ، هەربۆیە ناوبراو ئەوە دەخاتەوە بیر، کە زۆربەی رۆژنامەوانانی ئەم وڵاتانە، بۆ بەدەست هێنانی هەواڵ، چاوەڕوانی وتەبێژەکانی دەوڵەت دەکەن و گرنگترین کارێکیان ڕێخستن و وەرگرتنی وتەی وتەبێژانەوە شیکردنەوەی لایەنەکانی مەراسیمی تەشریفاتی و هاتن وچوونی وتەی وتەبێژانی دەوڵەتییە[60].

سەرچاوە: د.کاظم معتمد نژاد، ڕوزنامەنگاری، ص٤٩٨–٥١٨.

[60] Robert Pierce. Keeping the Flame: Media and Government in Latin America. New York. Hasting House, 1979.

## کورته مێژوویەکی
## ڕۆژنامه و سانسۆر له ئێراندا

وشـەی ڕۆژنامـە: کـۆنترین سەرچـاوەیەك، کـە وشـەی ڕۆژنامـەی تێدایـە بـەکارهاتبێ، شیعرەکانی (عنصری)یە، لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا:

به روزنامه ایام در همه پیداست

اگر بخواهی دانست روزنامه بخوان

وشەی ڕۆژنامـە ئـەبو ڕەیحـان لـە (الجـاهیر) چاپی کەلکـەتا، ل ٢٦٠) و (الثعـالبی) لـە (الیتیمة. چاپی دیمەشق، بـەرگی دووەم، ل١٠-١١) و (یـاقوت الحمـوی) لـە (معجـم الادبـاء. بەرگی پێنجەم، ل ٤٤٠) بەکاریان هێناوە، هەوەرها لە فەرمانی بنکەی کتێبخانەی شاهانە بۆ (کمال الدینی بەهزاد) وشەی ڕوزنامچە بـەکارهاتووە لـە (بیـست مقالـە قزوینـی، بـەرگی ٢، ل٢٦٩) سائب تبریزی دەڵێت:

گرنیست باورت که دل از ما ربودی

در روزنامـــــەی سر دو تا ببیـن

هەروا ناصر خسرو لە سەفەرنامەی خۆیدا دەنووسێ: ((ئـەم مانایـە لـە کۆمـەڵگای(بیـت المقـدس)دا دیـت بـووم وێنـەم کێـشاوەوە هـەر لـەوێ لەسـەر ئـەو ڕۆژنامەیـەی کـە هـەم بـوو، نوسیمەوە.)) هەروەك لەو سەرچاوانەی کە ناویان برا هاتووە، نووسەران و بیژەران بـە ڕۆژناچـە، ڕۆژنامەج، یان ڕۆژنامە لە هەموو شوێنێکی ڕاپۆرتی ڕۆژانەیان دەنووسییەوە.

کۆنترین سەرچاوە، کە نووسەری وتاری (وشەی ڕۆژنامە) (ڕەحیم ڕەزا زادەمەلەك)، وشەی ڕۆژنامەی بەواتا و چەمکی ئەمڕۆی ڕۆژنامە دیوە، کتێبی (مآثر الاثر)ی (اعتماد السلطنة) لە سەردەمی ناسرەدین شای قاجاردا بووە. مێژووی ڕۆژنامەوانی لە ئێراندا، دەتوانرێ بەسـەر دوو قۆناغی دیاریکراو، قۆناغی ئێرانی کۆن ودەورەی دواییدا دابەش بکرێت.

ڕۆژنامـەوانی کـۆن لەسـەردەمی داریوشـی هەخامەنیـشییەوە دەسـت پێـدەکات و تـا سەردەمی نادر شـا درێـژە دەکێـشێ وقۆنـاغی دوایـیش بەبڵاوبونـەوەی ڕۆژنامـەی (مـیرزا ساڵحی شیرازی) لە سەردەمی (محەمەد شـای قاجـار)ەوە دەسـت پێـدەکات، بـەڵام بـە هـۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە لە سـەردەمی مـیرزا سـاڵح. ەوە تـا ڕۆژنامـەی (**وقـایع اتفاقیـە**) لـە

سەردەمی (ناسرەدین شا)دا،سەرەتایی مێـژووی ڕۆژنامـەوانیی نـوێ دەبـێ بەبڵاوبوونـەوەی ڕۆژنامەی (وقایع اتفاقیه) دابنرێ.

(جهـانگیری سـولَح جـوو) لـە کتێبـی (مێـژووی چاپەمەنی ئێران وجیهـان) لـە بـارەی سەرهەڵدانی ڕۆژنامە لە ئێرانی کۆندا دەنووسـێ: ((بـۆ یەکـەمین جـار لـە مێـژووی ئێرانـدا لـە سـەردەمی پاشـایەتی داریۆشـی گـەورەدا کێـشەکانی وڵات لەسـەر تـابلۆی هەڵکـەنراو وەدەنووسرایەوە بۆ فەرمانڕەوای ناوچە جیاوازەکان و سەرۆکی وڵاتانی ڕزگارکراو دەنێـردران. بـۆ ڕەوانەکردنی ئەم جۆرە هەواڵانە پەیکی خێرایان هەڵدەبژارد کە لە هەرچەند قۆناغێکدا دەگۆڕان و بەم شێوەیە هەواڵەکانی مەملەکەت بەزووترین کـات لـە سەرانسەری وڵاتـی پـان و بـەرینی هەخامەنشیدا بڵاودەبووەوە. ژمارەی ئەو نووسراوانە لە سـەرەتادا زۆرکـەم بـوون، بـەڵام وردە وردە گرنگییان بۆ دەرکەوت)).

دەزگای پەخشی هەواڵ فراوان بۆوەو لە باتی نووسین لـە سـەر تاتـە قوڕەکـان، سـوود لـە بەردی نەرم دار وەرگیرا. تیراژی ئەم بڵاوکراوەیەی سەرەوە فەتحنامە و جەنگنامەیەکی زۆریش لەو سەردەمەوە ماوەتەوە، (٥٠) سـاڵی دواتـر، ژمـارە سـەرەڕای ئـەو بڵاوکراوەیـەی سـەرەوە مانگێ جارێك بڵاو دەبۆوەو ڕووداوی گرنگی مەمەلەکەتی تێدا دەنووسرا.

(٢٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش لە سەردەمی پاشایەتی (خشایار شـا)دا هەنـدێ بڵاوکـراوە لـە سـەر پێـست و چـەرم بڵاودەکرایـەوە کـە تێیـدا قـسە لەسـەر شـەڕ، داگیرکردنـی، بـارودۆخی ویلایەتەکان و پێگەی دوژمنان و هەواڵی ناوخۆی وڵاتدا دەکـرا. ئـەم ڕۆژنامانـە لـە (٥٠) تـا (٣٠٠) دانەی بە هۆی تەتەرەکانەوە لە سەرانسەری ئێران و ئاسـیای بـچووکدا بڵاودەکرانـەوە، ٣٠٠ ساڵ بەر لە دایك بـوونی مەسـیح درێـژەی هـەواڵی هێرشـی ئەسـکەندەر بـۆ سـەر ئێـران (سەردەمی داریوشی سێیەم)دا بە چەند دانەیەك بڵاکراوتەوە.

هەروەها چەندین هەڕەشە نامە بۆ دروست کردنی تـرس وسـام لـە نێـو سـوپای دوژمنـدا بڵاوکراوتەوە دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن (ئەسـکەندەری مەکـدۆنی)یـەوە، باسـی شـکانی ئێران و سەرکەوتنی ئەسکەندەر لەسەر ئەو کاغەزانەی کە لە یۆنانـەوە هێنـابووی، نووسـران و سەرانسەری جیهاندا بڵاو کرایەوە.

لە سەردەمی پاشـایانی هەخامەنـشی. دا تـا سـەردەمی بـە هـەرمێن بـوونی مەزهـەبی زەردەشتی ئەم بڵاوکراوانە تەنیا لایـەنی مێـژووی و جـەنگیی کـارگێری دەگرێتەوە،بـەڵام لـەوە

بەدواوە شێوەی چالاکیی ئایینی و کاروباری ڕۆژانەی بە خۆوە گرت، دوای ئەوەی حەزرەتی عیسا و حەزرەتی محەمەد بوونە پێغەمبەر لایانگران و پێڕەوانی ئەم دینانە بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی خۆیان کەوتنە بلاوکردنەوەی بلاوکراوەو و شەونامە، لە بەرامبەر ئەوانیشدا فەرمانڕەوایانی ئەوکاتە و کۆمەلانی دژ بەوانیش ڕۆژنامەی خۆیان دەردکرد. لەو کاتەوە ڕۆژنامە وەك هۆکارێك بۆ سەرکەوتنی بیروباوەڕ و مەرامە تایبەتییەکان سوودی لێ دەبینرا.

لە سەردەمی (ئەنەو شیروان)دا ڕۆژنامەوانیی ئێرانی گۆڕانێکی تازەی بەخۆوە بینی و سەرەڕای بلاوکردنەوەی هەواڵ، بۆ پەرپێدانی زانست و زمانە جیاوازەکان سوودی لێ بینرا لە سەردەمی ئەودا ئێران بوو بە یەکێ لە بنکە زانستییەکان جیهان. چەندین لاپەڕەو بەچەندین زمانی گرنگی وەك پەهلەوی، عەرەبی، تورکی، حەبەشی، یەمەنی، بلاودەکرانەوە و بە زۆربەی ولاتانی جیهاندا پەخش دەکران.

دژایەتی مەزدەکیان.یش لەگەڵ ئەنوشیرواندا بووە هۆی کە ڕۆژنامەوانی لە ئێراندا پەرەبستێنێ، ئەو دژایەتی کردنانە بەزۆری لە شێوەی ڕۆژنامە و شەونامەدا دەکران. ڕۆژنامەکانی مەزدەکیان بەدوو مەبەست بلاودەکرانەوە، وروژاندنی خەلك لە دژی ئەنەوشیروان و لە کارخستنی دام ودەزگاکانی سەلتەنەت، هەروەها بانگەشەو داواکردن لە خەلك بۆ ئەوەی ڕووبکەنە دینی زەردەشت.

روزنامهٔ وقایع اتفاقیه بتاریخ جمعه هشتم شهر جمادی الثانی مطابق سال تنگوزئیل سنه ۱۲۶۷


نمره دهم

هر کس در طهران طالب این روزنامه‌ها باشد در بازار در دکان میرزا کاظم بلورفروش فروخته می‌شود

قیمت
یک نسخه ده شاهی
سه ماه ششهزار دینار
شش ماه دوازده هزار
یکساله بیست و چهار هزار


## اخبار داخلهٔ ممالک محروسهٔ پادشاهی

### دارالخلافه طهران

چونکه سرکار اعلیحضرت پادشاهی از زمان جلوس بر تخت فرمانروائی تا
کنون ممالک محروسه را سیاحت ننموده اند خاطر خسروانی مایل
که انتظام ولایات و آسودگی رعایا را زیاده از پیش منظور فرموده چون
آفتاب جهانتاب وجود مبارک روشنی‌بخش بلاد گردیده عموم رعایا
در سایهٔ رأفت و مرحمت بر سرمندی و آسودگی و تقدیم شکرگذاری
حاصل نمایند لهذا خاطر مبارک عزیمت سیاحت ممالک عراق و اصفهان فرموده
سلاطین سلف ... همیشه با قشون و شوکت تمام بولایات
حرکت مینمودند ولی اعلیحضرت پادشاهی که شوکت دولت همایون و
جلال نوبت روز افزون خود را در آسایش و رفاهیت رعایا ... ملاحظه
میدانند و منظور دارند که از زیادی قشون در هر حرکت آسیبی برعایا نرسد
باین ملاحظه با جزئی قشونی بقدر کفایت قراول وجود مبارک و بقدر لزوم
جمعی از سایر چاکران و خدام و حشم دربار خسروانی در غرهٔ رجب انشاالله
بعزم سیاحت و تشریف فرمائی صفحات اصفهان و آن نواحی خواهند شد
انشاالله تعالی ازین سفر فیروزی اثر برای عموم اهالی ولایات محروسه فواید
و منافع کلی حاصل خواهد گردید

تذکرهٔ مرور که سابقا قرار شده بود که درین دولت علیه داده شود
درین هفته مباشرین تذکره که بولایات بایست بروند مأمور شده
رفتند و بعد ازین قرار شده است که احدی از ولایات مقرره بی تذکره نکند
و بهر کسی لازم است در عبور و مرور بطوریکه در کتابچهٔ دستورالعمل تذکره
مرقوم است تذکره بگیرند

عالیجاه حسنعلی خان سرهنگ کردستانی که احضار شده بود با فوج جدید
و صاحب منصبان فوج قدیم برکاب همایون آمده وارد دارالخلافه شد
و عالیجاه حسنعلی خان از التفاتات شاهانه ولایات بمنصب سرتیپی سرافراز
فرمودند

شاه نهر بزرگی که در دارالخلافه در بالای نگارستان حفر شده بود که آب
از رودخانهٔ کرج بشهر بیاید در عهد شاهنشاه ... ساخته نشده
و تا کنون آبی بشهر از نهر مزبور جاری نشده بود درین اوقات که
اول بهارست و اهل شهر قدری کم آبی میکشیدند و بسبب اینکه تا
حال آب در نهر مزبور جاری نبود و قدری خرابی بهم رسیده بود
محض رفاه رعایا و برایا و سکنهٔ دارالخلافه امنای دولت علیه مخارج
حفر و تعمیر و بنای نهر مزبور را که قریب بده هزار تومان میشد از خزانهٔ
عالی داده درست نموده از آب کرج بالکل ... بشهر جاری کرده و در
شبانه روز در کل محلات و خانه‌ها تقسیم شده و اغلب مساکین که همه وقت در

... ایام یکشنبه
و سه شنبه روزه بطبع میرسد

محل فروش (چاپخانه فراکلوبرسان)
(در خیابان علاء الدوله)

شنبه هجدهم جمادی الاولی ۱۳۲۰
مطابق بیست و سوم اوت ماه فرانسه
(۱۹۰۲ میلادی)

قیمت آبونه هر ماهی سه قران

# خلاصة الحوادث

نمره هشتصد و هشتاد و پنجم — No 885

هر گونه مقاله مفیده و اعلاناتیکه منافی بصلاح دولت و ملت نباشد باداره روز نامه خلاصة الحوادث بفرستند بکمال امتنان طبع و نشر خواهد شد

## لندن

بعد از ورود اعلیحضرت اقدس شهریاری ارواحنا فداه مسیو بالفور رئیس دار الشوری و سایر وزراء بحضور همایونی شرفیاب شده و چند نفر نماینده از طرف کمپانی تلگراف هند و اروپا که یك رشته سیم ادارهٔ آنها از خاك ایران میگذرد بحضور باهر النور شرفیاب شده ورود اعلیحضرت اقدس شاهنشاهی را تبریك گفتند و صندوقچهٔ نقره برسم هدیه با نظام لائحهٔ مبنی بر تشکر از اهتمامات دولت ابد مدت در باب حمایت ادارهٔ کمپانی تلگراف تقدیم حضور مبارك نمودند

## ایضا

اعلیحضرت ادوارد هفتم برای باز دید و سان و برای تجربه و معاینه سفائن نظامی که مرکب از یکصد و هشت فروند کشتی جنگی میباشند تشریف فرما شدند

سردار ها و جنرالها بوئر وارد لندن شدند دولت و ملت انگلیس از جنرال های مغلوب در

سردار های مشار الیهم برای شرفیابی حضور اعلیحضرت پادشاه انگلستان از لندن روانه ساحل دریا شدند

## طرابلس

رئیس طریقهٔ سنوسی در ناحیهٔ کانون که از جمله توابع طرابلس است وفات نموده

## امریکا

در مملکت جمهوری ونه زوئلا شورش و اغتشاشی فراهم آمده سیاسیون و رجال که بدو طریقه مختلفه و عقیدهٔ متضاده میباشند برای تصاحب نمودن زمام حکومت مدت شش روز در جنگ بودند و در این محاربه یکصد و هشتاد نفر جنرال و سه نفر سرهنگ و یکصد و شصت و هفت نفر سرباز از طرفین مقتول شدند موافق این صورت عدهٔ صاحب منصب مقتول نسبت بسربازان فوق العاده متناسب است معلوم میشود که یا صاحبمنصبان بیشتر از سربازان بوده‌اند یا آنکه در مواقع جنگ صاحب منصبان کمتر محتاط بوده و یا آنکه کلیه

دوای ئەوەی خەڵکی ڕووی لە ئیسلامەتی کرد، شەپۆلی دژایەتی کردنی حەزرەتی محەمەد(د.خ) و خانەوادەکەی بەهۆی بڵاوبوونەوەی چەندین وتاری شۆڕشگێرانە پەرەی گرت. بەم شێوەیە ڕۆژنامە و بڵاوکراوە چوو ناوجیهانی عەرەب.

لە سەردەمی (هارونە ڕەشید)ی خەلیفەی عەبباسی دا، خانەوادەی (بەرمەکی) یان بە لاساییکردنەوەی دەربارەی پاشایانی ئێران، دەزگای خەلافەتی هارونە ڕشیدیان گەیاندە ئەو پەڕی مەزنی وشکۆداری، بەم شێوەیە شارستانیەتی ئێرانییان بۆ دەزگای سادەی خەلافەتی عەبباسی گواستەوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا دەستووری کارگێڕی ڕۆژنامەوانیشییان بۆ وڵاتە عەرەبییەکانی تر برد و لە هەمووان زیاتر لە بەغدای پایتەختی خەلیفەکانی عەبباسیدا بایەخدار کرد.

دوای داگیرکردنی ئێران لەلایەن عەرەبەوە و سەرەتای دەورەی لاوازیی خەلیفەکانی عەبباسی،گەورە پیاوانی ئازادیخواز لە هەموو سووچێکی ئێراندا ڕاپەڕین و جووڵانەوەیەکی مەزنیان لە دژی بێگانان بەرپاکرد و کە هەوەڵین و گرنگترینیان ڕاپەڕینی (ئەبو موسلیمی خوراسانی) بوو. ئەو پیاوە بۆ هاندانی خەڵك لە دژی خەلیفەکانی عەبباسی وبۆ وەدەست هێنانی ئازادی و سەربەخۆیی لە دەستچووی ئێران دەستی بەبڵاوکردنەوەی چەندین شەونامەی یەك لە دوای یەك کرد، کە بە زۆری لەسەر پیستە یان کاغەز دەنووسرانەوە و پەخش دەکران.

هێرشی مەغۆل بۆ ئێران و ئەو وێرانکارییەی لە هەموو سووچێکی ئێراندا وبە تایبەتی ناوچەی خوراسانی هینایەکایەوە، بووە هۆی ڕق و تووڕەیی شاعیر ونووسەرانی ئێرانی، ئەم کینە ونەفرەتە لە قاڵبی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە وبڵاوکراوە جۆروبەجۆرەکاندا دەرکەوت. لە کاتی حوکمڕانی مەغۆلان لە ئێرانی، چاپەمەنی فارسی زیاتر لە هەموو کاتێك گۆڕانی بەسەردا هات.

هەوەڵین دەزگای چاپ لەوکاتەدا هاتە ئێرانێ، هەڵبەتە ئەم دەزگایە زۆر سادە بووە و زیاتر بۆ نووسینی سەرجەم بەکارهاتووە و زیاتر بۆ بڵاوکردنەوەی ئەسکەناس سوودی لێ وەرگیراوە. سەرباری ئەوە کاغەزێکی زۆریش لە (پەکین)ەوە هات، ئەم دوو هۆکارە لەلایەك و لە لایەکی دیکەشەوە موعاناتی نووسەران و زانایانی سەردەمی مەغۆل بووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامە لەو سەردەمەدا گرنگی پەیدا بکا.

لە سەردەمی پاشایەتی شاعەبباسی یەکەمدا، بە هۆی نوێنەرانی وڵاتانی ئەورپایی شا ئاگاداری چۆنیەتی بڵاوکراوە جۆربەجۆرەکانی ئەوروپا بوو و حەز و ئارەزووی ڕۆژنامەی

لەلاپەیدا بوو. لەو ڕۆژەدا بەدواوە تەواوی هەواڵی مەملەکەت بە دەزگای چاپیی سادە (هەڵکوڵین و پرێس) لە سەرانسەری وڵاتدا پەخش دەبوو. ناوی (جەریدە)ش لە سەردەمی شا عەبباسی دا بە باڵای چاپەمەنیی فارسیدا بڕا، تیراژی ڕۆژنامەکان لە سەردەمی شاعەبباسدا لە (١٠٠٠) دانەی تێدەپەڕاند.

کاروباری کارگێڕی دامودەزگای گەورەی حکومەتی (نادرشای ئەفشار) و ناچاری وەرگرتنی هەواڵ لە هەموو سووچێکی ئێران تا هیندستان، ئەفغانستان، و قەفقاز بوە هۆی ئەوەی ڕۆژنامەوانی لە سەردەمی ئەم پاشایەشدا بایەخی خۆی لە دەست نەدات. لە سەردەمی نادرشا دا هەرچی هەواڵی ناوخۆ هەبوون، لەسەر کاغەز دەنووسرانەوە و بۆ هەموو ویلایەت و مەملەکەتەکانی بن دەستی ئێران ڕەوانە دەکران و لەباتی ئەوەش هەواڵ وەردەگیرا.

نادر شا بۆ ئاگاداری لە بارەی مەملەکەت مەزنەکەی خۆی چەند کەسێکی بە ناوی ڕووداونووس بۆ سەرانسەری وڵات ڕەوانەکرد بۆ ئەوەی تا دوا هەواڵ و ڕووداوی پێ ڕابگەیەنن.

لە کتێبی (مێژووی ڕۆژنامەوانی ئێران)دا نووسراوی خواڵێخۆشبوو (محەمەد سەدر هاشمی) لەبارەی سەرەتای دەرکەوتنی ڕۆژنامە لە ئێراندا وا هاتووە:

(کۆنترین ڕۆژنامە، کە بەزمانی فارسی بڵاوکرابێتەوە، ڕۆژنامەیەکە لە دەوروبەری ساڵی (١٢٥٣) ی کۆچی دا بە سەرپەرشتی میرزا ساڵحی شیرازی لە تاران دامەزراوە و چاپکراوە. لە بارەی ڕۆژنامەی ناوبراو لەگەڵ ئەو هەموو گەڕان و کۆششەی لەلایەن نووسەرەوە کراوە، هیچ نوسخەیەکی دەست نەکەوتووە و زانیاری لە بارەیەوە تەنیا هەر ئەو باسەیە کە لە گۆڤاری ئەنجوومەنی ئاسیایی (بەرگی پێنجەم، ساڵی ١٨٣٩)دا نووسراوە. لە گۆڤاری ناوبراودا بە ناونیشانی (ڕۆژنامەی ئێرانی) باسێك بڵاوکراوەتەوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

لە سەدەی سێزدەیەمدا، واتای دەوروبەری ساڵی(١٢٥٣)ی کۆچی، لە تاران ڕۆژنامەیەك بە سەرپەرشتی میرزا ساڵحی شیرازی دامەزراوە و چاپ بووە، ئەو ڕۆژنامەیە لەسەر دوو کاغەزی گەورە چاپ دەبوو، کە لە لایەکیەوە بە خەتێکی ئاشکراو نزیك لەیەك وتارەکان چاپ دەبوون و لە لایەکەی دی سپی بووە.

کۆی دێرەکانی لەگەڵ مانشێتی وتارەکان (٢١٧) دێر دەبوو، هەموو ژمارەیەکی لە ژێر ناوی (اخبار وقایع) مانگی (محرم الحرام) (١٢٥٣)ی قەمەری لە دار الخلافە لە تاران چاپ کراوە.) پاشان بە ناونیشانی (هەواڵی وڵاتانی ئێرانی تێدا بڵاودەکرایەوە، دوای بە ناونیشانی (هەواڵی

بڵاوبوونەوەی ئەم ڕۆژنامەیە هەروەك سەرەتای دامەزراندنەکەی دیار نییە، بۆیە ناشتوانری ئەو ڕۆژنامەیە بە سەرەتای دەست پێکردنی ڕۆژنامە لە ئێرانی بژمێردرێ. سەرهەڵدانی ڕۆژنامە لە ئێران، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە هەنگاوەکانی (امیر کبیر)ەوە دەست پێدەکات. ئەو لە سەردەمی وەزارەتی خۆیدا ڕۆژنامەیەکی بە ناوی (وقایع اتفاقیه)ەوە بڵاو دەکردەوە.

ڕۆژنامەی (وقایع اتفاقیَه) پاشان بە گۆڕینی ناوەکەی بۆ (ایران سلگانی) و (ایران) بڵاودەبووەوە. لە سەردەمی ناسرەدین شا دا زۆربەی ڕۆژنامەکان هی دەوڵەت بوون و لە پایتەختدا بڵاودەبوونەوە و ئەگەر جاروبار لە هەندێ لە ویلایەتەکاندا وەك ئیسفەهان و تەورێزو فارس. ڕۆژنامە بڵاوکراتەوە، لەژێر چاودێری فەرمانڕەوایانی ئەو کاتدا بووە.

لە وەزارەتی چاپەمەنی کە یەکێ لە وەزارەتخانە گرنگەکانی ئەو سەردەمە بووە، ئیدارەی (دار الگابعەی موبارەکە)ەوە هەبووە، کە ئەرکی ئەو ئیدارەیە ڕێکخستنی وتار و دەرکردنی ڕۆژنامەی دەوڵەتی بووە. لە ساڵی (١٨٦٣)دا (صنیع الدوله) لەلایەن (ناسرەدین شا)وە ئەم کارە پێی دەسپێردرێ ئیدارەی دار الگباعە لە ئەستۆ گرێ و هەموو چاپخانەکانی ئێرانی دەکەونە ژێر چاودێری ئەو.

(صنیع الدولە) پیاوێکی زانا بووەو شارەزایی لە زمانە بیانییەکاندا هەبووە و لە سەردمی ئەودا سێ ڕۆژنامەی گرنگ (ایران) و (مریخ) و(علمی) بڵاو دەکرانەوە. (محەمەد حەسەن خان) بەڕێوەبەری گشتی (دار الگباعە)ی دەوڵەتی بەهۆی عەشق و سووتانی زۆری بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی دەوڵەتییەوە، لە ماوەیەکی کورتدا، خزمەتگوزارییەکانی سەرنجی (ناسرەدین شا)ی ڕاکێشا و لە مانگی (ربیع الاول) لە ساڵی (١٢٨٨)ی کۆچی توانی نازناوی (صنیع الدولە) لە شا وەربگرێت.

سپپارەی دەسخەتی بەخشینی ئەو نازناوە لە بەرگی سێیەمی کتێبی (مرێت البلدان)دا بەم شێوەیە هاتووە: ((بەهۆی پێشکەوتنی خوێندن لە دار الگباعە ی پیرۆزدا چاودێری جوان وگرنگی پێدانی تەواوی محەمەد حەسەن خان خزمەتکار و وەرگێڕی تایبەتی و بەڕێوەبەری گشتی (دار الطباعە)ی مەملەکەتی ئێران ڕوون و ئاشکرایە و بە تەواوی ئێمەی دڵخۆش کردووە، نازناوی (صنیع الدولە)مان پێ بەخشیوە و شایانی شانازی و بەرچاوییە و بە ئومێدی ئەوەی زیاتر خزمەت بکات، لە مانگی ربیع الثاني ١٢٨٨)).

دوای ساڵێك، واتا له ساڵی (١٢٧٩)دا سەر لەنوێ (صنیع الدوله) کەوتـەوە بـەر لـوتفی ناسرەدین شا و چەپکە گوڵێکی زیوینی بەدیاری وەرگرت. دەقی فەرمانەکە کە لـەم ڕووەوە بـۆ (مشیرالدولة صدر اعظم) نووسراوە بـەم شـێوەیەیە: ((جـەنابی صـدر اعـظم لـە مـاوەی سـاڵی ڕابردوو دا کە خزمەتی چاپ و بڵاوکردنـەوەی ڕۆژنامـەی دەوڵـەتی خرابـووە ئەسـتۆی محەمـەد حەسەن خان (صنایع الدوله) بە پێی بەنـدەکانی ئـەو پەیماننامەیـە بـە چـاکی کارەکـانی خـۆی کردووە.

ئێستا کە کاغەزاکانی دەوڵەتی بـۆ ڕەوانـە دەکرێتـەوە بـۆ هانـدان و نیـشانەی چـاودێری پاشایانە چەپکە گوڵێکی زیوینی پێشکەش دەکرێ تا وەك خزمـەتی زیـاتر بکـات و لـە کـاری خۆیدا سەرکەوتوو بێت مانگی (محرم الحرم ١٢٨٩) لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی (ناسرەدین شـا) بەشێوەیەکی گشتی ئاگاداریی بۆ فەرمانڕەوایانی ویلایەتەکان چاپ دەکرا ولـەو ئاگادارییانـەدا فەرمانڕەواکانیان بەکاری قبووڵ کردن و بەجێهێنانی ئابوونەی ڕۆژنامـەکان ئاشـنا دەکـرد، بـۆ نموونەیەکێ لەو ئاگادارییانە، کە لە ژمارە(٥١)ی ڕۆژنامەی (وقائع اتفاقیه)ی ڕێکەوتی پێـنج شەممەی (ربیع الاول. ١٢٦٨)ی کۆچـیدا هـاتووە، وا لـە خـوارەوەدا دەینووسـینەوە: ((لـەبارەی زیادبوونی کڕیاری ئەو ڕۆژنامەنەوە هەروەك لە ڕۆژنامەی ژمارە(٢٤)دا ڕاگەیانراوە، سەرلەنوێ ڕادەگەیەنرێ، کە مەبەستی پاشای خاوەن شکۆ لە دەرچوونی ئەو ڕۆژنامەیـە ئاگادارکردنـەوەی خەڵکی ئەم دەوڵەتەیە لە فەرمانەکانی دیوان و هەواڵەکانی ناوەوە دەرەوە، بۆیە کاربەدەستانی دەوڵەت بـە پێـی فـەرمانی شـاهانە دەبـێ کاربەدەسـت و دەرەبـەگ و خزمـەتکارانی ناسـراوی دەرباری شاهانە و فەرمانڕەوا و کرێکار و خوێندەوار و ناوداری شارەکان وئـێلات ومـەمالیکی مەحروسە بۆ ئاگادارییان لە فەرمانی دیوان لە نێو ئەو ڕۆژنامانەدا، هەروەها کۆمەڵانی خەڵك لە بازرگانی و کاسبکار و چینی ناوەڕاستی خەڵك بە مەیل و ئـارەزووی خۆیـان هـەرکامێکیان حەز بکەن ڕۆژنامە بخوێننەوە پێویستە فەرماندارو کاربەدەستانی ویلایەتەکان بە پێی فـەرمانی پیرۆزی شاهانە ناویان لە لایەن کاربەدەستانی ڕۆژنامەکانەوە بنووسرێت بۆ ئـەوەی ڕۆژنامـەیان بۆ بنردرێت.

لەبەر ئەوەی ئەو چەند هەفتەیەکە ئەو فەرمانە لە ڕۆژنامەدا بڵاوکراوەتەوە و لە زۆربـەی ویلایەتەکانەوە تا ئێـستا وەڵام نەهاتۆتـەوە، بۆیـە بـە پێـی ئـەو فەرمانـە دەبـێ لـە هەفتـەی داهـاتوودا بـەو تەتەرانـەی کـە ڕۆژنامـە بـە ویلایەتـەکان لیـستی نـاوی کەسـانی نـاوبراو بـۆ

کاربەدەستانی ویلایەتەکان دەگەیەنن ئەگەر فەرماندار و کاربەدەستانی ڕۆژنامەی نەنێرن و بە پێی فەرمانی دیوانەوە نەچن، چونکە سەرپێچییان کردووە، کاربەدەستانی مەزنی دیوان هەڵوێستی خۆیان وەردەگرن)).

لە زەمانی (ناسرەدین شا)دا، دەربەگ و بەگزادە و فەرماندارانی مەملەکەت بۆ بەجێ هێنانی ئابوونە ڕادەپەرموون و لە پایتەختدا بە پێی پۆلێن کردنێکی دیاریکراو، ڕۆژنامە بۆ فەرمانداری ویلایەت و شارۆچکەکان دەنێردرا و ئەوانیش بەدەوری خۆیان ڕۆژنامەیان دابەش دەکرد و لە کۆتایی ساڵدا ئابوونەکانیان کۆدەکردەوە بۆ پایتەختیان دەنارد. یەکێ لە کارە گرنگەکانی فەرماندار و کاربەدەستانی ویلایەتەکان، ئەو دابەشکردنەی ڕۆژنامەی دەوڵەت و کۆکردنەوەی ئابوونەکانیان بووە..

سەرچاوە:

زەهرا باقریان نژاد اصفهانی، ڕوزنامە و ڕوزنامەنگاری در ایران، انتشارات مولانا، اصفهان، ١٣٧١، ص١٧-١٦.

## پێناسەی ڕۆژنامە و
## پۆلینکردنی بە بۆچوونی یونسکۆ

سازمانی جیهانی یۆنسکۆ بۆ دەستنیشانکردنی جیاوازی نێوان ڕۆژنامە و کتێب، سێ تایبەتمەندی هاوبەش وتایبەتمەندی جیاکەرەوە دەست نیشان دەکات، کە بە هۆیەوە دەتوانرێت ڕۆژنامەی ڕۆژانە و ناڕۆژانەی پێ لە یەکتر جیابکرێتەوە. ئەم تایبەتمەندیە هاوبەشانە بریتین لە:

١) چاپکراو بێت.

٢) ئامادەکردن و ڕێکخستنی لە ناوەوەی ولاتدا بێت.

٣) بۆ سوودی گشتی بێت.

١- چاپکراو بێت، بەو واتایەیە، کە بلاوکراوەکە بە ژمارەیەکی زۆر بێت جا بەشێوەی چاپی دەستی بێت، یان بە مەکینە.

٢- بلاوکەرەوەیەکی نیشتمانی دەبێ لە ناوەوەی ولاتدا ئامادە و ڕێکبخرێت، بەلام دەتوانرێت چاپکردنەکەی لەبەر باری ئابووری لە دەرەوەی ولاتیش بێت.

٣- بەگشتی بوون: بلاوکراوەکە دەبێت دوای چاپکردنی بکەوێتە بەرچاوی هەموو لایەك و هەمووان سوودی لێ ببین. ئەوجا چی بە شێوەی خۆڕایی یان بەشداری دانەفرۆشی بێت.

ئەو خاسیەتانەی،کە ڕۆژنامە لە هەموو بلاوکراوە و کتێبان جیادەکاتەوە، بریتین لە:

١- بلاوبوونەوەی بەردەوام، بەیەك ناونیشان.

٢- بلاوبوونەوە لە کاتی جیاوازی ڕێکوپێکدا، یان نارێك بەلام بە مەرجێك دەبێ سالانە زیاتر لە جارێك بلاوبێتەوە.

٣- بلاوبوونە بە مێژوو ژمارەی دیاریکراو.

ڕوونکردنەوەی ئەم خالانە: یەکێ لە جیاوازییەکانی بلاوکراوەی دەوری، بلاوبوونەوەی بەردەوامە لەگەل پاراستنی ناونیشانێکی دیاریکراو، بەلام هەندێ جار وەها ڕێك دەکەوێت کە بلاوکراوەی سیاسی دوای وەستانی، ناونیشان وئارمی بلاوکراوەکەی خۆی دەگۆڕێت یان بە تەواوی یەکێکی دی لە جێگەی دادەنێت، یان دەخرێتە سەر دەزگایەکی گەورەتر و نانیشانی ئەوێ وەردەگرێت، بەلام دەبێت سەرنج بۆ ئەوە بدرێت کە هاوبەشێکی زۆر لە نێوان ناوە کۆن و نوێیەکەدا هەیە کە بە ئاسانی هەمووان دەتوانن بیناسنەوە.

١- بڵاو بوونەوەی دەورەی ڕۆژنامە دەبێ لە کاتی دیاریکراو و بابەتی جیاواز بگاتە دەست خەڵك و هەر ژمارەیەکی لەگەڵ ژمارەکانی پێشوودا جیاواز بێت.

٢- بڵاوکراوەی دەوری دەبێ مێژووی بڵاوکردنەوەی ژمارەی تایبەتی خۆی جیاواز بێت.

شارەزایانی یۆنسکۆ ڕۆژنامە بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکەن، ڕۆژنامەی ڕۆژانە و ناڕۆژانە، ڕۆژانەمەی ناڕۆژانە. ئەوانەن کە هەفتەی دوو یان سێ جار بڵاودەبنەوە بەسەر ڕۆژنامەی هەفتانە و ڕۆژنامەی مانگانەدا دابەش دەبن.

ڕۆژنامەی ڕۆژانە هەفتەی شەش یان پێنج جار، بەلایەنی کەمەوە چوار جار بڵاودەبنەوە لە ڕووی کاتەوە بۆ ڕۆژنامەی بەیانیان و عەسران دابەش دەبن.

شارەزایانی یۆنسکۆ ڕۆژنامەی ڕۆژانە بۆ دەستە ڕۆژنامەی هەواڵی گشتی و ناهەواڵی گشتی، یان پسپۆڕی دابەش دەکەن، جیاوازی ئەو دوو ڕۆژنامەیە لە تیڕوانیتیان دایە بۆ ڕووداوی هەنووکەیی و خستنەڕوویان لەبەرچاو گرتنی پێوەندی پێویستی گشتی و تایبەتی، ڕۆژنامە لەسەر بنچینەی مەڵبەندتی بڵاوبوونەوەیان دەتوانرێ بۆ ڕۆژنامەی میللی یان نیشتمانی، ڕۆژنامەی ناوچەیی یان هەرێمی دابەش بکرێت.

١- **ڕۆژنامەی دەوڵەتی:** بە زۆری لە پایتەخت یان لە شارە گرنگەکاندا بڵاودەبێتەوە لە سەرانسەری وڵاتدا دەبەخشرێتەوە، ئەم ڕۆژنامانە زیاتر لە وڵاتانەی کە دەسەڵاتی سیاسی، یان مەرکەزییان هەیە پەرەدەسێنن.

٢- **ڕۆژنامەی ناوچەیی:** بە زۆری ئەو وڵاتانەی کە هەر ناوچە و هەرێمێکی خاوەن فەرهەنگ، ڕێکخستنی کارگێڕی وتایبەتمەندی کۆمەڵایەتیان لەو ناوچانە، یان هەرێمانە جیاوازە، بڵاودەبێتەوە. کە هەتا وەك تیراژیان لە ڕوژنامەکانی میللی زیاترە.

٣- **ڕۆژنامە ناوخۆییەکان:** ئەو ڕۆژنامانەن کە لە چوارچێوەی شارێك و دەروبەرەکەیدا بڵاودەبێتەوە بابەت و مەسەلەکانیشی تایبەت بەو شوێنەن.

هەر لە لاپەرەیەکی ڕۆژنامە خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی، لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی لە ڕاستی دا ئاوێنەیەکی ڕوونی هەر ڕۆژنامەیەکە و ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکانی لەو لاپەرەیەدا بۆ خوێنەرانی دەخاتەڕوو.

لاپەرەکانی تر جیاوازییەکان بە وتاری تایبەت بە لاپەڕە پسپۆڕییەکان بە وتـاری تایبـەت بە لاپەڕکەوە بەندە کە لە هەموو لاپەڕەکانی تر جیای دەکاتەوە و ڕووداوەکانی ڕۆژانەی کەمتر تێدا ڕەنگ دەداتەوە. لاپـەڕە ناوخۆییـەکان کـە زۆر جـاران، ڕۆژنامـە میللـی یـەکان هـەواڵ و ڕیپۆرتاژی شارە گەورەکانی تێدا بڵاودەکەنەوە.

*    *    *

سەرچاوە: زهرا باقریـان نـژاد اصـفهانی، ڕوزنامـە وروزنامـەنگاری در ایـران، اصـفهان، ١٣٧١، ص٤٧-٥٠

## تیۆرەکانی ڕۆژنامەوانی

لە کتێبە کلاسیکییەکاندا بە ناونیشانی (چوار تیۆرییەکەی ڕۆژنامەوانی) فرێد سیبێرت و تیۆدۆر پیترسۆن و ویلبور شرام چوار تیۆریان لە بابەت کارکردنی ڕۆژنامەوانی لە کۆمەڵدا دیاری کردووە. کۆنترین تیۆری دەسەڵاتدارییەتییە.

**تیۆری دەسەڵاتداریەتی:**

ئەم تیۆرە لە سەدەکانی شازدە و حەڤدەدا دەرکەوت و لەگەڵ داهێنانی چاپخانەدا لە ئەوروپادا بڵاوبووەوە. پەیوەندی بە هەندێ خێزانی دەستەلاتدارەوە هەیە، وەك خێزانی تیۆدۆر لە ئینگلتەرەو بۆربۆن لە فەرەنسا و هاپسبۆرگ لە ئیسپانیا. لە کۆمەڵی هاوچەرخیشماندا لە کاتی جیاوازدا بەرەو حکومەتەکانی یابان و ڕووسیای ئیمپریالی و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و هەندێ لە وڵاتانی ئاسیا و ئەمریکای باشوور ڕێگەی گرتووە.

ئەم تیۆرەی دەستەڵاتدارییتی وەها لە مرۆڤ دەڕوانێ. کە سەر بە دەوڵەتە و مافی سروشتی دەوڵەتە نەك خوداوەندیی ڕژێم بپارێزێ و پایەی دەوڵەت بەهێز بکات. ڕۆژنامەش وەك کۆمەڵ بە ئامرازێك دادەنێ بۆ بڵاوکردنەوەی هەڵوێستی دەوڵەت لە سەر جەماوەر و ڕاستی و چەوتی پێ ڕابگەیەنی بە پێی بۆچوونی دەوڵەت بەرامبەر بە مەسەلەکان، بەیاننامە ساسییە ڕەسمییەکانی دەستە بژێری فەرمانڕەوای پێ ڕابگەیەنێ.

دەوڵەت، دوای دەست نیشانکردنی ئامانجەکانی، ڕۆژنامەوانی وەك ڕێگەیەك بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە بەکاردەهێنن، کەوابێ ڕۆژنامەوانی دەبێتە هۆیەك بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك لەوەی کە ئامرازێك بێت بۆ ڕەخنەگرتن لە هۆ و ئامانجەکان پێکەوە. سیبێرت لە نووسینەکاندا سەبارەت بە تیۆری لە دەستەڵاتداییەتی ئاماژە بەوە دەکات، کە دەوڵەت لە قۆناغەکانی بەراییدا ڕۆژنامەوانی بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە بەکارهێناوە، بەوەی کە جەخت لە سەرخۆ تێهەڵقووتاندنی ڕۆژنامەوانی لە بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکان دەکاتەوە.

پاشان ڕۆژنامەوانی و دواتریش کەناڵەکانی پەیوەندی بەشێوەیەکی گشتی، بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانەو وەك ئامرازێك بۆ یارمەتیدانی دەوڵەت لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا بەکار هێناوە. لە سایەی تیۆری دەستەڵاتدارییەتیدا خاوەنداریەتی ڕۆژنامەوانی و چۆنیەتی بەکارهێنانی لە گرنگیدا یەکسانن. لە ئینگلتەرای کۆندا ڕێگەی بە کەرتی تایبەت درا بۆ

ئەوەی خاوەنی ڕۆژنامەوانی بێت، بەڵام ئەو کەرتە بریتی بوون لە هاوڕێ دەوڵەمەندەکانی دەرباری پاشا، کە خاوەندارییەتی و ئیمتیازی ڕۆژنامەوانیی خۆیان بەشێوەیەکی خراپ بۆ ڕەخنە گرتن لە لایەن حکومەتەوە بووە هۆی لە دایك بوونی ژمارەیەك ڕۆژنامەی ڕەسمی کە لەسەر هەمان ڕێڕەوەی حکوومەت دەڕۆیشتن، لە کۆتاییدا کەناڵی ڕاگەیاندنی تایبەتیش لە پاڵ کەناڵەکانی حکوومەت هاتنە کایەوە.لێرەوە دژوارییەك دروست بوو لە ئەرکی تیۆری دەستەلات. کە چۆن حوکم بەسەر ڕۆژنامەوانیی تایبەتدا بکات؟

ئەو حوکم کردنە چەند شێوەیەکی وەرگرت، هەروەك پێشتر باسمان کرد لە ڕاگەیاندنی ئەو بڵاوکراوانەدا، کە حووکمەت بۆ توێژێکی کەمینەی دەردەکرد. سیستمی (ڕێگە پێدان) بۆ ماوەی دوو سەد ساڵ لە ئینگلتەرە درێژەی کێشا، پاشان لە سەدەی حەڤدەیەمدا ئەو سیستەمە بەهۆی سەرکەوتنی ڕۆژنامەوانیی تایبەتی نەیارەوە هەرەسی هێنا، بۆیە حکوومەت ناچار بوو دەست نیشانی ژمارەی ئەو کرێکارانەی لای خاوەن ئیمتیازەکان بکات، بەڵام ئەو ڕێژەیەش زۆر بە خێرایی هەرەس هێنا، لەبەر ئەوەی خاوەن ڕۆژنامەکان کەم بوون، ئەو کەسانەی تازە دەست پێکەر بوون، کە دەگەیشتنە قۆناغی ئەو کرێکارانەی ڕاهێنرا بوون، کاریان دەست بەسەرداگرتن ئەو سانسۆرە ڕاستەوخۆیە بوو، کە دەبوایە بۆ ناوەرۆکی بەرهەمە هەڵبژێردراوەکان لە دەوڵەتەوە وەربگیرێ. سانسۆریش دەریخست کە جەماوەرێکی زۆری نییە، هەر بۆیە ئەویش سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

ڕێگەی چوارەم و ئەویش تا ڕادەیەك سەرئەکەوت. ئەوە بوو کە هەر کەسێك بابەتێك چاپ بکات شایستەی دەوڵەت نەبێت، ئەوا بەپێی یاساکانی ناپاکی، یان ئاژاوەنانەوە دادگایی بکرێت. لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بە شێوەیەکی زۆر کت وپڕ بە بەراورد لەگەڵ هەندێ وڵاتی تردا، گۆڕان لە ڕۆژنامەوانیی سەر بە دەستەلات بۆ ڕۆژنامەوانیی ئازاد ڕووی دا. مۆرکی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی چەندین پرەنسیپی تازەی بۆ سەربەستی بیروڕا هێنایە گۆڕێ.

نیشانەی ئەو گۆڕانەش لەو ڕووداوەی ساڵی (١٧٧٦) کە بەسەر ڕۆژنامەی ڤێرجینیا گازێت دەردەکەوێت، کە لە ولیامزبێرگ لە ویلایەتی ڤێرجینیادا بڵاودەکرایەوە. لە ژمارەی ڕۆژی (١٠ ی مایسی ١٧٧٦)دا ناوی ڕۆژنامەکە گوزارشت لە دەستەلاتدارییەتی بەریتانیا دەکات و دروشمی بەگزادەیی پێوە دیارە. دوای هەفتەیەك لەو مێژووە ناوی ڕۆژنامەکە

گیانێکی شۆڕشێگێری پێوە دیارە و دروشمی بەگزادەیی گۆری بۆ وشەکانی (سێزدە کۆلۆنیالی یەکگرتوو). هەروەها بە دروشمی(بە یەکیەتی دەمێنینەوە بە پەرتی دەڕووخێین).

لە (٧ی حوزەیرانی ١٧٧٦) لەگەڵ دروشمێکی نوێدا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند.

ئەمرۆش لە زۆر پارچەی جیهان لە وڵاتانی کۆمۆنیست، لەو وڵاتانی لە ژێر دەستەڵاتی دیکتاتۆریدان سیستمی ڕۆژنامەوانی دەستەڵاتدارییەتی باوی هەیە. هەروەها لە هەندێ ناوچەی ئەفریقیاش ڕۆژنامەوانیی ئازاد بە تەنیا تیۆرە وبێ پراکتیك.

**تیۆری ئازادی:**

تیۆری ئازادی بە شێوەیەکی هێدی لە سەدەی شازدەیەمدا پێشکەوت و لەسەدەی هەژادەیەمدا سەقامگیر بوو، بەتایبەتی دوابەدوای ئەوەی پرەنسیپەکانی ئازادی لە چوارچێوەی دەستووری دەوڵەتاندا جێگەی خۆی گرت. ئازادی تاك دەخاتە سەرووی دەوڵەتەوە نەك ژێرەوەی و سەیری مرۆڤ دەکات بەوەی کە ئاژەڵێکی عاقڵە! هەرچەندە وەك تاك کامڵ نییە، بەڵام تاکەکان پێکەوە دەتوانن باشترین بڕیار بۆ بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵ بدەن.

(فرێد سێبێرت) لە گفتوگۆ کردنیدا لە مەڕ پێشکەوتنی (ئازادی) وگۆڕانی و (دەستەڵاتتدارییەتی)یەوە فەزڵەکە بۆ چوار کەس دەگەڕێنێتەوە: جۆن میلتۆن لە سەدەی حەڤدەیەمدا، جۆن ئەرسکن و تۆماس جیفرسۆن لە سەدەی هەژدەیەمدا وجۆن ستیوران میل لە سەدەی نۆزدەیەمدا. میلتۆن وتویەتی خەڵکی توانای ئەوەیان هەیە جیاوازی لە نێوان هەڵەو ڕاست و چاکەو خراپەدا بکەن. لە ئەنجامی ئەوەدا. بۆ دروستکردنی بڕیار دەبێ خەڵکی بگەنە بیروڕای جیاواز وبیرکردنەوەی خەڵکانی تریش وەربگرێت هەروەها ئەرسکن وتویەتی ئەو خەڵکانەی هەوڵ دەدەن بۆ ڕۆشنبیرکردنی خەڵکانی دی، نایانەوێ زەلیلیان بکەن، دەبێ توانای ئەوەیان هەبێ، کە لێدوانەکانیان ئاڕاستەی عەقڵی گشتیی میللەتێك بە هەموو چین و توێژەکانیەوە بکەن بە تایبەتی لەوەدا. کە پێیان وایە حەقیقەتە.

هەروەها جۆن ستیورات میل وا هەست دەکات، کە خەڵك مافی بیرکردنەوەو و کارکردنیان هەیە هەرچۆنێك، کە خۆیان دەیانەوێ مادام دەستدرێژی نەکەنە سەر مافی خەڵکانی دی. بەڵام جێفرسۆن، کە سوودی لە بیروڕاکانی میلتۆن وەرگرتووە. ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەگەر کۆمەڵێ خەڵك پێکەوە کۆببنەوە و خاوەن زانست و هۆشیاری بن. دەتوانن بڕیاری ڕاست و دروست بدەن. ڕۆژنامەوانی ئامرازی ئاگادار کردنەوەی خەڵکە

کەوابێ دەبێ لە کۆت و پێوەندەوە بە دوور بێت. لە ساڵی (١٧٧٤)دا کە جیفرسۆن کورتەی بیروڕاکانی لە بارەی مافی ئەمریکا و بەریتانیا بڵاوکردەوە، زەمینەی بۆ دەرکەوتنی ڕۆژنامەوانیی ئازاد ڕەخساند.

ئیدی وردە وردە مافی ڕۆژنامەوانیی ئازاد جێ پێی خۆی قایم کرد. سەرەتا لە دادگاکاندا تاوانبارکردن و ئاژاوەنانەوە و سووك کردن و زمانی نابەجێ بۆ یاخی بووانی دەوڵەت پێشکەش دەکرا، بەڵام ئەو تاوانبارکردنانە بە بەردەوامی بەتاڵ دەبوونەوە، چونکە هاوپەیمانەکان مافی بڕیاریدانی ئەویان هەبوو، کە ئەو کەسە گوناهبارە لە بڵاوکردنەوەی بابەتێکی ئاراستەکراو، یان نا.

هەرچەندە هاوپەیمانەکان زۆر گرنگییان بەوە دەدا، کە ڕزگاریان بێ لە باج نەوەك پاڵپشتی لە بڕیاری دادوەرەکان بکەن، کە باج ئەوانی دامەزراند بوو، زۆربەی کات ئەگەر دادەوەر بڕیاری ئەوەشی بدابوایە، کە ئەو بابەتە ئاژاوە دەنێتەوە - ئەوان بە ئاسانی دەیانوت تاوانبار بابەتەکەی چاپ نەکردووە هەر بۆیە ئەو هیچ بەرپرسیاری بڵاوکردنەوەی نییە. دواجار ئازادی لەگەڵ سەربەستی ڕۆژنامەوانی بووە بەشێك لە پرەنسیپەکانی دەستوور لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پاشان ئینگلتەراش.

**تیۆری بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی:**

لە گەڵ سەدەی بیستەمدا ڕۆژنامەوانیی بیستەمدا چاپکراو کەوتە قۆناغی ڕۆژنامەوانیی زەرد وسەرەتای ترووسکەی ڕادیۆ فیلمی سینەمایی دەستی پێکرد. وای لێهات بیروباوەڕی سیاسی توانای ڕازی کردنی لە تریبۆکانی وەك شەپۆلەکانی هەوای و شاشەی گەورەدا هەبێت.

بەرگی ئەو نامیلکەیەی تۆماس جێڤەرسۆن لە ساڵی (١٧٧٤)دا بڵاوی کردەوە بووە هۆی داڕشتنی بانگی سەربەخۆیی. ئەم نامیلکەیە بە نموونەیەکی کلاسیکی لە قەڵەم دەدرێت بۆ سەرەتاکانی ڕۆژنامەوانیی ئازاد لە ئەمریکادا لە کەش و هەوای شۆڕشی پیشەسازیدا کۆمەڵ بە فرە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەناسریتەوە، تیۆری ڕۆژنامەوانیی ئازاد، بەڵام بەرپرسیار دەرکەوت. ئەم تیۆری باوەری وایە، کە ڕۆژنامەوانی مافی ئەوەی هەیە ڕەخنە لە حکومەت و دامودەزگاکان بگرێت، بەڵام چەندین بەرپرسیاریی بنچینەیی دیاریکراویشی لە سەر شانە بۆ سەقامگیریی کۆمەڵ. یەکێ لەو هۆکارانە کە بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی ئەم تیۆرە، دەرکەوتنی یەکییەتی پیشەیی تایبەت بە ڕۆژنامەوانی بوو، وەك کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ

نووسەرانی ڕۆژنامە و کۆمەڵەی پیشەی ڕۆژنامەوانان، هەر دووکیان نزیك لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەست بەکار بوون و هاوپەیمانییەتی و شەرەفیان هەبوو بۆ هاندنی بەرپرسیارییەتی لە لایەن ئەندامەکانەوە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی یاسای پێوەندی کردنی، کە لە ساڵی (١٩٣٤)دا بۆ ڕێکخستنی کاروباری ڕادیۆ بڵاوکرایەوە، لەسەر گوتەیەك دامەزراوە، کە دەڵێ: ((لەپێناو بەرژەوەندی، گونجان، پێداویستیی گشتی)).

ئیتر ڕۆژنامەوانی کەوتە بەر ڕخنەیەکی ئاشکرا هەر وەك لە زۆر کتێب و سەرچاوەی ڕۆژنامەوانیدا هاتووە. تیۆدۆر پیترسۆن لە نووسینەکەی خۆیدا لە بارەی تیۆری بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی پێی وایە ئەو ڕەخنەیە ڕەگ و ڕیشەکەی بۆ ئەلقەکانی ویل ئیروین، کە کاتی خۆی لە بارەی ڕۆژنامەوانی لە گۆڤاری کۆلییرز لە ساڵی (١٩١١)دا بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها بۆ هەر دوو کتێبی ئەپتۆن سنکلەیر بە ناونیشانی خەسڵەتە باڵاکان لە ساڵی (١٩١٩) و کتێبەکەی جۆرج سێلدز بە ناونیشانی ئازادیی ڕۆژنامەوانیی، دەگەڕێتەوە. ڕەخنەی ئەو نووسەرانە جەخت لەسەر ئەو مەترسییە شاراوانە دەکاتەوە، لەوەی، کە ڕۆژنامەوانیی، بە شێوەیەکی فراوان پشت بە ڕیکلام ببەستێ.

هەرچەندە ڕۆژنامەوانی بە چاوی بازرگانی ودوور لە دەستەڵاتی حکومەت تێی بڕوانێ، بەڵام ئەو قازانجەی سەر حیسابی خزمەتی گشتی دەیکات جێگەی مەترسییە. ئەو چەمکە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، هەر لەدەست بەسەرداگرتنی پیشەسازیی فیلم لە سییەکاندا، تا مولکدارییەتی یەکگرتووی ڕۆژنامە و ڕادیۆکان لە حەفتاکاندا. لە میانەی ڕەخنەی ئازاد و ڕاشکاوانە لە ڕۆژنامەوانیی وهاوبەندی شەرەف و بڵاوکراوە حکومییەکان و ئاراستەکردنی بەرپرسیارییەتی ئەندامان و کارمەندانی ڕۆژنامەوانیی، بەهای تیۆری بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت.

**تیۆری سۆڤیەتی کۆمۆنیستی:**

لە کتێبی (چوار تیۆرەکەی ڕۆژنامەوانیی)دا وێلبۆر شرام سەرەتای قسەکانی لە بارەی تیۆری سۆڤییتەتی کۆمۆنیستی بە خاڵێکی گرنگی دەست پێدەکات کە پوختەکەی ئەوەی، کاتێ دوو ڕۆژنامەوانی سۆڤییەتی و ئەمریکی تووشی یەك دێن (قسەکانیان بێ گومان سەیرو تا ڕادەیەکیش بێ ئومیدن). ئەو چوارچێوە دەستوورییەی کە هەر یەکەیان لێوەی هەڵدەقوڵێ

دژەبەیەکن.ئەمریکییەکە ژیانی ڕۆژنامەوانە سۆڤیەتییەکە بە سووك دادەنێ لە ڕۆژنامەوانییەك کە دەوڵەت دەستی بەسەردا گرتبێت، ڕۆژنامەوانە سۆڤیەکەش هەروا ئەمریکییەکە دەداتە پاڵ ڕۆژنامەوانییەکی بۆگەن، نا بەرپرسیارە کە لە لایەن بەرژەوەندی تایبەتەتییەوە بەڕێوە دەچێت.

بۆ تێگەیشتنی تیۆری سۆڤییەتی کۆمۆنیستی بۆ ڕۆژنامەوانیی، نابێ هەر بە دوای چەمکی سیاسی سۆڤییەتی، کە بە تیۆری مارکسییەتەوە سەرچاوەی گرتووە بکۆڵیتەوە، بەڵکودیراسەی ئەوەش بکەین، کەشی کردنەوەی سۆڤییەتی بۆ وشەی (ئازادی) چییە. هەروەها سەرباری ئەوە، کە پرەنسیپی سەرەکی ژیانی سیاسی سۆڤییەتی(یەکیەتییە). پاشان دەرکەوتنی چینی کرێکار و بەرپابوونی شۆڕش، جۆوڵانەوەیەك بۆ بەدیهێنانی یەکییەتی لە نێو کۆمەڵی سۆڤییەتیدا ئەنجام دەدەن. تێکەڵاوکردنی خەڵك لە کۆمەڵێکی بێ چین بۆتە فەلسەفەی دەوڵەتی سۆڤییەت. هەر بۆیە ئازادی لە تێڕوانینی سۆڤیەت بریتییە لە ئازادی لە چەوسانەوەی کۆمەڵێکی فرە چین و توێژی وەك چینەکانی باڵا و ناوەڕاست و خوارەوە.

(شرام) ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، کە پێوەندی جەماوەری لە سێ شێوەی جیاوازی ناوی ڕۆژنامەی ڤێرجینیاگازێت، کە تێیاندا گەشەسەندنی گیانی سەربەخۆیی و گۆڕان لە ڕۆژنامەوانیی دەسەلات بۆ ڕۆژنامەوانیی ئازادی تێدا دەردەکەوێت سایەی تیۆری سۆڤییەتی کۆمۆنیستیدا بریتییە لە ئامرازێك بە دەست دەوڵەتەوە. هەر دوو ڕۆژنامەی سۆڤییەتی (پراڤدا و ئیزڤیستا)ش دوو نموونەن.

هەروەها چاپکراوەکانی پڕۆپاگەندەی نێودەوڵەتی وەك گۆڤاری (ژیانی سۆڤیەت) ڕەنگدانەوەی تیۆری سۆڤیەتی کۆمۆنیستییە لە کتێبی (چوار تیۆرەکەی ڕۆژنامەوانیی)دا (شرام) دەڵێت: ((خاڵێك هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە ئەو کەسانەی لە کەناڵەکانی پێوەندیی جەماوەریی سۆڤیەتیدا کاردەکەن بە هیچ شێوەیەك خاوەن کەسایەتییەکی دیاری خۆیان نین. کەسایەتییان، هەر وەك دیارە کەسایەتیی دەوڵەتە. ئامرازێکن مل کەچن و بە وریاییەوە ڕێڕەوی حزب و فەرمانشتەکانی دەوڵەت پیادە دەکەن).

کەناڵەکانی پێوەندی جەماوەری لەگەڵ ئامرازەکانی دەوڵەت وەك قوتابخانە و پۆلیس و کۆڕ و کۆمەڵەکانی تری وەك ئامرازێك بەرگری لە فەلسەفەی دەوڵەت دەکەن، یەك خراوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کە ڕۆژنامەوانی بۆتە ئامرازێك بۆ یەکییەتی، هەروا بە ئامرازێك

دادەنرێت بۆ ئیلهام و بەهرە وەرگرتن لەپێناو هۆشیارکردنەوەی خەڵك و ئامادەکردنی جەماوەر بۆ یەکییەتی و یەکگرتن پاشان شۆڕش کەوابێ ڕۆژنامەوانی (هاندەر، داواکەر و ڕێکخەر). ڕادیۆیش هەروەتر، لە سایەی تیۆری سۆڤیەتی کۆمۆنیستیدا خزمەتکردنی جەماوەری بەلاوە مەبەست نییە، بەڵکو ئاگادارکردنەوەیەتی، بەرنامەکانیش دیسانەوە ئامرازێکی دەوڵەتن، ئەمەش بە هۆی زۆریی ژمارەی دانیشووانەوە بۆ دەوڵەت ڕێگەیەکی گرنگە یان کەناڵێکی گرنگە، چونکە ڕادیۆ دەتوانێ بە ئاسانی بیگەیەنێ.

لێدوانمان لە چوار تیۆرەکەی ڕۆژنامەوانی بەو تێڕوانینەوە دەبێت، کە دەکرێ کەناڵەکانی پێوەندی بەو پێیە پۆلێن بکرێن، چونکە ئەوانی دیکەش چەند شێوەیەکی جیاوازی گەیاندنی وڵاتانی ترو تا بەسەر کەناڵەکانی ناوەوەی یەك وڵاتیشدا پیادە بکرێت. ئەوە بە تەنیا ڕەگو ڕیشەی ڕۆژنامەوانی لە کۆمەڵدا نییە، بەڵکو ئەمە ڕەگو ڕیشەی کەناڵەکانی پێوەندی جەماوەرین بە گشتی.

❊ ❊ ❊

الاتصال الجماهيري مدخل، ترجمة د. عمر الخطيب، المؤسسة العربية للدراسات، بيروت، ١٩٨٧، ص٤٤٤-٤٥٣.

## دکتۆر هیمداد حوسین بەکر

- ساڵی ١٩٦٤لە هەولێر لە دایك بووە.

- ساڵی ١٩٩٥ماستەری بە ناونیشانی (ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا) لە کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین وەرگرتووە.

- ساڵی ٢٠٠١ دکتۆرای بە ناونیشانی (ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی کوردستان ١٩٤٢-١٩٤٧) لە کۆلێژی زمان/ زانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.

- چەندین لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لە بارەی ڕۆژنامەوانی کوردی بلاوکردۆتەوە.

- ئێستا پرۆفیسۆری یاریدەدەرە لە بەشی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان/ زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر.

**کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر:**

١- کلك براوەکان، عەزین نەسین، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٥.

٢- چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر،بەغدا، ١٩٨٦.

٣- ڕۆمانی حیزبی کەرامەتو حیزبی سەلامەت، عەزیز نەسین، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٨.

٤- دەرمانی بێخەوی، عەزیز نەسین، وەرگێڕان، بەغدا، ١٩٨٨.

٥- کورتە ڕۆمانی ماڵئاوا گوڵی خەم، بەغدا، ١٩٨٨.

٦- گوناهـ، کۆمەڵە چیرۆك، بەغدا، ١٩٨٨.
٧- ململانێی شارستانیەتەکان، سامۆئیل هانتگتۆن، وەرگێڕان، بلاوکراوەی ڕۆژنامەی میدیا، هەولێر، ١٩٩٨.
٨- ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.
٩- چیرۆكو ئەفسانەی کوردی، ئوستراليا، ١٩٩٨.
١٠- پەیامی کافکا، کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبیە، وەرگێڕان، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی، ٢٠٠٠.
١١- پلاتۆنەڤە شێت، چیخۆف، وەرگێڕان، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٢- ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی کوردستان ١٩٤٢-١٩٤٧، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٣- گۆڤاری گڕوگاڵی منداڵانی کورد و سەرەتای ڕۆژنامەنووسیی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٢.
١٤- جیهانی سێیەم و گەڕان بە دوای ڕۆژنامەوانیی ئازاددا، وەرگێڕان، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
١٥- بە شەرتی چەقۆ، عەزیز نەسین، وەرگێڕان، کتێبخانەی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦.
١٦- ڕێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧.
١٧- ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی- دەق و لێکۆڵینەوە، سەنتەری هەتاو، هەولێر، ٢٠٠٧.
١٨- دەروازەیەك بۆ ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
١٩- ڕۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨